هەڵگری خەڵاتی نۆبڵی ساڵی ١٩٨٢

گابریێل گارسیا مارکیز

# سەدساڵ تەنیایی

وەرگێڕانی:
م. حەسەن ڕەستگار





- ناوی کتێب: **سەد ساڵ تەنیایی**
- ناوی نووسەر: **گابریل گارسیا مارکیز**
- ناوی وەرگێڕ : **م.حەسەن ڕەستگار**
- دەرهێنانی هونەری ناوەوە: **خەلیل هیدایەت مام شێخ**
- بەرگ : **ئاکار جەلیل کاکەوەیس**
- نرخ : **(٩٠٠٠) دینـار**
- تیرەی چاپ: **چاپی سێیەم : ٢٠١٥**
- شوێنی چاپ: **چاپخانەی ڕۆژهەڵات – هەولێر / ٠٧٥٠٤٦٣٩٥٣١**
- **لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی ( ٥٤٩) ساڵی ٢٠١٥ی دراوەتێ.**

**بەڕێوەبەری هونەری دەزگا**

**سەلام محمد رسول**

**پرۆژەی هاوبەشی**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات - خانەی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

**خوێنەری بەڕێز:**

کتێبی "سەد ساڵ تەنیایی"، کە لە بەردەستتان دایە، ڕەنگە هەم کتێبەکە و هەمیش نووسەرەکەی، واتە، گابریل گارسیا مارکێز، بۆ ئێوە زۆر ئاشنا نەبن. خۆشم هەتا چەند ساڵ پێش خوێندنەوەی سەدساڵ تەنیایی، ناوی گابریل گارسیام نەبیستبوو، کە خەڵاتی ئەدەبیی "نۆبێلی" وەرگرتووە. ناحەقیش نییە ، ئاگاداری ئەدەبیاتی جیهان و ڕەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵی مرۆڤایەتی نەبین، چونکە نە خۆمان وەک نەتەوەی کورد و نە زمانەکەشمان وەک زمانێکی سەربەخۆ ددانی پێدا نەنراوە و سەرەڕای گیانبازی و فیداکارییەکی زۆر بۆ ئەو مەبەستە، جارێ نەمانتوانیوە یان نەیان هێشتووە خۆمان بڕیاری چارەنووسی خۆمان بدەین. هەر بۆیەشە، نووسینی داستان و چیرۆک و شانۆ و بابەتی هونەریی لەوپەڕی کزی و لاوازیی خۆیدایە. وەرگێڕانیش هەر مەپرسە. بەرهەمی ئەدەبیی نووسەرانی گەورەی جیهان، یان، بەکوردی وەرنەگێڕدراون یان ئەگەر وەرگێڕدرابن لە چەند نووسەری وەک عەزیز نەسین و یاشار کەماڵ و ... ئەویش لە ڕادەی چەند بەرهەمێکی ئەو نووسەرانە تێپەڕی نەکردووە. خۆ ئەگەر وەرگێڕی باش و نووسەری چاکیشمان هەبن، لە بەر خوێنەری کەم و گرانیی مزەی چاپەمەنی کەم کەس مەیلی بە سەر نووسین و وەرگێڕانەوە ماوە.

لە سەر گابریل گارسیا مارکێز، لەو ساڵانەدا ئەوەندی زانیبم کتێبێکی گچکەی کراوەتە کوردی. بەڵام شاکاری بەرهەمەکانی گابریل گارسیا مارکێز ئەو کتێبەی "سەد ساڵ تەنیایی"یە، کە خەڵاتی نۆبێلی لە ساڵی ١٩٨٢ پێدراوە و ناو و ناوبانگێکی جیهانیی داوەتە نووسەرەکەی.
"سەد ساڵ تەنیایی" لە ساڵی ١٩٦٧ا بڵاو کرایەوە و تا ئێستا بە سی زمان وەرگێڕدراوە و زۆرترین خوێنەری لە جیهاندا بۆ لای خۆی راکێشاوە. لە دیدارێکدا کە گۆرباچۆف لە ساڵانی دەسەڵاتیدا لەگەڵ گابریل گارسیا مارکێز لە مۆسکۆ کردی، پێی گوت: " چۆنە ئەو هەموو شتانەت لە کتێبێکی وەها بچووکدا کۆ کردۆتەوە؟". لە راستیشدا هەروایە. نووسەر، چارەنووسی مرۆڤی لە سەرەتای نیشتەجێ بوونیەوە لە چوارچێوەیەک بەناوی گوند هەتا دونیا خراپ دەبێ (دیارە هەر لەو گوندە) لە کتێبێکی سێ سەد و حەفتا هەشتا لاپەڕەییدا، هێناوە، لەگەڵ زۆربەی دەورانەکانی گەشەکردنی کۆمەڵگەی مرۆیی.
ئەو شاکارەی گابریل گارسیا مارکێز لە ساڵی ١٩٧٢ خەڵاتی "رۆمۆڵد گایگۆس"ی لە ڤەنزویللا وەرگرت. لە ساڵی ١٩٦٩یش رەخنەگرانی ئیتالیا خەڵاتی "کیانچانۆ"یان پێدا. هەر لەوساڵەدا فەرانسەوییەکان بە باشترین کتێبی دەرەوەی ساڵیان دانا و لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بە یەکێک لە دوازدە رۆمانی ساڵی ١٩٧٠ دیاری کرا. فرانسوا میتران لە ساڵی ١٩٨١ نیشانی "لژیۆنی دونوور"ی خەڵاتی نووسەر کرد، هەر ئەوانەش بوون کە سەرنجی هەموو لایەکی بۆ لای گابریل گارسیا مارکیز راکێشا.
با بزانین نووسەری "سەد ساڵ تەنیایی" کێیە؟و لە کوێ بووە؟و خەڵکی کوێیە؟
گابریل گارسیا خەڵکی وڵاتی کۆلۆمبیای ئەمریکای لاتینە و لە ٦ی مارسی ١٩٢٨ لە شارۆچکەیەک بە ناوی (ئاراگاتاکا) لە نزیک

کەنارەکانی کاریبی لەدایک بووە. وەک شارەزایان دەڵێن: " گوندی ماکۆندۆ"، کە بناخەی داستانەکەی "سەد ساڵ تەنیایی" لە سەر دامەزراوە، هەر هەمان شارۆچکەی "ئاکاتاکا"یە کە نووسەری لێ لەدایک بووە. باوکی گابریل گارسیا تێلگرافچی بووە بە ناوی گابریل ئێلیخۆ گارسیا. دایکیشی ناوی سانتیاگا مارکێز بووە. گابریل، باپیر و داپیرەی گەورەیان کردووە. داپیرە ، کە دەبێتە دایکی دایکی، هەر لە منداڵییەوە گوێچکەی گابریل گارسیای بە چیرۆکە خۆشەکانی چاخدا و باپیرەشی لەو بارەیەوە دەستی کەمی لە داپیرە نەبوو. گارسیا مارکێز خوێندنی ناوەندیی لە ١٩٤٦ تەواو کرد و دوای ساڵێک بۆ درێژەی خوێندن رۆیشتە کۆلیژی یاسا "حقووق" لە زانکۆی بۆگوتا. هەر لەو ساڵەدا بوو کە چیرۆکی کورتی خۆی بە ناوی "تەسلیمی سێهەم" بڵاو کردەوە. شارەزایان باوەڕیان وایە بۆ ئەو داستانە کورتە، نووسینەکانی کافکا کاری تێکردووە. هەروەها هەمەنگوای و فۆکنەر و زۆر نووسەری ئەمریکای لاتینیش لە سەر نووسینی داستانەکانی گارسیا مارکێز بێ شوێن نەبوون.
گابریل گارسیا مارکێز داستان و کورتەچیرۆکی گەلێک زۆرن، کە چەندیان ئەوانەن: "کەس بۆ سەرهەنگ نامە نانووسێ، ئەوین لە ساڵانی کۆلێرادا، پاییزی پاتریارک، سەرهاتی مەرگێکی راگەیەنراو".
گابریل گارسیا مارکیز بە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی کووبادا بۆ ماوەی ٣ ساڵان هاوکاریی هەواڵدەریی دەوڵەتیی "پرێنسا لاتینا"ی کووبای کرد. گابریل گارسیا مارکیز بۆ ماوەی ٨ ساڵان لە (١٩٦٧-١٩٧٥) لە ئیسپانیا نیشتەجێ بوو و، لەو ماوەیەدا کۆمەڵێک داستانی کورتی نووسین. گارسیا لە کۆتایی حەفتاوە تا مردنی لە نیشتمانەکەی خۆی کولۆمبیا و مەکسیکۆسیتیدا دەژیا.
نازانم کتێبی "سەد ساڵ تەنیایی" سەری لە چاپ دێتە دەر یان نا. سەرەڕای ئەوەش پێویستە ئەوەندە بڵێم لە وەرگێڕانی ئەو داستانەدا

تێنەکۆشاوم زۆر دەسکاریی دەقە فارسییەکەی بکەم و بە قەولی خۆمان بیکوردێنم، چونکە لام وابوو هەم زۆر زەحمەتە و هەمیش رەنگە لە چوارچێوەی وەرگێڕانەکە دەربچم. بێگومان دەزانم کەموکوڕیشی زۆر تێدایە، بەڵام هەرچۆنێک بێ، کاری وەرگێڕانەکەم پێ لە نەکردنەکەی زۆر باشتر بوو، بەڵکو توانیبێتم خزمەتێکی هەرچەند بچووکیش بێ بە ئەدەب و زمانی کوردیم کردبێ.

لە کۆتاییدا بەپێویستی دەزانم سوپاسی هاوڕێیانم بکەم کە هانیان دام بۆ وەرگێڕانی ئەو رۆمانە، بە زمانی کوردی، هەروەها شەماڵی رەستگاری کوڕم، کە شوێنی حەسانەوەی خۆی لە وڵاتی سوید بۆ تەواوکردنی کارەکە بۆ بەجێ هێشتم. سوپاس و رێزم بۆ هاوڕێیان کاک عوسمان رەحیمی، کە دوو جار بە نووسینەکەدا چۆتەوە بۆ رێک وپێککردن و بژار، هەروەها مامۆستا بێبەش جارێکی پێداچۆتەوە بۆ هەڵەوپەڵە هەڵگرتن. بەڵام زەحمەتی لە هەمووان زۆرتر بەر هاوڕێی لاومان کاک عەلی سووسەنی کەوت، کە بە حەوسەڵە و بەجوانی رۆمانەکەی تایپ کرد و بۆ چاپ ئامادەی کرد، زۆری سوپاس دەکەم.

**وەرگێڕ؛ حەسەن رستگار**

ساڵانی دواتر، کاتێک که سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا[1] له بەرامبەر ئەو سەربازانەدا راوەستابوو که بریار بوو تیرەبارانی بکەن، دوانیوەڕۆیەکی جارانی بیر کەوتەوە که باوکی بۆ دیتنی سەهۆڵ لەگەڵ خۆی بردبووی. لەو کاتەدا گوندی ماکۆندۆ[2] تەنیا بیست خانووی قوڕ و بەرد وچەپەری هەبوو، خانووەکان له بەستێنی چۆم دروست کرابوون. ئاوی رووبار روون بوو و به سەر بەردی سپی و گەورەدا دەهاتە خوارێ که دەتگوت هێلکەی زیندەوەری پێش مێژوون. جیهان ئەوەندە نوێ بوو که زۆر شتان هێشتا ناوێکیان نەبوو، بۆ ناویان تەنیا راداشتنی قامک له کایەدا بوو، هەموو ساڵێ نزیک مانگی مارس بنەماڵەیەکی قەرەچی شڕۆڵ چادری خۆیان له نیزک ئەو گوندە هەڵدەدا و به دەنگی دەهۆڵ و زورنا، خەڵکی گوندەکەیان له شتی تازە داهاتوو ئاگادار دەکرد. ئاسنرفێن یەکەمین شتی تازەداهاتوو بوو که گەیشتبووە ئەو گوندە. کابرای قەرەچی به قەڵافەت که دەیگوت ناوم (میلیادێس)ە[3]، به ریشی تێکهاڵاو و دەستی قرچهەڵاتوو، ئەوەی که پێیان دەگوت هەشتەمین سەیر و سەمەرەی زانایانی کیمیاگەری مەقدوونییە، به خەڵکی نیشان دا. کابرا به دوو کوتە ئاسنەوە له ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی دیکە دەرۆیشت، خەڵکی ئاوەدانی که دەیاندیت هەموو قاپ و مەنجەڵ و قابڵەمە و سێ پایە و تەورداس و تەور له جێگای خۆیان دەبزوون و دەکەونە سەر زەوی سەریان سوور مابوو، پێچ و بزماری تەختان که دەیانویست دەرپەرن جیرە جیریان وەتەختان خستبوو، تەنانەت زۆر شت که دەمێک بوو بزر ببوون دۆزرانەوە و به دوای کوتە ئاسنە

---

[1]– AurelianoBuendia

[2]- Macondo

[3]- Melauiades

سیحراوییەکانی میلکیادێسدا وەرێکەوتن. میلکیادێسی قەرەچ بە زاراوەیەکی ناخۆش دەیگوت: "شتان گیانیان هەیە، بەڵام پێویستە وەخەبەریان بێنن". خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا[4] کە هەمیشە خەیاڵی فرە و بێ سنووری دەگەیشتە ئەوپەڕی موجزات و سروشت و جادووگەری، بیری دەکردەوە رەنگە ئەو شتە تازە داهاتووە بێهوودەیە بە کەڵکی وەی بێ زێڕی لە زەوی پێ دەربێنی. میلکیادێس کە پیاوێکی راستی بوو، شتێکی ئەوتۆی پێشبینی کردبوو: "بەدەردی ئەو کارە نایە." بەڵام خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لەو کات و زەمانەدا بڕوای بە قەرەچییان نەبوو، هەر بۆیە یەسترەکەی و چەند سەر گیسکی لەگەڵ ئەو دوو تیکە ئاسنرفێنە سەودا پێکرد. ژنەکەی ئۆرسۆلا ئیگواران[5] کە هیوای بە داهاتی ئەو حەیوانانە بوو، نەیتوانی پێشی ئەو سەودایە بگرێ و مێردەکەی پەشیمان کاتەوە. کابرا لە وەڵامدا دەیگوت: "بەم زووانە ئەوەندەمان زێڕ دەبێ کە دەتوانین هۆدەکانی پێ فەرش بکەین". بۆ سەلماندنی قسەکانی چەند مانگان زۆر بە توندی کاری کرد. تەواوی ناوچە، تەنانەت تەختی رووبارەکانیشی بست بە بست بەو دوو تیکە ئاسنە پشکنی و تاقیکردەوە، بە دەنگی بەرز دوعاکانی میلکیادێسی دەوتەوە، تەنیا شتێکی کە توانی لە ژێر خاک دەریبکێشێ و بیدۆزێتەوە، زرێیەکی ژەنگاویی سەدەی پازدەیەم بوو کە شوێنە قوپاوەکانی وەک کەدووی گەورەی خیزاوی زرینگەی دەهات. کاتێک خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بە یارمەتیی چوار پیاو کە لەگەڵی بوون زرێیەکەیان لە بەر یەک کردەوە، لە نێویدا ئێسقانی بەگەچبووی مردوویەکی دۆزییەوە کە قوتوویەکی بچووکی مسی لە گەردندا بوو. لە نێو قوتووەکەدا چنگێک مووی ژنیان دۆزییەوە.

قەرەچییەکان لە مانگی مارسدا گەڕانەوە، ئەوجار دووربینێک و زەرەبینێکی بە قەرا تەپڵێکی لەگەڵ خۆیان هێنابوو. ئەوانەیان وەک دوایین داهێنانی جوولەکانی شاری ئەمستردام نیشان دا، ژنێکی قەرەچیان لە دووری گوند دانا و دووربینیان لە بەر دەرکی چادر دامەزراند، هەر کام لە خەڵکی گوند

---

[4]– Jose ArcadioBuendia

[5]– Ursula-Iguaran

بە دانی پێنج ڕیاڵ[٦] دەیتوانی چاو لە دووربین بکا و ژنەی قەرەچ لە یەک هەنگاوی خۆی ببینێ. میلکیادێس دەیگوت؛ "زانست، مەودای هەڵگرتووە، بەم زووانە مرۆڤ دەتوانێ لە ماڵەوە پاڵ بداتەوە و هەر شتێکی لە جیهاندا ڕوو بدا ببینێ." لە نیوەڕۆیەکی گەرمدا بە زەرەبینی گەورە شانۆیەکی سەیریان گێڕا، قولێک گیای وشکیان لە نێوەڕاستی جاددە دانا و بە کۆکردنەوەی تیشکی خۆر لە ناوەندی زەرەبین ەکە گیایەکەیان ئاگر تێبەردا. خۆزێ ئەرکادۆ بوێندیا کە هێشتا لە شکستی ئاسنرفێنەکان نەهاتبۆوە سەرەخۆ، بە مێشکی داهات کە ڕەنگە لەو شتە تازەیە بتوانێ چەکێکی شەڕ ساز بکا. میلکیادێس هەوڵی دا لەو بیرە پەشیمانی کاتەوە، بەڵام سەرەنجام رازی بوو زەرەبینەکەی لەگەڵ دوو تیکە ئاسنرفێنەکە و سێ سکەی زێڕ لەگەڵدا سەودا بکا. ئۆرسوڵا لە داخان دەستی بە گریان کرد. ئەو سێ سکەیە بەشێک لەو سندووقە زێڕە بوو کە باوکی بە عومرێک پاشەکەوت و لەخۆبوردوویی کۆی کردبۆوە و لە ژێر تەختەکەی چاڵی کردبوو بۆ ئەوەی لە دەرفەتێکا بیکاتە دەستمایە. خۆزێ ئەرکادۆ بوێندیا تەنانەت دڵخۆشیی ئۆرسوڵاشی نەدایەوە، بە پێکێشی زانستییانە وەها لە تاقیکارییەکاندا نوقم ببوو کە نزیک بوو گیانیشی لە سەر دابنێ.

بۆ نیشاندانی کارکردی زەرەبین لە بەرەی دوژمندا، خۆی کردبووە ئامانجی تیشکی هەتاو و لەشی وا سووتا کە هەتا ماوەیەکی زۆر شوێنی سووتاندنی لێ دیار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە ژنەکەی دژایەتیی دەکرد و دەیزانی بەرهەمی ئەو داهێنانە مەترسیی هەیە، زۆری نەمابوو ماڵەکەی ئاگر تێبەردا. زۆر سەعاتان دەرگای لە سەرخۆ داخست و ئیمکاناتی شەڕی ئەو چەکە نوێیەی لێکدایەوە، سەرەنجام کتێبێکی هەموو لایەنەی ئەو بارەوە ئامادە کرد و لەگەڵ بەرهەم و تاقیکارییە زۆرەکان و گەڵاڵەداڕێژراوەکان ناردییە لای کاربەدەستانی دەوڵەت. دایە دەستی نەتەرێک کە چیا و زەل و چۆمی خورێنی بڕین و زۆر جار نزیک بوو لە بەر تاعوون و تینی ناهومێدی و هێرشی زیندەوەری کێوی و دڕندە، گیانی لە دەست بدا، هەتا سەرەنجام گەیشتە جادەیەک کە دەگەیشتنەوە سەر

---

[٦]- Reale

جادەیەکی دیکە کە هێسترەکانی پۆستی بە وێدا رادەبردن. لەگەڵ ئەوە کە لەو کات و زەمانەدا سەفەر بۆ پێتەخت ئیمکانی زۆر زۆر کەم بوو، خۆزێ ئارکادۆ بویندیا، بڕیاری دابوو هەر کە لە لایەن کاربەدەستانەوە بانگ بکرێ، وەرێ بکەوێ و بۆ نیشاندانی داهێنانی خۆی بە پایەبەرزانی نیزامی بچێتە پێتەخت و بەرپرسایەتی فێرکردن و راهێنانی هونەری سەختی شەڕی خۆرەتاوی بە ئەستۆوە بگرێ، سالان چاوەڕوانی وەڵام بوو، سەرەنجام لە چاوەڕوانی وەرەز بوو و لای میلکیادێس پێی بەوەدا نا کە تێشکاوە، تەنیا ئەوکاتە بوو کە کابرای قەرەچ سەلماندی درۆی لەگەڵ ناکا، زەرەبین ەکەی وەرگرتەوە و سکەکانی دایەوە، هەروەها هێندێک نەخشەی جوغرافیای و رێنوێنی جۆراوجۆری دەریاگەریی دایە. لەگەڵ ئەوانەشدا بە دەست خەتی خۆی کورتەیەکی لە زانیارییەکانی هێرمانی راهیب بۆ نووسییەوە و دایە دەستی هەتا شێوەی کار بە دووربین و قیبلەنوما و گۆشەیاب فێر بێ. خۆزێ ئارکادۆ بویندیا، لە وەرزی باراندا بە مانگ لەو هۆدە بچکۆلەیەدا مایەوە کە لەو سەری ماڵەکەیدا دروستی کردبوو بۆ ئەوەی کەس نەبێتە کۆسپی تاقیکردنەوەکانی، ئەرکی ماڵەوەی بەتەواوی لە بیر چووبۆوە، شەوانە لە حەوشە خەریکی روانینی ئەستێران بوو و بۆ ئەوەش بزانێ بە وردی کەی دەبێتە نیوەڕۆ، کەمی مابوو تاو بیبا، کاتێک بە شێوەی کاری گەورە کەرەسەکانی بەتەواوی ئاشنا بوو و راهات، زانیاریی سەبارەت بە فەزا بەجۆرێک بوو کە بێ ئەوەی لە هۆدەی تاقیکاری بچێتە دەرێ، دەیتوانی لە دەریا نەناسراوەکاندا کەشتیرانی بکاو و سەر زەوییە دووەرەدەستەکان بگەڕێ و لەگەڵ زیندەوەرە ئەفسانەییەکان پێوەندی بگرێ. لەو دەورەیەدا بوو خووی گرت لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد. ئۆرسۆلا و منداڵەکان لە باخچە دارەمۆزە و سنجوو و شەتڵە چەوەندەر و پەتاتە و تەماتەیان دەچەقاند و لەبەر ماندوویی پشتیان راست نەدەبۆوە. لە پڕ و بە بێ هیچ جۆرە ئاگادارییەکی پێشوو، شێوەحاڵەتێکی جەزبە جێگای تێکۆشانی پێشووی گرتەوە.

چەندەها رۆژ هەروەک سیحری لێ کرابێ، حەدەس و بۆچوونەکانی لە بن لێوان دەگوتەوە بێ ئەوەی بۆخۆی بزانێ دەڵێ چی، سەرەنجام سێ شەممە

رۆژێکی مانگی دیسەمبەر، لای نیوەڕۆیە هەموو قورسایی باری عەزابی خۆی بە تەکانێک وەدەرنا، منداڵەکانی هەتا کۆتایی تەمەنیان فەرامۆشیان نەکرد کە باوکیان چۆن بە ڕێزێکی تایبەتی لەرزان لە تاووتێی شەوانی بێداریی دوور و درێژ و تووڕەیی خەیاڵی لە سەر کورسی دانیشت و دۆزینەوەی خۆی ڕاگەیاند:

**زەوی وەک پرتەقاڵ خڕە.**

ئۆرسولا خۆی پێ ڕانەگیرا، نەڕاندی: "ئەگەر قەرارە شێت بی، خۆت بە تەنیا شێت بە، بەڵام هەوڵ مەدە ئەو بیرە قەرەچیئاسایە بە مێشکی منداڵەکاندا بکەی." خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا، کە ئارام بوو، تەنانەت ئەوکاتە ژنەکەی لە داخان دووربینەکەی بە زەویدا دا و شکاندی، سامی نەکرد، یەکی دیکەی دروست کرد. پیاوانی گوندی لە هۆدەکەی خۆی کۆکردەوە و بە تیۆرییەکانی ،کە بۆ هیچ کامیان زانراو نەبوون، نیشانی دا ئەگەر لە نوختەیەکەوە بە کەشتی (پاپۆر) بەرەو ڕۆژاوا ڕێکەوین و هەر بڕۆین، دەگەڕێینەوە نوختەی هەوەڵێ کە وەڕێکەوتووین. هەموو خەڵکی ئاوایی هاتنە سەر ئەو باوەڕەی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا شێت بووە، هەتا ئەو کاتەی میلکیادێس گەیشتێ و هەموو شتێکی روون کردەوە، لە بەرچاوی هەموویان سوپاسی هۆش و تێگەیشتنی خۆزێ ئارکادۆ بویندیای کرد، کە چۆن لە ڕێگای زانستی ئەستێرەناسی (هەیئەت) گەیشتۆتە تیۆرییەک کە بە کردەوە سەلمێندراوە، ئەگەرچی ئەو تیۆرییە هەتا ئەو کاتی لە گوندی ماکۆندۆ نەناسراو مابۆوە، بۆ سەلماندنی ئەو پێداهەڵگوتنەش دیارییەکی پێدا، کە لە دوارۆژی گوندی ماکۆندۆدا نەخشێکی زۆر گرنگی هەبوو:

**دەزگای تاقیکاریی کیمیاگەری.**

میلکیادێس لە پڕ و بەپەلە پیر ببوو، لە یەکەمین سەفەرەکانیدا کەم و زۆر هاوتەمەنی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا دەهاتە بەرچاو، لە کاتێکدا خۆزێ ئارکادۆ هێز و توانای بێوێنەی کە دەیتوانی گوێی ئەسپی بگرێ و لە زەوی بدا، پاراستبووی، کابرای قەرەچ بەپێچەوانە دەتگوت تووشی نەخۆشییەکی سامناک بووە، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لە کەمییەی دەدا. لە ڕاستیشدا بەرهەمی هەموو ئەو نەخۆشییە کەم و جۆراوجۆرانە کە لە سەفەرەکانی دەوری

دنیادا تووشیان هاتبوو، لە لەشی ئەودا سەریان هەڵدابوو. لەو کاتەدا کە بۆ دامەزراندنی دەزگای تاقیکاری یارمەتیی خۆزێ ئارکادیۆی دەدا، بۆی دەگێڕایەوە کە چۆن مردن لە هەموو شوێنێک بە دواوەیەتی، بەڵام سوور نییە و نایهەوێ زەربەی ئاخری لێ بدا.ئەو نموونەی هەڵاتوویەک بوو کە تووشی هەموو نەخۆشی و کارەساتێک ببوو کە ئیمکانی هەیە بۆ مرۆڤ بێتە خوارێ. پەلاگەر[٧] لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، سکوربوت[٨] لە دورگەی مالیزی، گولی لە ئەسکەندەرییە، بیری بیری[٩] لە ژاپۆن، تاعوون لە ماداگاسکار، بوومەلەرزە لە سیسیل و غەرق بوونی پاپۆڕ لە تەنگەی ماگالیانیس[١٠]، ئەو کابرا سەیرە کە دەیگوت کلیلی نوستراداموسی[١١] لە دەست دایە، پیاوێکی ناشاد بوو کە لە پشت تەمێکی خەماوی و روانینی ئاسایی دەتگوت ئەودیوەی هەموو شتێک دەبینێ، کڵاوێکی گەورەی وەک باڵی قاژووی رەش لە سەر بوو و، نیوباڵتۆیەکی مەخمەری کە شوێنی چەندەها سەدەی پێوە دیار بوو، بەڵام سەرەڕای زانستی زۆر و دیمەنی سیحراوی مرۆڤێکی سەرزەوی بوو کە نەیدەتوانی لە بچووکترین شتی ژیانی رۆژانەی رابگا و دەربچێ. لە دەردی پیری دەیناڵاند، لە بێبایەخترین گیروگرفتی ماڵێ سکاڵای دەکرد، زۆر دەمێک بوو پێنەدەکەنی چونکی بە نەخۆشیی سکوربوت هەموو ددانەکانی هەڵوەریبوون. لەو نیوەڕۆ گەرمەدا، کە میلکیادێس پەردەی لە سەر نهێنییەکانی هەڵدایەوە، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا دڵنیا بوو دوستایەتییەکی بەهێز لە نێوانیاندا دەستی پێکردووە. منداڵەکان لە خۆشیی ئەو داستانانەدا کە دەیگێڕانەوە دەمیان رەق ببوو. ئۆرلیانۆ کە لەو زەمانەدا تەمەنی پێنج ساڵ بوو، بە درێژایی تەمەنی ئاوای دەهاتەوە یاد کە پاشنیوەڕۆی ئەو رۆژە لە بەرامبەر تیشکی خۆر کە لە پەنجەرەوە دەهاتە ژوورەوە، دانیشتبوو و بە دەنگێکی گەورە تیشکی

---

[٧]- نەخۆشییەک کە لە کەمبوونی ویتامین p پەیدا دەبێ - و

[٨]- نەخۆشییەک کە لە کەمبوونی ویتامین c پەیدا دەبێ - و

[٩]- نەخۆشییەک کە لە کەمبوونی ویتامینb پەیدا دەبێ – و

[١٠]- مەلەوانی دەریایی پرتەقلی (١٥٢١-١٤٨٠) کە ئەم تەنگەی لە باشووریترین نوختەی ئەمریکای باشووری دۆزییەوە.

[١١]-Michel Nostrada m us ئەستێرەناس-کیمیاگەر و پزیشکی فەرانسەوەی ٦٦-١٥٠٣ - و

داویشتە دوورترین سەر زەوییەکانی خەیاڵی و ئارەقی لە لاجانگان دەهاتە خوارێ. خۆزێ ئارکادۆ برا گەورەکەی بۆ نۆبەی خۆی هەموو ئەو دیمەنە جوانانەی وەک میرات بۆ ئەوان مابوون، بە جێهێشت، بەڵام بە پێچەوانە بۆ ئۆرسـوڵا لەو چاوپێکەوتنەدا بیرەوەرییەکـی نـاخۆش بە جێمـا، چـونکە لە کاتێکــدا هـــاتبووە ژوورەوە کە میلکیـــادێس لە رووی کەمتەرخەمـــی شووشەیەکی "بی کلورۆری" جیوەی شکاندبوو.

ژنە گوتی: "بۆنی شەیتانی دێ."

میلکیــادێس رســتەی ژنەی راســت کــردەوە و گــوتی (بە هــیچ جــۆر) دەرکەوتــووە شــەیتان لە ســولفور دروســت بــووە، بەڵام ئەوەیـان تەنیـا سوبلیمەیە.

ئەوجار سەبارەت بە تایبەتییەکانی شەیتانی بەردی خۆی زانایانە دوا، بەڵام ئۆرسوڵا گوێی نەدایە و منداڵەکانی بۆ دوعا خوێندن لەگەڵ خۆی برد، ئەو بۆنە توند و تیژەی بۆ هەمیشە لەگەڵ یادی میلکیادێس لە بیر مایەوە.

دەزگای تاقیکاری بریتی بوو لە تەندوورێک، لیوانێکی تاقیکاریی مل درێژ (لەگەڵ هێنـدێک کاســە و رەحەتــی و پــاڵوێنە و هــێڵەگ) و دەزگــایەکی ئاوپــاککەرەوە کە بە هــۆی قەرەچییەکــان و لە بەر رووناکــایی رێنــوێنییە نوێیەکـان بە شـێوەی ئەنبیقی سـێ باسـکی "مریەمـی یەهـوودی" دروسـت کرابوو. بێجگە لەو کەرەسانە، میلکیادێس نموونەی حەوت ئاسن بەرامبەر بە حەوت ئەســتێرە، فۆرمــولی مووســا و زوسیمووســی[١٢] بــۆ زێــڕ دروستکردن و هێندێک نووسراوە و گەڵاڵە سەبارەت بە "زانستی گەورە"ی بـۆ بە جێهێشـت هەتـا بتـوانێ هەوێنـی کیمیـاگەری دروسـت بکـا، خـۆزێ ئەرکادۆ بوینـدیا کە بەگەرمـی عاشـقی سـاکاری و فۆرمولەکـانی زێڕسـازی ببوو، چەند حەفتە لە سەریەک لە ئۆرسوڵا پارایەوە کە رێگەی بدا زێڕەکان لە ژێر زەوی دەرهێنێتەوە و ئەوەندەی لێکجیابوونەوەی جیوە ئیمکان دەدا زێڕەکــان زۆر بکا.ئۆرســـوڵا هەروەک جــاران لە بەرامــبەر پێــداگرتنی مێردەکەی تەسلیم بوو و بەوجۆرە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا سی سکەی زێـڕی لە تاوەیەکـدا لەگەڵ وردەمــس و زەرنیخــی زەرد و گــۆگرد و مــژ

---

[١٢]–Zosi us زانای یونای کە لە دەورەی سەدەی سێهەمی پێش زایینی دەژیا– و

تواندەوە، دوایی هەمووی ئەوانەی بە تینێکی زۆر لە مەنجەڵێک رۆن گەرچەکدا کوڵاند هەتا بوو بە شلەیەکی خەست و هەڵگەڕا، کە زۆرتر وەک ئاوی نەباتی سووتاو دەچوو هەتا زێڕ. لە رەوتی ناهۆمێدانەی پاڵاوتندا، میراتی بە قیمەتی ئۆرسۆلا لە ئەنجامی تواندنەوە لەگەڵ حەوت ئاسنی ئەستێرەیی و تێکەڵاو لەگەڵ جیوە و ویتریولی قیبریسی و، بە دوایدا کوڵاندن لە پیوی بەراز لە جیاتی رۆنی توور، بوو بە مشتێک تڵتە و بە بنی مەنجەڵەوە نووسا.

کاتێک قەرەچییەکان گەڕانەوە، ئۆرسۆلا هەموو خەڵکی لێ هان دابوون، بەڵام بزۆزی لە ترس بەهێزترە، ئەو جارە قەرەچییەکان کاتێک لە گوند تێپەڕ دەبوون، بە هەموو کەرەسەیەکی موسیقا هەرا و هوریایەکی یەکجار زۆریان وەرێ خستبوو و جارچییەکیش نواندنی سەیرترین دۆزینەوەی زانایانی ئاسیای بچووکیان رادەگەیاند. خەڵکەکە رۆیشتنە چادری قەرەچییەکان و بە پوولێک (پارەیەک) میلکیادێسیان بینی کە جوان وجحێل بۆتەوە، چرچ و گنجی دەموچاوی نەمابوون و ددانەکانی سپی و تازە بوون و دەبریسکانەوە، ئەو کەسانەی کە پووکی شین هەڵگەڕاو و روومەتی تێکقوپاو و لێو و لیچی هەڵقرچاوی ئەویان دەهاتەوە یاد، لە بەرامبەر هێزی بێ ئەولاو و ئەولای ئەوپەری سروشتی کابرای قەرەچ لە ترسان دەلەرزین. ئەو کاتە کە میلکیادێس ددانەکانی دەرهێنان و بە هەموویانی نیشان دا، ترسەکە دوو بەرامبەر بوو، لە یەک دەمدا بۆوە بە کابرای کڵۆڵی ساڵەکانی پێشوو و بە دوایدا کە دیسان ددانەکانی لە دەم خستنەوە، بە دڵنیاییەوە لە لاویەتیی دووبارەی زەردەخەنەی هاتێ، تەنانەت خۆزێ ئارکادۆ بویندیاش سەلماندی کە زانین و زانستی میلکیادێس بێسنوورە و تەنیا کاتێک هەناسەی ئاسوودەیی هەڵکێشا کە کابرای قەرەچ بە دزییەوە شێوەی کاری ددانە دروستکراوەکانی بۆ باس کرد.

ئەو شتە ئەوەندە بۆی سادە و ئاسان بوو و لە هەمان کاتدا سەرسووڕهێنەر، کە هێشتا شەو دانەهاتبوو هەموو زانستی کیمیاگەریی لە لا پووچ و بێ بایەخ هاتە بەرچاو. دیسان تووشی قەیرانی بەدرەفتاری بوو و تەرتیبی خواردنی تێکچوو، لە تەواوی رۆژێدا لە نێوماڵێدا دەهات و

دەچوو و لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد. بە ئۆرسوڵای دەگوت: "لە جیهاندا رووداوی ئەوتۆ روودەدەن مرۆڤ بڕوا ناکا، لە دوو قەدەمیی ئێمە لەوبەر رووبار، هەموو جۆرە دەزگایەکی جادوویی پەیدا دەبێ و ئێمەش لێرە وەک رەوە کەر دەژیـن. "ئەو کەسـانەی کە ئەویـان لە سـەرەتای دروسـتبوونی گوندی ماکۆندۆوە دەناسی، لەو ئاڵوگۆڕەی، کە لە ناسیاریتی میلکیادێسەوە بە سەریدا هاتبوو، سەریان سووڕمابوو.

سـەرەتا، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وەک سـەرۆک عەشیرەتێک دەچوو کە بە خۆشـیی تەواوەوە سـەبارەت بە تۆوچانـدن و ئاژەڵـداری و پەروەردەی منداڵان فەرمانی پێویسـتی دەدا و بـۆ چـاکترکردنی وەزعـی گشـتیی گونـد تەنـانەت بە کـردەوە بەشـداریی لە کاروبـاری هەمـووان دەکـا. لە بەر ئەوە خانووەکەی باشترین خانووی گوند بوو، خانووەکانی دیکەی گوندیان هەر بە شـێوەی ئەو دروسـت کـردن، خـانووەکەی بریتـی بـوو لە هـۆدەیەکی دانیشتنی گەورە و رووناک، هۆدەیەکی نان خواردن بە بەرهەیوانێکی پڕ لە گـوڵی رەنگاوڕەنـگ، دوو ژووری نووسـتن، حەوشـەیەکی بێـدەنگ کە دار بەرروویەکی گەورەی تێدابوو، باخچەیەکی پڕ لە سەوزی و، حەوشـەیەکی چکـۆڵە کە بزنەکـان و بەرازەکـان و مریشـکەکان بە ئاشـتی و خۆشـی بەیەکەوە دەژیـان. تەنیـا زینـدەوەرێک کە نەدەبـووایە بێـتە ئەو مـاڵە و گوندەکە، کەڵەشێری شەڕانی بوو.

ئۆرسوڵاش وەک مێردەکەی تێدەکۆشا. ژنێکی تێکۆشەر و ورد و هەتا بڵێی لە سـەرەخۆ بـوو. کەس گـوێی لە پـرتە و بـۆڵەی ئەو ژنە نەبیـوو. لە بەرەبەیـانییەوە هەتـا شـەو دەتگـوت لە هەمـوو شـوێنێک ئامـادەیە، دەنگـی خشەخشی ژێرکراسەکەی دەبیسرا. بە هیمەتی دارین کە بە دەسـتی خۆیـان دروستیان کردبوون، هەمیشە پاک و خاوێن بوون و لە سندووقە کۆنەکانی جلوبەرگەوە بۆنی نەرمی ریحانە بڵاو دەبووە.

خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا، کە لە هەموو کارەکاندا هەمیشـە پێش قەدەم بـوو، شێوەی دروسـتکردنی خانووەکانی بە جۆرێک دارشـتبوو کە هەر کەس بە هاسـانی ئـاوی لە چەم دەهێنـا و شـەقامەکانی بە جۆرێـک کێشـابوو کە هەر ماڵێک بە رادەی ماڵەکەی دیکە هەتاوی تێکا، لە مـاوەی چەنـد سـاڵدا گونـدی

ماکۆندۆ بوو بە ئاوەدانییەکی وەها کۆشا و بە تەرتیب کە سیٚ سەد کەس دانیشتووبی ئەو گوندە هیچ کات نەیاندیبوو. بە تەواوی دەتتوانی بڵێی گوندێکی بەختەوەرە. جێیەک کە کەس تەمەنی لە سی ساڵ زۆرتر نەبوو و هەتا ئێرەش کەسی لیٚ نەمردبوو.

خۆزیٚ ئەرکادۆ بوێندیا لەو کاتەوە دەست بە دروستکردنی گوندکرا، تەپکە و داوی دروست کرد و لە ماوەیەکی کورتدا، نە تەنیا ماڵی خۆیان، بەڵکو هەموو ماڵەکانی دیکەی گوندیشی پڕ کرد لە قەناری و کەواسەوز و سریلە. چرە و خوێندنی ئەو هەموو باڵندە جۆراوجۆرانە گوێی کەڕ دەکرد و، ئۆرسوڵا بۆ ئەوەی شێت نەبیٚ مێوی لە گوێی خۆی ئاخنی. هەوەڵین جار کە تیرەی میلکیادێس بۆ فرۆشتنی حەبی شووشەیی سەرئێشە هاتنە ئەو گوندە، خەڵکی زۆریان پیٚ سەیر بوو، کە ئەوانە چۆنیان ئەویٚ لەوبەری ئەو هەموو زەلانە دۆزیوەتەوە، قەرەچییەکان دانیان بەوەدا هێنا کە دەنگی مەلەکانی گوند بۆ نێو ئاوەدانیی کێشاون.

کەچی ئەو گیانەکۆمەڵایەتییە خۆشمەعشەرە،هەر خێرا دوای ماخۆلانی تاووتوێی ئاسنرفێن و حیسابەکانی هەئیەت و خەیاڵی کیمیاگەری و نیگەرانیی ناسینی سەیر و سەمەرەی جیهان، لەنێو چوو. خۆزیٚ ئارکادۆ بوێندیای پاک و خاوێن و وریا، بوو بە پیاوێکی تێکشکاو کە بە جلک و لیباسی خۆی رانەدەگەیشت و، ئۆرسوڵا بە چەقۆی ئاشپەزخانە دەیتوانی ریشی هاتوو و تێکهاڵاوی هەڵپاچیٚ. هێندێک تەنانەت لایان وابوو تەلەسم و جادووکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا وەختایەک دەستی لە شتە سەیرەکان هەڵگرت و، ئامادە بوو لە پێش هەموویانەوە لە ماکۆندۆوە ڕێگایەک بەرەو شتە تازەداهاتووە سەیرەکان بکاتەوە، هەموو کەس تەنانەت ئەوانەی شکیان لە شێتی و ماخولیایی ئەودا نەبوو، بۆ جێبەجێکردنی ئەو نەخشەیە دەستیان لە کار و ژیانی خۆیان کێشایەوە.

خۆزیٚ ئەرکادۆ بوێندیا بچووکترین ئاگادارییەکی لە سەر چۆنیەتیی هەڵکەوتی جوغرافیایی ئەو ئاوچەیە نەبوو. هەر ئەوەندە دەیزانی لە لای رۆژهەڵات زەنجیرە چیای زۆر بڵند و سەرکەش هەن و لە پشت ئەوانەوە

شاری کۆن و قەدیمی ڕیۆهاشا[13] هەڵکەوتووە. لە ڕۆژگاری کۆن (باپیری، ئۆرلیانۆبویندیای یەکەم، بۆی باس کردبوو) فرانسیس دریک[14] بە تۆپی دەچووە راوی تیمساح و ئەوانی بە کا هەڵداخنی و دەیبردە لای مەلەکە (شا) ئەلیزابێت و پێشکەشی دەکرد. کاتێک خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لاو بوو، لەگەڵ پیاوەکانی و ژن و منداڵ و ئاژەڵ و هەموو جۆرە کەرەسە و خرت و پرتی ماڵەوە، بۆ گەیشتن بە دەریا، لە زنجیرە چیا تێپەڕیبوو، بەڵام لە پاش بیست و شەش مانگ لە بریاری خۆی پەشیمان ببۆوە و بۆ ئەوەی ناچار نەبێ لەو ڕێگایەوە بگەڕێتەوە، گوندی ماکۆندۆیان دروست کردبوو. ئەو ڕێگەیە، بۆ ئەو بێ سوود بوو و تەنیا دەیگێڕایەوە بۆ رابردوو. لە لای باشوور زەلاوی بچووک هەبوون کە بە جۆرە گیایەک داپۆشرابوون و بە دوایدا گۆلاوێکی یەکجار پان و بەرین هەبوو کە بە وتەی قەرەچییەکان سەروبنی نەبوو. ئەو گۆلاوە گەورە لە لای ڕۆژاوا لەگەڵ زۆر ئاوی بەرینی دیکە تێکەڵ دەبووە کە ماسیی گەورە و جوان و ناسکی سەرژنانەی تێدا بوون، کە لۆتکەوانەکانیان بە مەمکی خڕ و جوان فریو دەدا. قەرەچییەکان شەش مانگ بە سەر ئەو ئاوانەدا لۆتکەیان رادا هەتا بگەنە ڕێگای خاکی کە یەستری پۆستی پێدا دەڕۆیشتن. بە لێکدانەوەی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا تەنیا ئیمکانی پێوەندیگرتن لەگەڵ جیهانی پێشکەوتوو ڕێگای باکوور بوو. بۆ ئەو مەبەستە کەرەسەی راو و ئەسپابی پێویست بۆ برین و وەلانانی لک و پۆپی گەڵا ئامادە کرا و، لەگەڵ ئەو پیاوانەی کە لە دروستکردن و بنیاتنانی ماکۆندۆ هاوکارییان کردبوو وەڕێکەوت. نەخشە و دەزگاکانی قیبلەنومای لە کۆڵەپشتییەک هاویشت و پێی نایە ئەو شوێنە پڕ مەترسییە.
ڕۆژانی هەوەڵ لەگەڵ گیروگرفتێکی ئەوتۆ ڕووبەڕوو نەبوون، لە داوێنی بەردەڵانی بەستێنی چۆمی هەتا ئەو جێگایەی ساڵانی پێشوو زرێی کابرای شەڕکەریان دۆزیبۆوە، ڕۆیشتنە خوار و لەوێوە بە ڕێگای باخچەی نارنجاندا چوونە نێو دارستان و لێرەوار. لە کۆتایی حەوتووی یەکەمدا

---

[13] -Riohacha

[14] -Francis Drake (١٥٤٠-١٥٩٦) دەریاگەری ئینگلیسی و یەکەم ئینگلیزی کە لە ڕێگای دەریا دنیا دەور لێدا- و

شووریێکیان کوشت و کردیانە کەباب، بەڵام تەنیا نیوەیان خوارد و ئەوی دیکەیان خوێ کرد و بۆ رۆژانی داهاتوویان هەڵگرت. بەوکارە دەیانەویست لە خواردنی گوشتی تووتی، کە شین و بۆنی قەوزەی لێ دەهات، خۆ بپارێزن و نەیخۆن. جاریێکیان بۆ ماوەی دە رۆژان خۆریان چاو پێنەکەوت. زەوی وەک خۆڵەمێشی بورکان، نەرم و تەڕ بوو و گیا و گوڵ وردە وردە بەسامتر دەبوون، دەنگی باڵندان و نەڕەی مەیموونان دوورتر بۆوە، جیهان بۆ هەمیشە خەماوی بوو. پیاوان بە وەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەکانیان لەو بەهەشتە تەڕەدا داهێزابوون. بەهەشتێکی بێدەنگ و تەڕ کە پێش بەهەشتی ئادەم و حەوا دروست کرابوو، جێگایەک کە چەکمەکانیان لە قووڵکەی چەوری هەڵماویدا رۆ دەچوون و ساتۆرەکانیان شین شینک و مارمێلکەیان قەڵت و بڕ دەکرد. حەفتەیەکی تەواو بێ ئەوەی قسە لەگەڵ یەک بکەن، وەکو ئەوانەی بە دەم خەوەوە دەڕۆن، لە دنیای پڕ لە دەرد و خەمدا بەرەو پێش چوون. دنیایەک کە تەنیا رووناکایی فڕینی مێش و مەگەسی نوورانی بوو. لە بۆنی ناخۆشی خوێن تەنگەنەفەس ببوون. رێگەیەک بۆ گەڕانەوە نەبوو، ئەو رێگەیە کە دەیان دڕی و دەیان کردەوە، لە ماوەیەکی کورتدا بەو گیاوگوڵانە کە لە پێش چاویان دەڕوا و هەڵدەستا، پڕ دەبۆوە، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا دەیگوت گرنگ نییە، تەنیا نابێ رێگە گوم بکەین. بە یارمەتیی قیبلەنوما پیاوەکانی بەرەو باکووری نادیار رێنوێنی کرد و لەو سەرزەوەییە تەلەسمکراوە هاتنەدەر. شەوێکی تاریک و بێ ئەستێرە بوو، بەڵام هەوا ساف و پاک ببۆوە، ماندوو لەو رێگا دوور و درێژە جولانە جاوەکانیان لە داران بەست و لە پاش دوو حەوتوو بۆ یەکەمین جار خرپ خەویان لێکەوت. کاتێک لە خەو هەستان، رۆژ هاتبووە سەرێ، هەموویان حەپەسان. لە بەرامبەریانەوە لە نێو دار و درەختی سەرەخس و خورمایان لە تیشکی بێ جووڵەی بەربەیانی کەشتییەکی چارۆکەداری ئیسپانیایی سپیی تۆز لێ نیشتوو دەبینرا. پاپۆر کەمێک لە بەریەک ترازابوو و لە لاشەی دەست لێنەدراوە، لە نێوان رستە قوڕاوییەکانی بەنە چلکنەکانی بادباب "باگر" هەڵواسرابوون. لاشەی پاپۆرەکە بە زیندەوەری دەریایی مردووی رەق هەڵگەڕاوی ورد و قەوزەی نەرم داپۆشرابوون و ببوونە

بەرد. وا دەهاتە بەرچاو هەموو کەشتییەکە لە شوێنی شیاوی خۆی جێگیر بووە، شوێن و جێگایەکی فەراموشکراو و تەنیا، دوور لە فەسادی زەمان و عادەتی پەرندان، کاتێک پیاوەکانی پێیان نایە ناو پاپۆڕەکە، بینیان دارستانێکی گەورەی پڕ لە قوڕە.

دۆزینەوەی پاپۆری چارۆکەدار کە دەیگەیاند دەریا نزیکە، خۆزێ ئارکادۆ بویندیای لە پێ خست. باوەڕی وابوو چارەنووس گاڵتەی پێ دەکا. کاتێک بە هەزاران دەردی سەر و لەخۆبووردوویی بە دوای دەریادا گەڕابوو نەیدۆزیبۆوە، ئێستا کە بە دوای دەریادا نەدەگەڕا، چارەنووس دەریای وەکو کۆسپێکی گەورە لە سەر ڕێگا دانابوو. ساڵانی دوایی کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بەوێدا رابرد، ئەو ڕێگایە ببوو بە جادەیەکی ئاسایی پۆست و لە ناو دەشتێکی پڕ لە گوڵاڵەسووورە تەنیا لاشەی سووتاو و هەڵکرووزاوی پاپۆرەکە دەبینرا. سەرەنجام کاتێک تێگەیی ئەو داستانە لە خەیاڵی باوکییەوە سەرچاوەی نەگرتووە، لە خۆی پرسی ئەو پاپۆرە چۆن توانیویەتی هەتا ئەو رادەیە بە وشکانیدا بێتە پێش. بەڵام خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا پاش چوار ڕۆژ کە دەریای لە مەودای دوازدە کیلۆمەتریی پاپۆرەکە دۆزیبۆوە، ئیتر ئەو پرسیارەی لە خۆی نەکردەوە.

هەموو ئاواتەکانی لە بەرامبەر ئەو دەریا خۆڵەمێشی ڕەنگە و کەفاوییەدا، کە بە هیچ جۆر شیاوی ئەو هەموو لەخۆبووردووییە و سەفەرە سەرشێتانەی نەبوو، بوونە بڵقی سەر ئاو.

هاواری کرد "چ بەدبەختییە! چوار دەوری ماکۆندۆ ئاو گرتوویە."

بە پێی ئەو نەخشەیەی کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا دوای گەڕانەوە لەو سەفەرە گەلاڵەی کردبوو، لایان وابوو ماکۆندۆ شێوە دوورگەیە، نەخشەی بە تووڕەییەوە گەلاڵە کردبوو و لە وەبەرچاوگرتنی گیروگرفتەکان و پێوەندی گرتن لەگەڵ دنیای دەرەوە چاو و ڕاوی کردبوو، هەر وەک بەوشێوەیە بیهەوێ بە بۆنەی هەڵبژاردنی ئەو شوێنە بۆ ژیان خۆی سزا بدا، بە پرتە و بۆڵەوە بە ئۆرسوڵای دەگوت: "هیچ کاتێک ناگەینە هیچ شوێنێ، هەتا کۆتایی تەمەنمان بێ ئەوەی دەستمان بە قازانجی زانین و زانست رابگا هەر لێرە دەرزین." دڵنیاییەک، کە لە ماوەی مانگەکاندا لە

ژووری تاقیکردنەوە لە نێو چووبوو، ئەوی هێنایە سەر ئەو بڕوایەی کە گوندی ماکۆندۆ بۆ شوێنێکی لەبارتر بگوێزێتەوە. بەڵام ئەو جارەیان ئۆرسۆلا نەخشەی مێردەکەی تێکدایەوە.
بە دزی و لە سەرەخۆ و بە شێوەی کاری مێرووله ژنانی گوندی دژی مێردەکانیانان هان دا کە خۆیان ئامادە دەکرد گوندەکە بگوێزنەوە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا نەیزانی لە کوێوە و بە کام هێزی ناتەبا نەخشەکەی لەگەڵ دژایەتی و سەرپێچی بەرەوروو بووە، هەر ئەوەندە لەپڕ زانی شکستی هێناوە. ئۆرسۆلا بە سرنجێکی خاوێنەوە سەیری دەکرد و رۆژێک ، کە ئەو بە ناهومێدی لە تێکچوونی سەفەر ردانی دەسیرەوە دەبرد و کەرەسەی تاقیکارییەکانی لە سندووقەکانیاندا دەنایەوە. تەنانەت زگیشی پێی سووتا. راوەستا هەتا کارەکەی تەواو کا، راوەستا هەتا دەرگای سندووقەکانی بزمارڕێژ بکا و لە سەریان بە مەرەکەب پیتی هەوەڵی ناوی خۆی بنووسێ. لۆمەی نەکرد، بەڵام دەیزانی کە تێگەیشتووە پیاوانی گوند ئامادە نین یارمەتیی نەخشەکەی بدەن (کاتێک لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد ئەوەی بیستبوو) تەنیا ئەو کاتەی دەیویست دەرگای ژووری تاقیکارییەکە لە رێمسە دەربێنێ، ئۆرسۆلا بە پارێز هۆی ئەو کارەی پرسی و ئەویش بە گرژی وەڵامی دایەوە: "ئێستا کە کەس ئامادە نییە لەگەڵمان بێ، خۆمان لێرە دەڕۆین." ئۆرسۆلا نیگەران نەبوو.
گوتی: "ئێمە لێرە ناڕۆین، هەر لێرە دەمێنینەوە، چونکە لێرە منداڵمان بووە".
ئەو گوتی: "بەڵام هێشتا مردوومان لێرە نییە، کاتێک کەسێک مردووی لە شوێنێک نەبێ نابێتە خەڵکی ئەو شوێنە."
ئۆرسۆلا بە ئارامی و لێبڕاوانە گوتی: "ئەگەر پێویست بێ بۆ مانەوە کەسێک بمرێ، دەمردم." خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا، کە باوەڕی نەدەکرد ژنەکەی ئەوەندە بە ورەیە، تێکۆشا بە خەیاڵاتی رازاوە فریوی بدا. بە وادەی دنیای ئەفسوون و جادوویی کە لەو دنیایەدا هەر ئەوەندە بەسە چەند دڵۆپ لە ئاوێکی جادوویی بە سەر زەویدا بپرژێنی، دار و درەختەکانی بە مەیلی تۆ میوە دەردەکەن، دنیایەک کە هەموو جۆرە دەرمانێکی ژان و سەرئێشە بە

قیمەتێکی هەرزان دەفرۆشن، بەڵام ئۆرسـوڵا گوێی بەوقسـە پڕوپووچانە نەدا.
گوتی: "لە جیاتی ئەوەی بیر لە دۆزینەوەی شتی نوێ و سـەیر بکەیەوە، باشترە کەمێکیش بە مناڵەکان رابگەی، سەیریان کە، وەها بەرەڵڵان، دەڵێی ئەسپن."
خـۆزێ ئەرکـادۆ بویندیا، بە بیسـتنی ئەو قسـانە لە پەنجەرەوە تەماشـای دەرەوەی کـرد لە نێـو بـاخچەی هەتـاوگردا دوو منـداڵە پـاپەتییەکەی بینـی. هەستی بەوە کرد بە هێزیی رستەکانی ئۆرسوڵا تـازە و لەو دەمەدا گیانیان وەبەر هاتوە و ژیانیان پێ بەخشراوە.
لە دەروونیدا شتێک جووڵایەوە، هەسـتێکی نەناسـراوە و نادیـار کە بنج و بناوانی ئەوی لە زمانی خۆی دەرکێشا و بە مەڵبەندی دەست لێ نەدراوی بیری ئەسپارد. ئۆرسـوڵا خەریکی گەسک لێدانی مـاڵەکەی بوو، کە ئێستا دەیزانی هەتا ماوە، هەر لەوێ دەبێ. زەق زەق ئەوەندەی چـاو لە مناڵەکان بڕی هەتا چاوی پڕ بوون لە ئاو. فرمێسکەکانی بە پشتەدەست سڕینەوە و لە رووی ناچاری و تەسلیم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.
وتی: "زۆر چاکە، بڵێ بێن یارمەتیم بدەن کەرەسەکان لە سندووقەکان بێنمە دەر."
خۆزێ ئارکادۆ، منـاڵە گەورە و چاردە سـاڵە بـوو، ڕوخسـاری چوارگۆشـەو پرچـی پڕ و رەوشـتی بـاوکی هەبـوو، هەر چەنـد بە رادەی تەمەنـی هەڵـی دابـوو و بەهێـز بـوو، بەڵام هەر لەو کاتەشـدا دیـار بـوو خەیـاڵپەروەر نییە. ئۆسـۆلا لە کاتەدا کە لە زنجیرە چیاکان تێدەپەڕین، بەومناڵە زگی پڕ بـوو و پێش دروستکردنی ماکۆندۆ زابوو. دایک و بـاوکی دوای ئەوەی دڵنیـا بـوون کە منـاڵەکە نەقوسـتان نییە، شـوکری خوایـان کردبـوو. ئۆرلیـانۆ یەکەمـین مرۆڤێـک بـوو کە لە ماکۆنـدۆ هـاتبووە دونیـاوە لە مـانگی مارسـدا دەبـوو بە شـەش سـاڵ. بێدەنگ و بەکـار بـوو، لە زگـی دایکیـدا ئەوەنـدە گریـابوو، بە چاوکراوەیی هـاتبووە دنیا. کاتێک ناوکیـان دەبڕی، سـەری بەمـلا و ئەولادا دەگێڕا و شـتومەکی نێو هـۆدەکە و دەموچـاوی خەڵکەکەی بە وردی و بێ ترس سـەیر دەکرد. بە دواییدا بێ ئەوەی گوێ بداتە خەڵکەکەی، سـەیریان

دەکرد و لێی نزیک دەبوونەوە، چاوی بڕییە ئەو دارە خورمایەی کە خەریک بوو لە بەر تەوژمی باران لە بنەوە هەڵدەکەندرا. ئۆرسوڵا ئیتر بیری لە هێزی چاولێکردنی ئەو نەکردەوە. هەتا ڕۆژێک ئۆرلیانۆی بچکۆڵە بوو بە سێ ساڵانە، ڕاست لەو کاتەدا کە مەنجەڵی چێشتی لە سەر ئاگر هەڵگرتبوو و دەیویست لە سەر مێزی ئاشپەزخانەی دابنێ وەژوور کەوت، منداڵەکە کە لە بەرامبەر دەرگای ئاشپەزخانە بە شکەوە وەستابوو، وتی: "هەر ئێستا مەنجەڵەکە دەکەوێ." مەنجەڵەکە لە نێوەڕاستی مێزەکە بوو، بەڵام هەر کە منداڵەکە ئەوەی وت، مەنجەڵ دەستی بە لەرزین کرد، هەروەک هێزێک لە ناوەوە بۆ لای لێواری مێزەکە پاڵی پێوە بنێ، مەنجەڵەکە کەوتە خوارەوە. ئۆرسوڵا بە ترسەوە ئەو جەرەیانەی بۆ مێردەکەی گێڕایەوە، بەڵام ئەو ئەو مەسەلەیەی بێ حیسابی هەڵکەوتی سروشتی دانا. ئەو هەمیشە لە منداڵەکانی بێ خەبەر بوو، لە لایەک دەورانی منداڵی بە سەردەمی جۆرێک گەوجیی فیکری دادەنا و لە لایەکی دیکەشەوە بێوچان بە بیروبۆچوونەکانی خۆیەوە خەریک بوو.

بەڵام لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەوە کە بانگی کردن کەلوپەلەکانی لە سندووقەکان لەگەڵ دابێننەوە، باشترین سەعاتی ژیانی خۆی بۆ ئەوان بە کارهێنا. لەو هۆدە بچووکەدا کە دیوارەکانی وردە وردە بە نەخشەی سەیر و سەمەرەی جوگرافی و گەڵاڵەی لەو چەشنە دادەپۆشرا، منداڵەکانی فێری خوێندنەوە و نووسین و حیساب کرد، باسی شتی سەیری جیهانی بۆ دەکردن – نە تەنیا هەر ئەوەندە کە خەیاڵی ڕێگەی دەدا، بەڵکو زۆر لەوە زۆرتر کە بیری بڕی دەکرد- هەر ئەوە بوو کە منداڵەکان زانیان لە باشووریترین بەشی ئەفریقا، کەسانی ئاشتیخواز و تێگەیشتوو هەن کە تەنیا کاریان دانیشتن و بیرکردنەوەیە یان ئەوە لە دەریای ئێژە دەکرێ لە دورگەیەکەوە بچی بۆ دورگەیەکی دیکە هەتا دەگەیە بەندەری سالۆنیک.

ئەو دەردە بەرزانە وا لە مێشکی منداڵەکان چەسپاوبوو کە ساڵانی داهاتوو، یەک چرکە پێش ئەوەی فەرماندەی دەستەی تیرەباران دەستووری تەقە بدا، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوئێندیا دیسانەوە هەموو ئەو پاش نیوەڕۆیەی مانگی مارسی بیر کەوتەوە کە باوکی دەرسی فیزیکی بە نیوەچڵی بە

جێهێشــتبوو و دەســتی بــۆ هەوا بڵینــد کردبــوو و چــاوی بە مــۆلەق وەســتاوبوون. لە دوورەوە گوێی لە تەپڵ و زورنـای قەرەچییـان ببـوو کە دیسـانەوە دەهـاتن بـۆ گونـد بۆ ئەوەی (ئـاخرین داهێنـراوی جوانی زانایـانی مەمفیس) نیشان بدەن.

ئەوانە قەرەچـی نـوێ بـوون. ژن و پیـاوی لاو کە تەنیـا بە زمـانی خۆیـان دەدوان، ئەوانە نموونەی ئەسل و قەشەنگ بوون کە پێستی سـاف و لـووس و دەسـتی لەباریـان هەبـوو. گـۆرانی و هەڵپەڕینیـان لە شـەقامەکان ئاواییـان نـوقمی شـادی و خۆشـی کـرد. تـووتی ڕەنگاوڕەنـگ کە گـۆرانیی ئـۆپێرای ئیتالیاییـان دەگـوت، مەلێـک کە بە دەنگـی دەهـۆڵ هـێلکەی زێـڕی دەکـرد، مەیمـوونێکی پەروەردەکـراو کە بیـری مرۆڤـی دەخوێنـدەوە، ماشـینێ کە دوگـمەی دەدروو، تـای دەهێنـایە خـوارەوە و خەم و خەیاڵیشـی لە یـاد دەسـڕییەوە، بـۆ کـات رابـواردن و هەزاران داهێنـراوی سـەیری دیـکە، کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا دڵی دەیەویست مێشکێکی ئەوتۆ پەیدا بکا هەمـوو ئەو شـتانە بەو بسـپێرێ و لە بیـری نەچـنەوە. لە یەک ئانـدا قەرەچییەکـان گونـدیان بە تەواوی شـێواند. خەڵکـی ماکۆنـدۆ لەپـڕ لە نێـوان ئـاپۆرای شەقامەکاندا خۆیان ون کرد.

خـۆزێ ئەرکـادۆ بویـندیا لە کاتێکدا دەسـتی منداڵەکانی تونـد گرتبـوو، لە نێو خەڵکدا ونیان نەکا، بە نێو ئاکرۆبات بازە ددان زێڕەکان و چاوبەستە شـەش دەستەکاندا بەرەو پێش دەڕۆیی. بۆنی چڵک و هەرڕنـاهووتی خەڵـک نەفەسـی لێ بڕیبوو وەک شـێتان بەمـلاو ئەولایدا دەڕۆیشـت و چاوی بۆ میلکیـادێس دەگێـڕا، بەڵکـو بیـدۆزێتەوە و ئەو نهێنییـانەی بـۆ شـێ بکـاتەوە. لە چەنـد قەرەچی پرسـی، بەڵام هیچ کامیان نەیانزانی دەڵێ چی. سـەرەنجام گەیشتە جێگایەک کە میلکیادێس هەمیشە لەو شوێنە چادرەی هەڵدەدا. قەرەچییەکـی ئەرمەنـی بە زمـانی ئیسـپانولی تـاریفی شـەربەتێکی دەکـرد کە ئەگەر مـرۆڤ بیخـواتەوە، لە بەر چـاوان بـزر دەبێ. کە خـۆزێ ئەرکـادۆ بویـندیا بەزۆری ئانیشکان خەڵکەسەرسامەکەی وەلا نـا و خـۆی گەیاندێ، لیـوانێکی لەو ئـاوە عەنبەر ڕەنگە خواردبۆوە، خۆزێ توانی پرسیارەکەی لێ بکا. کابرای قەرەچ ئەوی لە نێو پرشنگی نیگـای سـامناکی خۆیدا پێچـایەوە و بە دوایـدا بـوو بە

تۆپەڵێک قیلی هەڵماوی و بۆگەن کە ڕەنگدانەوەی وەڵامەکەی ئێستاش لەودا دەبیسرێ: "میلکیادێس مرد."

خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لەو هەواڵە داما و لە جێگای خۆی وشک بوو، هەوڵی دا بە سەر خەم و پەژارەی خۆیدا زاڵ بێ. لەو کاتەدا خەڵکەکە بەرەو سەمەرەیەکی دیکەی یارییە سیحرییەکان داکشان و تۆپەڵە قیلی کابرای ئەرمەنی بە تەواوی لە نێو چوو. دواتر قەرەچییەکانی دیکە بۆیان روون کردەوە کە میلکیادێس لە کەنارەکانی سەنگاپوور بە نەخۆشیی گرانەتا کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەیان هاویشتۆتە نێو قووڵایی دەریای جاوە. منداڵەکان گوێیان بەوهەواڵانەوە بوو، گڕنەیان گرتبوو باوکیان بیانبا بۆ تەماشای سەیر و سەمەرەکانی زانایانی مەمفیس کە لە چادرێکی دیکەوە جاڕیان بۆ دەکێشا و بە قسەی قەرەچەییەکان پێوەندیی بە حەزرەتی سلێمانەوە هەبووە. ئەوەندەیان پێداگرت هەتا خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا سی ڕیاڵی داو بردنیە نێوەڕاستی چادرەکە. پیاوێکی غووڵئاسای سەرتاشراو کە یوپاڵتۆیەکی خوری لە بەردا بوو، لەوێ ڕاوەستابوو، ئاڵقەیەکی لە لووتی و زنجیرێکی ئاسنی لە پێدا بوو. لە بەرامبەری سندوقێک دەبیندرا. کاتێک دەرگای سندووقەکە کرایەوە، هەوایەکی ساردی لێ هاتەدەر. لە نێو سندووقەکەدا شتێکی بلووریني گەورە دەبینرا کە هەزاران هەزار دەرزیی لە نێودا بوو و تیشکی ئێوارەکە لێیدا بوون و وەک ئەستێرە ڕەنگاوڕەنگ دەدرەوشانەوە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا کە دەیزانی منداڵەکانی چاوەڕوانی وەڵامی فەورین دەسپاچە بوو و لە بەر خۆیەوە وتی: "ئەوە گەورەترین ئەڵماسی جیهانە."

کابرای قەرەچ قسەکەی ڕاست کردەوە و وتی: "نا ئەوە قاڵبە سەهۆڵە".

خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا کە هیچی لێ تێنەگەیشتبوو، دەستی بۆ لای ئەو شتە سیحراوییە درێژ کرد، بەڵام کابرا غووڵە دەستی لادا و وتی: "بۆ دەست لێدان پێنج ڕیاڵە." پارەکەی دایە و دەستی لە سەر سەهۆڵەکە دانا و چەند دەقیقەیەک ڕایگرت. دڵی لە خۆشیان و لە ترسان لێی دەدا، نەیدەزانی بڵێ چی. دە ڕیاڵی دیکەشی دا هەتا منداڵەکانیشی لەو بەهرەیە بێبەش نەبن. خۆزێ ئارکادیۆی بچکۆڵە ئامادە نەبوو دەستی لێ بدا. ئۆرلیانۆ بە پێچەوانە

هەنگاوێک رۆیشتە پێشەوە و دەستی لە سەر دانان و دەست بە جێ کشایەوە و بە ترسەوە وتی؛ "دەکوڵێ". بەڵام باوکی گوێی نەدایە، سەرمەست لە ئاشکرابوونی ئەو موجیزەیە، ئەرکی خۆی و تەرمی میلکیادێسی کە دەبوو بە خۆراکی ماسییان، فەرامۆش کرد. پێنج رِیاڵی دیکەشی دا و لەو دەمەدا کە دەستی لە سەر سەهۆڵەکە بوو، هەروەک ئەوە کتێبی ئاسمانی بە شاهید بگرێ، وتی: "ئەوە گەورەترین داهێنراوی سەردەمی ئێمەیە"

کاتێک فرانسیس دریک چەتەی دەریایی لە سەدەی شانزەهەم هێرشی کردە رِیۆهاشا، نەنکی ئۆرسولا ئیگواران ئەوەندە لە دەنگی زەنگی مەترسی و تەقەی تۆپان ترسا، بێ ئەوە ئاگای لە خۆ بێ لە سەر ئاگردان دانیشت. بە جۆرێک سووتا کە هەتا کۆتایی تەمەنی لە ژنایەتی کەوت. لە کاتی دانیشتندا ناچار بوو چەند باڵنج لە بن خۆی دابنێ و بێگومان لە رێ رۆیشتنیدا گۆرانێکی تەواو سەیر پێک هاتبوو، چونکە لەوە بەدوا نەهاتەوە نێو خەڵک. چونکە لای وابوو لەشی بۆچزووی سووتاوی لێ دێ. لە هەر جۆرە تێکۆشانێکی کۆمەلایەتی خۆی کێشایەوە. پێش بەرەبەیان لە حەوشە ئامادە دەبوو، دەترسا بنوێ و لە خەودا ببینێ ئینگلیسان بە سەگی درِەوە هاتوونە ژوورەکەی و ئاسنی باریکی سووربووەوەی تێ رۆ دەکەن. مێردەکەی تاجرێکی خەڵکی ئاراگۆن[1] بوو کە دوو منداڵی لێی هەبوو. بایی نیوەی شتومەکی دووکانەکەی دابوو بە دەرمان و کەلوپەلی سەرگەرمی، بەڵکو بەوهۆیەوە ترسی لێ دوور کاتەوە. سەرەنجام دووکانەکەی فرۆشت و ماڵی گواستەوە بۆ گوندێکی داوێنی چیا دوور لە دەریا کە دانیشتووانی سوورپێستی ئاشتیخواز بوون. لەو گوندە هۆدەیەکی بێ پەنجەرەی بۆ ژنەکەی دروست کرد هەتا چەتە دەریاییە خەیاڵییەکانی کە شەو دەهاتنە خەونی ژنەکەی، رێگەی هاتنە ژوورەوەیان نەبێ.

دەمێک بوو لەو گوندە دوورەدەستە پیاوێک بە ناوی دۆن خوزێ ئەرکادۆ بویندیا دەژیا کە توتنی دەکرد. باپیری ئۆرسولا بوو بە شەریکی و لە ماوەی چەند ساڵدا سامانێکی زۆری پێکەوە نا. چەند سەدە دواتر نەتیژەی

---

[1]– Aragun ناوچەیەکە لە باکووری ئیسپانیا- و

تووتنکار لەگەڵ نەتیژەی تاجری ئاراگۆنی زەماوەندیان کرد. بۆیە، هەر کات ئۆرسـوّلا لە کـارە گەوجانەکـانی مێـردەکەی تـوورە دەبـوو، سێسـەد سـاڵ دەگەڕاوە دواوە و لەعـنەت و نەفرینـی بـۆ ئەو رۆژە دەنـارد کە فرانسـیس دریک هێرشی کردبووە ڕیۆهاشا. ئەوە تەنیا دڵی فێنک و ئارام دەکردەوە، ئەگینـا لە راسـتیدا ئەو دووانە بە زنجیرێـک بەهێزتـر لە ئەویـن بە یەکەوە بەسترابوونەوە: داخێکی ویژدانیی دوو لایەنە، بە یەکەوە کوڕمام و کچەمام بوون. دەورانی منداڵییان لە گوندێکی کە ئەژدادیـان بە کـار و کۆششـی زۆر کردبوویانە شارێکی چاک و گەورە، بە یەکەوە تێپەڕ کردبوو.
هەر چەنـد لە رۆژی لە دایکبوونیـانەوە زەماوەنـدی ئەو دوانە چـاوەڕوان دەکرا، بەوجـۆرەش رۆژێـک کە قسـەیان لە زەماوەنـد کـرد، دایـک و بـاوکی هەردووکیـان کۆشـان پێشـی ئەو زەماوەنـدە بگـرن. دەترسـان کە بەرهەمـی سـاخی ئەو دوو بنەمـاڵەیەی کە بە درێژایـی سـەدەکان لە نێوانیانـدا زان و منداڵ بـوون هەبـووە، سـەرەنجام ئیگوانـا[٢] یـان ببـێ! پێشـتر شـتێکی ئەوتـۆ رووی دابـوو، یەکێـک لە پوورەکـانی ئۆرسـوّلا لەگەڵ یەکێـک لە مامەکـانی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا زەماوەندی کردبوو. کوڕێکیـان ببوو کە بە درێژایـی تەمەنـی ناچـار بـوو شـەڵواری گوشـاد لەبەر بکـا و دوای ئەوە چـل و دوو سـاڵ بە کـوڕی مـایەوە، سـەرەنجام بە هـۆی خوێنبەربـوونێکی تونـد کـۆچی دوایی کرد. ئەو کوڕە بە کلکێکی کرۆژەیی کورتی خڕۆڵە کە سـەری مـواوی بـوو، هـاتبووە سـەر دنیـا و گەورە ببـوو – کلکێکـی بەرازی، کە هـیچ کاتێـک ژنێـک نەیبینـی و سـەرەنجام دۆسـتێکی قەسـابی لە رووی خۆشەویسـتی بە چەقۆی قەسابی بڕییەوە و بوو بە هۆی مردنی- خـۆزێ ئارکـادۆ بوینـدیا، بە سەرەڕۆیی و هەوەسی نۆزدە ساڵەیی بەورستەیە گیروگرفتەکەی چار کرد: "گرینـگ نیـیە منـاڵە بەرازم ببـێ، تەنیـا دمەوێ قسـە بکـا" بە یەوکەوە زەماوەنـدیان کـرد. جێژنـی زەماوەنـد بە ئاگربـازی و سـاز و گـۆرانی سـێ شـەو و رۆژان درێـژەی کێشـا. ئەگەر دایکـی ئۆرسـوّلا بە جۆرەهـا پێشـبینی

---

[٢] Iguana– جۆرە مارمێلکەیەکی گەورەیە کە یەک هەتا دوو میتر دەبێ، لە سەر ملیەوە هەتا سەر کلکی تیخەڵەی وەکوو دڕوو رواوە، زۆرتر لە خەتی ئیستیوای ئەمریکا دەبێ.

بەسام سەبارەت بە منالّی و منداڵ بوون نەیترساندبان ئیمکانی هەبوو هەر لە سەرەتای زەماوەندییانەوە بەختەوەرییان دەست پێبکا.
بەڵام دایکی ئۆرسوڵا ئامۆژگاریی کردبوو تەنانەت لەگەڵ مێردەکەشی نەخەوێ، ئۆرسوڵا لە ترسی ئەوە مێردە بەهێز و هەوەسەی پەردەی کچێنی لە خوەسا هەڵنەگرێ، پێش چوونە نێو جێگاوە دەرپێیەکی ئەستوور کە دایکی لە پارچەی تایبەتی بۆی دووریبوو، لەپێیکرد. دەرپێ بە سیرمەی چەرمی تێکەلێش قایمتر دەبوو و لە پێشەوە بە قولاپێکی ئاسن دادەخرا. چەند مانگ بەوشێوە رابرد. رۆژانە مێردەکەی خەریکی کەڵەشێرەکانی بوو و ئۆرسوڵاش لە لای دایکی گوڵدۆزیی دەکرد، شەوانە چەند ساعات یەکتریان دێنا و دەبرد و مل بە ملەیان دەکرد، بە جۆرێک کە جێگەی ئەویندارییی دەگرتەوە. کار گەیشتە جێگایە هەموو زانیان کارەکە وا سادە نییە و دەنگۆ بڵاو بۆوە کە ئۆرسوڵا پاش ساڵێک زەماوەند هێشتا هەر کچە و هۆیەکەشی ئەوەیە کە مێردەکەی پیاوەتیی نییە. خۆزێ ئەرکادۆ بوێندیا ئاخر کەس بوو کە ئەو دەنگۆیەی زانی.
لە سەرەخۆ بە ژنەکەی وت: "ئۆرسوڵا بزانە خەڵک چی دەڵێن!".
ئەویش وتی: "با بڵێن، ئێمە دەزانین کە ئەوە راست نییە." هەتا شەش مانگی دیکەش وەزعەکە بەوجۆرە درێژەی کێشا. یەک شەممە رۆژێکی بەدووم کەڵەشێری خۆزێ ئەرکادۆ بوێندیا کەڵەشێری بروودینسیۆ ئاگیلاری بەزاند. کابرای دۆڕاو کە لە دیتنی کەڵەشێری سەر و گوێلاک خوێناویی خۆی زۆر نارەحەت ببوو، لە خۆزێ ئەرکادۆ بوێندیا کشایەوە هەتا ئەوەی دەیهەوێ بیلێ هەموو بە چاکی گوێیان لێ بێ.
هاواری کرد: "پیرۆز بێ! بەشکم سەرەنجام کەڵەشێرەکەت بتوانێ خزمەتێک بە ژنەکەت بکا".
خۆزێ ئەرکادۆ بوێندیا لە سەرەخۆ کەڵەشێرەکەی هەڵگرت و رووی لە خەڵکەکە کرد و وتی: "ئێستا دەگەڕێمەوە." و بە پردینسیۆ ئاگیلاریشی وت: "تۆش برۆ ماڵەوە چەکەکەت هەڵگرە. چونکە بەزوویی دەتکوژم." پاش دە دەقیقە بە نێزەی باپیرییەوە کە بە خوێن ئاشنا بوو، گەڕایەوە. پرودینسیۆ ئاگیلار کە لە مەیدانی شەڕە کەڵەشێران چاوەڕوانی بوو،، نیوەی خەڵکی

ئـاواییش لەو مەیدانەدا کۆببوونەوە. مـاوەی دەسـتکردنەوەی نەمـا. نێـزەی خـۆزێ ئەرکـادۆ بوینـدیا بەهێـز و تـاقەتی گـایەک بە هەمـان نیشـانەگیری و وردی کە یەکەمین ئۆرلیـانۆ بوینـدیا بەوری ئەو نـاوچەیەی پێ کوشـتبوون، ملـی پرودینسـیۆ ئـاگیلاری هەڵـدڕی. ئەو شـەوە کاتێـک خەڵکـی ئـاوایی لە مەیدانی شەڕە کەڵەشێراندا لە سەر تەرمی کابرا رۆژیان دەکردەوە، خـۆزێ ئەرکادۆ بویندیا  لەو کاتەدا رۆیشـتە ژوورەوە کە خێزانـی دەرپێ کـورتەی لەبەر دەکرد. نێزەکەی لە بەردەمـی راگرت و فەرمـانی دا کە: "ئەو شـتە لە پێت داکەنە." ئۆرسۆلا گومانی نەمـا کە مێردەکەی بەڕاسـت وا دەڵـێ، لە بەر خـۆیەوە وتـی: " هەر شـتێک روو بـدا، خـۆت بەرپرسـی." خـۆزێ ئەرکـادۆ بویندیا نێزەکەی لە لەپی ژوورەکە چەقاند و وتـی: "ئەگەر ئیگواناشـت ببێ، قەی ناکـا، ئیگـوانی گەورە دەکەیـن، بەڵام ئیتـر لەوە  بەدواوە نـابێ کەس بە سۆنگەی تۆوە بکوژرێ."

شـەوێک لە شـەوە جوانەکـانی مـانگی ژووئەن بـوو. هەوا فێنـک و مانـگ لە ئاسمان دەدرەوشایەوە، بێ ئەوە گوێ بدەنە ئەو بـایەی کە دەنگـی گریـانی خزم و کەسـی پرۆدینسـیۆ ئاگیلاریـان دەهێنـا ژوورەوە، هەتـا رۆژ بەخەبەر مانەوە و ئەویندارییان کرد.

ئەو رووداوەیـان بە حیسـابی بەرگری لە نـامووس دانـا، بەڵام ویژدانـی هەر دووکیـان لەو بـارەوە سـەخت لە عەزاب دابـوو. شـەوێک لە شـەوان کە ئۆرسـۆلا خەوی لـێ رەویبـوو و بـۆ ئـاوخواردنەوە چووبـووە حەوشـە، پرودینسیۆ ئاگیلاری لە لای گۆزە ئـاوەکە چاو پێکەوت. رەنگـی دەموچـاوی شێن هەڵگەڕاو و قیافەی زۆر غەمگین بـوو. هەوڵـی دەدا برینـی ئەسـتۆی بە مەڵحەمی گیا داپۆشی.

ئۆرسـۆلا لە بینینـی نەترسـا، بە پـێچەوانەوە دڵـی بـۆی سـووتا. گەڕاوە ژوورەوە هەتـا ئەوەی دیتبووی بـۆ مێردەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام مێردەکەی زۆری گوێ نەدایە. وتی: "مردوو نـاگەڕێنەوە، ئەوە ئێمەین نـاتوانین دەست لە سەرزەنشـتی ویژدانـی خۆمـان هەڵگـرین." دوو شـەو دواتـر، ئۆرسـۆلا دیسان پرودینسیۆ ئاگیلاری لە حەمام چاو پێکەوت، کە بە گیای تەڕ خوێنی دەڵەمەی ملی دەسڕیتەوە. شـەوێکی دیکە بینـی لە بەر بـاران پیاسـە دەکـا.

خـۆزێ ئەرکـادۆ بویندیا کە لە خەیـاڵاتی ژنەکەی وەدەنـگ هـاتبوو، دەسـتی دایە نێزە و رۆیشتە حەوشە، مردوو بە غەمناکی لەوێ راوەستابوو.
خـۆزێ ئەرکـادۆ بویـندیا گوڕانـدی: "لێـرە بـڕۆ. هەزار کەرەت بگەڕێـیەوە دیسانیش دەتکوژمەوە."
پرودینسـیۆ ئـاگیلار لە جێگـای خـۆی نەبزووت و خـۆزێ ئەرکـادۆ بویـندیا نەیوێرا نێزەی باوێتێ. لەوە بەدواوە خەوی لێ حەرام بوو. نیگای خەمـاویی مردوو لە نێو باران و دڵتەنگیی فرەی بۆ زیندووان و نیگەرانیی ئەو کە لە مـاڵەکەدا بـۆ ئـاو دەگەڕا هەتـا مەڵحەمـی گیـای پێ تەڕکا و لە سـەر برینـی خۆی دابنێ، خـۆزێ ئارکادۆ بویندیای سـەخت نـارەحەت و شـڵەژاندبوو، بە ئۆرسـۆلای دەگـوت: "رەنـگە زۆر ئـازار بکێشـێ، ئاشـکرایە فـرە هەسـت بە تەنیـایی دەکـا." دڵسـۆزیی ژنە گەیشـتە جێگـایەک کە کاتێـک مـردووی بینـی سـەری گۆزان هەڵدەداتەوە، مەبەسـتەکەی تێگەیشـت. لە هەمـوو شـوێنەکانی ماڵەوە گۆزە ئاوی دانا. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا شـەوێک کە بینی مـردوو لە نێو ژوورەکەی ئەودا برینەکەی دەشواتەوە، توانای لێبڕا و وتی: "زۆر چاکە پرودینسیۆ ، ئێمە لەو گوندە دەڕۆین، ئەوەندەی بتـوانین دوور دەڕۆیـن کە نەگەڕێینەوە. ئێستا دەتوانی بە خەیاڵی ئاسوودەوە لێرە بڕۆی."
ئەوە بـوو کە لە زنجیـرە چیـا تێـپەڕین. چەنـد کەس لە دۆسـتانی خـۆزێ ئارکـادۆ بویـندیا، ئەوانەی کە وەک ئەو لەو جەرەیـانە سـەخت پەرێشـان ببـوون، ماڵیـان بە جێهێشـت و دەسـتی ژن و منـداڵیان گـرتن و بەرەو زەوییەک، کە وادە نەدرابـوو، وەڕێکەوتـن. خـۆزێ ئەرکـادۆ بویـندیا پـێش رۆیشـتن نێـزەکەی لە حەوشـە بـن گـڵ خسـت و بـۆ ئاسـوودەیی خەیـاڵی پرودینسـیۆ ئـاگیلار کەڵەشـێرە شـەڕانییە جوانەکـانی یەک بە یەک خنکاند. تەنیا شتێک کە ئۆرسۆلا لەگەڵ خۆی هەڵیگرت، سـندووقی لیباسـی بـووکێنی و هێندێک پێویستی و مجری سکە زێڕەکانی بوو کە لە بـاوکییەوە بۆی بە میـرات بە جـێ مـابوو. نەخشـەیەکی روونیـان بـۆ ئەو سـەفەرە گەڵاڵە نەکردبوو. تەنیا تێدەکۆشان پشت بە ڕیۆهاشا بەرەپێش بڕۆن، بۆ ئەوەی نە شوێنیان دیار بێ و نە بگەنە خەڵکی ناسیاو. سەفەرێکی سەیر بوو.

دوای چاردە مانگان ئۆرسۆلا کە گەدەی بە خواردنی گۆشتی مەیموون و شۆرباوی مار لە نێو چووبوو، منالێکی بوو کە هەموو ئەندامی لەشی وەک منداڵی ئادەم بوو! هەتا نیوەی ڕێگای سەفەریان لە جۆلانەیەکیان دادەنا و دووپیاو بە شان هەڵیان دەگرت. ئاوسانی زگ پێیەکانی تێکدابوون و ڕەگەکانیان دەپسان. هەرچەند بینینی منالان بە زگی خاڵی و چاوی شلەقاو بەزەیی دەبزواند، بەڵام منالان چاکتر لە گەورەکان بەرگەی سەفەریان دەگرت و زۆرتر خەریکی گاڵتە و گەپ بوون، بەدوای دوو ساڵ سەیر و سەفەر ڕۆژێکی بەیانی چاویان بە داوێنی ڕۆژاوای چیا کەوت. لە سەر لوتکەی مژگرتووی چیا، ڕوانیانە ڕووبەری پانایی ئاو، گۆلاوی گەورە کە هەتا ئەوسەری جیهان درێژەی هەبوو، بەڵام هیچ کاتێک نەگەیشتنە دەریا، شەوێک دوای چەند مانگ دەربەدەری لە نێوان زەلاوانـدا، کاتێک کە لە ئاخرین سوورپێستی ڕێبوار زۆر دوور کەوتنەوە، لە کەنار چەمێکی بەردەڵان کە ئاوەکەی دەتگوت شووشەی سەهۆڵە، دامەزران.
ساڵەها دواتر، لە مەودای شەڕی دووهەمی نێوخۆ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا تێکۆشا لەو ڕێگایەوە هێرش بەرێتە سەر ریوئاچا و دوای شەش ڕۆژ خۆماندووکردن بۆی دەرکەوت کردەوەیەکی شێتانەیە. بەوحاڵەش شەوێک کە باوک و هاوڕێکانی لە بەستێنی ڕووبارەکە دامەزران، لە کەشتی شکاو دەچوون. ژمارەیان لە کاتی تێپەڕین لە چیا زیادی کردبوو و هەموویان ئامادە بوون بە پیری بمرن (و سەرکەوتن). ئەو شەوە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا خەوی بینی کە لەو شوێنە، شارێکی ئاوەدان دروست بووە کە دیوارەکانی هەموو لە ئاوێنەیە. پرسی ئەوە چ شارێکە؟ لە وەڵامدا ناوێکیان وت کە هەتا ئەو کاتە نەیبیستبوو، ناوێکی بێ مانا کە لە خەودا ڕەنگی ئەوپەڕی سروشتی دەدایەوە، ماکۆندۆ. بەیانیی ئەو ڕۆژە بە هاوڕێکانی سەلماند هیچ کاتێک ناتوانن بگەنە دەریا. فەرمانی دا دارەکانیان بڕییەوە و لە کەنار چەم زەوییان ڕێک و گۆر کرد و لە فێنکترین شوێنی بەستێن گوندیان دروست کرد.
خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا هەتا ئەو ڕۆژەی سەهۆڵی نەناسی، مانای دیواری ئاوێنەی نەزانی. بە ناسینی سەهۆڵ وایزانی مانای دروستی خەوەکەی

تێگەیشتووە، بیری کردەوە لە داهاتووی نزیکدا دەتوانن سەهۆڵێکی زۆر دروست بکەن. بە دەکارکردنی شتومەکی سەرەتایی، کە شتێکی ئاسایی و ئاشنا وەک ئاوە، دەتوانن ماڵەکانی تازەی ئاوایی بە سەهۆڵ دروست بکەن.ماکۆندۆ لە شوێنێکی گەرم، کە لاو لاوە و کرکرەی پەنجەرەکانی لە بەر تینی گەرما وێک دەهاتن، دەبوو بە شارێکی زستانی. تەنیا بەڵگە و دەلیلێک لە سەر دروست نەکردنی کارخانەی سەهۆڵسازی ئەوە بوو کە هەموو هۆشی بە دوای پەروەردەی مناڵەکانییەوە بوو، بەتایبەتی ئۆرلیانۆ هەر لە سەرەتاوە نیشانی دابوو هەتا چ رادەیەک دڵی بە کیمیاگەرییەوەیە. دەزگای تاقیکاری سەر لە نوێ دامەزرابۆوە. بە تەماشا و پێداچوونەوەی نووسراوەکانی میلکیادێس، ئاسوودە و بێ سەرقاڵی، لە سەرەخۆ هەوڵیان دا زێڕەکانی ئۆرسوڵا لەو تۆپەڵە رەژییە جیا کەنەوە. لە کاتێکدا باوک گیان و لەشی فیدای کیمیاگەری کردبوو، خۆزێ ئارکادیۆی لاو تەنیا جارێک لەو کۆبوونەوەدا ئامادە بوو. کوڕە گەورە لاوەکە لە تەمەنی زۆرتر هەڵی دابوو، ببوو بە لاوێک بەخۆوە، دەنگی گۆڕا و لە سەرووی لێوەکانی مووی نەرم دەرکەوتن. شەوێک کاتێک رووت دەبۆوە بچێتە نێو جێگاوە، ئۆرسوڵا هاتە ژوورەوە، لە چاوپێکەوتنی هەستی شەرم و دڵسۆزیی کرد. لە دوای مێردەکەی ئەوە یەکەمین پیاوی رووت بوو کە لە هەموو تەمەنی خۆیدا چاوی پێدەکەوت. کیری ئەوەندە گەورە بوو کە غەیرە سروشتی دەهاتە بەرچاو. ئۆرسوڵا بۆ جاری سێهەم ئاوس بوو، ترسی یەکەمین شەوی ئەویندارییی بیر کەوتەوە.

لەو دەورەیەدا، ژنێکی لەبار و دڵباز بۆ یارمەتیی ئۆرسوڵا هاتووچۆی ماڵەوەیانی دەکرد و فاڵی وەرەقیشی دەگرتەوە. ئۆرسوڵا سەبارەت بە کوڕەکەی لەگەڵ ئەو ژنە قسەی کرد. وایدەزانی کیری گەورەی کوڕەکەی وەک کلکی کوڕە خاڵەکەی شتێکی غەیرە سروشتییە. ژنە قاقایەکی وەهای لێدا کە وەک شووشەی شکاو دەنگی لە هەموو ماڵەوە گەڕا و وتی: "بە پێچەوانەوە، دەبینی کە دەبێتە هۆی خۆشبەختیی ئەو." بۆ سەلماندنی قسەی خۆی دوو سێ رۆژ دواتر بە دەستە وەرەقێکەوە هاتە ژوورەوە و لە عەمباری تەنیشت ئاشپەزخانە لەگەڵ خۆزێ ئارکادۆ بە تەنیا مانەوە.

وەرەقەکانی بە ئارامی لە سەر مێزە کونەکەی دارتاشی ریز کردن. قسەی لێر و لەوێ کرد. کورە لە لای راوەستابوو لە جیاتی ئەوە زۆرتر ورد بێتەوە وازی بە سەر چووبوو. لە پڕ ژنە دەستی درێژ کرد و دەستی لە کیری دا و وتی: "چەند گەورەیە!" وەها ترسا نەیتوانی هیچیتر بێژێ، خۆزێ ئارکادۆ هەستی کرد هەموو ئێسقانەکانی دەزوورێنەوە. دەترسا و رێک گەرووی دەکوشی. ژنە لەوە زۆرتری هان نەدا، بەڵام خوزێ ئارکادیۆ هەموو شەو بە دوایدا دەگەڕا، بە دوای بۆی ئەو دووکەڵەی لە بن هەنگڵی دەهات و چووبووە ژێر پێستی خۆی، دڵی دەیخواست هەمیشە لەگەڵ ئەو بێ. دڵی دەیەویست ئەو دایکی بایە. خوازیاری ئەوە بوو هەرگیز لە عەمبار دەرنەکەون و ئەو بڵێ: "چەند گەورەیە!" دیسانیش دەست لە نێو رانی بداتەوە و بڵێ: "چەند گەورەیە!" رۆژێکیان توانای بە سەر چوو و رۆیشتە ماڵی ژنەکە، چاوپێکەوتن رەسمی بوو. بێ ئەوەی وشەیەک بێتە سەر لێوی لە ژووری میوانداریی ئەودا دانیشت. لەو کاتەدا هیچ دڵی بە ژنەوە نەبوو، جیاواز بوو، بەو شێوەیە کە لە بۆنی ئەو بۆخۆی دروست کردبوو فرە جیاواز بوو، ژنێکی دیکە بوو، قاوەیەکی خواردەوە و بە خەمناکی لە ماڵەکەی دەرچوو. ئەو شەوە کاتێک خەوی لێ رەوی، دیسانەوە شێتانە خوازیاری ئەو بوو، بەڵام هەوەسی ئەوجارەیان جۆرێکی دیکە بوو، وەک جارەکەی عەمباریێ نەیدەویست. وەک پاش نیوەڕۆی رۆژەکە ئارەزووی بوو.

چەند رۆژ دواتر ژنە لە پڕ بانگی کردە ماڵی خۆیان. لەگەڵ دایکی بە تەنیا لە ماڵەوە بوو. بە بیانووی ئەوە کە دەیهەوێ جۆرێک وەرەقبازیی نیشان بدا، خۆزێی کێشایە ژووری خەوتن. ئەو کاتە بە ئازادی دەستی پێدا هێنا، بەڵام بە دوای لەرزینی سەرەتایی، هەموو خۆشی بە ترس گۆڕا. ژنە داوای لێکرد ئەو شەوە بچێتە ماڵیان، ئەویش هەر چەند دەیزانی ناچێ، بۆ دڵخۆشیی ئەو بەڵێنی دا. بەڵام هەر کە شەو داهات و چوو لە جێگاوە و راکشا، تێگەیشت کە بە هەر نرخێک بێ دەبێ خۆی بگەیەنێتێ. بە دەستەکوتە جلەکانی لە بەر کردەوە. لە تاریکاییدا گوێی بۆ هەناسەی ئاراکی براکەی، وشکە کۆخەی باوکی لە هۆدەی تەنیشتی، قرخەی

مریشکان لە حەوشــە، وزەی مێشــوولان، تەپەی دڵــی خــۆی و نــارەی بــێ پایانی لاوی کە هەتا ئەو کاتە ئاگاداری نەبوو، هەڵخست و، هەنگاوی نایە نێو شەقامی خەوتوو. لە قووڵایی دڵییەوە ئارەزووی دەکرد ئەو جۆرەی کە ژنە بەڵێنــی داوە دەرگــای ماڵەکەیــان نیوەئــاوەڵا نەبــێ و قفــڵ درابــێ، بەڵام ئاوەڵا بوو. بە سەری پەنجانی پاڵی بە دەرکەوە نا. لاو لاوەکان سیرەیەکی درێژ و خەماوییان لێ هەستا کە وەک بایەکی سارد لە هەموو لەشــی گەڕا و دەنگی دایەوە. کاتێک لە دەرگا تێدەپەڕی هەر بەو جۆرەی کە تێدەکۆشا بێدەنگ و خشپە بچێتە پێش، بۆنی ئەو بە بەرلــووتی داهــات. گەیشــتبووە ژووری دەرگاکە، سێ برای ژنە جولانەکانیان جۆرێک هەڵواسیبوو کە لەو تاریکاییەدا هەڵکەوتیان روون نەبوو. ناچار بوو بە سەر پەنجەی پێ لە نێو دەرگا تێپەڕێ، دەرگای ژووری نووستن بکاتەوە و بە جۆرێک بەرەوپێش بــڕوا کە پــێ لە جێوبــانی دیــکە دانەنــێ. تێیــدا ســەرکەوت، پێــی لە تەنــافی جۆلانەکــان گیــر کــرد کە زۆر خــوارتر لەوەی بیــری دەکــردەوە پێچرابــوون. پیاوێــک کە هەتــا ئەو کــاتی پــرخەی دەهــات، وەرســووڕا و بە دەم خەوە بە هەناسەساردی وتی: "چوارشەممە بوو." کاتێک دەرگای ژووری خەوی پــاڵ پێوەنــا، دەرگــا لە ســەر عەرزی کەچ و کرووچــی ژوورەکەدا وەجیــڕەکەوت. لەوپەڕی تاریکاییــدا، بە بێچــارەیی تەواو، لە پــڕ هەســتی کــرد کە هۆشــی لە دەست داوە، لەو ژوورە تەنگ و بچکۆڵەدا، دایک و کــچەکەی دی کە لەگەڵ مێــردەکەی و دوو منداڵیــان و ژنێــک کە رەنــگە چــاوەڕوانی ئەو نەبــوو، نووستبوون. دەیتوانی خــۆی بە بــۆنی ئەو بســپێرێ و بە دوایدا بــڕوا. بەڵام بۆنی لە هەموو ژوورەکە گەڕابوو، هەروەک لە بن پێستی خۆشــی گەڕابــوو. دەمێــک لە جێگــای خــۆی بە بــێ ئەوەی مــووی لــێ ببــزوێ، راوەســتا. لەو کــاتەدا بە سەرســــووڕمانەوە لە خـــۆی پرســــیار دەکــرد چــۆن لەو داوەی کەوتووە، دەستێک لە نێو تاریکایی راهــات و دەموچــاوی لاواندەوە. ســەری ســووڕما، چــونکە بــێ ئەوەی بزانــێ چــاوەڕوان بــوو، خــۆی بەو دەســتە ئەسپارد. ماندوو و مردوو، بێدەسەڵات بەدوای دەستەدا کێشــرایە شــوێنێکی بــێ قەوارە. دەســتەکان ئەویــان رووت کــردەوە و وەک گــوێنییە پەتــاتە بە دوای خۆیانــدا کێشــا و بەولا و ئەولایانــدا دا. لە تاریکاییــدا هەســتی بە

دەستەکانی خۆی نەدەکرد. لە جیاتی بۆنی ژنە، بۆنی ئاموونیاکی بە بەر لووتیدا دەهات. تێدەکۆشا دیمەنی ژنە بێنێتەوە یاد، بەڵام دەموچاوی دایکی دەهاتە بەرچاو. دەیزانی خەریکە کارێک بکا کە زۆر دەمێک بوو ئارەزووی دەکرد و هیچ کات بە تەمای ئەوە نەبوو لە راستیدا جێبەجێی بکا. نەیدەزانی چۆن ئەو کارە دەکا. نەیدەزانی لاقی لە کوێن، سەری لە کوێیە، ئەو پێیانە هی کێن، ئەو سەرە هی کێیە. هەستی دەکرد کە لەوە زیاتر ناتوانێ دەنگی ساردی گورچیلە و ریخۆڵەکانی خۆی ببیسێ و ئەو ترس و نیگەرانییە کوشندەیە و ئەو بێدەنگی و تەنیاییە سامناکە هەڵگرێ.

ناوی پیلار تێرنێرا[٤] بوو. ئەویش لەو کۆچەدا، کە بە دامەزرانی ماکۆندۆ کۆتایی هاتبوو، بەشدار بوو. بنەماڵەکەی، ئەویان لەگەڵ خۆیان هێنابوو هەتا لەو پیاوەی دوور خەنەوە کە لە چاردە ساڵانیدا وەسەری پەڕیوە و هەتا بیست و دوو ساڵ ئەویندارى بووە. پیاوە هەرگیز بڕیاری نەدا ئەوە ئاشکرا بکا، چونکە ئازاد نەبوو، بەڵام بەڵێنی پێدابوو هەر کات توانی سەروسامانێک بە ژیانی بدا هەتا ئەوسەری جیهان بە دوای دەکەوێ. پیلار لە چاوەڕاونیی ئەو ماندوو ببوو. هەر جارە کە پیاوانی قەد بڵێند و کورتەباڵا، مووزەرد و مووڕەش کە فاڵی وەرەقیان لە جادە جۆرەبەجۆرەکان، لە لە رێڕەوە دەریاییەکان هەتا سێ جار، سێ رۆژ، سێ مانگ یان سێ ساڵ بە وێدا هاتووچۆیان دەکرد، ئەوی دەدی. لە دەورانی چاوەڕوانیدا هێزی رانەکانی و، توورتیی مەمەکانی و عادەت بە خۆشەویستیی لە دەست دابوو. بەڵام سەودایی دڵی هەروەکو خۆی هێشتبۆوە. خۆزێ ئارکادۆ کە لەو هەوەسبازییە خولیایی ببوو، هەموو شەوێ بە دوای نیشانەی ئەودا لە هەزار تویێ ئەو ژوورە تێدەپەڕی. جارێکیان دەرگا داخرابوو، چەند جار لە دەرگای دا. دەیزانی ئەگەر جارێک بوێرێ لە دەرگا بدا، سامی دەشکێ. بە دوای چاوەڕوانییەکی بێکۆتایی، ژنە دەرگای لێکردەوە. رۆژانە دەبوو بە دزییەوە نوقمی بیرەوەرییە خۆشەکانی شەوی رابردووبێ. کاتێک ژنەم بە پێکەنین و خۆشحاڵ، ئاسایی و بە قسەکردن دەهاتە ژوورەوە پێویستی بەوە نەدەکرد هەڵچوونی خۆی

[٤] - PilarTernera

بشـــاریتەوە، چـــونکە ئەو ژنە کە تەقیـــنەوەی قاقـــای پێکەنینـــی کـــۆتری هەڵدەفڕادن و بەهێزی نادیاری نەفەس کێشان لە ناخەوە و چاوەدێریکردنی دڵی فێر دەکرد و تێگەیاندبوو کە هۆی ترسی مرۆڤ لە مەرگ چییە، هیچ پێوەندییەکی بە شێوەی پێشوو نەمابوو. بە جۆرێک چووبووە نێوخۆیەوە کە کاتێک دایک و باوکی هەواڵیان هێنا کە زێڕەکانی ئۆرسۆلایان لەو تۆپەڵە ئاسـنە جیـاکردۆتەوە –و بەوبـۆنەوە ماڵەکەیـان بە سـەر سـەری خۆیانـدا هێنابووە خوارێ – ئەو ئاگای لە شادی و خۆشحاڵی گشتی نەبوو.
سـەرەنجام بە دوای رۆژەهـا کـار و بێـنەوبەرە سـەرکەوتنیان بە دەسـت هێنـابوو. ئۆرسـۆلا خۆشـحاڵ بـوو، تەنـانەت بە بـۆنەی داهێنـانی کیمیاگەری سوپاسی خوای کرد. خەڵکی گوند هێرشیان هێنا بۆ دەزگای تاقیکاری و بە شیرنی گوایابا° و بیسکویت ئەو موجیزەیـان جێژن گرت. خـۆزێ ئارکادیۆ بویندیا زێڕی جیاکراوەی لە تڵتەی ئاسنەکانی پێ نیشـان دەدان، هەروەک ئێسـتا خـۆی داهێهێنـابێ. هەر بەو جـۆرە کە زێـڕەکەی لە دەسـت دابـوو، دەوری دەدا و بە هەموویـانی نیشـان دەدا. ئەو تـۆپەڵە وشـک و زەردەی لە پـێش چـاوی کـوڕە گەورەکەی راگـرت کە لەو دوایـیـانەدا پێـی نەنـابووە ژووری تاقیکاری و پرسی؛ "لات وایە وەک چی دەچێ؟"
خۆزێ ئارکادۆ بەڕاستی وەڵامی دایەوە: "گووی سەگ!"
باوکی بە پشتەدەست زللەکی وەها توندی لە دەمی دا کە خوێن و فرمێسـک بە یەکەوە لە دەموچـاوی هـاتەخوار. ئەو پیلار تێرنێرا بە تـاریکی بـوتری و لـۆکەی دۆزییەوە و دەم و لـووتی هەڵمسـاوی بە تەنتریـۆک هەڵکوشـی و بە دواییـدا بـێ ئەوە خـۆزێ ئارکـادۆ زەحـمەت بـدا ئەویـنداریی لەگەڵ کـرد و هەوەسی دامرکاند. گەیشتنە رادەیەک کە کەمێک دواتر بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن نارە ناریان بوو.
خۆزێ ئارکادۆ وتـی: "دەمەوێ تەنیا لەگەڵ تـۆ بـم، لەو رۆژانەدا ئەویـنداریی خۆمـان لە لای هەمـووان ئاشـکرا دەکەم، هەتـا ناچـار نەبـین بە دزیـیەوە یەکترمان خۆش بوێ."
پیلار تێنەکۆشا پێشی بگرێ

---

°– جۆرە میوەیەکە وەکوو کەدوو (کوولەکە) کە لە کولۆمبیا، ئارژانتین و بۆلیوی دەچێندرێ.

وتی: "چەند خۆش دەبێ، کاتێک بە تەنیا ماینەوە، چرا هەڵدەکەین هەتا یەکتر بە جوانی تەماشا بکەین و من هەرچی کە دڵم بیهەوێ بێ ئەوەی لە کەس بترسم، هاوار بکەم و تۆش هەرچی دڵت بیهەوێ بە گوێمیدا بدەی."
ئەو وتووێژە و، رقێکی توند کە لە دڵی خۆیدا بەرامبەر بە باوکی هەستی پێدەکرد و ئیمکانی ئەویندارییی بێ سنووری، ورەیەکی ئەوتۆی دایە هەتا هەموو شتەکانی بێ پێشەکی بۆ براکەی باس کرد.
ئۆرلیانۆی منداڵ، لە پێشدا هەر ئەو مەترسییەی کە هەرەشەی لە براکەی دەکرد تێگەیشت، بەڵام نەیدەتوانی لە جوانیی ئەو رووداوە تێبگا. وردە وردە نیگەرانی و نارەحەتی بە سەریدا زاڵ بوو، بەئاگابوون لە وردە مەترسییەکانی رووداوی ئەویندارانەی براکەی، لە رەنج و خۆشیی ئەودا دەبوو بە شەریک و هەستی بە ترسێکی تێکەڵاو لەگەڵ خۆشبەختی دەکرد. لە نێو جێگادا بەتەنیا وەک ئاگر سوور دەبووە و هەتا بەیانی چاوەڕوانی براکەی دەکرد و بە دواییدا هەتا کاتی لە خەوهەستان، بێ ئەوەی هەست بە بێ خەوی و ماندووبوون بکەن بە یەکەوە قسەیان دەکرد. وای لێهات دوای ماوەیەک هەردووکیان بە دایم وەنەوزیان دەدا و هەردووکیان بەرامبەر بە کیمیاگەری و زانستی باوکیان رق و قینی زۆریان لە دڵدا پێکەوە نا و لە تیەنیایی خۆیاندا نوقم بوون. ئۆرسوڵا دەیگوت: "ئەو دوو مناڵە دەڵێی گێژ بوون، بێگومان کرمیان هەیە." دەرمانێکی یەکجار زۆر بێ تامی لە هێلکەکرمی کوتراو دروست کرد کە هەردووکیان بە رووخۆشی خواردییانەوە و هەتا ئێوارە یازدە جار زگیان کاری کرد. کرمێکی ئاڵیان دانا، کە بە شادمانی بە هەموویانیان نیشان دا. چونکە بە هۆی ئەوەوە دەیانتوانی هۆی بێهۆشی و خەواڵوویی خۆیان بە ئۆرسوڵا بسەلمێنن.
ئۆرلیانۆ ئێستا نەتەنیا هەموو شتێکی دەزانی، بەڵکو تاقیکاریی براکەی هەنگاو بە هەنگاو مەزمەزە دەکرد. جارێکیان کە براکەی وردەکاریی ئەویندرایی بۆ شیدەکردەوە، قسەکانی بڕی و پرسیاری کرد: "مرۆڤ هەست بە چی دەکا؟".
خۆزێ ئارکادۆ دەستبەجێ وەڵامی دایەوە: "وەک بوومەلەرزەیە."

پێنج شەممەی ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی مانگی ژانوییە، سەعاتی دووی پاش نیوەشەوێ، ئامارانتا هاتە سەر دونیاوە. پێش ئەوەی کەس بچێتە ژوورەوە، ئۆرسۆلا مناڵەکەی بە وردی سەیر کرد، وەک بێچووە مارمێلکە، شل و سووکەڵ، بەڵام هەموو لەشی لە ئادەمیزاد دەچوو. ئۆرلیانۆ، هەتا ئەو کاتەی ماڵەکەیان پڕ نەبوبوو لە خەڵک، نەیزانیبوو چ قەوماوە. لە شلۆقیی ماڵەوە کەڵکی وەرگرت و بە دوا براکەیدا ڕۆیشت کە لە سەعات یازدەوە لە جێگادا نەمابوو. بڕیارەکەی ئەوەندە لە ناکاو بوو بیری لەوە نەکردەوە چۆن لە باوەشی پیلار تێرنێرای بێنێتەوە دەر. چەند سەعات لە دەوری ماڵیان هەڵسووڕا، بانگی کرد، فیتووی لێدا، سەرەنجام بە نزیکبوونەوەی بەرەبەیان ناچار گەڕایەوە. کاتێک گەیشتە ژووی دایکی، بینی خۆزێ ئارکادۆ لەوێیە و وا دەنوێنێ ماف بە لای ئەوەوەیە و لەگەڵ مناڵە تازەبووەکە یاری دەکا.

چلەی ئۆرسۆلا تازە بە سەر چووبوو کە قەرەچییەکان دیسان گەڕانەوە، هەر ئەو چاوبەست و ئاکرووباتییانە بوون کە سەهۆڵیان بۆ ئەوێ هێنابوو. بە پێچەوانەی کاولییەکانی میلکیادێس لە ماوەیەکی کورت نیشانیان دابوو کە تەنیا بۆ خۆشی و نواندن دێنە ئەوێ، نەک وەک پێشەنگی جیهانی پێشکەوتوو. تەنانەت ئەو کاتە سەهۆڵیان هێنا ئەوێ، ئەو کارەیان وەک یەکێک لە سەیرەکانی سیرک نیشان دابوو، نە بە مەبەستی قازانجەکانی سەهۆڵ لە ژیاندا. ئەوجار لەگەڵ ئارئێ ئاگرپەرینی زۆر قاڵیچەیەکی پەرەندەشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، بەڵام ئەو قاڵیچەیان وەک کەرەسەیەکی گاڵتە و گەپ ناساند، نە وەک شتێکی گرینگ بۆ بەرەوپێشبردنی هاتووچۆ. خەڵکی ئاوایی دەستبەجێ ئاخر سکە زێڕی خۆیان لە ژێر زەوی دەرهێنا هەتا بە سەر خانووەکانی ئاواییدا بفڕن. لە سایەی شلۆقی و تێکەڵ پێکەڵی گشتیدا، خۆزێ ئارکادۆ و پیلار تێرنێرا کاتێکی خۆشیان بە یەکەوە بردە سەر. لەو نێوەدا ببوون بە ئەویندار و گراوی بەختەوەر و تێگەیشتن کە ئەوین هەستێکی زۆر قووڵترە لە خۆشیی شەوانی نهێنیی ئەوان کە زوو دەهات و رادەبرد. بەوحاڵەش پیلار ئەو خۆشییەی تێکدا، لە خۆشحاڵی و شادمانیی خۆزێ ئارکادۆ لەگەڵ خۆی

کەڵکی خراپی وەرگرت و بە جارێک دنیای بە سەر سەریدا خراکرد و، وتی: "ئێستا بەراستی بووی بە پیاوێکی تەواو." بەڵام کاتێک زانی لە مانای قسەکەی نەگەیشتووە، راست و رەوان وتی: "بەم زووانە دەبی بە باوک."
خۆزێ ئارکادۆ هەتا چەند رۆژان نەیدەوێرا لە ماڵەوە دەرکەوێ. هەر کە گوێی لە دەنگی پێکەنینی پیلار لە ئاشپەزخانەوە دەبوو، بە راکردن خۆی دەژووری تاقیکاری دەهاویشت. دەزگای تاقیکاری دیسانەوە بە دوعای ئۆرسولا دامەزرابۆوە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بە رووخۆشییەکی زۆرەوە کورە هەڵاتووەکەی وەرگرت و لە گەڵ خۆی بردی بۆ دۆزینەوەی ئەکسیر.
رۆژێک پاش نیوەرۆ، مناڵەکان لە چاوپێکەوتنی قالیچەی سیحراوی کە بە تیژی بە بەر پەنجەرەی ژووری تاقیکاریدا دەفری، زۆر خۆشحاڵ بوون. پیاوێکی قەرەچی رایدەپەڕاند و چەند مناڵ لە سەرەوە بە خۆشحاڵییەوە بۆ لای ئەوان دەستیان رادەوەشاند، بەڵام خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا تەنانەت چاویشی لێ نەکردن، وتی: "با هەر بەوجۆرە لە خەیاڵی خۆیاندا بمێننەوە، ئێمە زۆر لەوان چاکتر هەڵدەفرین، بە سەرچاوەی زانستییانەتر و نەک وەک ئەوان بە رووتەختییەکی بوودەڵە." خۆزێ ئارکادۆ تێدەکۆشا وا بنوێنێ حەزی لە کیمیاگەرییە، هیچ کاتێک لە هێزی خوارایی خورتووم (الخطم الخرطوم) کە لای وابوو بوتڵێکی خوار و خێچە حاڵی نەبوو. نەیدەتوانی خۆی لەو نیگەرانییە سەختە رزگار بکا. خەو و خواردنی لێ بڕابوو، بە تەواوی وەک باوکی کە کاتێک تاقیکارییەکانی بە ئەنجام نەدەگەیشتن، خەمناک و رووگرژ دەبوو، وەزعی روحی وەها تێکچووبوو کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وایزانی ئەو تێکچوونە لە خۆشیی لە رادەبەدەری کیمیاگەرییە، هەر بۆیە رازی بوو کورە لە دەزگای تاقیکاردا خزمەت بکا.
ئۆرلیانۆ بە چاکی دەیزانی کە سەرچاوەی پەرێشانی و تێکچوونی براکەی چووکترین پێوەندیی بە تاقیکارییەکانی کیمیاگەرییەوە نییە، بەڵام ئیتر نەیدەتوانی ببێتە رازداری نهێنییەکانی، براکەی بە شێوەی پێشوو نەمابوو، خۆی لە دەردی دڵکردن دەپاراست و ئەوی نەدەکردە شەریکی خەمەکانی و ببووە کەسێکی گۆشەگیر و بەدرەفتار. شەوێک نیگەرانی تەنیایی و بە دڵێکی پڕ لە رق و قین دەرحەق بە دونیا و هەرچی لە دونیا دایە، وەک

جاران جێگاخەوتنی بە جێهێشت و بەڵام بە جێگای ئەوە بچێتە لای پیلار تێرنێرا، چوو بۆ تەماشاخانەی کاولییەکان. ماوەیەک بێ ئامانج لە نێو داهێنانە سەیر و سەمەرەکاندا گەڕا، بەڵا هیچ کامیان سەرنجیان رانەکێشا. سەرەنجام شتێک سەرنجی راکێشا: کچێکی کاولی، کچێکی تازەجحێڵ کە مۆر و متوو و مووررووی زۆری لە ملی کردبوو. خۆزێ ئارکادۆ قەت ژنی وا جوانی نەدیبوو. کچە لە نێو خەڵکدا چاوی لە نواندنی خەمناکی پیاوێک دەکرد کە بە هۆی سەرپێچی لە فەرمانی دایک و باوکی دەبوو بە مار.

خۆزێ ئارکادۆ بێ ئەوەی گوێ بداتێ، هەر لەو کاتەدا کە نواندنی کابرای مار درێژەی هەبوو، بە نێو خەڵکەکەدا بەرەوپێش رۆیشت بۆ ریزی هەوڵێ، نزیکی کچە کاولی و لە پشت سەری راوەستا. خۆی بە پشتییەوە نووساند و خەریکی خۆپێوەنانی بوو. کچەکە هەوڵی دا خۆی لادا، بەڵام خۆزێ ئارکادۆ توندتر خۆی پێوە چەسپاند. لە کاتەدا کە کچە لە ترسان و لە خۆشیان دەلەرزی، هەستی بە کیری کورە کرد. لە جێگای خۆی نە جولایەوە. باوەڕی بەوشتە نەدەکرد. سەرەنجام ئاوڕی دایەوە و بە ترسەوە زەردەخەنەی هاتێ. لەو کاتەدا، دوو پیاوی کاولی، مارەکەیان لە قەفەس نایەوە و بردیانەوە ژووری چادرەکە.

کاولییەکی دیکە، کە بەرنامەکانی رادەگەیاند، وتی: "ئێستاش خوشکان و برایان، نواندنی ژنێک دەست پێدەکا کە چونکە شتێکی کە نەدەبوو ببینێ، بینبووی، بەوە حوکم درابوو کە هەتا سەدو پەنجا ساڵ هەموو شەوێک سەری ببڕن."

خۆزێ ئارکادۆ و کچە لەسەر سەربڕینی ژنە رانەوەستان. رۆیشتن بۆ چادری کچەکە و لەوێ وردە وردە کە خۆیان رووت دەکردەوە، بە ترسەوە و شێتانە یەکتریان ماچ کرد. کچە کاولی کراسەکەی دانا و خۆی لە چنگ ئەو هەموو داوێنە سفتانە رزگار کرد. مەمکبەندی بێ کەڵک و ملوانکەکانی دەرهێنا، بوو بە شتێک کە هەر وەک لە پێشدا نەبووبێ، وەک بۆقێکی لەڕ و بچکۆڵە. مەمکی تازە خڕ دەبوون، رانەکانی ئەوەندە باریک بوون کە نەدەگەیشتنە ئەستوورایی باسکی خۆزێ ئارکادیۆش. هەر چەند ئامادە بوون و گەرمای باوەشی لەق و لاوازی لەشی قەرەبوو دەکەردەوە،

بەوحاڵەش خۆزێ ئارکادۆ نەیدەوێرا بە ئاسوودەیی لە باوەشی بگرێ. لە چادرێکی گشتیدا بوون کە کاولییەکان بۆ هێنان و بردنی کەرەسەی سیرک هەمیشە لە هاتووچۆدا بوون و خەریکی کارەکانیان بوون، تەنانەت لە لای تەختەکەی ئەوان دادەنیشتن و یارییان دەکرد. چرایەک کە لە نێوەڕاستی چادرەکە هەڵواسرابوو، هەموو نێو چادرەکەی رووناک دەکردەوە. خۆزێ ئارکادۆ لەکاتی لاواندنەوەی کچەدا بە رووتی لە سەر تەختەکە درێژ بوو. کچە خەریک بوو هەوەسی ئەوی دەبزواند. کەمێک دوای ئەوە ژنێکی کاولی، کە بەدەن و لەشێکی زۆر جوانی هەبوو لەگەڵ کابرایەک کە نە کاولی بوو، نە خەڵکی گوند، هاتنە ژووری چادرەکەوە و لە پێش تەختی نووستنی ئەوان خەریکی داکەندنی جلەکانیان بوون. ژنە چاوی لە لەشی رووتی خۆزێ ئارکادۆ هەڵەنگووت. بە گەرمی و لە سەرەخۆ دەستێکی بە سەر دەعبای جوان و نووستوی ئەودا هێنا و وتی: "کورم خوا هەر بەوجۆرە بتپارێزی."

کچە کاولی داوای لێکردن وازیان لێ بێنن، ئەو دوو کەسەش لە سەر زەوی نیزک تەختەکە راکشان. هەوەسی خەڵکی ئیشتیای خۆزێ ئارکادیۆشی هەستاند. بە یەکەمین وەیەککەوتنی ئەویندارانە، ئیسقانی کچە بە سەر یەکدا قرمان، هەروەک بیانەوێ لە بەریەک بترازێن، پێستی لەشی خوناوکەیەکی کەمڕەنگی دەردا و لە بەریەک کشایەوە و چاوی پڕ بوون لە فرمێسک و ناڵاندی، بۆنی گڵ بە نەرمی لە هەموو لەشی هاتەدەر، بەڵام بە ورەیەکی بەرز و ئیرادەیەکی پتەو خۆی لە بەر ئەو بەیەککەوتنە راگرت. خۆزێ ئارکادۆ وایدەزانی بەرەو ئاسمان بەرەو تیشکی فریشتان هەڵدەکشێ و لەوێ دڵی دەتەقێ، دەبێتە هەزاران هەزار وردەشەرمی خاوێن و لە گوێی کچەوە دەچێتە نێو لەشی، دەبێتە زمانی و لە دەمی دێتە دەرێ. ئەو رۆژە پێنج شەممە بوو. شەوی شەممە خۆزێ ئارکادۆ پارچەیەکی سووری لە سەر بەست و لەگەڵ کاولییان رۆیشت.

کاتێک ئۆرسۆلا بە ون بوونی ئەوی زانی، هەموو گوندی بۆ دۆزینەوەی پشکنی، لە جێگا چادری کاولییەکان، لە نێو زیلکی ئاورەکان کە سووکە دووکەڵیان مابوو، بەڵام ببوونە خۆڵەمێش. کەسێک کە لە نێو خۆڵەمێشی

ئاورەكاندا بە دوای مت و مووروودا دەگەرا و بە ئۆرسولای وت شەوی پێشتر كورەكەی ئەوی لەگەڵ كاولییەكان دیوە كە عارەبانەی قەفەزی كابرای – ماری لێ دەخوری. ئۆرسولا بە سەر مێردەكەیدا، كە لە ون بوونی كوڕەكەی بچووكترین نیگەرانی لە خۆی نیشان نەدابوو، گوڕاندی: "رۆیشتووە، بۆتە كاولی!".

خۆزێ ئەركادۆ بویندیا لەوكاتەدا كە لە دەست ئاونگدا خەریكی هارینی شتێك بوو كە هەزار جار وردی كردبوو و سووری كردبۆوە و دیسان هاریبوویەوە، وتی: "هیوادارم راست بێ، چونكە دەبێتە پیاو."

ئۆرسولا ریڕەوی كاولییەكانی پرسی، بەرەو ئەو جادەیەی كە نیشانیان دابوو، بە شوێن پێی كاولییەكاندا، بەو هیوایەی كە بتوانێ زوو بیانگاتێ، وەرێكەوت و لە ئاوایی دوور كەوتەوە. وەها دوور كەوتەوە كە بیری گەڕانەوەی لە مێشكی خۆی بردە دەرێ. خۆزێ ئەركادۆ بویندیا هەتا سەعاتی هەشتی شەو بە رۆیشتنی ژنەكەی نەزانی. ئەوەی كوتابووی خستییە نێو هێندێك كوودی گەرم و چوو بە لای ئامارانتای بچكۆڵە، كە لە بەر گریانی بەكوڵ خەریك بوو بخنكێ.

لە ماوەی چەند سەعاتدا دەستەیەكی لە پیاوانی تەیار كۆ كردەوە و دوای ئەوەی ئامارانتای بە ژنیك سپارد شیری بداتێ، بۆ دۆزینەوە ئۆرسولا كەوتنەرێ. ئۆرلیانۆ لەگەڵیان رۆیشت. لای بەیانی گەیشتنە چەند ماسیگرێكی سوورپێست، كە لە زمانی یەكتر تێندەگەیشتن. هەر چۆنێك بێ بە ئاماژەی بەدەست حاڵییان كردن كە هیچ كەسیان لەو دەورووبەرە نەدیوە. لە پاش سێ رۆژ خولانەوە بێ ئاكام بۆ گوند گەرانەوە.

خۆزێ ئەركادۆ بویندیا هەتا حەفتە سەری لەو كارە سوورمابوو. وەك دایكیك ئاگاداریی لە ئارمانتای بچكۆڵە دەكرد و دەیشووشت و لیباسی لێ دەگۆڕێ و رۆژێ چوار جار دەیبردە ماڵی ژنێك كە شیری دەدایە، تەنانەت شەوانە گۆرانیی وەهای بۆ دەوت كە ئۆرسولا هیچ كات بۆی نەوتبوو. جارێكیان پیلار تێنێرا پێشنیاری كرد هەتا ئۆرسولا دەگەڕێتەوە كارەكانی ماڵەوەیان بكا. ئۆرلیانۆ كە هێزی پێشبینی كردنی بەو هەموو رووداوە ناخۆشانە تیژتر ببوو، بە دیتنی ژنە هەموو شتێكی بۆ روون بۆوە.

ناڕاستەوخۆ تێگەیشت کە هەڵاتنی براکەی و بێ شوێن بوونی دایکی تاوانی ئەو ژنە بووە. لە سەرەخۆ و ئارام بەڵام بە شێوەیەکی وەها دوژمنانە ژنەی ئازار دا کە ژنە پێی لەماڵیان بڕی.

تێپەڕینی زەمان هەموو شتی ئاسایی کردەوە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا و کورەکەی نەیانزانی کەی و چۆن دیسان چوونەوە ژووری تاقیکاری. دوای تەکاندنی کەرەسەکان، ئاوری بێ گوڕەیان هەڵکرد و خەریکی دەستتێوەردانی مادەیەک بوون کە چەند مانگ بوو لە بن زبڵی گەرمدا مابۆوە. تەنانەت ئامارانتاش لە نێو قەرتاڵە بچکۆڵانەکەی خۆیدا راکشابوو، بەوردی سەیری کردەوەکانی باوک و براکەی دەکرد کە لە هۆدە گچکەی تاقیکاریدا کە پڕ ببوو لە دووکەڵی جیوە، خەریکی کار بوون. چەند مانگ دوای سەفەری ئۆرسۆلا، رووداوی سەیر پێش هاتن. بوتڵێکی بچکۆڵە کە لە گۆشەیەکی خەڵوەتی ماوەیەک بوو بە بەتاڵی فڕی درابوو، ئەوەندە قورس بوو کە ئیمکانی بزاوتنی نەبوو. لە سەر مێزی کارەکە مەنجەڵێکی پڕ لە ئاو بێ ئەوە ئاگری لە بن بێ، نیو سەعاتی تەواو کوڵی هەتا هەموو ئاوەکەی بوو بە هەڵم و تەواو بوو. خۆزێ ئارکادۆ و کورەکەی ئەو رووداوانەیان بە سەرسوورمانەوە تەماشا دەکرد. لەبەر ئەوەی کە نەیاندەتوانی بەڵگەیەک بۆ ئەو رووداوانە بدۆزنەوە وایان دەزانی ئەوە پێشەنگی دۆزینەوەی (ئەکسیرە).رۆژێکیان سەوەتەی ئامارانتا لە خۆوە جولایەوە دەورێکی تەواو بە ژوورەکەدا گەڕا. ئۆرلیانۆ بە پەشۆکاوی رایکرد و قەرتاڵەی راگرت. بە پێچەوانە باوکی نەترسا و سەوەتەکەی بردەوە شوێنی خۆی لە پێچکی مێزەکەی بەستەوە. ئێستا ئیتر دڵنیا بوو ئەوەی کە دەمێک بوو چاوەڕوانی دەکرد بەزوویی دەیگاتێ. لەو کاتەدا بوو کە ئۆرلیانۆ بیستی باوکی دەڵێ: "ئەگەر لە خوا ناترسی، لە ئاسنەواڵە بترسە."

لە پڕ ئۆرسۆلا دوای پێنج مانگان گەڕایەوە. جحێل ببۆوە. بە خۆشحاڵییەکی یەکجار زۆرەوە بە لیباس و بەرگێکی وەها کە هەتا ئەوەدەم پارچەکەشی لە گوند نەبینرابوو، هاتە ژوورەوە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا کە نزیک بوو دڵی لە خۆشیان راوەستێ هاواری کرد؛ "هەر ئەوە بوو. دەمزانی وای لێ دێ." لە قووڵایی دڵیەوە بڕوای بە قسەکەی خۆی هەبوو. لە ماوەی درێژی

تەنیایی خۆیدا، هەر لەو کاتەدا کە خەریکی ئەکیسر بوو، پڕ بە دڵ ئاواتەخوازی رووداوی چاوەڕوانکراو بوو، رووداوی دۆزینەوەی بەردی فەلاسیفەکان نا، ئەوەش نا نەفەسێک کە ئاسن زیندوو بکاتەوە، یان هێزێک کە قفڵ و لاولاوان بکا بە زێڕ نەبوو، شتێک بوو کە لە راستیدا پەرجوو وموجیزەبوو، گەڕانەوەی ئۆرسوڵا بوو". بەڵام ژنەکەی بەشداریی خۆشحاڵی ئەوی نەکرد. زۆر ئاسایی ماچی کرد و هەر وا بزانە سەعاتێکە لە ماڵ دەرکەوتووە، پێیگوت: "تەماشای دەرەوە بکە."
کاتێک خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە ماڵ دەرکەوت و خەڵکی بینی، پاش ماوەیەک حەبەسان سەیری کرد کاولی نەبوون، پیاو و ژنی وەک خۆیان بوون، پرچی ساف و پێستی ئاماڵ رەش کە بە زمانی ئەوان دەدوان و دەردی هاوبەشیان هەبوو، باری هێسترەکانیان خواردەمەنی بوو، عارەبانە قورسەکان کە کەڵان دەیانکێشا، پڕ بوو لە پێویستییەکانی نێوماڵ، پێویستی ساکار و بە کەڵک کە بە بێ هەرا و هوریا نیازی فرۆشتنیان هەبوو. لەوبەری زەلاوەکەوە هاتبوون، کە هەتا ئەوێ تەنیا دوو رۆژە رێ بوو. لەو لاوە، زۆر شار هەبوون کە لە هەموو مانگەکانی ساڵدا پۆستەیان پێدەگەیشت و کەلوپەلی خۆشیی ژیانیان دەناسی. ئۆرسوڵا نەیتوانیبوو بگاتە کاولییەکان، بەڵام، لەبری ئەوە رێگەیەکی دۆزیبۆوە کە مێردەکەی بە دوای دۆزینەوەی بێ ئاکامی داهێنانی گەورەدا نەیتوانیبوو ببینێتەوە.
منالّی پیلار تێرنێرایان دوو حەوتوو پاش لە دایکبوون، هێنا بۆ ماڵی بابە گەورە و دایەگەورەی. ئۆرسوڵا بە بێ مەیلی و بوڵە بوڵ وەریگرت. جارێکی دیکەش پێداگرتن و لاساریی مێردەکەی، کە نەیدەویست نەوە خۆشەویستەکەی بەڕەڵلا بکرێ، بە سەریدا زاڵ ببوو، بەڵام مەرجی دانا کە نابێ منالّەکە هیچ کات بزانێ لە کێ بووە. هەر چەند ناویان لێ نا خۆزێ ئارکادیۆ، بەڵام لە بەر ئەوە ناوەکان لێک نەگۆڕێن تەنیا بە ئارکادیۆ بانگیان دەکرد. لەو زەمانەدا ئاوایی وەها کۆشا ببوو و کارەکانی نێوماڵ ئەوەندە زۆر بوون کە پەروەردەی منالان کەوتە پلەی دووهەمی گرنگییەوە. منالّەکانیان بە ویسی تاسیۆن سپارد. ویسی ئاسیۆن ژنێکی سوورپێستی خەڵکی گواخیرا بوو. کە لەگەڵ یەکێک لە براکانی لە دەست تاعوونی بێ

خەوی کە چەند ساڵ بوو عێلەکەیانی داگرتبوو، هەڵاتبوو و هاتبووە ماکۆندۆ. ئەو دووانە ئەوەندە دڵسۆز و خزمەتگوزاربوون بوو کە ئۆرسۆلا هێنابوونی لە کاری ماڵەوەدا یارمەتیی بدەن. بۆیە ئارکادیۆ و ئامارانتا زمانی گواخیرانی لە پێش زمانی ئیسپانولی فێر بوون و دوور لە چاوی ئۆرسۆلا کە بە توندی خەریکی دروستکردنی ئاوی نەبات بە شکڵی زیندەوەران بوو، خواردنەوەی شۆرباوی مارمێلکە و خواردنی هێلکەی جاڵجاڵوکەش فێر بوون. گوندی ماکۆندۆش بە تەواوی گۆڕابوو، ئەو کەسانەی لەگەڵ ئۆرسۆلا هاتبوونە ئەوێ، خاکی زەوییان باش دەناسی و دەیانزانی کە خاکی ئەوێ چەندی بە سەر ناوچەکانی زەلاودا هەیە. گوندی کوێر و کوتری قەدیم، هێندەی پێ نەچوو ببوو بە گوندێکی ئاوەدان و پڕ هاتووچۆ، گوندێک کە دووکان و بازار و کارگەی سەنعەتە دەستییەکان و جادەیەکیشی هەبوو، کە هەمیشە ساتوسەودا و بازرگانیی تێدا دەکرا. یەکەمین دەستەی عەرەبان لەو شەقامەوە هاتنە نێو ئاوایی. شەڵواری گوێنی (تەلیس)یان دەگۆڕییەوە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا ئارا و قاراوی لێ هەڵگیرابوو. سەرمەستی ئەو راستییانە بوو کە زۆر لە خەیاڵاتی ئەو سیحراویتر بوون، بە تەواوی دڵی لە تاقیکاریی کیمیاگەری سارد بۆوە و ئەو شتانەی کە بە مانگ خەریکیان ببوو، فڕیی هەڵدان و دووبارە وەک رابردوو وەگەڕ کەوتەوە، وەک ئەو رۆژانەی کە شوێنی تێکەڵ بوونی شەقامەکان و شێوەی بینای ماڵەکانی نوێی بە جۆرێک دادەنا، هیچ کامیان بە سەر ئەوی دیکەیاندا نەبێ.

لە نێو تازەهاتووەکان ناوبانگ و دەسەڵاتێکی ئەوتۆی پێکەوە نا کە بە بێ پرسی ئەو هیچ شوێنێک دروست نەدەکرا و دیواری هیچ ماڵێک بڵێند نەدەبوو. کار گەیشتە جێگایەک کە وایان بە چاک زانی، ئەرکی دابەشکردنی زەوی بەدەستی ئەو بسپێرن. کاتێک کاولییەکان ئاکروباتباز بە جۆرەها نواندن و یاری و قومار گەڕانەوە، خەڵکەکە بەو هیوایەی خۆزێ ئارکادیۆشیان لەگەڵە، بە رووخۆشی بە پیریانەوە چوون، بەڵام خۆزێ ئارکادیۆیان لەگەڵ نەبوو، کابرای مارە تەنیا کەسێک کە دەیتوانی لە سەر چارەنووسی منداڵەکەیان هەواڵێکیان بداتێ، لەگەڵیان نەهاتبوو. لە بەر ئەوە

ڕێگەیان نەدا کاولییەکان لە ئاوایی بمێننەوە و دەریان کردن. تاوانباریان کردن کە خراپە و خراپەکاری بڵاو دەکەنەوە و خەڵک لە ڕێی ڕاست لادەدەن. بەوحاڵەش خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا ڕایگەیاند کە دەرگای شار هەمیشە بۆ خێڵی میلکیادێس، کە خاوەنی زانستی هەزار ساڵە و داهێنانی سەرسوورهێنەرن و لە بنیاتنانی گونددا بەشدار بوون، ئاوەڵا دەمێنێتەوە، بەڵام بە وتەی ئەو، ئەو کاولییە گەڕۆکانە خێڵی میلکیادێس نین چونکە پێیان لە ڕادەی زانستی بەشەر تێپەڕاندبوو، شوێنەواریان لە سەر زەوی سڕابۆوە.

خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا، کەلانی کەم بۆ ماوەیەک لە چنگ خەیاڵپەروەری ڕزگاری ببوو. لە ماوەیەکی کورتدا کارەکانی ڕێکوپێک کرد. بڕیار درا ئەو مەلانەی کە لە سەرەتای دامەزرانی شار بە دەنگە خۆشەکانیان شادییان خستبووە ئەو نێوە، ئازاد بکرێن و لە جێگای ئەوان سەعاتی زەنگوڵەدار هەڵاوەسرێن، ئەو سەعاتە جوانانە کە چوارچێوەی لە دار داتاشرابوون و عەرەبان بە تووتی، گۆڕینەوەیان پێ دەکردن. خۆزێ ئارکادۆ سەعاتەکانی ئەوەندە بەووردی قورمیش و ڕێکوپێک کرد کە هەر نیو سەعاتەی زەنگێکی خۆشیان لێدەدا و لە نێو ئاواییدا دەنگی دەدایەوە و نیوەڕۆیانیش ئاهەنگێکی تەواو لێ دەدرا. لەو ساڵانەدا بوو کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لێبڕا لە جیاتی داری ئەقاقیا داری بادام لە کەناری شەقامەکان بروێنن و هەر خۆش بوو بێ ئەوەی بە کەس بڵێ شێوەیەکی بۆ هەمیشە مانەوەی دارانە دۆزییەوە. ساڵانی ساڵ دواتر، کاتێک ماکۆندۆ بوو بە شارێکی گەورە و خانوو و کۆشکی شێروانیدار، دار بادامە شکاو و تۆزاوییەکان لە شەقامە کۆنەکان دەبیندران، بەڵام کەس نەیدەزانی کێ چەقاندوونی.

ئۆرلیانۆ، لەو کاتەدا کە باوکی خەریکی کاروباری شار بوو و، دایکی بە ئاوی نەبات فرۆشتن بە شکڵی کەڵەشێر و ماسی، کە ڕۆژی دوو جار لە سەر کەشەف بۆ بازار دەبرا، سامانی ماڵەوەی دەبردە سەر، چەند سەعاتی لە سەریەک لە شوێنی تاقیکاریی چۆڵ هەر لە بەر ئەوە کە مەیلی بە فێربوونی هونەری زەڕنگەری بوو، تێپەڕ دەکرد. لە ماوەیەکی کورتدا وەها گەورە ببوو لیباسی براکەی، کە بۆی بەجێ مابوو، بۆی نەدەبوو و لیباسی

باوکی لەبەر دەکرد. بەڵام لە بەر ئەوە ئۆرلیانۆ وەک بویندیاکانی دیکە بە خۆوە نەبوو، ویسیتاسیۆن کراس و شەڵوارەکانی بۆ کورت دەکردەوە. دەورانی باڵغی دەنگی شیرن و خۆشی گۆڕی و بوو بە کوڕێکی بێدەنگ و گۆشەگیر، بەڵام لە بەرامبەردا ئەو روانینە بەهێزەی پێ بەخشینەوە کە لە کاتی لەدایکبووندا هەیبوو. وەها غەرقی زەرنگەری دەبوو کە کاتی نان خواردن بە سەرگرانی لە ژووری تاقیکاری دەهاتەدەرەوە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا، کە نیگەرانی بێدەنگی و گۆشەگیری ئەو ببوو، بەو مەبەستە کە رەنگە پێویستی بە ژن هەبێ، کلیلی ماڵەوە و هەندێک پارەی پێدا. بەڵام ئۆرلیانۆ بەو پارەیە ئەسیدموریاتیکی کڕی هەتا بتوانێ ئاوی زێڕ پەیدا بکا، بە دوایدا کلیلەکانی ماڵەوەی پێ ئاوەزێڕ کردن، هەڵسوکەوتی جۆراوجۆری لە هەڵسوکەوتی ئارکادیۆ و ئاکارنتا دەچوو، ئەو دوانە لە لایەکەوە ددانی تازەیان هاتبوو، لە لایەکی دیکەشەوە بە سەرسەختی تێدەکۆشان لە جیاتی زمانی ئیسپانیۆلی زمانی گواخیرایی قسە بکەن. ئۆرسوڵا بە مێردەکەی دەگوت: "بە خۆرایی بۆڵەبۆڵێ مەکە منداڵان گێلیی دایک و باوک بە میرات دەبەن." ئۆرلیانۆ لەو کاتەدا کە ئەو سکاڵای بوو لە دەست گێژی و گەمژەیی منداڵەکانی و لای وابوو ئەو حاڵە لە بوونی کلکی بەراز کەمتر نییە، وەها چاوێکی لێکرد کە لەو بیروبۆچوونە تووشی شک و گومانی کرد. ئۆرلیانۆ پێیگوت: "کەسێک دێ."

ئۆرسوڵا وەک ئەو کاتانە کە کوڕەکەی شتێکی پێشبینی دەکرد، تێکۆشا بە شێوەی کابانیی خۆی پێی بسەلمێنێ هاتنی کەسێک سروشتییە، چونکە رۆژانە دەیان کەسی لاوەکی، بێ ئەوەی گومانێکیان لێ بکرێ، لە ماکۆندۆ تێپەڕ دەبوون. بەوجۆرەش ئۆرلیانۆ گوێ بەوبەڵگە و هۆیانە نەدەدا و بڕوای بە پێشبینیی خۆی هەبوو و دەیگوت: "نازانم کێیە، بەڵام هەر کەسێکە هەر ئێستا لە رێگادایە."

بەراستیش رۆژی یەکشەممە ڕێبێکا[٣] گەیشتێ. یازدە ساڵانە دەبوو. لەگەڵ کۆمەڵێک بازرگانی پێست کە پێیان ئەسپێردرابوو لەگەڵ نامەیەک تەسلیمی

---

[٣]- Rebeca

خۆزێ ئارکادۆ بویندیای بدەن، لە سەفەری سەخت و دژواری ماناورە[٤] هاتبوو. بە تەواویش نەیاندەزانی چ کەسێک ئەو داخوازییەی کردووە. شتومەکی بریتی بوو لە جانتایکی چکۆڵە، کوردییەکی راحەتی کە بە دەست نەخشابوو کیسە جاوێک کە ئێسکی دایک و باوکی لە نێودا خرتەیان دەهات. ئەو کەسەی نامەی بۆ خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا نووسیبوو، وتبووی لەگەڵ ئەوەشدا زەمانێکی زۆر تێپەڕیوە و مەودا دوورە، بەڵام دیسانیش ئەوی زۆر خۆش دەوێ و بە ئەرکی ئینسانیی خۆی زانیوە. ئەو کچە هەتیو و بێ پەنایەی بۆ بنێریتەوە. کچە خزمایەتییەکی دووری لەگەڵ ئۆرسۆلا و، لە ئەنجامدا لەگەڵ خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا هەبوو، هەرچەند خزمایەتیی لەگەڵ ئەویان دوورتر بوو. کچە، کچی دۆستی لەبیرنەچۆوەی ئەو، نیکانور ئولونا[٥] و ژنە بەڕێزەکەی ریبیکا مونتیلیی[٦] خوا لێخۆشبوو بوو، کە کچە ئیسقانەکانیانی هێنابوو هەتا ئەو جۆرەی شیاوی ئەوانە وەک مەسیحی بەڕێز بەخاکیان بسپێرێ. ناوی کابرا و ئیمزای نامەکە بەتەواوی دەخوێندرایەوە، بەوحاڵەش نە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا و نە ئۆرسۆلا هیچ کام بە یادیان نەدەهاتەوە خزمێکی بەو ناوانەیان هەبێ، کەسێکیشیان بە ناوی نامەنێرەوە لە گوندی دوورەدەستی ماناورە نەدەناسی. لە کچەش نەدەکرا زانیارییەکی پتر وەدەست بێنن. هەر لەو کاتەوە هاتبوو لە سەر کورسییەکەی دانیشتبوو بەو جۆرە کە ئەنگوستی گەورەی خۆی دەمژت و بە ترسەوە تەماشای ئەوانی دەکرد و هەروەکو هیچ لە پرسیارەکانیان نەگا. کراسێکی رەشی خەت خەتی لە بەر دابوو کە لە بەر کۆنی رزیبوو و جووتە پۆتینێکی لاسک شۆڕی کۆنە لە پێ. پرچەکانی بە لەچکەیەکی رەش لە پشت گوێی کۆ کردبۆوە، نەخشی لەچکە لە ئارەقەدا کاڵ ببوونەوە و لە نێو چووبوون. لە جومگەی دەستی راستدا ددانی جانەوەرێکی گۆشخۆر لە سەر بازنەیەکی مسی دەبیندرا کە نیشانەی قوربانی بۆکردنی بوو پێستی ئاماڵ سەوز و زگی هەڵمساو و باکردووی حیکایەتی لە نەخۆشی و

---

[٤]- Manaure

[٥]- NicanorVlloa

[٦]- RebecaMontiel

برسیبیایەتیک دەکرد کە زۆر لە تەمەنی ئەو کۆنتر بوو. کاتێک خواردنیان پێ دا دەوری لە سەر رانی دانا و دەستی لە خواردنەکە نەدا. کار گەیشتە جێگایەک کە وا بزانن ئیمکانی هەیە کەر و لاڵ بێ. هەتا سوورپێستەکان بە زمانی خۆیان پرسیاریان لێ کرد کەمێ ئاو دەخواتەوە، ئەو کە وێ دەچوو دیاننیاسێ، چاوی گێڕا و بە سەر وەڵامی دایەوە بەڵێ.
چونکە چارەیەک نەبوو لە لای خۆیان گێڕایانەوە. بڕیاریان دا ناوی بنێن رێبێکا کە بە پێی نێوەرۆکی نامە ناوی دایکی بوو. ئۆرلیانۆ بە لە سەرەخۆیی و تاقەتەوە هەموو ناوی سەر رۆژمێری خوێندەوە، بەڵام بینی لە بەرامبەر هەموو ناوەکاندا بێ تەفاوەتە. لەو کاتەدا لە ماکۆندۆ گۆڕستان نەبوو. لە بەر ئەوە ئێسقانی دایک و باوکیان هەتا شوێنێکیێ لەبار هەڵدەکەوێ بۆ گۆڕکردن هەر لە کیەسدا راگرت. رێبێکا هەتا ماوەیەکی زۆر هۆی دەردەسەری هەموویان بوو، لەو شوێنانە کە چاوەڕوان نەدەکرا، قوت دەبۆوە و وەک مریشکە کورکە دەیقرتاند. زۆر پێچوو هەتا توانی خوو بە ژیانی بنەماڵە بگرێ. لە دوورترین شوێنی ماڵەوە دادەنیشت و قامکی خۆی دەمژت. مەیلی تەنیا بە موسیقی سەعاتەکانەوە بوو، هەر نیو سەعات دەتگوت چاوەڕوانە ئاهەنگی سەعات ببیسێ. بە چاوترسانەوە بە دوایدا دەگەڕا. چەند رۆژی هەوەڵ نەیانتوانی خواردەمەنی پێ بدەن. نەیاندەزانی چۆن هەتا ئەو کاتە لە برسان نەمردوە. سەرەنجام سوورپێستەکان کە بە دڵەدزە و بێ پسانەوە هاتووچۆیان دەکرد، تێگەیشتن کە رێبێکا قوری حەوشە و گەچی دیواران دەخوا. دیار بوو دایک و باوکی یان هەر کەس گەورەی کردبوو زۆریان لە بەر ئەو کارە سزا دابوو، چونکە ئم کارەی بە دزییەوە و وەک تاوان دەکرد و هێندێک لەو گەچ و گڵانەوەی وەلا دەنا بۆ کاتێک کەس دیار نەبێ بیخوا لە پاش ئاشکرابوونی ئەو کارە هەموویان خستیانە ژێر چاوەدێری. لە هەموو حەوشەدا زراوی مانگایانکە زۆر تاڵ بوو پرژاند و بیباری سووریان لە دیواری گەچ هەڵسوو. بڕوایان وابوو بەوکارە ئەو خوو و خدە ناحەزە لە سەر دەردەکەن، بەڵام ئەو بۆ وەدەستهێنانی گڵ فێڵی ئەوتۆی دەدۆزییەوە کە ئۆرسۆلا ناچار بوو رێگایەکی دیکە بدۆزێتەوە. قابڵەمەیەکی ئاوی

پرتەقاڵ و ریواسی تاڵی شەو تا رۆژ دانایەوە هەتا لە خورێنی بیداتێ. هەر چەند کەس نەیوتبوو کە ئەو دەرمانە تاڵە چارەی گڵ خواردنە دەکا، بەڵام ئەو وایدەزانی کە دەرمانی تاڵ بە زگی برسی کار دەکاتە سەر جەرگی و دژکردەوەیەکی باش دەبێ. رێبێکا بەو کزی و لاوازییەوە ئەوەندە بەهێز و یاخی بوو کە بۆ دەرخوارددانی ئەو دەرمانی ناچاربوون وەک گوێلک گوێی بگرن و شەویلکەی داپچڕن. کچە شەقی دەهاویشت و گازی دەگرت و جنێوی دەدا و تفی دەهاویشت و شتانێکی دەگوت کە بە قەولی سوورپێستەکان پیسترین جنێو بوون. سەرەنجام ئۆرسۆلا چارەسەری بە شێلاق تێکەڵاو کرد، روون نەبۆوە لە بەر دەرمانی تاڵ بوون یان قامچی یان هەردووکیان، کە دوای چەند هەفتە نیشانی چاکبوونەوەی تەواو لە رێبێکا پەیدا بوو، لە یاری و گەمەی ئارکادیۆ و ئامارانتادا کە بە چاوی خوشکی گەورە سەیریان دەکرد بەشداری کرد. بە ئیشتیاوە خواردنی خوارد و، وەک هەموویان کەڵکیلە کارد و چەنگاڵ وەرگرت.

هێندەی پێ نەچوو تێگەیشتن زمانی ئیسپانیایش وەک زمانی سوورپێستەکان دەزانێ و لە کاری دەستیدا زۆر بەهۆشە. شیعری بۆ ئاهەنگی واڵی سەعاتەکان دانابوو و بە گۆرانی دەیگوتەوە. وەکو کەسێک لە بنەماڵەی خۆیان وەریان گرت. ئۆرسۆلای زۆر لەوە کە منداڵەکانی خۆی خۆشیان دەویست، خۆشی دەویست. ئارکادیۆ و ئامارانتای بە برا و خوشک، ئۆرلیانۆی بە خاڵ و خۆزێ ئارکادیۆ بویندیای بە "بابەگیان" ناو دەبرد. سەرەنجام بە شاوی ئەوەیان زانی کە وەک ئەندامەکانی دیکە بنەماڵە لە خۆیانی بزانن و ناوی رێبێکا بویندیای لە سەر ادابێنن، ناوێک کە هەتا کۆتایی تەمەنی بە شیاوییەوە بە سەریدا مایەوە.

لەو دەورەدا کە رێبێکا عادەتی گڵخۆریی تەرک کردبوو و لە ژووری منداڵەکاندا دەنووست، شەوێک ویسیتاسیۆن، ئەو ژنە سوورپێستە کە لە لایان دەخەوت، لە خەو هەستا و لە گۆشەی ژوورەکە گوێی لە دەنگێکی سەیر بوو. بەو خەیاڵە کە رەنگە گیان لەبەرێک هاتبێتە ژوورێ، بە ترسەوە دانیشت و لەو کاتەدا چاوی بە رێبێکا کەوت کە لە سەر کورسییەکەی خۆی دانیشتووە و ئەنگوستی لە زاری ناوە و چاوەکانی وەک چاوی پشیلە

لە تاریکیدا دەبریسکێنەوە. ویسیتاسیۆن کە لە ترسان هەموو لەشی ویشک بیوو، شەکەت و ماندوو لەو چارەنووسەی تووشی هاتبوو، لە چاوەکانی ئەودا نیشانەی نەخۆشییەک بەدی دەکرا کە ببووە هۆی ئەوەی ئەو و براکەی لە قەبیلەیەکی هەزار ساڵە ،کە خۆیان شازادە بوون، رابکەن: تاعوونی بێ خەوی.

کاتائورەی سوورپێست هێستا هەر شەوی مابوو بۆی دەرچوو. خوشکی لەوێ مایەوە، چونکە دڵی خەبەری دابوو بۆ هەر گۆشەیەکی ئەو جیهانە بڕوا، ئەو نەخۆشییە ترسناکە بە دواوەیەتی. هیچ کەس لە ترسی کوشندەی ویسیتاسیۆن تێ نەدەگەیشت. خۆزێ ئارکادۆ بوینـدیا بە رووخۆشـی دەیگوت؛ "ئەگەر بڕیار بێ نەخەوین، باشترە ئەو کات لە ژیان زۆرتر کەڵک وەردەگـــرین." بەڵام ژنە سوورپێســـتە بۆیـــانی روون کـــردەوە کە مەترسیدارترین شتی نەخۆشیی بێ خەوی تەنیا خودی بێ خەوی نییە، بەڵکو تووشی وەزعێکی ترسناک هاتنە: لە دەستدانی بیر و هۆش. نەخۆش کاتێک عادەتی بە بێ خەوی گرت وردە وردە بیرەوەییەکانی منداڵیی لەبیر دەچێتەوە، بە دواییدا ناو و شێوەی کەڵکوەرگرتن لە شتوومەک لە یاد دەباتەوە، پاشان ناسینەوەی خەڵک و تەنانەت خۆشی فەرامۆش دەکا، هەتا سەرەنجام لە نێو جۆرە گێژی و فەرامۆشییەکدا نوقم دەبێ. خۆزێ ئارکادۆ بوینـدیا کە لە پێکەنینـان دەتگـوت پچـڕا، لای وابـوو کە ئەو نەخۆشـییە دروستکراوی خورافەپەرستیی سوورپێستانە. بەوحاڵەشەوە ئۆرسوڵا بۆ پارێز ڕێبێکای لە منداڵەکانی دیکە جیاکردەوە.

چەنـد حەوتـوو دواتـر، کە وێـدەچوو ترسـی ویسیتاسـیۆن نیشـتبێتەوە، شـەوێک خـۆزێ ئارکـادۆ بوێنـدیا بە سەرسـووڕمانەوە هەسـتی بەوە کـرد خەوی لێ ناکەوێ.

ئۆرسوڵا،، کە خەوی لێ نەکەوتبوو پرسیی بۆ ناخەویە ئەو وەڵامی دایەوە: "دیسـان بیـر لـر پرودینسـیو ئـاگیلار دەکەمەوە." ئەو شـەوە تەنـانەت دەقیقەیەکیش نەخەوتن، بەڵام سبەینەکەی حالی هەردووکیان هێندە باش بوو کە بێخەویی شەوی رابردوویان لەبیر کرد. لە سەر نانی نیوەڕۆیانێ، ئۆرلیـانۆی حەپەسـاو بـۆی گێـڕانەوە کە هەر چەنـد شـەوی رابـردوو بـۆ

ئاوەزێڕکردنی گۆبەرۆک، کە دەیەوێ بۆ رۆژی لەدایکبوون بە دیاری بیدا بە ئۆرسوڵا، هەتا رۆژ لە تاقیگا بووە و یەک دەم نەخەوتووە، بە هیچ جۆر هەست بە ماندووبوون ناکا. رۆژی سێهەم بوو کە ترس هەموویانی داگرت. کاتی خەوتن بینیان کە خەویان لێ ناکەوێ و پەنجا سەعات پترە چاویان لێک نەناوە.

ژنە سوورپێستەکە بە باوەڕی تەواوەتی وتی: "مناڵەکانیش نەخەوتوون. کاتێک ئەو تاعوونە پێ بنێتە هەر ماڵێک، کەس بە ساخی دەرناچێ."

بەڕاستی هەموویان تووشی نەخۆشیی بێ خەوی هاتبوون. ئۆرسوڵا کە لە دایکییەوە فێری دەرمان گرتنەوە لە گیاوگوڵ ببوو، شەربەتێکی لە گوڵی تاج الملوک دروست کرد و هەر کەسە پیاڵەیەکی پێ خواردنەوە. دیسان نەیانتوانی بخەون، لە بری خەو تەواوی رۆژەکە بە سەر پێوە مانەوە و خەونیان بینی. لەو حاڵە سەیرە بێدارییەدا، نەتەینا شکڵ و تارمایی خەونی خۆیان، بەڵکو خەونی ئەوانی دیکەشیان دەبینی. هەروەک ماڵەوە لە هێرشی خەونەکانیان پڕ بووبێ لە خەڵک. ریبێکا، کە لە گۆشەی ئاشپەزخانە لە سەر کورسیی خۆی دانیشتبوو، بێ ئەوەی چاو لێک بنێ، خەونی دیت پیاوێک کە زۆر وەک خۆی دەچێ و لیباسی کەتانی سپی لە بەردایە و یەخەی کراسی دوگمەی زێڕی پێوەیە، باوەشێکی گوڵی سوور بۆ هێنا و، ژنێک کە لەگەڵ ئەو پیاوە بوو و دەست و پەنجەیەکی جوانی هەبوو، گوڵێکی لە لاسکێک کردەوە و لە پرچی کچۆڵەی چەقاند. ئۆرسوڵا وایزانی ئەوانە دەبێ دایک و باوکی ریبێکا بن، بەڵام بە هەموو کۆششیەوە بۆ ناسینەوەیان، سەرەنجام بۆی روون بۆوە کە هیچ کات لە ژیانیدا ئەوانەی نەبینیوە. لەو ماوەیەدا بە بێ سڵەمینەوە، کە خۆزێ ئارکادۆ بویندیا هیچ کات لە بارەوە خۆی نەبەخشی، ئاوی نەباتە دارینەکان بە شکڵی جانەوەری گچکە لەماڵەوە دروست دەکران و لە نێو گونددا دەفرۆشران. گەورە و گچکە بە خۆشحاڵییەوە کەڵەشێرە سەوزە بەتامەکانی ئالوودە بە بێ خەوی، ماسییە سوورە جوانەکانی بێ خەوی و ئەسپە چکۆڵە و زەردەکانی بێ خەویان دەلستەوە. بەرەبەیانی رۆژی شەممە هەموو خەڵکی گوند بە خەبەر بوون. لە پێشدا کەس نەیزانی چ باسە. بە پێچەوانەوە، لەوەی کە

خەویـان نەدەهـات زۆریـش رازی بـوون، چـونکە لەو کـاتەدا لە ماکۆنـدۆ ئەوەندە کار زۆر بوو پێ رانەدەگەیشتن.
هەموویان ئەوەندە کاریان کرد هەتا کارەکانیان تەواو کرد. سەعاتی سێی نیوەشەو بوو، دەستیان لە سەر دەست دانا و خەریکی ژماردنی چکەی چـرکەی سـەعاتەکان بـوون. ئەوانەی دەیانەویسـت بـخەون – نە لە بەر ماندوویی، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوە خەو ببینن – بۆ خۆماندووکردن دەستیان دایە هەزاران فێل. لە دەوری یەکتر کۆ دەبوونەوە دەستیان بە چەنەوەڕی دەکـرد. چەنـد سـەعات لە سـەر یەک داسـتانێکیان تـاریف دەکـرد. سەرگوزەشـتەی کەڵەشـێری یەختەیـان وەهـا لە یەککێشـاوە ببـوو بە داستانێکی بێ بڕانەوە. حیکایەتخوان لەوانی دەپرسی دەتانەوێ گوێ بدەنە داستانی کەڵەشێری یەختە، ئەگەر وەڵامـی "ئا"یـان دابـایەوە حیکـایەتخوان دەیگوت، لەوانی نەویستووە کە بڵێن "بەڵێ"، بەڵکو پرسیویە پێتان خۆشە داستانی کەڵەشێری یەختەتان گوێ لێ بێ، ئەگەر وەڵامیان دابایەوە "نا"، حیکـایەتخوان پێـی دەگـوتن کە لەوانـی نەویسـتووە بڵـێن "نـا"، بەڵکـو پرسیویەتی پێتان خۆشە گوێتان لە داستانی کەڵەشێری یەختە بێ یان نا، ئەگەر هیچ وەڵامیان نەدابایەوە، حیکایەتخوان دەیگوت کە لەوانی نەویستوە هیچ وەڵام نەدەنەوە، بەڵکو پرسیویە ئایا پێتان خۆشە گوێتان لە داستانی کەڵەشێری یەختە بێ یان نا، کەسیش نەیدەتوانی بچێتە دەرێ، چونکە حیکایەتخوان دەیوت لەوانی نەویستوە بڕۆن، بەڵکو پرسیویە ئایا مەیلتان هەیە گوێ لە داستانی کەڵەشێری یەختە بگرن یان نا، هەر بەوشێوەیە بە زنجیرە شەوە درێژەکان بەسەر دەچوون.
کاتێک خـۆزێ ئەرکـادۆ بویندیا زانـی نەخۆشـیی بـێ خەوی سەرتاسـەری گوندی داگرتووە، سەرۆکی بنەماڵەی دانیشتووانی لێک کۆکردەوە و، ئەوەی سـەبارەت بە نەخۆشـیی بـێ خەوی دەیزانـی بـۆی بـاس کـردن. بڕیـار هـاتە سـەر ئەوە کە بە هەر شـێوەیەک بـێ، لە بڵاوبـوونەوەی ئەو نەخۆشـییە بـۆ دێهاتی دەورووبەر پێشگیری بکەن. بۆ ئەو مەبەستە زەنگوڵەی بزنەکانیان، کە بە تـووتی لەگەڵ عەرەبانیـان گۆڕیبـوونەوە، لە ملی بزنـان دەرهێنا و لە دەروازەی شار، دایان بەو کەسانەی بێ گوێدانە ئامۆژگـاری و پاڕانەوەی

پاسەوانان بۆ دیتنی گوند پێیان دادەگرت. هەر بێگانەیەک لەو زەماندا کە بیویستبا بە شەقامەکانی ماکۆندۆدا رابرێ ناچار بوو زەنگوڵەی خۆی راوەشێنێ هەتا نەخۆشەکان بزانن کابرا ساخە. لە مەودای مانەوەیدا مافی نەبوو خواردن بخوا و ئاو بخواتەوە، چونکە بێگومان ئەو نەخۆشییە لە رێگەی دەمەوە بڵاو دەبێتەوە و، هەموو خواردەمەنی و ئاوی خواردنەوەی گوندەکە بە نەخۆشیی بێ خەوی ئاڵوودە ببوو. سەرەنجام نەخۆشی هەر لە چوارچێوەی ئەو گوندەدا مایەوە. دەورەدان (قرنطینە) وەها بەکەڵک بوو کە رۆژێک گەیشت ئەو وەزحە ئاسایی وەربگیرێ و ژیان بە جۆرێک تەرتیب درا کە کاروبار جارێکی دیکە هاتە سەر دۆخی ئاسایی خۆی و کەس بیری لە عادەتی بێهوودەیی خەوتن نەکردەوە.

سەرەنجام ئۆرلیانۆ هەر لە خۆوە شێوەیەکی داهێنا، کە بۆ چەند مانگان بوو بە خۆشیی هەموو لایەک. لە بەر ئەوە کە ئەو یەکەمین کەس بوو تووشی ئەو نەخۆشییە ببوو، لەو ماوە بێ خەوەییەدا هونەری زێڕەنگەری بەباشی فێر ببوو، رۆژێک بە دوای شتێکدا دەگەڕا کە ئاسنەواڵەی لە سەر وەرەقە وەرەق دەکرد و ناوەکەی لەبیر چووبۆوە. باوکی ناوەکەی پێوت "سەندان". ئۆرلیانۆ ناوەکەی لە سەر تیکە کاغەزێک نووسی و بە چەسپ لە بنی سەندانە بچکۆڵەکەیەوە نووساند. بەوشێوە دڵنیا بوو کە لە دوارۆژدا لە یادی ناکا. بەڵام بە مێشکیدا نەهات کە لەبیرکردنی ئەو ناوە خۆی یەکەمین نیشانەی لەدەستدانی هۆشە (حافظە). چەند رۆژ دواتر بۆی دەرکەوت کە بۆ وەبیرهێنانەوە هەموو ئەو کەرەسەی لە کارگای زێڕنگەری دایە، دەبێ تین و تەوژم بۆ مێشکی بێنێ. لە بەر ئەوە ناوی لە سەر هەموو شتەکان نووسی، کە هەر کات چاوی پێکەوتن بە بیری بێنەوە. کاتێک باوکی پێیگوت نیگەرانی ئەوەیە هەموو رووداوە گرنگەکانی سەردەمی منالیی لەبیر کردووە، ئۆرلیانۆ شێوەکاری خۆی بۆ شیکردەوە و خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا ئەو شیوەیەی لە هەموو ماڵەوە بەکار هێنا و کەمێک دواتر هەموو خەڵکیی ناچار کرد لەو شێوەیە کەڵک وەربگرن. بە پێنووسێک و مەرەکەب ناوی هەر شتێکیان لە سەر خۆی نووسی. مێز، کورسی، سەعات، دەرکە، دیوار، تەختی خەوتن، قابڵەمە، رۆیشتە حەوشە، حەیوان و ماڵات و گیاوگوڵی

نیشانەکردن: گا، گوێلک، بەراز، مریشک، داری سنجوو، داری مۆز، بەرە بەرە بە لەبەر چاوگرتنی ئەو ئیمکانە کە رەنگە زۆر شت ناوی بزانرێ، بەڵام لەبیر بچێتەوە بۆچی بەکار دێن، لەو بارەوە شێوەیەکی روونتری بەکار هێنا. نووسراوێکی کە لە ملی مانگایان کرد، نموونەیەکی بەرچاوی شەڕی خەڵکی ماکۆندۆ بوو دژی فەرامۆشی: "ئەوە، چێڵە، هەمو رۆژێ بەیانیان دەبێ بدۆشرێ هەتا شیر دەست کەوێ، شیر دەبێ بکوڵێ و لە قاوە بکرێ هەتا شیرقاوەی لێ دروست بێ." بەوشێوەیە لە راستییەک دا ژیانیان دەبردە سەر کە هەر ئان لێیان دوور دەکەوێتەوە و، تەنیا لە رێگای وشەکانەوە پارێزرابوو و، بە لەبیر چوونەوەی مانای وشەکان بۆ هەمیشە لەدەستیان دەچوو.
لە سەرەتای شەقامی زەلێ، تابلۆیەکیان هەڵواسیبوو کە لێی نووسرابوو: "ماکۆندۆ" و تابلۆیەکی گەورەتریان لە شەقامەڕێ هەڵواسیبوو کە نووسرابوو: (خوا هەیە). لە هەموو ماڵەکان تابلۆیەکیان بۆ بیرهاتنەوەی شتەکان و هەستەکان هەڵواسیبوو، بەڵام ئەو شێوەیە ئەوەندە پێویستی بە هێزی بیرکردنەوە و هەمیشەیی هەبوو کە زۆر کەس وازی لێ هێنا ، خۆیان بە راستییەکی خەیاڵی سپارد، راستییەک کە داهێنانی خۆیان بوو، ئەگەرچی رۆژ بەکار نەدەهات، بەڵام لانیکەم خەیاڵی ئاسوودە دەکردن.
پیلار تێرنێرا، بە پێداگرتنی تەواو ئەو بیرەی لە خەڵکەکەدا بە جۆش هێنا: بە فاڵی وەرەق ئاگاداری رابردووین، هەروەک ئەو کاتەی بە فاڵی وەرەق داهاتوویان پێشگوێ دەخست. بەوفێڵە، دانیشتووانی نەخەوتوو، لە جیهانێکدا ژیانیان دەست پێکرد کە چارەنووس لە رێگای فاڵی وەرەق بۆی لە بەر چاو گرتبوون، لە جیهانێکدا کە باوک پیاوێکی سەوزە روو بوو و سەرەتای مانگی ئاوریل هاتبووە ئەوێ، دایک ژنێک بوو دەموچاوی لەبەر هەتاو سووتابوو و ئاڵقەیەکی زێڕی لە ئەنگوستی دەستی چەپی دابوو، رۆژی لەدایکبوونی، ئاخرین سێ شەممەیەک بوو کە کۆترە باریکە لەسەر داری غار خوێندبووی. خۆزێ ئارکادۆ بویندیا، کە لەو هەموو کردەوە دڵنەوازیانە وەڕەز ببوو، بڕیاری دا: دەزگایەکی بیرەوەری" دروست بکا کە زەمانێک بۆ لەبیر نەکردنی داهێنانی سەرسوڕهێنەری قەرەچییەکان

ئارەزووی کردبوو. ئەو دەزگایە ئیمکانی ئەوەی پێک دەهێنا کە مرۆڤ هەرچی لە ماوەی تەمەنیدا دیتوویە و فێری بووە رۆژانە پێیدا بچێتەوە. ئەو دەزگایەی وەک وشەنامەیەکی چەرخان لەبەر چاو دەگرت، کە ئەگەر کەسێک لە نێوەڕاستدا بیویستایە، دەسگیرەی سووڕاندبا، لە ماوەی چەند سەعاتدا هەرچی بۆ ژیان پێویست با بە بەرچاویدا رادەبرد. چاردە هەزار شتی نووسیبوو کە لە جادەی زەلێ پیرەپیاوێک، کە بیچمێکی سەیری هەبوو، بە زەنگوڵەی خەماوی کەسانێک دەتوانن بنوون هاتە نێو ئاوایی. جانتایێکی قورسی بە تەناف بە دوای خۆیدا رادەکێشا و عەرەبانەیەکی پڕ لە پارچەی رەشی پێ بوو. یەکراست بۆ بەردەرکی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا چوو.

کاتێک ویسیتاسیۆن دەرگای ماڵەوەی کردەوە، ئەوی نەناسی. وایزانی دەیەوێ شتێک بفرۆشی و نازانێ لە گوندێکدا کە لە باتلاقی فەرامۆشیدا رۆ دەچێ شتێک نافرۆشرێ. پیاوێکی بەساڵاچوو بوو. گەرچی دەنگی بە نەبوونی دڵنیایی شکابۆوە و دەستەکانی گومانیان لە بوونی شت دەکرد، بەڵام دیار بوو لە جیهانێکڕا هاتووە کە هێشتا خەڵکەکەی دەتوانن بنوون و بە بیر بێننەوە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە ژووری میوانان چاوی پێکەوت کە دانیشتووە و خۆی بە کڵاوە رەشە پینەکراوەکەی باوەشێن دەکا و بە وردی ئەو نووسراوانە دەخوێنێتەوە کە لە دارودیوار نووسراون. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە ترسان کە مەبادا پێشتر ناسیبی و ئێستا لە بیری چووبێتەوە، بە رووخۆشی چووە پێشەوە، بەڵام میوان زانی رووخۆشییەکەی ساختەیە و تێگەیشت لە بیر کراوە. ئەوە لە بیرکردنێکی سروشتی، بەڵکو بە فەرامۆشییەکی زاڵمانەتر و لە گەڕانەوە نەهاتووە، کە ئەو بە چاکی ئاشنایی لەگەڵی هەبوو: بە فەرامۆشی مەرگ. ئەو کات هەموو شتێک تێگەیشت. جانتاکەی خۆی کردەوە کە پڕ بوو لە شتوومەک و کەرەسە، لە نێوان ئەواندا قوتوویەکی کە چەند شووشەی لە نێودا بوو دەرهێنا و شەربەتێکی خۆش رەنگی دەرخوارد دا، کە جارێکی دی بیرۆکەی هاتەوە جێ.

خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا پێش ئەوەی خۆی لە ژووری سەیر و سەمەرەی میوانان، کە هەر شتەی ناوی خۆی لە ژێر نووسرابوو، ببینێ، پێش ئەوەی لە نووسینەکانی سەر دیواری خەجاڵەت بێتەوە و بە شۆق و خۆشییەک کە نووری چاو دەتاسێنێ، تازە هاتوو بناسێتەوە، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک. میوان میلکیادێس بوو.

لەو کاتەدا کە گوندی ماکۆندۆ جێژنی بیرهاتنەوەی بیرەوەرییەکانیان دەگرت، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا و میلکیادێس تۆزێ هاوڕێیەتیی کۆنیان تەکاند. کابرای قەرەچ دەیەویست لەو شارەدا بمێنێتەوە. لە راستیدا بۆ سەفەری مەرگ چووبوو، بەڵام چونکە توانای تەنیایی نەبوو، لەو دونیا گەڕابۆوە. دەرکراوی تایفە بە هۆی پێوەندیی بە ژیانەوە، هەموو تایبەتمەندییەکانی سەرووی سروشتی خۆی لەدەست دابوو، ئیدی پەنای بۆ ئەو گۆشەی جیهان، کە هێشتا مردن رووی تێنەکردووە، هێنابوو. تا کاتی خۆی لە شوێنی تاقیکاریی وێنەگریدا بەرێتە سەرێ. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا هەرگیز لە بارەی ئەو داهێنانەوە شتێکی نەبیستبوو، بەڵام کاتێک وێنەی خۆی و هەموو بنەماڵەی بەڕوونی و بەجوانی لە سەر وەرەقەیەکی ئاسنی رەنگاورەنگ بینی، واقی ورما.ئەو وێنە زەردکراوە دەگەڕاوە بۆ زەمانێک کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا مووی ماش و برینجی هەڵکزاوی هەبوو و یەخەی کراسەکەی بە دوگمەیەکی مسی توند داخرابوو و حاڵەتێکی سەنگین و بەڕێزی تێکەڵاو بە سەرسووڕمانی هەبوو. ئۆرسۆلا لە پێکەنینان دڵی لە خۆ ببۆوە و ناوی نابوو ژێنەراڵی ترساو. لە راستیشدا لەو رۆژە ساف و هەتاوەی مانگی دیسامبەردا، کە دەزگای وێنەگرتن وێنەی ئەوی خستە سەر وەرەقەی ئاسنی، ترسابوو، چونکە وای بیر دەکردەوە خەڵک بەرە بەرە لە نێو دەچن و وێنەی ئەو لە سەر وەرەقە دەمێنێتەوە. لە سەر بنەمای حیکمەتی سەیری گۆڕانی رەوشت، ئەو جارەیان ئۆرسۆلا بوو کە ئەو فکرەی لە سەری ئەو بردە دەرێ، رابردووی تاڵی لەبیر بردەوە و قبووڵی کرد میلکیادێس لە ماڵیان بمێنێتەوە، هەرچەند هیچ کات رێگەی پێنەدان وێنەی لێ بگرن، چونکە (بە وتەی خۆی) پێی خۆش نەبوو ببێتە گەپجاڕی نەوەکانی. ئەو رۆژە جوانترین لیباسی لە بەر مناڵەکان کرد و

دەموچاوی رازاندەوە و هەر کامە کەوچکێکی شەربەتی کوولەکەی پێ خواردنەوە، هەتا بتوانێ دوو دەقیقە لە بەرامبەر ئەو دەزگا سەیرەی میلکیادێسدا بێ جووڵە راوەستن. لەو وێنە بنەماڵەییەدا تەنیا وێنەیەک کە مابوو، ئۆرلیانۆ لیباسێکی مەخمەری رەشی لەبەردا بوو و لە نێوان ئامارانتۆ و رێبێکا راوەستابو. نیگای قووڵ و خومار بوو، دروست وەک نیگایەک کە ساڵانی دوایی لە بەرامبەر دەستەی ئیعدامدا هەیبوو، بەڵام ئەو کات هێشتا داهاتووی خۆی پێشبینی نەکردبوو. زێڕنگەرێکی بەتوانا بوو، هەموو گوندەکانی دەوروبەری ناوچەی زەلْێ دەسکردی ئەویان پەسند دەکرد. لە کارگەکەدا کە (میلکیادێس)یش دەزگایەکی تاقیکاریی دانابوو، تەنانەت دەنگی هەناسەکێشانیش نەدەهات. دەتگوت گەڕاوەتەوە بۆ زەمانێکی دیکە.

باوکی و پیاوە قەرەچییەک پێشگۆییەکانی نوستراداموسیان بە دەنگی بەرز لێک دەدایەوە. دەنگی بوتڵ و سینییەکان دەهاتە بەرگوێ. ئەوەندەی هەڵدەنگووتن و ئەوەندەی ئانیشکیان لە یەک دەخشا، ئەسید و بریموری زیو لە هەموو شوێنێکی بڵاو ببۆوە. ئۆرلیانۆ، کە هەموو کاتی خۆی بە کارەوە دەبردە سەر و زۆر ورد بوو لە کارەکەیدا، لە ماوەیەکی کورتدا زۆرتری لە ئاوە نەباتەکانی ئۆرسوڵا بەدەست هێنا، بەڵام هەموویان سەریان سوورمابوو کە چۆنە لە ژیانی ئەو لاوە قەد و باڵا جوانەدا ژنێک نابینرێ – لە راستیشدا ژنێکی لەژیاندا نەبوو.

چەند مانگ دوایی، فرانسیسکۆی پیاو[^٨] گەڕایەوە، پیاوێکی بەساڵاچوو بوو کە دایم بە دەوری دونیادا دەگەڕا و دوو سەد ساڵێک لە تەمەنی تێدەپەڕی. زۆر کات کە بە ماکۆندۆدا رادەبرد، ئەو ئاهەنگانەی بۆخۆی سازی کردبوون لەو گوندەیدا وە بەرەوی دەخستن. فرانسیسکۆی پیاو، رووداوەکان و هەواڵەکانی نێوان شارەکانی رێگا، لە مانورەوە هەتا سنوورەکانی زەلێی بە گۆرانی دەوتەوە، بەو جۆرە ئەگەر کەسێک ویستبای پەیامێک یان هەواڵێک بڵاو بکاتەوە، دەیتوانی بە دوو پوولی رەش ئەو کارە بکا. لەو رێگایەوە بوو کە شەوێک ئۆرسوڵا بەو هیوایە کە هەواڵێکی

[^٨]: ٨– Francisco El Hombre

کوڕەکەی، خۆزێ ئارکادۆ ببیسێ، گوێی دابووە گۆرانیی ئەو و بە هەڵکەوت لە مردنی دایکی ئاگادار بوو. فرانسیسکوی پیاو، لە پێشبڕکێی شیعر و گۆرانی بێ بیرکردنەوە شەیتانیشی بڕ دابوو و، هەر بۆیەش ئەو ناوەیان لێنابوو. کەس ناوی راستەقینەی ئەوی نەدەزانی. لە زەمانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی بێ خەوی لە ماکۆندۆ خواکردی و شەوێک لە مەیخانەی کاتارینۆ پەیدا بوو. هەموو خەڵکی بۆ بیستنی هەواڵی جیهان و گۆرانیی ئەو رۆیشتنە ئەوێ. ژنێکیشی لەگەڵ هاتبوو کە لە بەر قەڵەوی چوار پیاوی سوورپێست بە سەر کورسییەکەوە وەک کەژاوە لە سەر شانیان دانابوو و دەیان هێنا و کچێکی جوانی دوورەگەش بە چەترێکی سێبەری لەسەر کردبوو. ئەو شەوە ئۆرلیانۆش بۆ مەیخانەی کاتارینۆ رۆیشت، فرانسیسکوی پیاو وەک مارمێلکەی مێشوولەخۆر لە نێو کۆمەڵێک خەڵکی تامەزرۆ دانیشتبوو. بە دەنگی پیر و گڕی خۆی هەواڵی دەگێڕانەوە. ئۆکۆردیۆنێکی کۆنەی لێدەدا کە سیروالتر رالی[9] لە گوایانا[10] پێیدابوو. بە پێ کوتەی قاچە گەورەکانی، کە هێندە بە سەر شۆرەکاتدا رۆیشتبوو قەڵش قەڵش ببوون و کەرووبان هێنابوو، ئاهەنگەکەی رێک دەهێنا. لەو سەری گوند، لە پێش دەرگای ژوورێک، کە هێندێک پیاو لە هاتووچۆ دابوون، ژنە قەڵەوەکە دانیشتبوو و لە بێدەنگیدا خۆی باوەشێن دەکرد. کاتارینۆ گوڵێکی سووری لبادی لە پشت گوێی چەقاندبوو و شەرابی نەیشەکەری دەفرۆشت و جار بە جاریش لە هەلێک کەڵکی وەردەگرت و لە پیاوان نزیک دەبۆوە و دەستی لە سەر شوێنێک دادەنان کە نەدەبوو داینابا.

لای نیوەشەو گەرما هێرشی هێنابوو. ئۆرلیانۆ هەتا ئاخر هەواڵەکانی گوێ دایە. شتێکی ئەوتۆی سەبارەت بە بنەماڵەی خۆیان نەبیست. خەریکی گەڕانەوە بوو بۆ ماڵەوە کە ژنە قەڵەوە بە ئاماژەی دەست بانگی کرد، پێیگوت: "تۆش برۆ ژوورەوە تەنیا بیست سینتا و خەرج هەڵدەگرێ."

ئۆرلیانۆ سکەیەکی خستە لوولەیەک کە خانم رەئیس لە نێو رانی گرتبوو و بێ ئەوەی بزانێ چی بەسەر دێ، رۆیشتەژوور. کچە دوورەگە جوانەکە کە

---

[9]- Air Walter Raleigh نەجیبزادەیەکی ئینگلیسی ١٥٥٤-١٦١٨ ـــو

[10]- Guayana

هێشتا مەمکی بەتەواوی خڕ نەببوون، وەک دیڵەسەگ بە رووتی لە جێگادا ڕاکشابوو. ئەو شەوە پێش ئۆرلیانۆش شێست و سێ پیاو هاتبوونە ئەو ژوورەوە. هەوای ژوورەکە بە نەفەس و ئارەق و هەناسە ئالوودە ببوو. کچۆڵە مەلافە تەڕەکەی کۆکردەوە و داوای لە ئۆرلیانۆ کرد سەرەکەی دیکەی بگرێ. مەلافە وەک پارچەی خوێ گران ببوو. رایان وەشاند هەتا هاتەوە سەر دەقی خۆی. دوشەکیان بەرەوپشت کرد ئارەق لەو دیوی دوشەک سەری هەڵدا. ئۆرلیانۆ دەیویست ئەو کارە هەرگیز کۆتایی نەیەت. ئەو داب و رەسمی ئەوینداریی دەزانی، بەڵام ئەژنۆی هێزیان لە بەر بڕابوو و نەیدەتوانی لە سەر پێ ڕاوەستێ. هەرچەند پێستی داگیرساوی لەشی وەک پێستی مریشک هەڵەژنابوو، بەڵام نەیدەتوانی لە بەرامبەر پێویستیی خاڵیکردنی باری موسوڵدانی تاقەت بێنێ. کاتێک کچە جوانە جێگاکەی ئامادە کرد و پێیگوت رووت بێتەوە، ئەو بە منگە وەڵامی دایەوە: "پێیانگوتم بێمە ژوورەوە، گوتیان بیست سینتا و لەو داخیلە باوێم و زوو کارەکەم بکەم." کچە شەرم و گێژیی ئەوی دەرک کرد. لە سەرەخۆ پێیگوت: "ئەگەر کاتێک چوویە دەرەوە و بیست سینتاوی دیکە بدەی، دەتوانی کەمێک زۆرتر لێرە بمێنیەوە." ئۆرلیانۆ رووت بۆوە. لە بەر ئەوە لای وابوو لەشی رووتی ئەو لەگەڵ لەشی رووتی براکەی بەرامبەری ناکا، شەرمی دەکرد. سەرەڕای ئەوە کچە یارمەتیی دەدا، بەڵام ئەو بێ تەفاوەت بوو و بە توندی هەستی بە تەنیایی دەکرد. بە دەنگێک کە وەک داوای لێبووردن بکا، وتی: "بیست سینتاوی دیکەش دەدەم." کچە لە بێدەنگیدا سوپاسی لێکرد. شوێنی برینێکی گەورە لە پشتی کچە دیار بوو. مورەکانی پشتی بە دەرەوە بوون و لە بەر ماندوویی هەناسەی بەزەحمەت بۆ دەهات. دوو ساڵ پێشتر لە شوێنێکی زۆر دوورتر لەو شوێنە، شەوێک بێ ئەوەی شەمەکەی بکوژێنێتەوە خەوی لێ کەوتبوو. کاتێک هەڵسابوو، ئاگر هەموو لایەکی داگرتبوو. ئەو ماڵەی کە لەگەڵ نەنکی، کە ئەوی گەورە کردبوو، تێیدا دەژیان سووتا و بوو بە خۆڵەمێش. لەو کاتەوە نەنکی لەو شارەوە بۆ ئەو شار دەیگێڕا و بە بیست سینتاو دەیهاویشتە باخەڵی ئەو و ئەو، هەتا پارەی ماڵە سووتاوەکەی دەربێنێتەوە.

کچە بە حیسابی خۆی دەبووایە دەساڵی دیکەش هەر شەوە لە باخەڵی حەفتا پیاودا بنووستبایە، هەتا، بێجگە لە دەرهێنانەوەی پووڵی خانووەکە، خەرجیی سەفەر و خواردن و مووچەی چوار پیاوە سوورپێستەکەشی پەیدا کردبا کە کورسیی نەنکیان لە سەر شان هەڵدەگرت. کاتێک خانم رەئیس بۆ جاری دووهەم لە دەرگای دا ئۆرلیانۆ بێ ئەوە کارێکی کردبێ، ژوورەکەی بەجێ هێشت. دەیەویست بگری.
ئەو شەوە خەوی لێ نەکەوت، بە هەستێکی دڵسۆزانەی تێکەڵاو لەگەڵ شەهوەت بیری لەو کچە دەکردەوە. دڵی دەیەویست خۆشی بوێ و پشتی بگرێ. بەرەبەیانی ماندوو لە تاو بێ خەوی، بە شێوەیەکی ئاسایی بڕیاری دا لەگەڵ کچە زەماوەند بکا، بۆ ئەوە هەم کچەی لە دەست نەنکی رزگار بکا و هەم هەر شەوەی بە قەدەر حەفتا پیاو ئەویندارییی لەگەڵ بکا. بەڵام کاتێک سەعات ١٠ی بەیانی رۆیشتە مەیخانەی کاتارینو کچە لە شار رۆیشتبوو.
تێپەڕینی زەمان لە بڕیاری شێتانەی کەم کردەوە، بەڵام لە بەرامبەردا خەمی ئەوی لەو خەیاڵەدا کە پیاو نەبێ، زۆرتر کرد. پەنای بۆ کار برد. قبووڵی کرد کە دەبێ هەموو تەمەنی بێ ژن بێ و، شەرمی بێ کەڵکی و بێ باری خۆی بشارێتەوە. لەو ماوەیەدا میلکیادێس هەرچی لە ماکۆندۆدا بۆ وێنەگرتن دەبوو، وێنەی لێ هەڵگرت و دووربینی وێنەگری خۆی دا بە خۆزێ ئارکادۆ بویندیا کە لە هەر چی پێی خۆشە وێنە هەڵبگرێ. ئەویش بۆ سەلماندنی بوونی خودا کەڵکی لێ وەرگرت. بەو وێنانەی کە لە بەشە جۆربەجۆرەکانی ماڵەوەی دەگرت، دڵنیا بوو کە درەنگ یا زوو دەتوانێ وێنەی خودا بگرێ و بیسەلمێنێ خوا هەیە یا نییە و جارێک بۆ هەمیشە گومان لە بوونیدا نەهێڵێتەوە. میلکیادێس لە جاران زۆرتر غەرقی موتاڵای نوستراداmووس ببوو. شەوانە هەتا درەنگانێک بەخەبەر بوو و پاشان لە لیباسە مەخمەرە پواو کاڵبووەکەیدا دەخەوت. بە دەستە بچکۆلەکانی کە لە باڵی پەرەسێلکە دەچوون و ئەنگوستیلەکانی بریسکەی جارانیان نەمابوو، شتانێکی دەنووسی. شەوێک بە خەیاڵیدا هات توانیوویەتی داهاتووی ماکۆندۆ پێشبینی بکا. ماکۆندۆ دەبوو بە شارێکی نوورانی و لە خانووە

جوانە بلوورینییەکانیدا ئاسەوارێک لە بنەماڵەی بویندیا نامێنێ. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بە هاوارەوە وتی: "لە پێشبینییەکەتدا هەڵەت کردووە. خانووەکان بلووری نین و هەروەک من لە خەوما دیتوومە لە سەهۆڵ دروست کراون و هەمیشەش کەسێک لە نەوەی بویندیا دەمێنێ هەتا سەدان و سەدان." ئۆرسۆلا هەموو هەوڵی خۆی بەکار دەهێنا، هەتا لەو ماڵە سەیرەدا، وەزعەکە ئاسایی رابگرێ. ئاوی نەباتسازیی پەرە پێدابوو و شتانێکی دیکەشی دروست دەکرد. ئاگردان بە درێژایی شەو دەگەڕا و بەیانی قەرتاڵە نان و هەمەجۆر شیرینی و بیسکویت لەو ماڵە دەچووە دەرێ و لە ماوەی چەند ساعەتدا لە جادە پێچ دەر پێچەکانی دێهاتی ناوچەی زەلێدا ون دەبوون.

گەیشتبووە تەمەنێک کە مافی حەسانەوەی هەبوو، بەوحاڵەشەوە زۆرتر لە هەموو کاتێک تێدەکۆشا. وەها غەرقی پەرەپێدانی تێکۆشانی خۆی بوو کە رۆژێکیان ئێوارە بە پەشۆکاوی سەرێکی بۆ لای حەوشە، کە ژنە سوورپێستەکە هەویری نانی شیرین دەکرد، هەڵبڕی، دوو کچی جوانی بینی کە گەیشتبوونە تەمەنی بڵووغ و لە رووناکایی پێش خۆرئاوابووندا گوڵدۆزییان دەکرد، رێبێکا و ئامارانتا بوون. هەر کە لیباسی پرسەیان لەبەر کردەوە، کە سێ ساڵ بوو بە خاتری مەرگی نەنکیان لە بەریان دابوو، لیباسی رەنگینی نوێیان لە بەر کرد، دەتگوت شوێنێکی تازەیان لە جیهاندا بۆ کردبوونەوە. رێبێکا بە پێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوانی دەکرا، لە ئامارانتا جوانتر بوو. پێستی سپی و چاوی گەورە و نیگای حەزاوی بوو. دەستە جادووییەکانی دەتگوت بە بەنی نادیار بە دوای گەلای گوڵدۆزیدا دەڕوا. ئامارانتای بچووکتر، زۆر جوان نەبوو، بەڵام رێز و پۆزێکی هەبوو کە لە نەنکییەوە بۆی بەمیرات بەجێ مابوو. بە بەراورد لەگەڵ ئەو دووانە، ئارکادیۆ کوڕێژگەیەک بوو، ئەگەرچی بەرە بەرە قەڵافەتی وەک قەڵافەتی باوکی دەچوو. لە ئۆرلیانۆ، کە خوێندن و نووسینی فێر کردبوو، زێڕنگەری فێر بوو، ئۆرسۆلا لەپڕ تێگەیی کە ماڵ پڕ بوو لە حەشیمەتە و منداڵان گەیشتبوونە قۆناخێک کە دەبێ زەماوەند بکەن و ببنە خاوەن منداڵ و بەزوویی لە بەر کەمبوونی جێگا و رێگا لێک بڵاو دەبن. پوولێکی کە بە

ســاڵان و رەنجێكــی زۆر كــۆی كردبــۆوە دەری هێنــا و قەرزەكــانی لە مشــتەرییەكان وەرگـرتەوە و بەرپرسـایەتیی گەورەكـردنەوەی مـاڵەوەی بە ئەســتۆ گـرت. دەســتووری دا ژوورێكــی میوانــان دروســت بــكەن لەگەڵ ژوورێكی دانیشتنی رەحەتی رێكوپێك بۆ رۆژانە، ژوورێكی نان خواردن بە مێزێكی دوازدە كەسییەوە، كە هەمـوو ئەندامانی بنەمـاڵە بە میوانەكانەوە لە دەوری دابنیشــن، نــۆ ژووری خەوتــن پەنجەرەكانیــان بە ســەر حەوشــەدا بڕوانــێ، هەیـوانێكی بڵێنـد كە بـاخچەی گـوڵی ســووری لە تـاوی هــاوینی دەپاراســت و نەردەیە كە بتـوانرێ گوڵـدانەكانی شـەمدانی لە ســەر دابنـرێ. ئاشپەزخانەشــیان گەورە كــردەوە و دوو ئاورگیــان لــێ دروســت كــرد. عەمبارەكەی پیلار تێرنێرا لەوێ بۆ خۆزێ ئاركـادۆ فاڵی دەگرتەوە خراپیان كرد و لە جێگای عەمبارێكی دوو بەرابەریان دروست كرد، كە ماڵ هیچكات ئازووقە و خواردەمەنیی لێ نەبڕێ. لە حەوشـە لە ژێر سێبەری داربەڕوو دوو حەمامیـان ســاز كـرد، یەک بـۆ ژنـان و یەک بـۆ پیـاوان. لە ســووچی ماڵەوە تەویلەیەک، كۆخە مریشكێک كە دەوران دەوریان سیمكێش كردبوو، شــوێنێک بــۆ مانگادۆشــین، هێلانەیەكــی چــوار لای ئــاواڵا بــۆ مەلانــی ســەرگەردان كە شــەوانە تێیـدا بحـاوێنەوە، دروسـت كـران. ئۆرسـۆلا، كە دەتگـوت بە تـاوتوێی شـێتی مێـردەكەی گیـرۆدە بـوو، بە كۆمەڵێـک بەنـاو دارتــاش كە بەدوایەوە بــوون، لای رووناكـایی و گەرمـای هەتـاوی دیـاری دەكرد و، بێ لەبەر چاوگرتنی سنوورێک مەودای ماڵەوەی دابەش دەكرد.

كۆشـكی سـەرەتایی، كە بە هـۆی دامەزرێنەرانـی گونـد دروسـت كرابوو، بە هـۆی كەرەســەی ســاختومانی و شــتومەكی بەننــایی و كرێكارانێـک كە لە ئـارەقەدا شــەلاڵ ببــوون جــمەی دەهــات. داوایــان لە هەمــوو لایەک دەكـرد بەردەســتیان نەگــرن و دەنگــی خــرتە و خــرمەی كیســە ئێســقانان شــێتی كردبوون. هیچ كەس باوەڕی نەدەكرد، كە چۆن لەو وەزعە تێكەڵ پێكەڵە و شلۆقەدا، لە نێو تۆزی قسڵ و بۆنی قیلدا، لە دڵی زەوی نەتەنیا گەورەترین خانووی گوند، بەڵكو رەحەتترین و فێنكترین خـانوو كە لە دێهـاتی نـاوچەی زەلێـدا هەبــوو ســەری هەڵـدا. تەنــانەت خــۆزێ ئاركــادۆ بوینـدیاش كە لە گەرمــاوگەرمی ئەو تــێكە و لــێكەدا هەمــوو هەســتی كەوتبــووە ســـەر

غافلگیرکردنی "هێزی خواوەند"، بەمەی نەزانی. دروستکردنی ماڵی تازە نزیکی تەواوبوون بوو کە ئۆرسۆلا ئەوی لە دنیای پووچ هێنا دەرێ، هەتا پێی بڵێ پێیان راگەیاندووە دەبێ ماڵەکەیان لە جیاتی رەنگی سپی، کە خۆیان حەزیان لێی بوو، رەنگی شینی لێ بدەن. نامەی وریاکردنەوەی رەسمی پێ نیشان دا. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بێ ئەوە لە وتەکانی ژنەکەی حاڵی بێ، چاوێکی لە ئیمزای نامەکە کرد و پرسی: "ئەو کابرایە کێیە؟"
ئۆرسۆلا بە ئارەحەتییەوە وەڵامی دایەوە: "رەئیسی شارەوانی، دەڵێن لە لایەن دەوڵەتەوە ئەو ری پێ دراوە."
(دۆن ئاپۆلینار مۆسکۆتە)ی[11] شارەوان، بە بێدەنگی هاتە ماکۆندۆ، چووە میوانخانەی یاقووب، میوانخانەی دروستکراوی ئەو عەرەبانەی کە بۆ یەکەمین جار هاتبوونە ئەوێ و خرت و پرتیان لەگەڵ تووتی دەگۆڕییەوە. بۆ سبەی بەیانی ژوورێکی چکۆڵەی لە نزیک ماڵی بویندیا، کە دەرگەی بە سەر شەقامدا دەکرایەوە، بەکرێ گرت. کورسی و مێزیکی کە لە یاقووب کڕیبووی، لە ژوورەکەی دانا. نیشانی کۆماری، کە لەگەڵ خۆی هێنابوو لە دیواریدا و لە دەرگای ژوورەکەی نووسی: شارەوان. هەوەڵین فەرمانی ئەوە بوو بە بۆنەی ساڵرۆژی سەربەخۆیی نەتەوەیی دەبێ خانووەکان رەنگی شینیان لێ بدرێ. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا روونووسی دەستوورەکەی هەڵگرت و چووە ژووری شارەوان، ئەو لەو ژوورە تەنگ و بچکۆڵەیەکدا لە جۆلانەدا خەریکی حەسانەوەی پاش نیوەڕۆ بوو. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا پرسی: "ئەوە تۆ نووسیوتە؟"
دۆن ئاپۆلینان مۆسکۆتە پیاوێکی بەساڵا دچوو و شەرمن و دەموچاو سوور و سپی بوو. وەڵامی دایەوە بەڵێ. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا پرسی: "بە چ مافێک؟" دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە لە ناو مجری مێزەکەی نامەیەکی دەرهێنا و نیشانی دا و وتی: "من بە شارەوانی ئێرە دیاری کراوم."
خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا تەنانەت چاویشی لە حوکمەکەی نەکرد.

[11]– Don ApolinarMoscote

لە سەرەخۆ وتی؛ "ئێمە لەو شارە بە کوتە کاغەزێک دەستووران نادەین، بۆ ئاگاداریت بۆ جاری هەوەڵ و ئاخیر بێت دەڵێم ئێمە لێرە قازیمان ناوێ، چونکە هیچ شتێک پێویستی بە دادگا و قەزاوەت نییە."
لە بەرامبەر هێمنیی دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە، بێ ئەوەی دەنگ هەڵبڕێ، بە کورتی باسی ئەوەی کرد چۆنیان گوند دروست کردووە، چۆنیان زەوی و زار دابەش کردووە، چۆنیان جادە و شەقام ساز کردووە، بێ ئەوەی گیروگرفتێک بۆ دەوڵەت پێک بێنن یان دەوڵەت تەگەرە بخاتە رێگەیان، چۆن بەرە بەرە وەزعی شاریان بە پێی پیویست پەرە پێداوە، وتی: "ئێمە بە جۆرێک لە ئاشتی و ئارامیدا دەژین کە تا ئێستا کەسێک بە مردنی سروشتییش نەمردووە، هەروەک دەبینی هێشتا قەبرستانمان نییە." لەوە کە دەوڵەت یارمەتییەکی نەدابوون شکایەتیان نەبوو، بەپێچەوانە، لەوە کە وازی لێ هێنابوون لە ئاشتی و خۆشیدا بژین، رازی بوون و هیوادار بوون لە داهاتووشدا دەوڵەت دەستیان لە کۆڵ کاتەوە. ئەوان ئەو گوندەیان بۆ ئەوە دروست نەکردبوو کە یەکەمین کەسێکی پێ دەنێتە ئەوێ، فەرمانیان بە سەردا لێ بدا، دەبێ چ بکەن و چ نەکەن. دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە پانتۆڵێکی سپی کەتانی لە بەردابوو، بێ ئەوەی رەفتاری بگۆڕێ، کەوا سپییەکەی پۆشی.
خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وتەی خۆی بەو جۆرە کۆتایی پێهێنا: "کەوابوو ئەگەر دەتەوێ وەک دانیشتووانی ئاسایی لێرە بژی، قەدەمت لە سەر چاوان، بەڵام ئەگەر هاتووی شلۆقکاری بکەی و خەڵکی ناچار بکەی رەنگی شین لە خانووەکانیان بدەن، باشترە کەرەسە و شتوومەک و سیپاڵانت هەڵگری و لەو رێگایەوە هاتووی تەشریف بەری، چونکە رەنگی خانووی من دەبێ وەک کۆتری سپی بێ."
دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە رەنگی بە رووانەوە نەما، هەنگاوێک گەڕاوە دواوە و هەر وا کە ددانی لە سیرەوە دەبرد، وتی: "پێت رادەگەیەنم کە من چەکدارم."
خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا نەیزانی چۆن دەستەکانی هێز و توانای لاوییەتیان هاتەوە بەر. وەک ئەو کاتەی ئەسپی لە زەوی دەدان، یەخەی دۆن ئاپۆلینار

مۆسکوتەی گرت و هەتا راست بەراستی چاوانی بڵیندی کرد و وتی: "ئەو کارە بۆیە دەکەم پێم باشترە لەشی زیندووت هەڵگرم هەتا ئەوەی وەباڵی مردنت هەتا ئاخری تەمەنم بە کۆڵمەوە بێ."
بەم شێوەیە بردییە سەر جادە و کاتێک گەیشتە نێوەڕاستی شەقامی زەلێ، لە زەوی دانا. هەفتەیەک دواتر ئەو بە شەش سەربازی پاپەتی و رووتەڵە و تفەنگ بەشان و، عارەبانەیەکی کەلان کە ژن و حەوت کچەکەی سوار ببوون، گەڕایەوە.
دوو عارەبانەی دیکە دوایە هاتن و کەلوپەلی ماڵەوەیان هێنا. مناڵەکانی لە میوانخانەی یاقووب دانا و خۆی بە دوای خانوویەک کەوت و بە پشتیوانی سەربازەکان دیسان دەفتەری دانایەوە.
دامەزرێنەرانی ماکۆندۆ، کە لە سەر دەرکردنیان سوور بوون، لەگەڵ کوڕە گەورەکانیان چوونە لای خوزێ ئەرکادۆ بوێندیا و ئامادەگیی خۆیان دەربڕی، بەڵام ئەو دژی دەرکردنی ئەو بنەماڵەیە بوو. بۆی روون کردنەوە، راستە دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە لەگەڵ ژن و کچانی گەڕاوەتەوە، بەڵام سووکایەتی پێکردنی لە بەر چاوی ژن و منداڵیدا دوور لە پیاوەتییە، لە بەر ئەوە لێبڕا مەسەلەکە بە ئاشتی جێبەجێ بکا.
ئۆرلیانۆ لەگەڵی رۆیشت. ئەو کات سمێڵێکی رەش و چەخماخیی هێشتبۆوە. هەوای دەنگی ئەوەندە پتەو بوو، بە کاری رۆژی شەڕ دەهات. بێ چەک و بێ ئەوەی گوێ بدەنە پاسەوانان، وەژوور دەفتەری شارەوان کەوتن. دۆن ئاپۆلینار هەروا لە سەرەخۆ بوو، دوو دانە لە کچەکانی کە لەو دەمدا لەوێ بوون، پێی ناساندن: ئامپارو[12] و شازدە ساڵە سەوزەروو وەک دایکی و، رێمیدیوس[13] کە لە نۆ ساڵ تێنەدەپەڕی، کچۆڵەیەکی یەکجار جوان، پێستی ئاڵ و چاوی سەوز. هەر دوو کچ جوان و بەئەدەب بوون، هەر کە ئەو دوو پیاوە هاتنە ژووری، پێش ئەوەی بە مانیان بناسێنن، کورسییان بۆ هێنان، بەڵام پیاوەکان هەروا بە پێوە راوەستان.

---

[12]- Amparo

[13]- Remedios

خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وتی: "زۆر باشە هاوڕێ، ئەتۆ لێرە دەمێنیتەوە نەک لە بەر ئەوە ئەو چەتە چەکدارانەت لەگەڵ خۆت هێناوە، بەڵکو تەنیا بە خاتری ژن و کچەکانت."
دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە نارەحەت ببوو، بەلام خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا مۆڵەتی نەدا وەلام بداتەوە و لێی زیاد کرد؛ "تەنیا بە دوو مەرج، یەکیان ئەوە هەر کەس هەر رەنگێکی پێ جوانە خانووی خۆی پێ رەنگ دەکا، دووهەم ئەوە سەربازەکانت بێ سێ و دوو دەبێ لێرە بڕۆن. نیگەرانی نەزمی گشتیش مەبە، نەزم بە عۆدەی ئێمە." شارەوان دەستی راستی بۆ سەرەوە هەڵبڕی.

- قەولی شەرەف؟

خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وتی: "قەولی دوژمن." و بە ناخۆشی وتی: "دەبێ ئەوەش بڵێم من و تۆ هەروەک جاران دوژمنی یەک دەمێنینەوە."
سەربازەکان هەر ئەو رۆژە پاش نیوەڕۆ، رۆیشتن، چەند رۆژ دواتر خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا خانوویەکی بۆ ماڵی شارەوان پەیدا کرد. ئاشتی و هێمنی جارێکی دیکە بۆ هەموو لایەک گەڕایەوە، بێجگە لە ئۆرلیانۆ. دیمەنی ریمیدیوس کچە چکۆلەی شارەوان، کە بە کچی ئەو دەشیا، لە شوێنێکی لەشیدا مابۆوە و ژانی دەکرد- دەردێکی ئەوتۆ کە لە کاتی رێگە رۆیشتندا نارەحەتی دەکرد، وەکو پلووکەبەردی نێوکەوش.

ماڵە تازەکە وەک کۆتری سپی بوو، بە کۆڕێکی هەلپەڕکێ کرایەوە. ئۆرسوڵا لە پاش نیوەڕۆی ئەو رۆژە کە تێگەیشتبوو، ریبێکا و ئامارانتا جحێل بوون، لە بیر پێکهێنانی کۆڕێکی هەلپەڕکێدا بوو و، لە راستیشدا دەتوانین بڵێین هۆی بنەڕەتی دەستتێوەردان و گەورەکردنەوەی خانووش هەر بۆ ئەوە بوو کە کچەکان بۆ بانگهێشتنی دۆستەکانیان شوێنێکی شیاو و ئابروومەندیان هەبێ. بۆ ئەوەی لە کۆڕی هەڵپەڕکی شتێکیان کەم نەبێ، وەک کەنیزان خۆی شەکەت کرد هەتا قورەکاری لە کاتی خۆیدا تەواو بێ. کەرەسەی زینەتی و گرانبایی و مێز و کورسیی بە دروستکردن دا، لەگەڵ داهێنانێکی کەم وێنە کە ببێتە هۆی سەرسوورمانی خەڵکی ئاوایی و شادیی

لاوەکان: پیانۆلا. بەشەکانیان بە جیا جیا لە چەند سندووقدا هێنا، لەگەڵ مۆبلی دروسکراوی ڤینتا و کریستالی بوهوم و سرویسی نان خواردنی دروستکراوی شیرکەتەکانی سووریپێستانی ئەمریکای ناوەندی روومێزی گرانقیمەتی هولەندی و چرا و شەمەدان و پەردەی قیمەتی لە بەر دەرگای ماڵ بەتاڵ کران. کارخانەی ناردنی پیانۆلا پسپۆرێکی ئیتالیایی بە ناوی پیترۆ کریسپی بە خەرجی خۆی ناردبوو پیانۆلای وار بکا و کۆکی کا و کڕیارەکان بۆ لێدانی رابێنێ و هەڵپەرکێی بە مۆدی رۆژ کە لە شەش لوولدا راگیرابوون، فێری ئەوان بکا.
پیترۆ کرێسپی گەنج و قژزەرد بوو، پیاوی وا جوان و بە ئەدەب هەتا ئەو کاتەی لە ماکۆندۆ نەدیترابوو. بەجۆرێک بە لیباس پۆشینەوە بە خەم و وەسواس بوو، بە گەرمای هاوین بە جلیقەی دەستچن و کۆتی ئەستوور کاری دەکرد. شەلاڵی ئارەقە، لە کاتێکدا دەیویست لە نێوان خۆی و خاوەنانی ماڵەکەدا پەرژین و نێوانێک هەبێ، بە شۆقێکی زۆرەوە وەک شۆقی ئۆرلیانۆ لە زێرنگەریدا خەریکی کار بوو و چەند حەتوو لە سالۆنی ماڵەوە دەرنەکەوت. رۆژێکیان بەیانی بێ ئەوەی دەرگا بکاتەوە و بێ ئەوە کەس بۆ بینینی ئەو سەمەرە (معجزە) بانگ کا، یەکەم لوولەی ئاهەنگی خستە نێو پیانۆلا.
دەنگی چەکوچکاریی گوێ رووشێن و دەنگی یەکبینی دارتاش لە ماڵەوە کۆتایی هات و نەوای ڕێکوپێک و خۆشی مۆسیقا جێگای گرتەوە. هەموو رایانکردە سالۆن. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا دەتگوت کارەبا گرتوویە، حەپەسابوو نەک لە بەر خاتری دەنگی خۆشی ئاهەنگەکە، بەڵکو لە بەر خودکاربوونی پیانۆلاکە، دووربینی وێنەگری میلکیادێسی هێنا، بەڵکو بتوانێ لەو موسیقاژەنە نادیارە وێنە بگرێ. ئەو رۆژە لاوە ئیتالیاییەکە، کە لەگەڵ ئەوان نیوەڕۆیانی خوارد، ڕێبێکا و ئامارانتا کە خواردنیان بۆ سەر مێز دەهێنا، لە بەکار هێنانی کێرد و چەنگاڵ بە هۆی ئەو لاوە جوان چاکە دەست سپی و بێ ئەنگوستیلەیە تاسابوون. لە ژووری دانیشتن بە تەنیشت سالۆنێوە پیترۆ کرێسپی بە کەڵکوەرگرتن لە نەرمەئاهەنگێک لە ژێر چاوەدێری بەئەدەبانەی ئۆرسۆلادا بێ ئەوەی دەستی کچەکان بگرێ، فێری

هەڵپەڕکێی کردن. ئۆرسوڵا لە هەموو ئەو ماوەیەیدا کە کچەکانی فێری هەڵپەڕکێ دەبوون، بۆ دەمێک ژوورەکەی بەجێ نەهێشت. پیترۆ کرێسپی شەڵواری تەنگ و چەسپان و کەوشی هەڵپەڕکێی دەبەر دەکرد.خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بە ژنەکەی دەگوت: "پێویست نییە هێندە نیگەران بی، ئەو کوڕە منالێکی پرچنە." بەو حالەش ئۆرسوڵا هەتا راهێنانی هەڵپەڕکێ تەواو نەبوو و، لاوە ئیتالییەکە ئەوێی بەجێ نەهێشت وازی لە چاوەدێری نەهێنا. ئەو جار دەستیان بە ئامادەکاریی جێژن کرد. ئۆرسوڵا بەوردی ریزی ئەو کەسانەی کە دەبوایە بانگ بکرێن ئامادە کرد. میوانەکان بریتی بوون لە دامەزرێنەرانی شار، بێجگە لە بنەماڵەی پیلار تێرنێرا کە هەتا ئەودەم دوو منالی دیکەشی لە دوو پیاوی نەناسراو ببوون، میوانەکان هەموویان لە پیاوماقوولانی شار بوون، بەلام دۆستایەتی و هاورێییش لە هەڵبژاردنیاندا بێ شوێن نەبوو، چونکە نەتەنیا دۆستانی قەدیمی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا کە لەگەڵ ئەو هاتبوونە ئەوێ و شاریان دروست کردبوو، کور و نەوەکانیشیان، کە لە منالییەوە لەگەڵ ئۆرلیانۆ و ئارکادیۆ دۆست بوون، بانگکرابوون. کچەکانیان تەنیا ئەوانە هاتبوون کە هاتووچۆی ماڵە ئەوانیان دەکرد و لەگەڵ ریبێکا و ئامارانتا گوڵدۆزییان دەکرد. دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە، کە ئێستا تەنیا دوو پاسەوانی چەکدار بە دارەدەستی لە بەر دەرگا بوو، نەخشی رازاندنەوەی کۆڕانی هەبوو. کچەکانی بۆ یارمەتی خەرجی ماڵەوە بەرگدروویان دانابوو و، هەر لەوێش بێجگە لە دروستکردنی گوڵی دەستی و شیرنیپەزی، نامەی ئاشقانەشیان بە پارە بۆ خەڵک دەنووسی. بەوحالەشەوە، هەرچەند کچانی لە سەرەخۆ و کاری و لە کچە جوانەکانی شار دەژمێردران و لە هەڵپەڕکێکانی نوێشدا شارەزاییان هەبوو، بۆ ئەو کۆڕی هەڵپەڕێیە بانگ نەکران. هەر لەو کاتەدا ئۆرسوڵا و کچەکانی شتومەکیان لە سندووقان دەرهێنا و زیوەکانیان خاوێن کردەوەو و تابلۆی رازاوە بە وێنەی کچی جوان لە نێو لۆتکەی پڕ لە گوڵی سووریان لە دیواران دەکوتا، هەتا گیانێکی تازە بە بەر ئەو شوێنە رووت و تازەسازانەدا بکەن، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە گەڕان بە دوای خوا و وێنە لێهەڵگرتنیدەستی هەڵگرت و ئیتر سەلماندبووی خوانییە. ئەو جار بە دوای

ئاشـــکراکردنی نهێنیـــی پیـــانۆلا کەوت. دوو ڕۆژ پـــێش جەژن لە نێـــوان چەکوچکارییەکاندا، کلیلی پیانۆلای هەڵڕشتنەدەریێ و سیمەکانی کە لە لایەک دەی بەستنەوە، لە لای دیکە دەکرانەوە گیری کردبوو، سـەرەنجام بە هەر جۆر بـوو ئـامیری موسـیقای جارێکی دیکە خسـتەوە سـەریەک. مـاڵ هـیچ کاتێک بەو جۆرە بڵاو و تێکەڵ و پێکەڵ نەبوو. بەوحاڵەش چرا نەوتییەکـان لە کـات و سـەعاتی خۆیانـدا هەڵکـران و دەرگـا بـۆ میوانـان کـرایەوە. مـاڵ هێشتا بۆنە زامووسـکە و قسـڵی لێدەهات. منـال و نەوەکانی دامەزرێنەرانی شـــار، دوای تەماشـــای هەیـــوانی پـــڕ لە گـــوڵی شـــەمدانی و "بگۆنیـــا" و ژوورەکـانی بێدەنگ و ئـارام و بـاخی پڕ لە بـنەی گوڵەسـوورە، لە ژووری میوانـــان لە دەوری ئەو داهێنـــانە نەناســـیاوە کە بە پـــارچەیەکی ســـپی داپۆشـرابوو، کۆبـوونەوە. کەسـانێک کە لە دێهـاتی نـاوچەی زەلـیێ پیانۆیـان دیبوو، لە دیتنی پیـانۆلا هێندێک سـەریان سـوورما، بەڵام حـاڵی ئۆرسـۆلا لە هەموویـان خراپتـر بـوو. چـونکە کاتێـک لـوولەی موسـیقایان هاویشـتە نێـو دەزگـــاکەوە، هەتـــا ڕێبێکـــا و ئامارانتـــا هەڵـــپەڕن، دەزگـــا کـــاری نەکـــرد. میلکیـادێس کە لەو کـاتەدا بە تەواوی پیـر و دەکـریێ بلێین کـوێریش ببـوو، هەموو زانستی خۆی کە زەمانی نەدەناسی، بەکار هێنا بەڵکو بتوانیێ چاکی کاتەوە. سەرەنجام خۆزیێ ئەرکادۆ بوێندیا **بە** هەڵە شتێکی لە شـوێنی خـۆی تەکان دا، دەنگی موسیقا لە دەزگا بەرز بۆوە. پێشـەکی وەک تەقینەوەیەک و بە دواییدا بە نـۆتی تێکەڵـوپێکەڵ. چەکوچەکـان بەو سـیمانەوە کە بە بـیێ نەزم لە نێو دەزگاکەدا لێک ئاڵابوون، بیێ کۆک دەستیان بە لێدان کرد، بەڵام منداڵانی بزۆزی بیست و یەک بنەماڵەی نەترس، کە بۆ گەیشتن بە دەریـا بە کێواندا بەرەو ڕۆژاوا هاتبوون، بیێ لەبەر چاوگرتنی ئەو ئاهەنگە بـیێ کـۆک و دوور لە نۆتە، ڕۆژ هەڵپەڕین.

پیترۆکرێسـپی بـۆ چـاککردنەوەی پیـانۆلا گەڕایەوە. ڕێبێکـا و ئامارانتـا بـۆ ڕێکوپێـک کردنـــی ســـیمەکان یارمەتییـــان دا. هەرســـێکیان بە بیســـتنی ئەو ئاهەنگانە کە نۆتەکانیان تێکەڵ ببوو، قاقا پێکەنین. لاوێژگە هێندە میهرەبـان و ئەوەنـدە ڕەفتـاری بەئەدەبـانەی هەبـوو، ئۆرسـۆلا دەسـتی لە چـاوەدێری کێشـایەوە. شـەوی پێش ڕۆیشتنی، بۆ خواحافیزی میوانداریێەکی بچکۆڵەیـان

بۆ ساز کرد. لاوی ئیتالیایی بە ئاهەنگی پیانۆلای چاککراوە، لەگەڵ ڕێبێکا زۆر جوان هەڵپەڕی. ئامارانتا و ئارکادیش لەگەڵ ئەوان هاوکارییان دەکرد، بەڵام کۆڕی هەڵپەڕکێ تێکچوو، چونکە پیلار تێرنێرا، کە لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە لە بەر دەرگا کۆ ببوونەوە، لەگەڵ ژنێک بەشەڕ هات و کار گەیشتە گەزتن و پرچ ڕاکێشان، چونکە ژنە وێرابووی بڵێ سمتی ئارکادیۆ وەک سمتی ژنان دەچێ.
نزیکی نیوەشەوێ، پیترۆکریسپی پاش وتارێکی کورت و شاعیرانە لەوێ ڕۆیشت و قەولی دا بەزوویی بگەڕێتەوە. ڕێبێکا هەتا بەر دەرگای لەگەڵ ڕۆیشت و دوای داخستنی دەرگا و کوژاندنەوەی چراکان چووە
ژوورەکەی خۆی و گریا. شیوەن و گریانی هەتا چەند ڕۆژ بێ پسانەوە درێژەی کێشا، تەنانەت ئامارانتاش لە هۆی گریانی نەگەیشت، گۆشەگیری ئەویش شتێکی تازە نەبوو. هەرچەند بە ڕواڵەت میهرەبان و خۆشحاڵ بوو، بەڵام لە ناوەوە گۆشەگیر و پرێسکەی دڵی نەدەکردەوە. کچێکی بەکجار چەلەنگ و جوانی لێ دەرچووبوو، ئەندامی ڕێک و پتەوی هەبوو. بەو حاڵەش هێشتا لە سەر ئەو کورسییە ڕاحەتییە دادەنیشت کە لەگەڵ خۆی هێنابوویە ئەوێ. چەند جار کورسییان چاک کردبووەوە، بەڵام سەردەستەکانی بەتەواوی تێکچووبوون. هیچ کەس نەیزانیبوو ڕێبێکا بەو تەمەن و ساڵەوە قامک مژینی تەرک نەکردووە. هەر کە هەلی بەدەست هێنابا، دەچووە ئاودەست و دەرگای لە سەر خۆی دادەخست، شەوانەش کە دەچووە نێو جێگا، عادەتی کردبوو ڕوو لە دیوا بکا. لە پاش نیوەڕۆیانی بارانیدا کە لەگەڵ دۆستەکانی لە هەیوان دادەنیشتن و گوڵدۆزییان دەکرد، لە پڕ قسەی خۆی لە بیر دەچۆوە و بە دیتنی گڵی تەڕ و ئەو تەرەخۆڵانەی کرمان لە باخچە هەڵیاندابۆوە، لە دڵتەنگی فرمێسکی دەهاتە خوارێ و زاری سوێر دەکرد. ئەو مەزە نهێنییە کە لە پێشوودا لە بەر ئاوی پرتەقاڵ و ڕێواسی تاڵ بەزیبوو، کاتێک دەگریا توندتر هێرشی دەکردە سەر. جارێکی دیکەش گڵخۆریی دەست پێ کردووە. جاری یەکەم کە بۆ کوڵینەوە گڵی خوارد، دڵنیا بوو ئەو تامە ناخۆشە دەبێتە باشترین چاری ئەو وازوازییە. لە ڕاستیدا نەیتوانی تامی گڵ لە دەمیدا هەڵگرێ، بەڵام نیگەرانی ڕۆژ بە ڕۆژ

بە سـەریدا زاڵ بـوو و، بەرەبەرە ئیشـتیای قەدیمـی، بە مەودای کـانی و ڕازیبوون بە خواردنی بنەڕەتی و سـەرەتایی بەشـەری، کراوە. لەو کاتەدا کە دۆسـتەکانی فێـری گوڵـدۆزی زۆر گـران دەکـرد و بە هەسـتێکی پـڕ لە خۆیش و ئیشتیا باسی ئەو پیاوانەی دەکرد کە شیاوی ئەوە نەبوون کەس بە خاتری ئەوان گەچی دیوار بخوا، گیرفانی پڕ دەکردن لە گڵ و دوور لە چاوی خەڵک وردە وردە دەیخوارد. تەنیا پیاوێک کە نرخی مستە گڵەکانی ئەوی هەبێ، نزیکتر و راستتری دەنواند، هەروەک ئەو زەوییەی کە ئەو بە چەکمەی چەرمی بریقەدار، لە گۆشەیەکی دیکەی جیهاندا بە سـەریدا دەڕوا، گرانایی و گەرمایی خوێنی بەتامی کانی (معدنی) دەگۆڕێتەوە، کە لە دەمیدا تامێکی توندوتیژ و لە دڵیدا ئاسوودەیی بەجێ دێڵێ. پاش نیوەڕۆی رۆژێک لە رۆژان ئامپارۆ مۆسکوتە، بێ پێشـەکی ئیجـازەی خواسـت خـانووی تـازە ببینـێ. ئامارانتـا و ڕێبێکـا کە لەو دیـدارە چـاوەڕواننەکراوە نـیگەران بـوون، زۆر بەرەسمی وەریانگرت. ماڵی تازەیـان پێشـان دا، ئـاڵقە موسـیقایان بـۆ لە نێـو پیـانۆلا دانـا و بە بیسـکویت و مرەبـای پرتەقـاڵ میوانـدارییان لێکـرد. ئامپـارۆ ئەوەنـدە بەئەدەب خـۆی نیشـان دا، ئۆرسـۆلا کە جارجـار دەهـاتە ژووری، خۆشحاڵ بوو. دوای دوو سەعاتان قسەیان لێ بڕابوو، ئامپارۆ لە دەمێک حەواس پەرتی ئامارانتا کەڵکی وەرگرت و نامەیەکی دا بە ڕێبێکا. لە سەرەوەی نامە بەو مەرەکەبە سەوزەی کە وشەی جوانی دەستووری کار پیـانۆلای پـێ نووسـرابۆوە، رسـتەی، بگـا بە دەسـتی بەڕێـز ڕێبێکـا خـانمی بویندیا،

دەبینرا. ڕێبێکا بە سـەری قامکـان نـامەکەی قەد کرد و خسـتییە نێو سـینگی و، چـاوێکی پـڕ لە حەقناسـی و پەیمـانێکی بێـدەنگی دۆسـتایەتی لە ئامپـارۆ مۆسکوتە کرد.

دۆسـتایەتی لەپـڕی نێـوان ئامپـارۆ مۆسـکوتە و ڕێبێکـا بویـندیا، جـارێکی دیـکەش ئۆرلیـانۆی هیـودار کـرد. بەڵام بیـرەوەرییەک هەروا ئـازاری دەدا. هەر چەنـد هەلێـک هەڵنەکەوتبـوو ڕێمیدیۆسـی بچکـۆڵە ببینن، کاتێک لەگەڵ هاوڕێکــانی مــاگنی فیکۆویســـباڵ و خرینیلـــدۆمارکیز لە شـــار دەگەڕا، بە نیگەرانییەوە چاوی دەبڕییە بەرگدرووەکەیان (خیاط خـانە) بـۆ دیتنـی، تەنیـا

خوشکە گەورەکانی دەدیتن. هاتنی ئامپارۆ مۆسکوتە بۆماڵیان وەک ترساندنێک بوو. ئۆرلیانۆ بە ئەسپایی بەخۆی دەگوت: "دەبێ لەگەڵ خۆی بێنێ، دەبێ ئەو بێتە ئێرە." هێندە ئەو رستەیەی لە قووڵایی دڵەوە دووپاتکردەوە کە رۆژێکیان پاش نیوەڕۆ لە کارگەی زێرنگەریدا خەریکی دروستکردنی ماسییەکی زێڕ بوو، دڵنیا بوو کە کیژۆڵە وەڵامی داوەتەوە. لە راستیدا پاش دەمێک دەنگی مناڵانەی ئەوی بە گوێ گەیشت. دڵی لە ترسان راوەستا، سەری هەڵێنا و کچەی لە پێش دەرکی کارگای دیت کە کراسێکی ئاڵی پۆشیوە و پۆتینی سپی لە پێ دایە.

ئامپارۆ مۆسکوتە لە پێش دەرگای ماڵەوە پێیگوت: "رێمیدیۆس مەچۆ ژوورەوە خەریکن کار دەکەن." بەڵام ئۆرلیانۆ مۆڵەتی نەدا بە قسەی بکا، ماسییە زێرە بچکۆڵانەکەی، کە لە دەمەوە بە زنجیرێک هەڵواسرابوو، پێشان دا و وتی: "وەرە."

رێمیدیۆس نزیک بۆوە و سەبارەت بە ماسییە بچکۆڵەکە هێندێک پرسیاری کرد. بەڵام ئۆرلیانۆ نەیتوانی وەڵامی بداتەوە، چونکە لەپڕ تووشی هێرشی ئاسم ببوو. بە دڵ دەیەویست هەتا هەتایە لە لای ئەو پێستە ئاڵ و چاو کەژاڵە و ئەو دەنگە، کە بە هەر پرسیارێک بەو رێزە کە بۆ باوکی دادەنا پێی دەوت ئاغا، بمێنێتەوە. میلکیادێس لە گۆشەیەک لە پشت مێزی نووسین دانیشتبوو بە نیشانە شتانێکی دەنووسی کە کەس سەری لێ دەرنەدەچوو.

ئۆرلیانۆ هەستی کرد لێی بێزارە، تەنیا ئەوەندەی توانی بە رێمیدیۆس بڵێ کە ئەو ماسییەی دەداتێ و منداڵەکە لەو بەڵێنییە وەها ترسا کە بە پەلە لە کارگە رۆیشتە دەرەوە. ئەو رۆژە دوای نیوەڕۆ، ئۆرلیانۆ سەبرێکی کە لە چاوەڕوانیی ئەودا کردبووی لە دەستیدا و، چەند جار بێ ئیختیار و شێتانە بانگی کرد، بەڵام رێمیدیۆس وەڵامی نەداوە،. بە دوایدا چوو بۆ بەرگدرووی خوشکەکانی و لە پشت دیواری ماڵیان و دەفتەری باوکی بە دوایدا گەڕا، بەڵام هەوڵەکانی بەهەدەرچوون وتەنیا لە خەیاڵ و تەنیاییە ئازاربەخشەکەی خۆیدا وێنەی ئەوی دەهاتە بەرچاو،ئیدی ، لەگەڵ ڕیبیکا ،چەندین سەعات گوێیان لە مۆسیقای پیانۆلاکە دەگرت. ڕیبیکا بەو مۆسیقایە لاوە ئیتالییەکەی وەبیردەهاتەوە کە فێرە سەمای کردبوو و

.ئۆرلیانۆس چونکە هەمووشتێک، تەنانەت مۆسیقاس،ڕیمیدیۆسی بەبیر دەهێناوە.
ماڵ پڕ بوو لە ئەوین. ئۆرلیانۆ ئەوینی خۆی لە شیعرانێکدا کە نە سەری هەبوو نە بن، دەوتەوە. لە سەر ئەو پارچە پێستانە کە میلکیادێس دابوویە و، لە سەر دیواری ئاودەست و لە سەر پێستی دەستی خۆی شیعری دەنووسی. ڕێمیدیۆس لەو شیعرانەدا شکڵی دەگۆڕا: ڕێمیدیۆس لە داهێنراوی دووی پاش نیوەڕۆدا ڕێمیدیۆس لە هەناسەی ئارامی گوڵە سووراندا، ڕێمیدیۆس لە بەدزی چوونی دارە بیدا، ڕێمیدیۆس لە عەتری نانی بەیانیان، ڕێمیدیۆس لە هەموو شوێنێ، ڕێمیدیۆس هەتا ئەبەد، ڕێبێکا سەعات چواری پاش نیوەڕۆ لە بەر پەنجەرە گودۆزی دەکرد و چاوەڕوانی ئەوین بوو. پەستری پۆست هەر پازدە ڕۆژان جارێک بەوێدا رادەبرد، بەڵام ئەو بەو هیوایە کە ڕەنگە جارێک بە هەڵە ڕۆژێکی دیکە بە وێدا رابرێ، چاوەڕوانی دەکرد. دروست پێچەوانەی چاوەڕوانیی ئەو رووی دا ئێستری پۆستی لە ڕۆژی دیاریکراودا نەهات. ڕێبێکا شێت و ناهومێد نیوەشەو لە جێگای خۆی هەڵسا و بە ئیشتیایەکی مرۆکوژ مست مست گڵی باخچەی وەزاری کرد و خواردی. لە تاوی دەرد و ڕەنج فرمێسکی دەهاتنە خوار. کرمەکانی نێو گڵی دەجوو و سەدەفی شەیتانۆکانی بە ددان دەشکاندن. هەتا ڕۆژ ڕشایەوە، نۆبەتێدار و بێحاڵ لە هۆش چوو و دڵی لە ورێنەی بێ شەرمدا کرایەوە. ئۆرسوڵا کە لەو ورێنەدا بەتوندی هەستی بە بێ ئابروویی دەکرد، قفڵی سندووقەکەی ئەوی شکاند و لە نێو سندووقەکەدا شازدە نامەی بۆنداری دیتەوە کە لە نێو دەسماڵێکی چێرەییدا پێچرابوون، لەگەڵ چەند پەڵک و پەڵکەگوڵی وشک لە نێو لاپەڕەی کتێبە کۆنەکان دا و کۆمەڵێک پەپوولەی وشک کە دەستی پێیان کەوت ورد بوون و لە نێو چوون.
ئۆرلیانۆ تەنیا کەسێک بوو کە وەزعی ڕێبێکای دەرک دەکرد. ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆ، کاتێک ئۆرسۆلا تێدەکۆشا ڕێبێکا لەو ورێنە وێژییە رزگار بکا، ئەو لەگەڵ ماگنیفیکۆ وێسباڵ و خرینیلدۆ مارکیز چوونە مەیخانەی

کاتاریبۆ. مەیخانە بە هێندێک ژووری دار گەورە کرابۆوە. ژنانی بێ مێرد لەوێ دەژیان کە بۆنی گوڵی سیس بوویان لێ دەهات.
دەستەی موسیقا بە ئۆکۆردیۆن و تەپڵ ئاهەنگەکانی فرانسیسکۆی پیاوی لێ دەدا، کە لەمێژ ساڵ بوو لە ماکۆندۆ رۆیشتبوو. سێ هاوڕێ شەرابی نەیشەکەریان خواردەوە. مسگنیفیکۆ و خرینیلدۆ، کە هاوتەمەنی ئۆرلیانۆ بوون، لەو کارانەدا لەو شارەزاتر بوون، ژنانیان لە سەر کۆشی خۆیان دادەنا و شەرابیان دەخواردەوە. یەکێک لە ژنەکان کە چرچ و لۆچ ببوو و ددانی زێڕی هەبوو، دەستی بە سەروچاوی ئۆرلیانۆدا هێنا، ئەو هەموو لەشی وەلەرزین کەوت و ژنەی وەلانا. بۆی دەرکەوت کە هەرچی زۆرتر لەو شەرابە دەخواتەوە زۆرتر دەکەوێتە بیری رێمیدیۆس، بەڵام رەنجی بیرەوەری باشتر دەتوانێ بکێشێ. نەیزانی چۆنی بوو، تەنیا لە یەک ئاندا هەستی کرد لە نێو ئاوکەوتووە. دۆستەکانی بینی لەگەڵ ژنەکان لە نێو نوورێکی ئابرووبەرانەدا بێ قەبارە و بێ قورسایی مەلە دەکەن و وشانێک دەڵێن کە لە نێو دەمیان نایەتە دەرێ ا ئاماژانێک دەدەن کە لەگەڵ حاڵەتی دەموچاویان جیاوازیی هەیە. کاتارینۆ دەستی لە سەر شانی دانا و پێیگوت: "سەعات بۆتە یازدە." ئۆرلیانۆ سەری هەڵێنا و دەموچاوی گەورە و گۆڕاوی ئەوی دیت کە گوڵێکی دەسکردی لە بنانگوێ داوە. ئەو کاتی بێهۆش کەوت، تەواو وەک دەورەی نەخۆشیی فەرامۆشی و، جارێکی دیکە لە سیحرێکی سەرسووڕهێنەردا و لە ژوورێکی نەناسیاودا هۆشی هاتەوەبەر. پیلار تێرنێرا کە تەنیا شۆرتێکی دەبەردا بوو لەوێ راوەستابوو و پرچی بە دەوری شانیدا بڵاو کردبۆوە و چرایەکی بۆ چاولێکردنی ئەو هەڵێنابوو – لە سەیران واقی وڕمابوو.
_ ئۆرلیانۆ!
ئۆرلیانۆ پێی لە جێگا قایم کرد و سەری هەڵێنا. نەیدەزانی چۆن گەیشتۆتە ئەوێ، بەڵام مەبەستی خۆی دەزانی، چونکە لە منالییەوە لە گۆشەیەکی دوورکەوتووی دڵی خۆیدا شاردبوویەوە.
وتی: "هاتووم، لە باوەشی تۆدا بنووم."

جلەکانی قوڕاوی و بە ڕشانەوە پیس ببوو. پیلار تێرانێرا، کە ئەو دەم لەگەڵ دوو منداڵی بچکۆڵەی خۆی بەتەنیا دەژیا، هیچ لێی نەپرسی. بردییە نێو جێگا، دەموچاوی بە پارچەیەکی تەڕ خاوێن کردەوە و لیباسەکانی لە بەر داکەند و خۆشی رووت کردەوە و کوللەی خەوتنەکەی داداوە، هەتا ئەگەر منداڵەکانی بەخەبەر هاتن نەیبینن. لە چاوەڕوانیی پیاوێک کە لە لای بمێنێتەوە، لەو پیاوانەی کە ئەویان بە جێ هێشتبوو، پیاوانێکی بێ ژمار کە لە فاڵی وەرەقدا ماڵی ئەویان بزر کردبوو – ماندوو ببوو. لەو چاوەڕوانییەدا پێستی لەشی چرچ ببوو، مەمکی داچۆڕابوون و بڵێسەی دڵی دامرکابوو. لە تاریکاندا بە دوای ئۆرلیانۆدا گەڕا، دەستی خستە سەر زگی و بە خۆشەویستییەکی دایکانە گەردنی ماچ کرد. بە نارە نار وتی: "منداڵە هەژارەکەی من!." ئۆرلیانۆ لەرزی. بە لێزانییەکی ئارام و بێ خەتا، کۆمەڵە خەمەکانی ڕەواندەوە و ڕێمیدیۆسی چاو پێکەوت کە بۆتە زلێکی بێ سەروبن و بۆنی جانەوەری خاو و پارچەی تازە ئوتوکراو دەدا.
کاتێک هۆشی هاتەوە بەر، دەگریا، سەرەتا گریانێکی پچڕپچڕ و بێ ئیرادە و دوایی هەڵیڕشت و دڵی خۆی خاڵی کرد. هەستی کرد شتێکی بەژان و هەڵمساو لە وجوودیدا تەقیوە. ژنە، چاوەڕوان بە سەری پەنجان سەری بۆ دەخوراند و سەرەنجام لەشی ئۆرلیانۆ لە شەڕی ئەو شلەتێنە پڕ ڕەنگە کە ژیانی لێ تاڵ کردبوو، رزگاری هات. پیلار تێرانێرا لێی پرسی: "کێیە؟" ئۆرلیانۆ ماجەراکەی پێگوت. ژنە قاقایەکی کێشا کە زەمانێک کۆتری هەڵدەفڕاندن، بەڵام ئێستا تەنانەت منداڵەکانیشی لە خەو هەڵنەستاند. بە گاڵتەوە وتی: "لە پێشدا دەبێ گەورەی بکەی." بەڵام ئۆرلیانۆ بەو گاڵتەیەی زانی کە ژنە تێگەیشتووە، کاتێک لە ژوورەکە چووە دەرەوە، گومانی ئەوە کە پیاوە یان پیاونییە و ئەو سەنگینییە تاڵە کە چەند مانگ بوو لە دڵی خۆیدا ڕایگرتبوو، بەجێی هێشت. پیلار تێرنێرا بە دڵەوە قەولی پێدابوو کە: "لەگەڵ کچەی دەدوێم، دەبینی چۆن بە دوو دەستان لە نێو سینیدا پێشکەشت دەکەم."
لە کاتێکی نالەباردا وەفای بە قەولەکەی خۆی کرد، چونکە ماڵەوەیان هێمنایەتیی پێشووی خۆی لە دەست دابوو. ئامرانتا، کە لە ئەوینی ڕێبێکا

تێگەیشت، چونکە شاردنەوەی بەو هاوار هاوارەی کە ئەو دەیکرد ئیمکانی نەبوو، نۆبەتێیەکی توند دایگرت. ئەویش لە تەنیاییدا عاشق ببوو. دەرگای ئاودەستی لە سەر خۆی دادەخست و بە نووسینی نامەی پڕ سۆز و ئاگرین، کە لە نێو سندووقدا دەیشاردەوە، رەنجی ئەوینی ناهومێدانەی خۆی هەڵدەرشت. ئۆرسۆلا نەیدەزانی چۆن لەو دوو کچە نەخۆشە چاوەدێری بکا. بە پرسیارە یەک لە دوای یەکەکانی هۆی نەخۆشیی ئامارانتای بۆ روون نەبۆوە. سەرەنجام لە کاتێکا وەک پێی بڵێن دەرگای سندووقی ئامارانتای شکاند و ئەو نامانەی دۆزییەوە کە لە نێو سەرپێچێکی چێرەیی رەنگەوە پێچرابوون، نووسراوانێک کە بە گەڵای گوڵی یاس و فرمێسکی چاو ئەستوور ببوون، بۆ پیرتۆکرێسی نووسرابوون، بەڵام نەیناردبوون. ئۆرسۆلا کە لە داخان دەگریا، لەعنەتی بۆ ئەو رۆژە دەنارد کە بیری کرینی پیانۆلا لە سەری دابوو، دەرسی گوڵدۆزی قەدەغە کرد و شێوەیەک پرسەی بێ مردووی دەمەزراند، کە هەتا کچەکانی دەست لەو هیوا بێهوودەیە نەکێشنەوە درێژەی دەبێ. بەریڤانی خۆزێ ئارکادۆ بوینندیاش کە بیروباوەڕی پێشووی خۆی سەبارەت بە پیترۆکرێسپی گۆڕیبوو و لێزانیی ئەوی لە مێکانیکی موسیقادا ستایش دەکرد بێ فایدە بوو. بۆیە کاتێک پیلار تێرنێرا ئۆرلیانۆی ئاگادار کردەوە ریمیدیۆس ئامادەیە زەماوەندی دەگەڵ بکا، تێگەیشت کە ئەو هەواڵە لەو وەزعەدا رەنجی دایک و باوکی دوو بەرامبەر دەکا، بەوحاڵەش هەنگاوی بۆ پێشەوە نا. لە کۆبوونەوەیەکی رەسمی لە ژووری میوانان، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا و ئۆرسۆلا بێ ئەوە چاو بتروکێنن گوێیان بۆ قسەی کوڕەکەیان راگرت.
خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بە بیستنی ناوی گراوی کوڕەکەی لە شەرمان سوور هەڵگەڕا. بە تووڕەییەوە نەراندی: "ئەوین وەک تاعوون وایە. بەوهەموو کچە چەلەنگ و بەناوبانگانە کە بە دەورووبەرتەوە هەن، تەنیا شتێک کە بە مێشکتدا هاتووە زەماوەند لەگەڵ کچی دوژمنی ئێمەیە!."
ئۆرسۆلا لەگەڵ هەڵبژاردنەکەی موافیق بوو. خۆشەویستی خۆی سەبارەت بە کچەکانی بنەماڵەی مۆسکوتە بە خاتری جوانی و کارزانی و خۆبەکەم گری و ئەدەب نیشان دا و ئافەرینی بە هەڵبژاردەی کورەکەی وت. خۆزێ

ئەرکادۆ بویندیا شادی ژنەکەی کاری تێکرد و بەڵام مەرجێکی دانا. ریبێکا لەگەڵ پیترۆکریێسپی زەماوەندی دەکرد (لەگەڵ ئەو زەماوەندە موافیق بوو)، ئۆرسۆلا هەر کە هەلی بۆ هەڵکەوتایە، ئامارانتای دەناردە ناوەندی ئوستان بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکی دیکە پێوەندی بگرێ و هیوای ئەو ئەوینەی لە سەر بچێتە دەرێ. ریبێکا هەر کە ئەو بڕیارەی بیست، دەردی لێ بڕا. نامەیەکی سەرتاپا خۆشحاڵیی بۆ دۆستەکەی نووسی و رازی بوونی دایک و باوکی پێراگەیاند. نامەکەی بۆخۆی و بە بی یارمەتیی کەسێکی دیکە پۆست کرد. ئامارانتا وای پێشان دا کە ئەو وەزعەی قبووڵ کردووە و بەرەبەرە ئەویش تایەکەی چاک بوو، بەڵام بەڵێنی بە خۆی دا ریبێکا تەنیا کاتێک زەماوەند بکا کە بە سەر لاشەی ئەودا تێپەڕێ.

شەممەی حەتووی داهاتوو، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا کۆت و شەڵوارە رەشەکانی دەبەر کرد. کراسی یەخەئاهاری پۆشی، چەمە قایشەکانی کە شەوی جێژن بۆ یەکەم جار دەپێی کردبوون، هەڵێکێشان و بۆ خوازبێنی ریمیدیۆس مۆسکوتە رۆیشت. شارەوان و خێزانی بە رووخۆشی بەخێر هاتنیان کرد و هەر لەو کاتەشدا لەو هاتنە چاوەڕوان نەکراوەش نیگەران بوون. بەڵام دوایی کاتێک کە لە هۆی هاتنی ئاگادار بوون، گومانیان لەوەدا نەما کە ناوی کچەی لێ گۆڕاوە، ژنی شارەوان بۆ سەلماندنی ئەو هەڵەیە ریمیدیۆسی لە خەو هەستاند و بە باوەش هێنای بۆ ژووری میوانان. هێشتا خەواڵوو بوو، لێیان پرسی ئایا بەراستی بڕیاری داوە زەماوەند بکا، ئەو بە گریان وەڵامی دایەوە کە تەنیا دەیهەوێ لێی گەڕێن بنوێ. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا کە هەستی بە نیگەرانی و ئاڵۆزیی بنەماڵەی مۆسکوتە کردبوو، بۆ روونکردنەوەی مەسەلەکە گەڕایەوە لای ئۆرلیانۆ و پرسیاری لێکرد. کاتێک جارێکی دیکە گەرایەوە بۆ ئەوێ، ژن ومێردی مۆسکوتە لیباسی میوانیان دەبەر کردبوو و شوێنی موبڵەکانیان گۆڕیبوو و گوڵی تازەیان لە نێو گوڵدانا دانابوو و لەگەڵ کچە گەورەکان چاوەڕوانی ئەویان دەکرد. خۆزێ ئارکادۆ بویندیاش کە هەم لەو رووداوە و هەروەها لە دەست یەخەی ئاهاری تاسابوو، دووپاتیکردەوە کە ئەو کچەی کورەکەی دڵی پێوەیە ریمیدیۆسە، دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە لەوپەڕی حەبەساندا وتی: "چۆن! ئێمە

شەش کچی دیکەمان هەیە، هەموویان بێ مێردن و لە تەمەنی مێردکردن دان، هەموویان شیاوی هاوسەری لاوانێکی کۆشا و زیرەکی وەک کوڕی تۆن و ئۆرلیتۆ[٤] هەر چاوی لەو یەکەیە کە ئێستاش جێگاکەی خۆی تەڕ دەکا." ژنەکەی کە هێشتا پشتی چاوی ئاوسابوو، مێردەکەی بە خاتری ئەو قسە لە روو بوونە سەرزەنشت کرد.
لە دوای خواردنەوەی پیاڵەیەک ئاوی میوە، بە خۆشییەوە خوازبێنی ئۆرلیانۆ قبوول کرا. تەنیا خانمی مۆسکوتە بە پاڕانەوە داوای کرد لە چاوپێکەوتنێکی تایبەتدا لەگەڵ ئۆرسۆلا قسە بکا. ئۆرسۆلا، کە ئارا و قاراوی لێ هەڵگیرابوو، نارەزایی دەربڕی بۆچی تێکەڵی ئەو کارانەی دەکەن کە پێوەندیی بە پیاوانەوە هەیە. سبەی بەیانی ئەو رۆژە بە نارەحەتی و، هەر لەو کاتەشدا بە شۆق و زۆقەوە رۆیشتەماڵیان. نیو سەعات دواتر گەرایەوە و رایگەیاند کە رێمیدیۆس هێشتا عەزەب نەبووە، ئەو پێشهاتە بۆ ئۆرلیانۆ هێندە کۆسپێکی گەورە نەبوو، ئەو هەمووە سەبری کردبوو، ئێستاش دەیتوانی ئەوەندە چاوەڕوان بێ هەتا دەسگیرانەکەی عەزەب دەبێ.
ژیانیان کە دیسان هاتبۆوە سەر دۆخی ئاسایی، تەنیا بە مردنی میلکیادێس تێکچوو. پێشبینی ئەوەیان دەکرد بمرێ، بەڵام نەوەک لەو کات و ساتەدا چەند مانگ دوای گەڕانەوەی بۆ ئەوێ وەها بەخێرایی پیر ببوو، وەک ئەو لاشە مردووانە دەهاتە بەرچاو کە لە ژووراندا دەگەڕێن و پێیان بە دوای خۆیاندا رادەکێشن و بە دەنگی بەرز رۆژانی خۆشی رابردوو یاد دەکەنەوە، لەو پیرانە کە کەس پێیان راناگا و بیریان لێ ناکەنەوە رۆژێک لاشەیان لە جێگا و باندا دەدۆزنەوە. سەرەتاکان خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە خۆشیی دووربینی تازەداهاتووی وێنەگری و لێکدانەوەی نوستراداموس نەختێکی پێراگەیشت، بەڵام بەرە بەرە بەتەنیایی وێڵی کرد، چونکە پێوەندیی لەگەڵ ئەو زۆر دژوار ببوو. کەم کەم هێزی بیستن و دیتنی لە دەست دەدا و دەوروبەری خۆی لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە پێش پەیدابوونی بەشەر دەیناسین، لێ تێک دەچوو. بە زمانێکی سەیر دەیدواندن. کوێرە کوێرە بە

[٤]– Aurelito – کورتکراوەی خۆمانی ئائۆرلیتۆیە – و

رێگادا دەڕۆیشت، بەو حاڵەش بە چاکی بە نێو شتاندا تێدەپەڕی، هەر دەتگوت خۆی شتەکانی لەوێ داناون. تاخمی ددانەکەی، کە لە سەرووی جێگاکەی لە نێو پەرداخێک ئاوی دەهاویشت، لە دەمی بنێتەوە، ئیتر نەیخستەوە دەمی. کاتێک ئۆرسۆلا لێبڕا خانووەکە گەورە بکاتەوە، لە تەنیشت کارگای ئۆرلیانۆ و دوور لە دەنگەدەنگ و هاتووچۆی ماڵەوە ژوورێکیان بۆ دروست کرد، بە پەنجەرەی گەورە و رووناک و قەفەزی کتێبخانەوە، کە ئۆرسۆلا خۆی کتێببەبە تۆز و خۆڵاوی و مۆریانەخواردووەکانی، لەگەڵ کاغەزە ناسک و پەرتووکەکانی، کە شتی بێ مانایان لە سەر نووسرابوو، بۆی لە قەوەزە خستن. لیوانی ددانە دروستکرداوەکەشی لە سەر قەوەزە دانا. لە نێو پەرداخەکەدا گیایەکی ئاوی گەورە ببوو و گوڵی زەردی بچکۆڵانەی دەرکردبوو. بە رواڵەت میلکیادێس لە ژوورە تازەکەی خۆی رازی و خۆشحاڵ بوو، چونکە لەوە بەدواوە تەنانەت کەس لە ژووری نانی نیوەڕۆیش نەیبینی. تەنیا دەچووە کارگای ئۆرلیانۆ و بە سەعات لەوێ دادەنیشت و لە سەر ئەو پارچە پێستانە کە لەگەڵ خۆی هێنابوونی و وەک نانەڕەقە خرتە خرتیان دەکرد، شتانێکی سەیر و سەمەرەی دەنووسی.

ئەو خواردنەی کە ویسیتاسیۆن رۆژێ دوو جار بۆی دەبرد، هەر لەوێ دەیخوارد، دوابیەکان ئیشتیای نەمابوو تەنیا سەوزی دەخوارد. زۆری نەخایاند کە حاڵەتی تایبەتیی کەسانی گیاخۆری بە خۆیەوە گرت و لەشی بە کەڕوویەکی نەرم و وەک کەڕووی لیباسەکانی، کە هەرگیز لە بەری نەدەکرد، داپۆشرا. نەفەس کێشانی وەک نەفەسی جانەوەری خەوتوو بۆگەن بوو. ئۆرلیانۆ، کە لە شاعیریدا غەرق ببوو. ئەوی لە بیر چۆوە، بەڵام جارێکیان وای بۆ دەرکەوت شتێک لە قسە سەیر و غەریبەکانی میلکیادێس تێدەگا، بەو مەبەستە گوێی دایە. لە راستیشدا ئەوەی کە لە نێو وشە نەزانراوەکانیدا فام دەکرا، دووپاتکردنەوە وشەی -Eqvinox

Eqvinox° و نـاوی ئەلێکسـاندر فـین هۆمبۆڵـد بـوو. ئارکـادیۆ کاتێـک لە کارەکانی زێڕنگەریدا یارمەتیی ئۆرلیانۆی دەکرد لە مێلکیادێس نزیک بۆوە. میلکیادێسیش وەڵامـی ئەو نزیکایەتیەی بە وتنـی چەنـد رستەی نەزانـراوی ئیسپانیۆلی دەدایەوە. بەوحاڵە رۆژێکیان پاش نیوەڕۆ دەتگوت بە شۆقێکی ناگەهـان گەشـایەوە. چەنـدین سـاڵ دواتـر، کاتێـک ئارکـادیۆ لە بەرامبەر دەستەی گوللەبـاران وێستابوو، مچوورکێکی بیرکەوتەوە کە رۆژێکیـان لە کـاتی گوێـدان بە چەنـد وەرەق لە نووسـراوە بـێ ماناکـانی میلکیـادێس بە لەشیدا هـاتبوو. ئەو شتێکیان لێ تێنەگەیشتبوو، بەڵام بیسـتنی ئەو رستانە کە بە دەنگی بەرز دەگوتران وەک سروودی مەزهەبی دەچوون. ئەو کات مێلکیـادێس دوای زۆر مـاوە زەردەخەیەکـی هـاتێ و بە ئیسـپانیۆلی وتـی: "کاتێ مردم، سێ رۆژان لە ژوورەکەمدا جیوە بسـووتێنن." ئارکادیۆ ئەوەی بە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وت، ئەویش ویستی لەو بارەوە زانیـاریی وردتر بزانـێ، بەڵام لە وەڵامـدا تەنیـا ئەو رسـتەیەی بیسـت: "مـن گەیشـتوومە جاویدانی" کاتێ هەناسـەی مێلکیـادێس بـڕی گرت، ئارکـادیۆ بەیـانی رۆژانـی پێنج شـەممە ئەوی دەبردە رووبـار بـۆ شوشـتن، وا دەرکەوت حـاڵی چاکتر بووبێ، خۆی رووت دەکردەوە و لەگەڵ کوڕان دەڕۆیشتە نێو ئاو. غەریزە ڕێنـوێنیی ئەوی دەکـرد و پێشـی ئەوەی دەگـرت بـۆ لای قووڵایی و شـوێنی مەترسیدار بڕوا. جارێکیان وتی: "ئێمە خۆمـان لە ئاو دروست کراوین." بە ناهومێدی هەوڵی دەدا پیانۆلاکە چاک کاتەوە، هەر جارە کە لەگەڵ ئارکـادیۆ دەڕۆیشـتە چەم، لفکەیەکـی کەدوو و قـالبە سـابوونێکی دارەخورمـای لە خـاولییەکەوە دەپێچا و وەبن هەنگڵی دەدا. رۆژی پێنجشـەممە بەیـانییەکەی پێش ئەوە بۆ ڕۆیشتنی چۆم ئاگاداری بکەن، ئۆرلیـانۆ لێـی بیسـت کە دەڵـێ: "من لە کەنارەکانی سەنگاپوور بە گرانەتا مردووم!" ئەو رۆژەیان لە لایەکـی مەترسیدارەوە رۆیشتە نێو چەمەکە."

---

°-Eqvinox دەورەیەک لە ساڵ کە شەو و رۆژ لە هەموو جیهاندا بەرامبەرن (هەوەڵی خاکەلێوە و هەوەڵی رەزبەر)

هەتا بەیانی ڕۆژی دوایی نەیاندۆزییەوە، چەند کیلۆمیترێک خوارتر، لە سەری پێچێک، ئاو لاشەی فڕێ دابۆوە دەرەوە و داڵاشێک لە سەر زگی هەڵنیشتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئۆرسوڵا بە تەوندی ناڕازی بوو و، هەر چۆن بۆ باوکی دەگریا بە خەم و پەژارەوە بۆ ئەویش فرمێسکی هەڵدەوەراند، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا دژی گۆڕکردنی بوو ئەیوت: "ئەو جاویدانییە و بۆخۆی ڕازی هەستانەوەی ئاشکرا کردووە." کوورەی لەبیرکراوی جارێکی دیکە هێنادەرێ. لە نزیک لاشەکە، مەنجەڵێکی جیوەی لە سەر کووره دانا. هەروا کە جیوە دەکوڵی لاشە بە بلش و کەفەڵۆکی شین دادەپۆشرا. دۆن ئاپۆلینار بە پارێزەوە پێی دەگوت کە لاشەی خنکاو بۆ تەندروستیی گشتی مەترسیی هەیە. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وەڵامی دایەوە؛ "بە هیچ جۆر وانییە، ئەو ماوە و مەترسینییە." حەفتاو دوو سەعاتان لە تەنیشت لاشەکە جیوەی سووتاند. لاشە بەرەشهەڵگەڕاوی لە بەریەک هەڵوەشا و دەنگی تەقینەوەی بڵقەکان، وەک هەڵمی تاعوون ماڵەوەی داگرتبوو. ئەو کات ئیجازەی بە خاک سپاردنی دا، بەڵام نەوەک بە شێوەی ئاسایی، بەڵکو بە ڕێز و شکۆیەکەوە کە شیاوی پیاوچاکترین پیاوی ماکۆندۆ بوو. یەکەم بەڕێکردنی جەنازە بۆ سەر قەبران بوو، تەواوی خەڵک بەشدارییان کرد تەنیا سەدساڵ دواتر کەرنەڤاڵی پرسەی دایەگەورە لە باری گرنگی و زۆریی خەڵکەوە لەویان لەپێشتر بوو. لە نێوەڕاستی ئەو زەوییە بەخاکیان سپار کە بۆ گۆڕستان لە بەر چاویان گرتبوو. لە سەر قەبرەکەی تەنیا شتێک کە لەویان دەزانی نووسییان: "مێلکیادێس." بۆ شەویش پرسەیان بۆ دانا. لە نێو ئەو خەڵکە کە لە حەوشە کۆ ببوونەوە و قاوەیان دەخوارەوە و داستانیان دەگێڕایەوە و قوماری وەرەقیان دەکرد، ئامارانتا دەرفەتی هێنا وئەوینی خۆی بە پیترۆکرێسپی ڕاگەیاند. پیترۆکرێسپی چەند حەفتە پێشتر بەڕەسمی لەگەڵ ڕێبێکا ببوونە دەسگیران و خەریکی دانانی دوکانێکی کەرەسەی موسیقا و ئەسبابی گەمەی قورمیشی لە گەڕەکی عەرەبان بوو. کە زەمانێک سات و سەودایان لەگەڵ دەکردن و ئێستا لەوێ نیشتەجێ بوون. خەڵک بەو گەڕەکەیان دەگوت گەڕەکی "تورکان". لاوی ئیتالیای کە کاکۆڵی فێرفێڕی، ژنانی وەهەناسە

هەڵکێشان دەخست، ئامارانتای بە کچێکی بیانووگیر و نەحاواوە دەزانی کە نرخی ئەوەی نییە هەستەکانی بەجیددی بگیرێن، وتی: "من برایەکی چکۆڵەترم هەیە کە قەرارە بێ و لە کاری دوکاندا یارمەتیم بکا."
ئامارانتا بەتوندی هەستی بە سەرشۆڕی کرد، بە تووڕەیییەکی زۆرەوە بە پیترۆکرێسپیی گوت هەرچۆنێکی بێ پێشی زەماوەندی ئەو لەگەڵ خوشکی دەگرێ، تەنانەت ئەگەر بەر دەرگای بە لاشەی خۆی بگرێ. لاوی ئیتالیایی وەها لە هەڕەشەی ئەو ترسا کە خۆی پێ ڕانەگیرا و ڕووداوەکەی لەگەڵ ڕێبێکا باس کرد. بەوجۆرە سەفەری ئامارانتا کە بە هۆی گرفتاریی ئۆرسۆلا هەر دواکەوتبوو. لە کەمتر لە حەفتەیەکدا ڕێک خرا. ئامارانتا ناڕەزایی دەرنەبڕی، تەنیا کە کاتێک بۆ خواحافیزی ڕێبێکای ماچ کرد، بە ئەسپایی بە گوێیدا چرپاند: "زۆر هیوادار مەبە، تەنانەت ئەگەر من بۆ ئەوسەری دونیاش بنێرن، زەماوەندی تۆ هەر تێک دەدەم. تەنانەت ئەگەر ناچار بم تۆش دەکوژم."
بە نەبوونی ئۆرسۆلا و بوونی نادیاری مێلکیادێس کە بە دزییەوە لە ژوورەکاندا دەگەڕا، ماڵ یەکجار زۆر گەورە و خاڵی دەهاتە بەرچاو. پێڕاگەیشتنی ماڵەوە خرابووە ئەستۆی ڕێبێکا. ژنە سوورپێستەکە ئاشپەزی دەکرد. لای ئێواران کە پیترۆکرێسپی بە بۆنی عەترێکی بۆنخۆش دەگەڕایەوە ماڵەوە، هەمیشە یارییەکی بەدیاری بۆ دەسگیرانی دەهێنا. ڕێبێکا لە ژووری میوانان پێشوازیی لێدەکرد و بۆ ئەوەی کەس گومانیان لێ نەکا دەرگا و پەنجەرەی ژوورەکانی لە سەر پشت ئاوەڵا دەکرد. ئەو خۆپارێزییە زۆر پێویست نەبوو، چونکە لاوی ئیتالیایی نیشانی دابوو کە پیاوێکی بەڕێزە و ئیجازە بە خۆی نادا دەستی ژنێک بگرێ کە کەمتر لە ساڵێکی دیکە دەبێتە هاوسەری. چاوپێکەوتنەکانی ئەو بەرەبەرە ماڵەکەی پڕ کرد لە کەرەسەی گەمەی سەیر و جۆربەجۆر. بیجبیجە خانمی قەرەچ، قدووی موسیقا و مەیموونی ئاکرۆبات و ئەسپی قورمیشی کە وێرغەیان دەکرد، و لۆتی چەقۆی کە تەپڵیان لێدەدا. نمایشگای بەرز و جوانی میکانیکی پیترۆکرێسپی، خەمی مەرگی مێلکیادێسی لە بیر خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بردەوە و جارێکی دیکەش گەڕایەوە سەر دەورانی کۆنی

کیمیاگەری. ئۆرلیانۆش کارگای خۆی جێ هێشتبوو و کاتی خۆی بۆ فێرکردنی نووسین و خوێندنی ڕێمیدیۆسی بچکۆلە تەرخان کردبوو. کیژۆڵە لە پێشدا بووکەڵەکانی لەو پیاوە، کە هەموو ڕۆژێ پاش نیوەڕۆیان دەهاتە ماڵیان، خۆشتر دەویست. کاتێک پیاوەکە دەهات، نەیاندەهێشت یاری بکا، دەیانشۆرد و لیباسیان دەبەر دەکرد لە ساڵۆن دایاندەنا. سەرەنجام سەبر و خۆڕاگریی ئۆرلیانۆ سەرکەوت، بە جۆرێک کە ڕێمیدیۆس بە درێژایی چەند سەعات لە لای ئەو دەمایەوە و مانای وشەکانی ئەلف و بێی لێ دەپرسییەوە و بە قەڵەمی ڕەنگی لە دەفتەرچەی وێنەگری ئەو کایانەی دەکێشایەوە کە لە مێرگان خەریکی لەوەڕ بوون و، ئەو ڕۆژە خڕانە کە تیشکیان لە پشت کێوان ئاوا دەبوون.

تەنیا ڕێبێکا لە هەڕەشەی ئامارانتا هەستی بە بەدبەختی دەکرد. شارەزای خوو و خۆبەزلزانی خوشکەکەی بوو و لەو بارەوە لە رک و قینی ئەو دەترسا. بە سەعات دەرگای ئاودەستی لە سەر خۆی دادەخست و ئەنگوستی خۆی دەمژت و هەموو ئیرادەی خۆی بەکار دەهێنا خۆ لە گڵ خواردن بپارێزێ. بە خاتری لەنێو بردنی نیگەرانی خۆی، پیلار تێرنێرای ئاگادار کرد فاڵی وەرەقی بۆ بگرێتەوە.

دوای سەرەتای هەمیشەیی فاڵ گرتنەوە، پیلار تێرانێرا وتی: "هەتا کاتێک دایک و باوکت نەنێژی، خۆشبەخت نابی."

ڕێبێکا لەرزی، دەتگوت لە بیرەوەری خەوێکی دوورەدەستدا، خۆی لە کاتی منداڵیدا دیوەتەوە، بە جانتایێک و کورسییەکی راحەتی و کیسەیەک، کە هەرگیز نەیزانیبوو چی تێدا، هاتبووە ئەو ماڵە. ئاغایەکی بیر کەوتەوە کە سەرێکی تاسی هەبوو، لیباسی کەتانی دەبەردا بوو و یەخەی کراسەکەی بە دوگمەی زێڕ داخرابوو، بەڵام ئەو پیاوە بە هیچ جۆر وەک شای دڵ نەدەچوو. ژنێکی گەنجی زۆر جوانی بیر کەوتەوە کە بە دەستی نیوەگەرمی بۆنداری کە بە هیچ جۆر وەکو دەستی لەڕی بی بی خشت نەدەچوو، گوڵی لە سەری ئەو دەدا، هەتا پاش نیوەڕۆیە لە گوندێک بیباتە گەڕانێ کە شەقامەکانی سەوز بوون.

وتی: "تێناگەم."

پیلار تێرنێراش کە حەواسی پەرت بوو، وتی: "منیش تێناگەم، بەڵام وەرەقەکان ئەوجۆرە پێشان دەدەن."
ڕێبێکا ئەوەندە لەو پێشهاتە نارەحەت و نیگەران بوو کە بۆ خۆزێ ئارکادۆ بویندیای گێڕایەوە. ئەویش لە ڕێبێکا تووڕە بوو کە بۆچی بە پڕوپووچی فاڵی وەرەق باوەڕ دەکا، بەڵام هەموو کاتێ خۆی بە هەستێکی ئەرکناسی بێدەنگ، بە بڵاوکردنەوەی سندووقەکان و باولەکان، هەڵگێڕ و وەرگێڕی مۆبڵەکان و تەختی خەوتن خەریکی دۆزینەوەی کیسی ئێسقانەکان بوو. بیری کەوتەوە کە دوای تەواوبوونی خانووەکە کەس ئەو کیسەیەی نەبینیەوە. بە دزییەوە وەستاکارەکانی بانگ کرد و یەکێ لەوان وتی: چونکە کیسەکە بەردەستی گرتووە، خستوویەتە نێو دیواری یەکێک لە ژوورەکانی خەوتن. دوای چەند ڕۆژ چاوخشاندنی ورد و گوێ بە دیوارداگرتن دەنگی خرتە خرتێکی توندیان بیست. دیواریان هەڵکۆڵی. ئێسقانەکان لە نێو کیسەدا هەروا مابوون. هەر ئەو ڕۆژە کیسەی ئێسقانەکانیان لە گۆڕێکی بێ کێلدا، لە تەنیشت گۆڕی مێلکیادێس بە خاک ئەسپارد و خۆزێ ئارکادۆ بویندیا، کە لە بەرپرسایەتییەک بۆ دەمێک وەک بیرەوەریی پرۆدینسیۆ ئاگیلار لە سەر ویژدانی قورسایی دەکرد، ئاسوودە ببوو. گەڕایەوە ماڵەوە، کاتێک بە بەر دەرگای ئاشپەزخانە دا ڕادەبرد، نێوچاوانی ڕێبێکای ماچ کرد و وتی: "خەیاڵی پووچ لە سەر خۆت دەرکە، تۆ بەختەوەر دەبی."
هاوڕێیەتی ڕێبێکا، دەرگای ماڵەوەی، کە لە زەمانی لە دایکبوونی ئارکادیۆ بە هۆی ئۆرسۆلا لە پیلار تێرنێرا داخرابوو، دیسان کردەوە. لە هەر کاتێکی ڕۆژدا بوو‌ایە، بە هەراوهوریا وەژوور دەکەوت و بە هێزێکی کەم وێنە کارە قورسەکانی ماڵەوەی دەکرد. جار جارەش دەڕۆیشتە کارگا و یارمەتی ئارکادیۆی دەدا کە مقەواکانی وێنەگری ڕاست لە سەر جێگاکانی خۆی دابنێتەوە.
وەها بە خۆشی و دڵسۆزییەوە ئەو کارەی دەکرد کە کوڕە گێژ ببوو. ئەو ژنە ئەوی نارەحەت دەکرد، ڕەنگی سووتاوی پێستی لەشی، بۆنی دووکەڵ، قاقای گڕۆکی لە تاریکخانەی وێنەگری، حەواسی تێکدابوو و لە ڕێگا ڕۆیشتندا لە شت هەڵدەنگوت.

جارێکیان کە ئۆرلیانۆ لە کارگای زێڕنگەری خەریک کار بوو، پیلار تێرنێرا پاڵی وەمێزەکە دا بۆ ئەوەی بە کارەکەی هەڵبڵێ، لە پڕ شتێک قەوما: ئۆرلیانۆ وایدەزانی کە ئارکادیۆ لە تاریکخانەیە، سەری هەڵێنا کەچی لەگەڵ پیلار تیرنێرا چاویان تێک بڕا کە فکرەکەی لە چاوییەوە دیار بوو، دروست وەک ئەوەی لەبەرامبەر خۆری نیوەڕۆدا راوەستابێ.

ئۆرلیانۆ وتی: "باشە، بڵێ بزانم چی بووە؟"

پیلار تێرنێرا بە زەردەخەنەیەکی خەماوەییەوە لێوی خۆی گەزت و وتی: "تۆ بۆ جەنگ باشی تیرەکانت چاک ئامانج دەپێکن!"

ئۆرلیانۆ بە بیستنی ئەو پێشگوییە خەیاڵی راحەت بوو. جارێکی دیکەش بیری لە سەر کارەکەی کۆ کردەوە، هەروەک خەبەرێک نەبووبێ. دەنگی جارێکی دیکە ئارام بۆوە وتی: "بە منداڵی خۆمی دەزانم، ناوی خۆمی پێ دەدەم."

خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا سەرەنجام ئەوەی لێی دەگەڕا دۆزییەوە. میکانیزمی سەعاتێکی بە بووکەڵەیەکی کۆکی گرێدا، بووکەڵە بە هەوای موسیقای خۆی سێ رۆژی تەواو بێ پسانەوە هەڵپەڕی. ئەو داهێنانە زیاتر لە هەموو کارەکانی دیکەی پێشووی خۆشحاڵی کرد. خەو و خۆراکی لێ هەڵگیرا. دوور لە چاوەدێری و پێڕاگەیشتنی ئۆرسولا نوقمی حاڵەتێک بوو کە هاتنەوەدەری بە هیچ جۆر ئیمکانی نەبوو. شەوانە بێ خەوتن بە ژوورەکاندا دەگەڕا و بە دەنگی بەرز ئەوەی بە بیریدا هاتبا دەیوتەوە و بە دوای رێگایەکەوە بوو کە ئاسایی پاندۆڵی بە سەر عارەبانەی کەڵ و گامێش بە سەر گاسن و هەر شتێکی بۆ رۆیشتن بەکەڵک بێ بەکار بێنێ. بێ خەوی وەهای تێک رووخاندبوو کە رۆژێکیان بەیانی پیرەپیاوێکی مووسپی هاتە ژوورێ نەیناسییەوە، پرۆدینسیۆ ئاگیلار بوو. سەرەنجام کاتێک ناسییەوە بە سەرسوورمانەوە بۆی دەرکەوت مردووش پیر دەبن. دڵتەنگی، دڵی خۆزێ ئارکادۆ بویندیای رێک گوشی. بە سەرسوورمانەوە وتی؛ "پرۆدینسیۆ ئاگیلار لە چ رێگایەکی دوورەوە هاتووی؟" لە دوای ساڵانی درێژ، دڵتەنگی بە خاتری زیندووان بەو جۆرە توند و پێویستی بە هەمدەمی و نزیکایەتیی مردن لە مردن دا ئەوەندە زۆر بوو کە پرۆدینیسیۆ

ئاگیلار سەرەنجام پەنای بۆ خراپترین دوژمنی خۆی هێنابوو. ماوەیەک بوو بە دوای ئەودا دەگەڕا. پرســـیاری ئەوی لە مردووەکـــانی ڕیۆهاشـــا، لە مردووەکانی دۆڵی ئۆبار، لە مردووەکای گۆلاو و زەلیێ دەکرد، بەڵام هیچ کامیان لەو بارەوە هەواڵێکیان نەبوو، چونکە (ماکۆندۆ) بۆ مردووان گوندێکی نەناسیاوبوو.
سەرەنجام مێلکیادێس هاتبوو و لە رووی نەخشەی رەنگاوڕەنگی مەرگ، نوختەیەکی زۆر بچکۆلانەی رەشی پێ نیشان دابوو. خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا هەتا رۆژهەلات لەگەڵ پرۆدینسیۆ ئاگیلار قسەی کرد. چەند سەعات دواتر ماندوو و شەکەت لە بێ خەوییان رۆیشتە کارگای ئۆرلیانۆ و پرسی : "ئەورۆ چ رۆژێکە؟" ئۆرلیانۆ وەلامی دایەوە: "سێ شەممە." خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وتی: "منیش وام بیر دەکردەوە، بەڵام تێنگەیشتم کە ئەورۆ وەک دوێنێ دووشەممەیە." ئاسمانێ چاو لێکە، دیوارەکان ببینە، گوڵە بگۆنیاکان تەماشەکە، ئەورۆش دووشەممەیە!" ئۆرلیانۆ کە دەیزانی باوکی خەرفاوە گوێی نەدایە. سبەی ئەو رۆژە، چوارشەممەیە، خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە کارگاوە وەژوور کەوت و وتی: "سامناکە، دەبینی هەوا چۆنە؟ تەماشا کە خۆر چ تینێکی هەیە! دروست وەک دوێنێ و پێرێ، ئەورۆش دووشەممەیە!" ئەو شەوە پیترۆکرێسپی لە هەیوانێ چاوی پێکەوت، دەگریا، گرینی گریانی خەمناکی پیرانە بوو. بە یادی پرۆدینسیۆ ئاگیلار دەگریا. بە یادی مێلکیادیس، بە یادی دایک و باوکی ریبێکا، بۆ دایک و باوکی خۆی و، بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەهاتنەوە یادی و کاتی مردن بەتەنیا بوون. پیترۆکرێسپی ورچێکی قورمیشی پێشکەش کرد کە لە سەر دوو لاق بە سەر وایەرێکی ئاسندا دەڕۆیشت، بەڵام ئەو ئەسبابە گەمەیەش نەیتوانی ئەو لە فکران بێنێتەدەرێ. لە پیترۆ سەبارەت بە باسێک کە چەن رۆژ پێستر قسەیان لە سەر کردبوو، هەوالی پرسی و لە ئیمکانی ئەوە کە دەزگایەک بە قورمیش دروست بکرێ و مرۆڤ بتوانێ هەڵفڕێ پرسیاری کرد. بەڵام پیترۆ لە وەڵامدا وتی ئیمکانی نییە، چونکە قورمیش دەتوانێ هەموو شت بەرز بکاتەوە بێجگە لە خۆی، رۆژی پێنج شەممە جارێکی دیکەش رۆیشتە ژووری کارگا، دەموچاوی دەتگوت شیوەردی بە گنج بوو، لە حاڵێک دا

نزک بوو لە بانگێ بدا وتی:"دەزگای زەمان دەلەنگێ، ئۆرسۆلا و ئامارانتاش کە هێندە دوورن." ئۆرلیانۆ وەک مناڵان سەرزەنشتی کرد، ئەویش دەستی کرد بە جەنەگرتن و لەجبازی. شەش سەعاتی تەواو شتوومەکی جۆراوجۆری ئەودیو و ئەودیو کرد هەتا بەڵکو بۆی دەرکەوێ لەگەڵ رۆژی پێشتر فەرقیان کردووە و بەوە جۆرە تێپەڕبوونی زەمانی بۆ دەکەوێ. تەواوی شەو لە جێگادا چاوی لێک نەنان. پرۆدینسیۆ ئاگیلار، مێلکیادێس و، هەموو مردووەکانی بانگ کرد بێن و لە خەمیدا بەشدار بن، بەڵام هیچ کامیان نەهاتن. رۆژی هەینی، پێش ئەوە کەس لە خەو هەستێ، دیسان دەستی کردەوە بە پشکنینی شتومەک و ئیتر هیچ گومانی بۆ نەمایەوە کە ئێستاش هەر رۆژی دووشەممەیە. ئەو کاتە میلەی ئاسنی پشتی دەرگای دەست دایە و بە تووڕە بوونێکی وەحشیانە وهێزێکی نائاسایی، کەلوپەلی کارگای کیمیاگەری و کامێرای وێنەگری و کارگای زێڕنگەریی وردوخاش کرد. وەک کەسێک شەیتان چووبێتە کلێشەیەوە بە زمانێکی نەزانراو و بەڵام روون هاواری دەکرد.

هێندەی نەمابوو شتەکانی دیکەی ماڵەوەش تێکوپێک بدا کە ئۆرلیانۆ داوای یارمەتیی لە دراوسێکان کرد. دە پیاو گرتیان، چاردە هەستیان لێ برِی و بیست پیاو بردیانە حەوشە و هەتا لای داربەڕووەکە رایانکێشا و لە داریان بەستەوە. بەو زمانە نەزانراوەی هاواری دەکرد و بەڵغەمێکی سەوز دەرشاوە.

کاتێ ئۆرسۆلا و ئامارانتا لە سەفەر گەرانەوە، دەست و پێی هێشتا بە داربەڕووەکەوە بەستراببوونەوە، لە بەر بارانە تلیسابۆوە و بەتەواوی تێکچووبوو. قسەیان لەگەڵ کرد. بێ ئەوە بیانناسێتەوە چاوی لێکردن و شتانێکی بێ مانای وتن. ئۆرسۆلا باسک و پێکانی کە بە زەبری تەنافکێشان برینـدار ببوون لە دارەکە کردەوە. تەنافی نێو قەدی ئەوی بە دارەکەوە هەروا بەستبۆوە. دوایی سێبەرێکیان بە گەڵای دارخورما بۆ دروستکرد بۆ ئەوەی لە باران و تینی هەتاو بپارێزرێ.

ئۆرلیانۆ بویندیا و رێمیدیۆس مۆسکوتە، یەکشەممەی رۆژێک لە رۆژەکانی مانگی مارس لە بەرامبەر میحرابێک کە بە دەستووری قەشەنیکانۆر رینا لە

ژووری میوانان دروست کرابوو، بە یەکەوە زەماوەندیان کرد. گرفتارییە زۆرەکانی بنەماڵەی مۆسکوتە لە ماوەی ئەو چوار حەفتەیەدا بەوزەماوەندە گەیشتە ئەوپەڕی، چونکە ڕێمیدیۆسی بچکۆڵە پێش ئەوە خوویی منداڵی دابنێ لە پڕ باڵق ببوو. هەرچەند دایکی ئەو گۆڕانانەی کە لە تەمەنی باڵق بووندا بە سەر کچاندا دێ، بەوردی بۆی شی کردبۆوە، بەوحاڵەشەوە پاش نیوەڕۆی ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی مانگی فیورییە، ڕێمیدیۆس کە لە ترسان هاواری دەکرد خۆی گەیاندە ژووری میوانان کە خوشکی و ئۆرلیانۆ لەوێ بە یەکەوە قسەیان دەکرد، شۆرتەکەی خۆی پێشان دان کە بە تەڕاییەکی خەستی قاوەیی ڕەنگ پەڵەی تێکەوتبوو. ڕۆژی مارەبییان مانگێک دواتر دیاری کرد. لەو یەک مانگەدا تەنیا دەرفەتی ئەوەیان هەبوو فێری بکەن چۆن بە تەنیایی خۆی بشوا و لیباس بپۆشێ و ئەرکە گرینگەکانی خانەدار بەڕێوە بەرێ، ناچاریان کرد بە سە خشتی سوورەوەبوو دا بمیزێ، هەتا بەڵکو عادەتی لە جێگا مێزتن تەرک بکا. بە چ زەحمەتێک پێیان سەلماند کە نابێ نهێنی ژن و مێردایەتی لە لای کەس باس بکا. چونکە ڕێمیدیۆس وا لەو پێشهاتە دەترسا و هەر لە هەمان کاتدا سەر سوورمابوو کە دەیویست تەواوی ورد و درشتی شەوی هەوەڵی بووکێنی بۆ هەمووان باس بکا. کارێکی گران بوو، بەڵام بە گەیشتنی ڕۆژی دیاریکرای زەماوەند، کیژۆڵە هەموو شتەکانی بووکایەتی بە ئەندازەی خوشکەکانی دەزانی. دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە، کە باسکی دابووە دەستی ڕێمیدیۆس، ئەوی بە درێژایی ئەو شەقامەی بە گوڵ و ئاڵقەی گوڵان ڕازابۆوە، لە نێو دەنگی ئاگربازی و دەنگی موسیقای چەند ئۆرکێسترادا ڕەوانە کرد.. ڕێمیدیۆس دەستی بۆ خەڵک هەڵدەشەقاند و بە زەردەخەنەوە سوپاسی ئەو کەسانەی دەکرد کە لە پەنجەرەوە ئارەزووی بەختەوەرییان بۆ دەکرد.

ئۆرلیانۆ کۆت و شەڵوارێکی ڕەشی دەبەر کردبوو و هەر ئەو چەکمە قایشە مامزدارەی دەپێ دابوو کە چەند ساڵ دواتریش لە بەرامبەر دەستەی گوللەباراندا لەپێیدابوو. کاتێک لە پێش ماڵەوە دەستی بووکێی گرت و بۆ لای میحرابێی برد. ڕەنگی بە ڕووانەوە نەمابوو و بوغز گەرووی دەگوشی. ڕەفتاری ڕێمیدیۆس ئەوەندە سروشتی و ئاقڵانە بوو، کاتێک ئەو

ئاڵقەی کە ئۆرلیانۆ دەیویست لە ئەنگوستی بکا خلیسکا و کەوتە سەر زەوی، دژکردەوەیەکی لە خۆی پیشان نەدا. لە نێو ورتە و سەرسوورمانی بەشداران هەر بەو جۆرە دەستی خۆی لە نێو دەستەوانەی تۆڕی بێ ئەنگوست هەڵێنا و ئەنگوستی خۆی ئەوەندە راگرت هەتا دەسگیرانەکەی توانی ئاڵقەکە بگرێتەوە، کە هەتا دەم دەرگا خزیبوو، لە حاڵێکدا لە شەرمان هەتا بنانگوێیانی سوور هەڵگەڕابوو، گەڕایەوە لای میحرابەکە. دایک وخوشکانی رێمیدیۆس لە ترسی ئەوە کە مەبادا لە جەنگەی رێورەسمی مارەییدا کچە هەڵەیەک بکا، ئەوەندە ئازاریان کێشابوو کە سەرەنجام خۆیان تووشی کردەوەی هەڵە بوون و کچەکەیان لە زەوی بەرز کردەوە و ماچیان کرد. لەو رۆژەوە بەدواوە. هەستی بەرپرسایەتی و دڵسۆزی کەسی و لەسەرەخۆبوونی رێمیدیۆس بۆ هەمووان ئاشکرا بوو. زانایی خۆی بوو کە بێ دەستووری کەسێکی دیکە، چاکترین بەشی کێکی بووکێنیی بڕی و لە لاوەی دانا هەتا لەگەڵ دەوری و چەنگاڵ بۆ خۆزێ ئارکادۆ بویندیای بەرێ. پیرەمێردی بالامەزن کە لە بەر نەبینینی خۆر و باران رەنگ و رووی لە دەست دابوو، لە حاڵێکدا بە قەدی دارەکەوە بەسترابۆوە، لە ژێر سێبەری گەلاخورما لە سەر کورسیلەیەکی دار هەڵکورمابوو. لە رووی ئەمەگناسی بزەی هاتێ و شیرینییەکەی بە دەست خستە دەمەوە و لە بن لێوان شتانێکی بێ مانای وتەوە. تەنیا کەسێک، کە لەو رێورەسمە جوانەی هەتا بەیانیی رۆژی دووشەممە درێژەی کێشا، خەمبار بوو، رێبێکا بویندیا بوو. زەماوەندی ئەو بێ جێژن مابۆوە. لە سەر بریاری ئۆرسۆلا، قەرار بوو زەماوەندی ئەویش هەر لەو رۆژەدا جەژن بگیرێ، بەڵام رۆژی هەینی پیترۆکرێسپی نامەیەکی پێ گەیشت کە رایدەگەیاند دایکی لە سەرەمەرگ دایە. زەماوەند دوخرا. پیترۆکرێسپی سەعاتێک دوای نامەکە بەرەو ناوەندی ویلایەت رۆیشت. بەڵام دایکیشی دروست هەر لەو کاتەدا لە سەفەر دابوو و، شەوی شەممە سەری وەخت هات و لە زەماوەندی ئۆرلیانۆدا گۆرانییەکی خەمهێنەری، کە بۆ زەماوەندی کوڕەکەی ئامادە کردبوو، وتەوە. پیترۆکرێسپی نیوەشەوی یەکشەممە، دوای ئەوەی پێنج ئەسپی گۆڕیبوو. هەتا بەوەخت بگاتەوە زەماوەندەکەی، دوای تەواو بوونی

ڕێورەسمی زەماوەندەکە گەیشتەوە.کەس نەیزانی کێ ئەو نامەیەی نووسیوە. بە وتەی ئۆرسۆلا، ئامارانتا لە بەرامبەر ئەو میحرابەدا کە دارتاشەکان هێشتا خەریکی کۆکردنەوەی بوون. فرمێسکی ڕشت و سوێندی خوارد بێ تاوانە.
قەشە نیکانور رینا کە دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە بۆ بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی مارەیی لەو لای زەلان هێنابووی، پیرەپیاوێک بوو کە لە حەقنەناسی پیشەی خۆی، مەلوول و خەمبار بوو و پێستی لەشی خەفەتاوی و تەنیا بە سەر ئێسقانەکانی دا کشابوو. زگێکی هەڵمساو و خڕی هەبوو و، وەک فریشتە پیرەکان زۆرتر ساویلکە بوو هەتا ئەوەی چاک بێ. نیازی وابوو دوای ڕێوڕەسمی مارەکردن، بگەڕێتەوە کڵێساکەی خۆی، بەڵام لە لاجبازی و یەکدەندەیی خەڵکی ماکۆندۆ سەری سوڕمابوو، کە بێ ئەوەی منالەکانیان غوسلی تەعمید بدەن و بێ ئەوەی ڕێوڕەسمی ئایینی بەجێ بێنن، لەوەدا کە بێ ئابڕوون، بە بەختەوەری دەژین. بەوبیرەوە لە هیچ شوێنێکی سەرزەوی بە ئەندازەی ئێرە پێویستی بە یارمەتیی خواوەند نییە، لێبڕا حەوتوویەکی دیکەش لەوێ بمێنێتەوە و ژن و پیاوان بکاتە عیسایی و گراوی و دۆستگرتن لە شەرع بخا و بۆ مردووان ڕێورەسمی ئایینی بەجێ بێنێ. بەڵام هیچ کەس گوێی پێ نەدا، لە وەڵامدا وتیان لەمێژ ساڵە بۆخۆیان بێ قەشە راستەوخۆ لەگەڵ خودا کارەکانیان بەڕێوە دەبەن و تاوانی مەزنیش بۆ وان مانا و واتایەکی نییە. کەشیش نیکانۆر لە مەوعیزەخوانی لە هەوای ئازاددا ماندوو بوو و بڕیاری دا بەرپرسایەتی دروستکردنی کڵێسایەک بەئەستۆ بگرێ ،کە گەورەترین کڵێسای جیهان بێ و هەیکەلی پاکان بە ئەندازەی سروشتی و پەنجەرەی بە شووشەی ڕەنگییەوە لە دوو لاوە هەبێ، هەتا خەڵک لە ڕۆمەوە بێنە ئەوێ و خوای لە مەڵبەندی کافراندا بناسن. دوور کەوتبۆوە و قاپێکی مسی بە دەستەوە سواڵی دەکرد. هەرچەند پارەی زۆریان دەدایە، دیسان زۆرتری دەویست، چونکە کڵێسا دەبوایە ناقووسێکی هەبێ کە بە دەنگی ئەو تەنانەت خنکاوەکانیش سەر ئاو کەنەوە.

ئەوەنــدە پــاڕایەوە دەنگــی کەوت. ئێســقانەکانی کەوتــنە تەق و لەق. ڕۆژی شــەممە، کاتێک بینی تەنانەت بە قەدەر خەرجیی دروســتکردنی دەزگاکانی کڵێســاش پــووڵی کــۆ نەکــردۆتەوە نــارەحەت بــوو. لە مەیــدانێ میحرابێکــی دروســت کــرد و ڕۆژی یەکشــەممە، بە ڕاوەشــاندنی زەنگــوڵەیەک، وەک زەمانی تاعوونی بێ خەوی، خەڵکی بۆ گێڕانی ڕێوڕەسمی نوێژ بانگ کرد. هێندێک لە بەر وردبینی و کۆڵینەوە و هێندێک لەبەر دڵتەنگی و هێندێکیش لە بەر ئەوە خوایــان ســەبارەت بە بــێ تەفــاوەتی بەرامــبەر نــوێنەرەکەی نەرەنجانــدبێ، چــوون. ســەعات هەشــتی بەیــانی نیــوەی خەڵکــی ئــاوایی لە مەیــدان کــۆ ببــوونەوە، کەشــیش نیکــانۆر بە دەنگێــک  کە لە بەر خەســتیی پاڕانەوە بەزۆر لە قورگی دەهاتەدەر، چەند ئایەتی لە ئینجیل خوێندەوە. لە کۆتاییــدا، بەو جــۆرە کە خەڵــک بڵاوەیــان دەکــرد، باســکی لێــک کــردنەوە و داوای کرد تەماشای کەن.

وتی: "دەقیقەیەک سەبر کەن، ئێستا یەکێک لە دیاردە گومــان هەڵنەگرەکانی توانای بێ بنی خواوەندی دەبینن."

کوڕێــک کە لە ڕێوڕەســمی نــوێژدا یــارمەتیی کردبــوو، فینجــانێکی گەرم و خەســتی بــۆ هێنــا کە هەڵمــی لــێ هەڵدەســتا. کەشــیش فینجانەکەی یەک قوم خواردەوە و بە دەســماڵێک کە لە قۆڵی دەرهێنا دەمــی ســرییەوە. بە دواییدا باسکی لێک ئاوەڵا کردن و چاوی لە ســەریەک دانان. ئەو کات بینیان کە قەشــە نیکــانۆر بە ئەندازەی پازدە ســانتی مێتر لە ســەر زەوی بەرز بۆوە. هەنگاوێکی حاشاهەڵنەگر بوو. چەند ڕۆژان کە لە مــاڵێکەوە بۆ مــاڵێکی دیکە دەڕۆیشتن و کوڕە پارەی کۆ دەکردەوە دەیخستە نێو کیس، ئەو ئەزمــوونی شەکەلاتی دەکرد، ئەوەندەی پارە کۆ کردبۆوە کە هێشتا مانگ تەواو نەببوو دروستکردنی کڵێسا دەستی پێکرا. هیچ کەس گومــانی لە ســەرەتای خــوایی بــوونی ئەو شــانۆیە نەکــرد، مەگەر خــۆزێ ئارکــادۆ بۆینیــدیا کە بــێ ئەوەی ڕواڵەتــی بە سەرســوڕمان بگــۆڕی، ڕۆژێــک بەیــانی ڕوانیــیە کۆمەڵێــک لەو کەسانە کە لە دەوری داربەرووەکە کۆ ببوونەوە هەتا جارێکی دیکەش ئەو موجیزەی تەماشا بکەن، تەنیا لە سەر کورسییەکەی خــۆی بزووت و شــانی

هەڵتەکاندن. قەشەنیکانۆر بەو کورسییەوە کە لە سەری دانیشتبوو لە زەوی بەرز بۆوە.
خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا وتی: (زۆر سادەیە. ئەو پیاوە خەریکە چوارەمین بوعد یانی بێ وەزنی دادێنێ.)
کەشیش نیکانور دەستی خۆی بەرز کردەوە و پێچکی کورسی بە یەکەوە کەوتنە سەر زەوی. وتی: (قسەکەم وەردەگرمەوە: ئەو ئەزموونە بێگومان وجوودی خوا دەسەلمێنێ.)
بەم جۆرە بوو کە تێگەیشتن ئەو زمانە سەیر و غەریبە، کە خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا قسەی پێ دەکرد، لاتینی بووە. کەشیش نیکانور چونکە تەنیا کەسێک بوو کە توانی پێوەندی لەگەڵ ئەو دامەزرێنێ، کاتی بە هەل زانی هەتا بوونی خوا لە مێشکی ئەو گێژە رۆکا. هەموو رۆژێ پاش نیوەڕۆیان لە تەنیشت داربەروو دادەنیشت و بە زمانی لاتینی مەوعیزەی بۆ دەکرد، بەڵام خۆزێ ئارکادۆ بویندیا بەوپەڕی سەرسەختییەوە شانۆی شەکەلاتی بۆ وجوودی خوا قبووڵ نەبوو و تەنیا بەڵگەی بۆ سەلماندنی بوونی خوا بە وێنەلێ گرتن دەزانی. کەشیش نیکانور میداڵی ئایینی، وێنە و، تەنانەت وێنەیەکی لە پارچە وێرۆنیکا بۆ هێنا، بەڵام خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا هەموو ئەوانەی بەو هۆیە کە دەست سازن و هیچ بناخەیەکی زانستییان نییە، رەتکردەوە. ئەوەندە لەخۆبایی و بیانووگر بوو کە سەرەنجام کەشیش نیکانور دەستی لە مەوعیزە هەڵگرت و لەوە بەدواوە تەنیا لە بەر هەستی مرۆڤدۆستی بۆ چاوپێکەوتنی دەچوو.
بەڵام ئەو جارەیان خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا تێدەکۆشا بە فرۆفێڵی هوشیارانە کەشیش لە رێ لابدا. جارێک کەشیش نیکانور تەختەنەردی هێنا هەتا لە لای داربەڕوو دابنیشێ و تەختەی لەگەڵدا بکا، بەڵام خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا قبووڵی نەکرد و وتی هیچ کات یارییەک کە هەر دوو حەریف لە سەر یاساکانی موافیق بن قبووڵ ناکا. قەشەنیکانور کە هەرگیز لە بارەی یاریی تەختەنەرد شتێکی ئەوتۆی بە مێشکدا نەهاتبوو ئیتر نەیتوانی دەست بۆ یاریی تەختەنەرد بەرێ. لە وەها هۆش و ئامادە زەینی خۆزێ ئارکادۆ

بویندیا سەری سوورمابوو کە لێی پرسی چۆن بووە لە قەدی درەختیان بەستۆتەوە.
ئەو وەڵامی دایەوە: "زۆر سادەیە چونکە دێوانەم."
ئەوە بەدواوە کەشیش لە ترسی ئەوە مەبادا ئیمانی خۆی لە دەست بدا، ئیتر بە لایەوە نەچوو و هەموو کاتێ خۆی بۆ دروستکردنی کڵێسا تەرخان کرد. ڕێبێکا هەستی دەکرد جارێکی دیکەش هیوا لە دڵیدا سەر هەڵدەداتەوە. دوارۆژی بەسترابۆوە بە تەواوبوونی ساختومانی کڵێسا. یەکشەممەیەک، کە کەشیش نیکانور بۆ خواردنی نیوەڕۆیان هاتبووە ماڵیان، هەروا کە قسەیان لە جوانی و بەسامیی ڕێوڕەسمی کڵێسا دەکرد، ئامارانتا وتی: "خۆش بە حاڵی ڕێبێکا." چونکە لە مەبەستی ئەو تێنەگەیشت، بە زەردەخەنەیەکی پاکانە مەبەستی خۆی روونتر بەیان کرد:
- تۆ بە ڕێوڕەسمی زەماوەندی خۆت کڵێسا دەکەیەوە.
ڕێبێکا هەموو قسەیەکی بە خۆی دەگرت، بەو جۆرە کە کاری دروستکردنی کڵێسا دەچووە پێشەوە، هەتا دە ساڵی دیکە تەواو نەدەبوو. کەشیش نیکانور موافیقی ئەو وتەیە نەبوو و دەیوت دەست ئاوەڵایی ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتری ئیمانداران ئەوی سەربارەت بە تەواوبوونی کڵێسا خۆشبین و هیودار کردووە. ڕێبێکا لە بەر نارەحەتی تەنانەت نەیتوانی خواردنەکەشی تەواو بکا. ئۆرسۆلا رای ئامارانتای سەلماند و پارەیەکی بەرچاوی بۆ پەلە لە تەواوبوونی کڵێسا دا بە کەشیش. کەشیش لەو باوەڕەدا بوو ئەگەر کەسێکی دیکەش پارەیەکی ئەوتۆ بە یارمەتی بدا، دروستکردنی کڵێسا هەتا سێ ساڵی دیکە تەواو دەبێ. لەوە بەدوا ڕێبێکا یەک قسەشی لەگەڵ ئامارانتا نەکردەوە، لەو باوەڕدابوو کە وتەی ئەو زۆریش نیازپاکانە نەبووە. ئەو شەوە کاتێک خەریکی شەڕ و کێشە بوون، ئامارانتا وتی: "لەوە بێ ئازارتر کارێکی دیکەم نەدەتوانی، بەوحیسابە هەتا سێ ساڵی دیکە ناتکوژم." ڕێبێکا داوای بەربەرەکانیی قبووڵ کرد.
پیترۆکرێسپی لە دواکەوتنی دووبارەی زەماوەند بێ ئەندازە خەمبار و بەپەرۆش بوو، بەڵام ڕێبێکا راستی و دڵسۆزیی خۆی جارێکی دیکەش سەلماند و، وتی: "ئامادەم هەر کات تۆ بڵێی بە یەکەوە لێرە ڕاکەین"

پیترۆکریسپی پیاوێکی ماجەراجۆ و گێرەشوێن نەبوو، وەک دەسگیرانەکەی بڕیاری کتوپڕی نەدەدا و ڕێزدانانی بۆ بەڵێن بە سامانێک دەزانی کە نەدەکرا بەربای بدا. ئەو کات ڕێبێکا دەستی دایە فێڵ و تەڵەکەی ئازایانە، بایەکی ئەفسووناوی چراکانی ژووری میوانانی دەکوژانەوە و ئۆرسوڵا دەیبینی کە ئەو دوو ئەویندارە لە تاریکیدا یەکتر ماچ دەکەن. پیترۆکریسپی ڕوونکردنەوەیەکی تێکەڵ و پێکەڵی سەبارەت بە خراپیی ئەو چرا نەفتییە تازانە باس دەکرد و تەنانەت بۆ چاکتر ئایسانی چراکان یارمەتیی دەدا، بەڵام دیسان یان نەفتیان لێ دەبڕا، یان فتیلەیان دەسووتا و ئۆرسوڵا ڕێبێکای دەدیت کە لە سەر ڕانی دەسگیرانەکەی دانیشتووە. سەرەنجام هیچ بروبیانوویەکی قبووڵ نەکرد. کارەکانی ئاشپەزخانەی بە ژنە سوورپێستەکە ئەسپارد و خۆشی لە سەر کورسییەک بۆ چاوەدێری ئەو جووتە دانیشت، هەتا نەهێڵێ بەو فێڵانە، کە تەنانەت لە زەمانی گەنجیی ئەویشدا کۆن ببوون فریوی بدەن. ڕێبێکا کە دەیبینی ئۆرسوڵا لە سەر کورسی دانیشتووە و، باوێشکی دێتێ، بە گاڵتە دەیگوت: "بێچارە مامان کاتی بمرێ ئەو کورسییەی لەگەڵ خۆی دەباتە بەرزەخێ!" پیترۆکریسپی دوای سێ مانگ ئەوینداری لە ژێر چاوەدێریدا لە بەرەو پێش نەچوونی کاری ساختومانی کڵێساکە هەموو ڕۆژێ سەری دەدا، ماندوو بوو و بڕیاری دا ئەو پارەیەی کە بۆ تەواوکردنی کاری کڵێسا پێویستە بیدا بە کەشیش نیکانور. بەڵام ئامارانتا سەبر و لەسەرەخۆیی لەدەست نەدا، هەموو ڕۆژێ پاش نیوەڕۆیان هاوڕێکانی دەهاتن بۆ لای و هەمووان بە یەکەوە لە هەیوانێ دادەنیشتن و خەریکی گوڵدۆزی دەبوون و ئەو لە کاتی وتوویژ لەگەڵ هاوڕێکانی نەخشەی تازەی لە مێشکیدا دەگوورانەدن لێکدانەوەیەکی هەڵە، نەخشەیەکی کە لە هەموویان بەکاریگەرتری دەزانی بەربای دا: ئەو دەنکە نەفتالینانە کە ڕێبێکا بە نێو جلەکانی بووکێنیی وەرکردبوو و جلەکانی لە سندووقێکدا لە ژووری نووستن دانابوو کۆی کردنەوە و دەریهێنان. ئەو نەخشەیەکی دوو مانگ پێش تەواو بوونی کڵێسا جێبەجێ کرد. بەڵام ڕێبێکا کە لە نزیکبوونەوەی زەماوەند بێ تاقەت ببوو، لێبڕا لیباسەکانی بووکێنی زۆر زووتر لەوەی ئامارانتا پێشبینی دەکرد.

ـەـدیان بکا. کاتێک سندووقەکەی کردەوە، لە پێشدا وەرەقە کاغەزەکان و ـۆی ئەو مەلافەی کە بـۆ پاراسـتن بە سـەر جلەکانیـدا دابـوو لای بـرد ـەـشـای کـرد تـۆڕی لیبـاس و گوڵـدۆزی و تـۆڕی دەسـماڵ و تەنـانەت ـەـکەگوڵی بەهارنارنج بەجۆرێک مۆرکە خواردوویەتی کە بوونەتە تۆز. هەرچەنـد دڵنیـابوو دوو لـوێچی نەفتـالین لە سـندووق کـردووە، بەڵام ـووداوەکە هێنـدە سروشـتی دەهـاتە بەرچـاو زاتـی نەکـرد بە ئەسـتۆی ـارانتـای دا بێنـێ. لەگەڵ ئەوەشـدا تەنیـا مـانگێکی بـۆ زەماوەنـد مـابوو، ئامپارۆ مۆسکوتە لە ماوەی حەفتەیەکدا دەستێکی دیکەی لیباسی بووکێنی ـۆ دروو.

ـە پاش نیـوەڕۆیەکی بارانـدا کاتێـک ئامپـاردۆ بـۆ ئـاخرین تـاقیکردنەوەی ـیاسـی ڕێبێکـا بە کەلـوپەلی بەرگـدروونەوە هـاتەماڵیـان، کەمـی مـابوو ئـامارانتا بە ئەرزیدا بکەوێ. دەنگی لە گەرویدا گیرا و ئارەقێکی ساردی بە ـێـو شـانـاندا هـاتەخوار. چەنـد مانـگ بـوو لە ترسـی هاتنەپێشـی ئەو کـاتە ـەرزی گرتبـووو. ئەگەر نەیتوانیبـا بەرهەڵسـتێکی تەواو لە سـەر ڕێگـای زەماوەندی ڕێبێکا دابنێ، کاتێک هەموو پیلانەکانی بەفیرۆ چووبا، ئەوکات وردەی ئەوەی بۆ پەیدا دەبوو دەرمانخواردووی بکا. ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆ هەروا کە ڕێبێکـا لە گەرمـان شـەکەت ببـوو و ئامپـارۆ مۆسـکوتە بە حەوسـەلەیەکی زۆر و بە هەزاران دەرزی لیباسـی بـووکێنی بە بەر تاقیدەکردەوە، ئامارانتا چەند جار لە جیاتی پارچە، دەرزیی لە قامکی خۆی ڕۆ کرد و ئەو کات بە لەسەرەخۆییەکی ترسناک بڕیاری دا پیلانی خۆی لە ئاخرین هەینی پێش زەماوەند جێبەجێ بکا و ژەهر لە نێو قاوەی ڕێبێکا بکا. پێشـهاتێکی گەورەتـر و لە بێچارەسـەر و بەو ئەندازەیەش پێشـبینی نەکراو هاتەپێش، جارێکی دیکەش بە ناچاری زەماوەندی خستە دواوە. حەفتەیەک پێش ماوەی دیاریکراو بۆ زەماوەند، ڕێمیدیۆسـی بچکۆڵە نیوەشـەو لە خەو هەڵسـا. شلەیەکی گەرم کە لە نێـو زگیـدا تەقیبـۆوە ئەوی لە خوێندا شـەلاڵ کردبـوو. سـێ ڕۆژ دواتـر، لە حاڵێکدا دوانەکەی لە زگدا مردبوون، خـوێنی گەڕابـۆوە و خۆشـی مـرد. ویژدانـی ئامارانتـا ئەوی بە تونـدی گـۆڕی. لە قووڵایی دڵییەوە لە خوا پاڕابۆوە ڕووداوێکی سامناک بێتە پێشەوە هەتا ئەو

ناچار نەبێ رێبێکا دەرمان خواردوو بکا. مردنی رێمیدیۆسی بە تاوانی خۆی دەزانی. رووداوێکی کە ئەو هەمووە بۆی پاڕابۆوە، ئەوە نەبوو، رێمیدیۆس لەگەڵ خۆی کۆمەڵێک شادی و خۆشیی هێنابووە ئەو ماڵە. لەگەڵ مێردەکەی لە ژووری نزیک کارگا دەژیا و ژوورەکەی بە بووکەڵەی گەمە رازاندبۆوە. دڵخۆشی و تریقانەوەی ئەو لە چواردیواری ژوورەکە تێدەپەڕی و وەک شنە دەگەیشتە هەیوانی گوڵە بگونیایەکان. لەگەڵ رۆژ دەبۆوە گۆرانی دەگوت و تەنیا کەسێک بوو کە دەیوێرا خۆی لە شەڕی رێبێکا و ئامارانتا هەڵقورتێنێ. ئەرکی گرانی پێراگەیشتنی خوزێ ئارکادیۆ بویندیاشی وەئەستۆ گرتبوو، خواردنی بۆ دەبرد، پێویستیی رۆژانەی بۆ جێبەجێ دەکرد، بە لفکە و سابوون دەیشوشت، ئەسپێ و رشکی لێ پاک دەکردەوە، ئاگای لە کەپرەکەی بوو و لە هەوای تووشدا سەری کەپرەکەی بە جاوی دادەپۆشی.لە ئاخرین مانگەکانی تەمەنیدا توانیبووی کەم و زۆر لە رستە لاتینییەکانی تێبگا. کاتێک منالی ئۆرلیانۆ بویندیا و لیلار تێرنێرا هاتە دنیاوە ئەویان بە رێورەسمی بنەماڵەیی غوسڵی تەعمید کرد و ناوی لێنا ئۆرلیانۆ خوزێ. رێمیدیۆس بڕیاری دا منالەکە وەک منالی گەورەی خۆی قبووڵ بکا.

ئۆرسولا لە غەریزەی دایکایەتیی ئەو زۆر سەری سوورمابوو. ئۆرلیانۆ رێمیدیۆسی بەمایەی ژیانی خۆی دەزانی. تەواوی رۆژ لە کارگایە خەریک بوو. نزیک نیوەرۆیان، رێمیدیۆس قاوەی بۆ دەبرد کە هەروا بە تاڵی و بێ شەکر دەیخواردەوە. ژن و مێرد، هەموو شەوێ دەچوونە ماڵی موسکۆتە. ئۆرلیانۆ لەگەڵ خەزووری دۆمینەی دەکرد و رێمیدیۆسیش لەگەڵ خوشەکانی زۆر بڵێیی، یان سەبارەت بە هێندێک شتی بنەرەتی لەگەڵ دایکی دەدوا. خزمایەتی لەگەڵ بنەماڵەی بویندیا توانای دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتەی لە ئاوایی پتەو کرد. دوای چەند سەفەر بۆ ناوەندی ئوستان دەوڵەتی ناچار کرد لەوێ قوتابخانەیەک دروست بکا و بەڕێوەبەرییەکەی بخرێتە ئەستۆی ئارکادیۆ کە مەیلی دەرس وتنەوەی لە بابە گەورەیەوە بۆ بە میرات مابۆوە و، سەرەنجام توانی نیوەی خەڵکی ئاوایی رازی بکا بە بۆنەی جێژنی سەربەخۆیی نەتەوەیی خانووەکانیان شین کەن. لە سەر داوای کەشیش

نیکانور، فەرمانی دا مەیخانەی کاتارینۆ بگوێزنەوە شەقامێکی بەلاوەتر و، چەند شوێنی بەدناو کە لە ناوەندی شار بوون هەڵگیران. جارێک بە شەش پاسەوانی چەکدارەوە هاتەوە و نەزم و ئاسایشی شاری بەوان ئەسپارد. کەس بیری نەکەوتەوە کە ئەو قەولی دابوو خەڵکی چەکدار لە شار رانەگرێ. ئۆرلیانۆ لە لێوەشاوەیی خەزووری هەستی بە سەربڵیندی دەکرد. هاورێکانی پێیان دەگوت "تۆش وەک ئەو قەڵەو دەبی!" بەڵام ژیانی خانەنشینی کە کولمەکانی دەرپەراندبوون و گیرایی چاوی دوو هێندە کردبوو، نە قورسایی زیاد کرد و نە نزمی رەوشتی گۆڕی، بەڵکو بوو بە هۆی دوعاکردن بە تەنیایی و ئیرادەی پتەو لێوی باریکی باریکتر کردن. بنەماڵەکەی وەها ئۆگری ئەو و ریمیدیۆس ببوون کە کاتێک ریمیدیۆس راگەیاند زگی پڕ و حاملیەیە، تەنانەت رێبێکا و ئامارانتاش ئاگربەسیان کرد هەتا ئەگەر کوڕ بوو لیباسی سەوز و ئەگەر کچ بوو لیباسی چێرەیی بۆ بچنن. ریمیدیۆس ئاخرین کەس بوو، بیری ئارکادیۆ کەوتەوە کاتێک چەند ساڵ دواتر سەربازان دەیانویست تیرەبارانی بکەن.

ئۆرسۆلا بۆ مەرگی ریمیدیۆس فەرمانی پرسەی دا. دەرگا و پەنجەرەی ماڵەوەیان داخستن. بۆ کاروباری پێویست نەبێ کەس هاتووچۆی ماڵی نەدەکرد. کەس هەتا ساڵێک مافی نەبو بەرز قسە بکا. پارچەیەکی رەشیان بە سەر وێنەی ریمیدیۆسدا دا و لە و شوێنە کە بە سەر مەیتەکەوە مابوونەوە و نەخەوتبوون دایای نا. چرایەکی رۆن گەرچەکیان، کە هەمیشە دەگڕا، لە ژێرەوە دانا. نەوەکانی داهاتوو کە هەرگیز نەیانهێشت ئەو چرایە بکوژێتەوە لە بەرامبەر ئەو کیژۆڵەیەدا کە داوێنی چیندراوی پۆشیبوو و پۆتینی سپی دەپێدا بوو و دەسماڵی ئۆرگاندی لە سەر نابوو، سەریان سوور دەما و نەیاندەزانی ئەو لەگەڵ وێنەی دایەگەورەی ئاسایی پێک بگرن.

ئامارانتا بەرپرسایەتیی بەخێوکردنی ئۆرلیانۆ خۆزێی بەئەستۆ گرت و ئەوی بە منداڵی خۆی قبووڵ کرد هەتا لە تەنیایی ئەودا بەشدار بێ و ویژدانی لەو ژەهرەی کە پاڕانەوەی بێ مەبەستی ئەو، لە قاوەی ژیانی ریمیدیۆسی کردبوو رزگار بێ. پیترۆکرێسپی لای ئێوارانە بە ئەسپایی بە سەر پەنجان

وەژوور دەکەوتەوە، دەسرۆکەیەکی رەشی لە دەوری کڵاوی هاڵاندبوو، زۆر بە بێدەنگی چاوی بە ریێبێکا دەکەوت. ریێبێکا دەلیباس رەشی سەردەستەدرێژدا دەتگوت خوێنی دەبەردا نەماوە. ئەو دووە بەجۆرێک مێژووی دیاریکراوی زەماوەندیان لە بیر چووبۆوە کە دەسگیرانەتیان ببوو بە هاتووچۆیەکی بێ پایان و ئەوینێکی تێکقوپاو کە کەسی پێوە ماندوو نەبوو، دەتگوت ئەو ئاشقانەی کە زەمانێک چرایان خراپ دەکردن هەتا لەو تاریکەدا یەکتر ماچ بکەن نەماون و مردوون. ریێبێکا کە ئامانجێکی لە ژیانی خۆیدا نەدەدی و بەتەواوی هیوای لە دەست دابوو دیسان دەستی کردەوە بە گڵخۆری.

دەورەی پرسە ئەوەندە درێژ ببوو کە کچەکان دیسان دەستیان کردبۆوە بە گوڵدۆزی. رۆژێک سەعات دووی پاش نیوەرۆیە لە پڕ کەسێک پاڵی بە دەرگاوە نا و هاتە ژوورەوە. لە بێدەنگیی گەرم و مەرگهێنەردا، پایەی ماڵەوە وەها بە توندی لەرزییەوە، ئامارانتا و هاورێکانی کە لە هەیوانێ خەریکی گوڵدۆزی بوون و ریێبێکا کە لە ژووری نوستن ئەنگوستی خۆی دەمژی و ئۆرسولا لە ئاشپەزخانە و ئۆرلیانۆ کە لە کارگای زێرنگەری کاری دەکرد، تەنانەت خۆزێ ئارکادۆ بویندیاش ،کە لە ژێر داربەرووەکەدا بە تەنیا بوو، وایانزانی بوومەلەرزە هاتووە. پیاوێکی زۆر بە هەیکەل وەژوور کەوتبوو، کە شانەکانی بەزۆری لە دەرگاوە دەچوو، بەملیەوە، کە دەتگوت ملی گایە، میداڵی "مریەمی چارەساز" هەڵواسرابوو و سینگ و باسکی هەموو بە خاڵکوتی سەیر داپۆشرابوو و لە جومگەی دەستی راستدا بازنەیەکی مسی تایبەتیی "مناڵانی خاچ" دەبینرا. پێستی بەدەنی بە خوێ هەوا سووتابوو، مووی سەری وەک مووی پشتی ئێستر کورت بوو، شەویلکەی ئەوەندە قایم بوون دەتگوت لە ئاسن دروست کراون. بزەیەکی خەمباری لەسەر لێوی بوو، کەمەبەرندی دوو هێندەی تەنگەی ئەسب بوو، چەکمەی مامزداری پانییەئاسنی لە پێدا بوو و پێی لە سەر هەر جێگایەک دانابا بوومەلەرزە دەهات. ساکی دڕاوی بە دوای خۆیدا دەکێشان، لە ژووری میوانان و نەهاریخۆری تێپەڕی و وەک برووسکە گەیشتە هەیوانی

گوڵەکانی بگۆنیا. ئامارانتا و هاوڕێکانی دەستیان بە دەرزییەوە لە هەوادا وشک ببوو، دەتگوت شەپلە لێیداون.
بە دەنگێکی ماندوو وتی: "سڵاو!" کیسەکانی فڕێ دایە سەر مێزی کار و بۆ لایەکی دیکەی ماڵەوە ڕۆیشت. لە ڕێبێکای پەشۆکاو، کە لە ژوورەکەیەوە دیتبووی ڕادەبرێ، سڵاوی کرد و، بە ئۆرلیانۆ، کە هەر پێنج هەستی گوێ بەزەنگ بوو، لە پشت مێزی زێڕنگەری دانیشتبوو، وتی: "سڵاو!" لە لای هیچ کامیان نەمایەوە. یەک ڕاست ڕۆیشتە ئاشپەزخانە و لەوێ بۆ یەکەم جار، لە کۆتایی سەفەرێک کە لەو سەری دونیاوە دەست پێکرابوو ڕاوەستا. وتی: "سڵاو!" ئۆرسوڵا واقی وڕما، تاوێک دەمی کردەوە و لە چاوانی ڕاما و هاواری کرد. هەروا کە لە خۆشییان فرمێسکی دەهاتنە خوارێ خۆی بە ملییەوە هەڵواسی. خۆزێ ئارکادۆ بوو. هەر بەو جۆرەی بە هەژاری ڕۆیشتبوو، بە هەژاریش گەڕابۆوە، ئۆرسوڵا دوو پیزۆی بۆ کرێی ئەسپەکەی دایە. زمانی ئیسپانیۆلیی تێکەڵ بە زاراوەی دەریاگەران قسە دەکرد. کاتێک لێیان پرسی لە هەموو ئەو ماوەیەدا لە کوێ بووە، وەڵامی دایەوە: " لەو لاو لەو لا" جۆلانەی خۆی لە ژوورەکەی بۆیان تەرخانکردبوو هەڵواسی و سێ شەو و سێ ڕۆژان خەوت. کاتێک لە خەو هەستا دوای لووشدانی شازدە هێلکەی کاڵ، یەک ڕاست چوو بۆ مەیخانەی کاتارینۆ. هەیکەلی گەورەی هەستی کۆڵینەوە و ترسی ژنانی بزوواندبوو. فەرمانی دا موسیقا لێ بدەن و هەموویانی بە خواردنەوە میوان کرد و مەرجی کرد بەتەنیا لەگەڵ پێنج پیاو ملەی بکا. کاتێک بینیان کە تەنانەت باسکی ئەویان پێ نابزوێ وتیان: "ئیمکانی نییە، چونکە ئەو کوڕانی خاچی هەیە." کاتارینۆ کە بڕوای بە فێڵی جادوویی زۆری بازوو نەبوو، لە سەر دوازدە پیزۆ مەرجی لەگەڵ کرد کە پێش خوانەکە لە جێگای خۆی تەکان بدا. خۆزێ ئارکادۆ پێشخوانی لە شوێنی خۆی هەڵقەند و لە سەر سەری دانا و لە جادە داینایە زەوی. بە دوازدە پیاوان گێڕایانەوە سەر جێگای خۆی. لە گەرماوگەرمی مەستیدا کیری خۆی دەرهێنا و لە بەر چاوی ئامادەبووان لە سەر پێشخوانی دانان. کیری گەورەی هەموو بە مەرەکەبی سوور و شین بە زمانی جۆراوجۆر خاڵ کووتی کرابوو. لەو ژنانەی کە بە ئیشتیا چاویان

لە کیری دەکرد پرسی کامەتان ئامادەن زۆرتر پارە بدەن. ژنێک کە لەوانی دیکە پووڵدارتر بوو پێشنیاری بیست پیزۆی کرد. ئەو کات خۆزێ ئارکادیۆ پێشنیاری کرد خۆی لە نیو ژنەکاندا بە لۆتەری"قورعە" دابنێ و هەر یەکە دە پیزۆ بدەن. پارەیەکی زۆر بوو، چونکە ئەو ژنەی کە لە ژنەکانی دیکەی زۆرتر پەیدا دەکرد، شەوی هەشت پیزۆ داهاتی هەبوو. بەوجۆرە دەکلاویکیان کردن. هەر ژنەی کاغەزێکی لە کلاوەکە دەرکێشا و کاتێک دوو کووتە کاغەز مانەوە روون بۆوە کە هی ئەو دوو ژنەیە کە ماونەوە. خۆزێ ئارکادۆ پێشنیاری کرد؛ "ئەفەری پێنج پیزۆی دیکەش بدەن هەتا لەگەڵ هەردووکتان بنووم."

لەم ریگایەوە خۆی دەژیاند. شێست و پێنج جار بە دەوری دنیادا گەرابوو و لەگەڵ دەریاگەرانی بێ ولات سەفەری کردبوو. ئەو ژنانەی کە ئەو شەوە لە مەیخانەی کاتارینۆ لەگەڵی خەوتن، بە رووت و قووتی هێنایانە نێو خەڵکەکە هەتا هەموو ببین کە لەشی لە پێشەوە و لە پشتەوە، لە ملی هەتا نووکی پیی، هەموو خاڵ کووت کراوە. نەیتوانی خۆی لەگەڵ بنەماڵە ریک بخا. تەواوی رۆژی دەنووست و شەوانە لە قەحبەخانە دەیگوزەراند و لە سەر زۆرەملە گرێوی دەکرد. ئەو جارە کەمانەی کە ئۆرسۆلا توانی لە سەر مێزی خواردن دایبنێ، پێشانی دا زۆر خۆش ئەخلاقە، بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە بەسەرهاتەکانی خۆی لە ولاتانی دوورەدەست دەگێرایەوە. جارێکیان کەشتییەکەی لێ غەرق دەبێ و دوو حەوتوو لە کەنار دەریای ژاپۆن دەمێنێتەوە و گۆشتی لاشەی هاورێکەی دەخوا، کە لە گەرمان مردبوو. گۆشتی لاشەکە لە بەر هەتاوی بەتین دەبرژا، تامی زۆر سوێر و چەوئاسای دەدا.

لە نیوەرۆیەکی هەتاودا، لە کەنداوی بەنگالدا کەشتییەکەی ئەژدیهایەکی دەریایی کوشتبوو. لە زگیدا کلاوخودێک و قولاپێک و چەکی سەربازێکی شەرەکانی سەلیبی (خاچ)یان دۆزیبۆوە. لە دەریای کاریبی تارمایی کەشتی دزی دەریای ویکتۆر هوگ ی دیبوو کە باگرەکانی، بای مەرگ لە بەر یەکی هەڵدریبوون و سیسرەی دەریایی لاشەی کەشتییەکەیان جووبوو و هێشتا بە دوای ریگای گوادالوپ دا دەگەرا. ئۆرسۆلا لە سەر مێز دەگریا،

هەر وەک ئەو نامانە بخوێنێتەوە کە خۆزێ ئاکاردیۆ بەسەرهاتەکانی خۆی نووسیوە و قەت نەیناردووە. لە هێقەهێقی گریاندا دەیگوت: "کورم لێرە ماڵت هەبوو، ئەو هەموو خواردنەت هەبوو کە ناچار بووین لە پێش بەرازانی رۆکەین!" لە دڵی خۆیدا نەیدەسەلماند منداڵێک کە لەگەڵ کاولیان رۆیشتووە، ئەو غوولە بێ شاخ و کلکەیە و نەهاران نیوبەرازێکی دەخوا و هەر جارەی دەترێ گولان سیس هەڵدەگەڕێن. کەسانی دیکەی ماڵەوەش هەستێکی ئەوتۆیان هەبوو. ئامارانتا نەیدەتوانی بێزاریی خۆی لە قرپ هێنانەوەی جانەوەرانەی ئەو لە سەر سفرەی نان خواردن بشارێتەوە. ئارکادیۆ، کە لە نهێنیی خزمایەتیی خۆی لەگەڵ ئەو بێ خەبەر بوو، پرسیارەکانی ئەوی کە بە ئاشکرا بۆ راکێشانی خۆشەویستی بوو، بەکەمی وەڵام دەدایەوە. ئۆرلیانۆ تێدەکۆشا لەو زەمانە قسە بکا کە بە یەکەوە لە ژوورێک دەنووستن. کۆشا بیرەوەریی منالیی تێدا وەخەبەر بێنێ، بەلام خۆزێ ئارکادۆ بیرەوەریی منالیی فەرامۆش کردبوو. ژیان لە نێو دەریادا بە هەزاران یاد و یادگار، بیری پڕ کردبۆوە. رێبێکا تەنیا بە یەکەمین چاوپێکەوتن لە پێ کەوتبوو. پاش نیوەڕۆیەک ، کە ئەو لە کاتی رابردن لە پێش ژووری خۆی چاوی پێکەوت، وایزانی پیترۆکرێسپی لە بەراورد لەگەڵ ئەو پیاوە هەیکەل گەورەیە کە دەنگی نەفەس کێشانی وەک بورکان لە ماڵێ دەبیسرا، بووکەڵەیەکی لۆکەیە.

بە هەر بیانوویەک با خۆی لێ نزیک دەکردەوە. جارێک خۆزێ ئارکادۆ بە چاولێکردنی بێ شەرمانە بە بەژن و باڵایدا روانی و، وتی: "خوشکە چکۆڵە، بوویە ژنیکی تەواو!" رێبێکا قەراری لێ هەڵگیرا، وەک جاران دەستی کردەوە بە خواردنی گێچ و خۆڵی دیواران، وەها بە نارەحەتی ئەنگوستی خۆی دەمژت، مێخەکەی لە قامکی هات. لەگەڵ زەرووی مردوو زەرداو رشاوە. چەند شەوان بە تا و لەرز رۆژی کردەوە. چاوەڕوانی دەکرد هەتا رۆژ بێتەوە و، ماڵ بە گەڕانەوەی خۆزێ ئارکادیۆ بلەرزێ. رۆژێک دوای نیوەڕۆ، کاتێک هەموو خەوتبوون، تاقەتی نەما و رویشتە ژووری خەوتنی ئەو. تەماشای کرد تەنیا ژێر شەڵواری دەبەر دایە و لە جۆلانەی خۆیدا، کە بە تەنافی کەشتی بە دارەکانی میچییەوە هەڵاواسیوە، درێژ بووە و

بەخەبەرە. رووتی لەشی گەورە و رەنگاورەنگی وەها کاری تێکرد کە بێ ئیختیار خۆی کێشاوە دواوە و وتی: "ببوورە نەمدەزانی تۆ لێرەی!" بەڵام ئەوەی ئەوەندە لە سەرەخۆ وت، کەس لە خەو هەڵنەستێ. خۆزێ ئارکادۆ وتی: "وەرە ئێرە" رێبێکا قبوولی کرد و هەروا کە ئارەقی ساردی بە هەموو لەشیدا دەهاتە خوارێ، لە پێش جۆلانەکە راوەستا. هەستی دەکرد ریخۆڵەکانی لێکدەهاڵێن. خۆزێ ئارکادۆ بە سەر پەنجان بەلەکی دەخوراند و کاتێک دەستی گەیشتە رانی لەبەر خۆیەوە وتی: "ئای، خوشکە چکۆڵانەی من، خوشکە چکۆڵانەی من!" کاتێک هێزێکی وەک گێژەڵووکە لە پشتێندەوە بەرزی کردەوە و بردییە سەرێ و بە سێ زەربە ئابرووی برد و وەک باڵندەیەکی بچکۆڵانە وردی کرد. هەوڵێکی لە توانا بەدەری دا هەتا نەمرێ، پێش ئەوەی لە خۆشیی ئەو ژانە لە توانابەدەرە لە هۆش بچێ سوپاسی خوای کرد کە هاتۆتە سەر دونیاوە. لە گوڵاوی هەڵماوی جۆلانەدا، دەتگوت خوێنی هەڵدەقولێ و خامی جۆلانە، وەک کاغەزی ئاومژ، ئەو خوێنەی هەڵمژی.

سێ رۆژ پاشتر، کاتی نوێژی سەعات پێنج، بەیەکەوە زەماوەندیان کرد، رۆژی پێشی خۆزێ ئارکادۆ رۆیشتە دووکانی پیترۆکرێسپی. ئەو خەریک بوو دەرسی سێ تاری دەگوتەوە. بێ ئەوەی بۆ قسەکردن بیباتە لاوە، وتی: "من و رێبێکا زەماوەند دەکەین!" پیترۆکرێسپی رەنگی لە رووان پەڕی. سێ تارەکەی دایە دەستی یەکێک لە قوتابییەکان و کۆتایی بە دەرس گوتنەوە هێنا. کاتێک لە ژوورەکە، کە پڕ بوو لە هەموو جۆرە کەرەسەیەکی مۆسیقا و ئەسباب گەمەی کۆکی بەتەنیا مانەوە، پیترۆکرێسپی وتی: "ئەو خوشکی تۆیە."

خۆزێ ئارکادۆ وەڵامی دایەوە: "بۆ من فەرق ناکا."

پیترۆکرێسپی ئارەقی نێوچاوانی بە دەسرەیەکی بۆنخۆش سرییەوە و وتی: "سەرەڕای ئەوە پێچەوانەی سروشت و پێچەوانەی یاساشە."

خۆزێ ئارکادۆ زۆرتر بە خاتری دەنگ پەرپوی پیترۆکرێسپی نەک بە خاتری باسەکە، سەبر و حەوسەلەی نەما، وتی: "بە گۆڕی بابی سروشت، تەنیا هاتبووم پێت بڵێم خۆت زەحمەت مەدە و لە رێبێکا هیچ مەپرسە."

بە دیتنی چاوی پڕ لە فرمێسکی پیترۆکرێسپی هێندێک لە حاڵەتی حەیوانی خۆی کەم کردەوە و، بە زمانێک دیکە وتی: "ئێستا کە بنەماڵەی ئێمەت خۆش دەوێ ئامارانتا هەیە."
کەشیش نیکانور لە ڕێوڕەسمی نوێژی ڕۆژی یەکشەممە ئاشکرای کرد خۆزێ ئارکادیۆ و ڕێبێکا خوشک و برا نین. ئۆرسۆلا کە ئەو ڕووداوەی بە سووکایەتییەکی یەکجار گەورە دەزانی لێیان خۆش نەبوو. کاتێک بووک و زاوا لە کلێسا گەڕانەوە ڕێگەی نەدان بێنە ماڵەوە. بۆ وی ئەوان مردبوون. لە بەر ئەوە خانوویەکیان ڕووبەڕووی گۆڕستان بەکرێ گرت. تەنیا کەلوپەلی ماڵەوە، جۆلانەی خۆزێ ئارکادۆ بوو. شەوی زەماوەند دووپشکێک کە چووبووە نێو کەوشی ڕاحەتی ڕێبێکا پێوەی داو و نوتقی بەسترا، بەوحاڵەش ئەو مەسەلەی مانگی هەنگوینیی نەشێواند. دراوسێکان لەو هاوارنەی کە شەوی هەشت جار و ڕۆژی سێ جار کاتی خەوی پاش نوەڕۆیان هەموو خەڵکی گەڕەکی هەڵدەستاند، سەریان سوورمابوو و دوعایان دەکرد ئەو شەهوەتە شێتانەیە خەوی مردیی گۆڕستان ئاڵۆز نەکا. ئۆرلیانۆ، تەنیا کەسێک بوو دەگەیشتە هیمدادیان. چەند مۆبل و هێندێک کەلوپەلی بۆ کڕین و پارەی دانێ، هەتا سەرەنجام خۆزێ ئارکادۆ گەڕایەوە جیهانی ڕاستی و لە زەوییەک، کە بە سەر باخچەی ماڵەوە بوو هی کەس نەبوو کەوتە کار. بەڵام ئامارانتا هەرچەند ژیان ئاسوودەییەکی وای دابوویە کە بە خەیاڵیشدا نەدەهات، ڕقی ڕێبێکای لە دڵ نەچووە دەرێ. لە سەر بڕیاری ئۆرسۆلا، کە نەیدەزانی چۆن سەرپۆش لە سەر ئەو ڕیسواییە دابنێ، پیترۆکرێسپی هەروەک جاران ڕۆژانی سێ شەممە بۆ نەهار دەهاتە ماڵەوە و بە غروور و سەربڵیندی و ئارامی تێشکانی خۆی تەحەممول دەکرد. لە بەر ڕێزدانان بۆ ئەو بنەماڵەیە رووبانی ڕەشی هێشتا لە کڵاوەکەی نەکردبۆوە و بە هێنانی دیاریی سەیر و سەمەرە دڵسۆزیی خۆی سەبارەت بە ئۆرسۆلا پێشان دەدا، سادرینی پرتەقاڵی، مرەبای گوڵی سووری تورکیە، جارێکیشیان شاڵی دەسکردی مانیلی هێنابوو. ئامارانتا بە ڕووخۆشی لەگەڵی بەرەوڕوو دەبوو، ویستەکانی جێبەجێ دەکرد، بەنی سەردەستانی بۆ دەبڕی و بۆ ڕۆژی لەدایکبوونی، لە سەر دوازدە دەسرە

پیتی یەکەمی ناوی ئەوی گوڵدۆزی کرد. رۆژانی سێ شەممە دوای نەهارێ بۆ گوڵدۆزی دەرۆیشتە هەیوانێ. پیترۆکرێسپی لە لای دادەنیشت و کەسێک کە هەمیشە لە بەرچاوی کێکی بچکۆلانە بوو، ئێستا بۆتە ژنێکی تازە. هەرچەند زۆر خۆش ئەخلاق نەبوو، بەڵام سەبارەت بە کاروباری دونیا هەستێکی غەریب و جوانییەکی نادیاری هەبوو.

رۆژێکی سێ شەممە، پیترۆکرێسپی داوای لێکرد مێردی پێ بکا. هەموویان زوو یان درەنگ چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد. ئامارانتا هەروا کە خەریکی گوڵدۆزی بوو، راوەستا هەتا سوورایی دەموچاوی لە بنانگوێیان تێپەڕێ و ئەو جار بە دەنگێکی ماقوولانە وتی: "دیارە کێسپی، بەڵام پیویستە یەکتر باشتر بناسین، پەلەکردن کاری شەیتانە."

ئۆرسۆلا گێژ و هێر ببوو. لەگەڵ ئەو رێزەش کە بۆ پیترۆکرێسپی دادەنا، نەیدەتوانی تێبگا بڕیاری تازەی ئەو دوای دەسگیرانیی دوور و درێژە لەگەڵ رێبێکا لە باری رەوشتەوە چاکە یا نا. سەرەنجام دوای ئەوەی کەس بەشداریی گومانی نەکرد وەک راستییەک قبووڵی کرد. ئۆرلیانۆ، کە پیاوی ماڵێ بوو، بە دەربڕینی ئاخر بیروڕای خۆی ئەوی زۆر لە جاران پەرێشانتر کرد.

- ئێستا کاتی ئەوەنییە کەس لە فکری زەماوەند دابێ.

ئەو بۆچوونە کە ئۆرسۆلا دوای چەند مانگان توانی لە ماناکەی تێبگا، تەنیا بیروڕایەکی بێ گرێ و گۆڵ بوو کە ئۆرلیانۆ لەو کاتدا - نەتەنیا سەبارەت بە زەماوەند، بەڵکو سەبارەت بە هەموو شت بێجگە لە شەڕ، هەیبوو. بۆخۆی کاتێک لە بەرامبەر دەستەی تیرەبارانـدا راوەستابوو، نەیدەزانی چۆن کۆمەڵێک رووداوی یەک لە دوای یەک ئەویان گەیاندۆتە ئەو شوێنە. مەرگی رێمیدیۆس، بەپێچەوانەی چاوەڕوانی، ئەوی داماو و خەمبار نەکرد، هەستی بە توورەیییەکی نادیار دەکرد کە بەرە بەرە خاو دەبۆوە، وەک ئەو کاتەی بڕیاری دابوو بێ ژن بژی. جارێکی دیکەش سەری نایەوە نێو کارەکەی، بەڵام دومینەی لەگەڵ خەزووری تەرک نەکرد. لە ماڵێکدا کە تازییە دەرگای لە هەموو شتێک داخستبوو، وتووێژی شەوانە، هاوڕێیەتیی

ـە نێو ئەو دوو پیاوەدا بەهێز کرد. باوکی ژنەکەی پێی دەگوت: "ئۆرلیانۆ، ژنیکی دیکە بێنە، من شەش کچم هەیە یەکێک لەوان هەڵبژێرە."
کەرەتێک، شەوی هەڵبژاردن، کاتێک دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە لە یەکێک لە ســەفەرەکانی دەگەڕایەوە، بە توندی سەبارەت بە وەزعی سیاسیی وڵات نیگەران بوو، ئازادیخوازان بڕیاری شەڕیان لەگەڵ حکوومەت دابوو. لەو کاتەدا ئۆرلیانۆ بە دروستی جیاوازیی نێوان ئازادیخوازان و پارێزەرانی نەدەزانـــی، لەو بــارەوە خەزووری هێنــدێک دەرســـی دادا و وتـــی: ئازادیخوازان فراماسیۆنێرن، خەڵکێکی بەدزاتن کە دەیانەوێ کەشیشان لە دار بدەن و مارەکردن و تەڵاق بڕەو پێ بدەن و منداڵانی شەرعی و ناشەرعی مافی بەرامبەریان هەبێ و وڵات لە دەست کاربەدەستانی بەرزی ئێستا دەربێنن و حکوومەتی فیدراڵ بهێننە سەرکار." لە لایەکی دیکەشەوە پارێزەران کە خوازیاری بوونی نەزمی گشتی و ڕێزگرتنی بنەماڵە و بەرگری لە ئایینی مەسیح بوون، هێزی بنەڕەتییان بەدەستەوە بوو و بە هیچ جۆر ئامادە نەبوون وڵات ببێتە پاشاگەردانی. ئۆرلیانۆ لە سەر بناخەی هەستەکانی بەشەریی خۆی، سەبارەت بە مافی منالانی ناشەرعی لەگەڵ ئازادیخوازن هاودەنگ بوو، بەڵام بەهەر حاڵ تێنەدەگەیی چۆن کەسێک دەگاتە قۆناخێک کە بە خاتری شتانێکی نادیار بەشەڕ بێ.
لای وابوو زیادییە، کە خەزووری، لەبەر هەڵبژاردن شەش سەربازی چەکداری بە فەرماندەیی سەردەستەیەک هێناوەتە گوندێک، هیچ کاری بە سیاسەتەوە نەداوە. سەربازەکان هاتن و ماڵ بە ماڵ گەڕان و هەموو چەک و ساتۆر و تەنانەت چەقۆی ئاشپەزخانەشیان کۆکردەوە و دەستیان بە سەردا گرت. ئەو جار بە سەر ئەو پیاوە گەنجانەی کە تەمەنیان لە بیست و یەک ساڵ پتر بوو، وەرەقەی شین، کە ناوی پاڵێوراوانی پارێزەرانی لێ نووسرابوو، وەرەقەی سوور کە ناوی پاڵێوراوانی ئازادیخوازانی لێ نووسرابوو، بڵاوکردەوە. شەوی پێش هەڵبژاردن، دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە خۆی فەرمانێکی خوێندەوە کە فرۆشی خواردنەوەی ئەلکهۆلی و کۆبوونەوەی سێ کەس کە لە بنەماڵەیەک نەبن لە نیوەشەو بەولاوە قەدەغەیە. هەڵبژاردن بە بێ ڕووداو بەڕێوە چوو، سەعاتی هەشتی بەیانیی

رۆژی یەکشەممە، سندووقی تەختەی دەنگدانیان لە مەیدان دانا. شەش سەرباز پارێزگارییان لێ دەکرد. دەنگدان بە تەواوی ئازاد بوو. ئۆرلیانۆ نزیک بە تەواوی ئەو رۆژەی لە لای خەزووری مایەوە، هەتا وریا بێ کە لە دەنگێک زۆرتر لە سندووق نەهاوێژێ. سەعاتی چوار پاش نیوەڕۆ بە تەپڵ لێدان کۆتایی هەڵبژاردنیان راگەیاند و دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە سندووقی دەنگەکانی چەسپ کرد و بە مۆری خۆی مۆری کرد. ئەو شەوە، کاتێک لەگەڵ ئۆرلیانۆ دومینەی دەکرد، فەرمانی دا بە سەر دەستە، قفڵ و مۆری سندووقێ بشکێنن و دەنگەکان بژمێرێ. ژمارەی دەنگەکانی سوور و شین هەتا رادەیەک بەرامبەر بوو، بەڵام سەردەستە تەنیا دە وەرەقەی سووری لە سندووقدا هێشتەوە و ماوەکەی بە وەرەقەی شین پڕ کردەوە. جارێکی دیکە سندووقیان کلۆمدایەوە و مۆریان کردەوە و بەیانیی رۆژی دواتر بۆ مەرکەزی ئوستانیان بەڕێ کرد. ئۆرلیانۆ: "ئازادیخوازان بەشەڕ دێن." دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە هێرشی دایە سەر داشەکانی دومینە، وتی: "ئەگەر ئەوەی بە خاتری گۆڕینی دەنگەکان دەلێی، ئەوان شەڕ ناکەن، چەند وەرەقەیەکی سوورمان لە سندووقدا هێشتۆتەوە هەتا ناڕەزایی دەنەبڕدرێ." ئائۆلیانۆ زیانی لە کەمایەتی کەوتنی دەرک کرد و وتی: "ئەگەر من ئازادیخواز بام بە خاتری ئەو وەرقانە شەرم دەکرد." خەزووری لە سەرووی عەینەکەکەیەوە چاوێکی لێکرد.

وتی: "ئۆرلیتۆ، راستە تۆ زاوای منی، بەڵام ئەگەر ئازادیخواز بای، گۆڕینی دەنگەکانت چاو پێ نەدەکەوت."

تووڕەیی خەڵک لە بەر ئەنجامی هەڵبژاردن نەبوو، بۆ ئەوەی بوو سەربازەکان چەکە زەوتکراوەکەیانیان نەدابۆوە. چەند ژن لەگەڵ ئۆرلیانۆ قسەیان کرد و داوایان لێکرد خەزووری بدوێنێ کە چەقۆکانی ئاشپەزخانە بدەنەوە.

دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە زۆر بە دزییەوە بۆی روون کردەوە، سەربازەکان چەکەکانیان لەگەڵ خۆیان بردووە، هەتا پێشان بدەن ئازادیخوازن خۆیان بۆ شەڕ ئامادە دەکەن. ئۆرلیانۆ زۆر ترسا، بەڵام هیچی نەوت. شەوێک کە خرینیلدۆ مارکیز و امگنیگیکۆ وێسبال و چەند هاوڕێی دیکە سەبارەت بە

چەقۆکانی ئاشپەزخانە دەدوان، لێیان پرسی کە ئازادیخوازە یان پارێزەر.
ئۆرلیانۆ بێ راوەستان وتی: "ئەگەر بڕیار بێ شتێک بم، دەبمە ئازادیخواز،
چونکە پارێزەران زۆر ساختەچین."
سبەی ئەو رۆژە، لە سەر داوا و پێداگرتنی هاوڕێکانی بۆ چاری نەخۆشیی
جگەر چوو بۆ لای دکتۆر ئالیریۆ نۆگرا. ئۆرلیانۆ تەنانەت ناوی ئەو
نەخۆشییەی نەشدەزانی. دکتۆر ئالیریۆ نوگرا چەند ساڵ بوو بە باولییەک
ناو دەرمان و حەبی بێ تام و رووپۆشێکی پزیشکی هاتبووە ماکۆندۆ.
بەدبەختیی نوێ، بەدبەختیی کۆنی لەبیر بردەوە، ئەو لە راستیدا
تەڵەکەبازێک بوو. لە پشت پەردەی پاکی پزیشکێکی ئاسایی، رووی
پیاوکوژێک شارابۆوە کە چەکمەی لاسک درێژی دەپێ دەکرد هەتا برینی
پێنج ساڵی زنجیر لە بەلەکی لاقی بشارێتەوە. لە یەکەم رووداوی
فیدرالیستی زیندانی کرابوو و توانیبووی بۆکوراسائۆ رابکا. بۆ ئەوەی کەس
نەیناسی، لیباسێکی کە لە هەموو شت لێی بێزارتر بوو دەبەری
کردبوو:عەبای کەشیش. بە دوای دەورەیەکی درێژی دوورخراوەیی، بە
هاندانی هەواڵی ئەو دوورخراوانەی دوورگەکانی کاریبی کە دەهاتنە
کوراسائۆ سواری کەشتییەکی شتومەکی قاچاخ بوو و بە شووشە
حەبەکانییەوە، کە هەر قەند بوون و، دیپلۆمێکی ساختەی دانیشگای لایپزیک
هاتە رێۆهاشا و لەوێ لە ناهومێدییان گریا. زەوقی فیدارلیستی کە
دوورخراوەکان وەک باروتێکیان دادەنا کە هەرئان لەوانەیە بتەقێتەوە، بە
هیوایەکی پووچی هەڵبژاردن گۆڕدرابوو. پزیشکی ساختە لەو شکانەوەیە
رەنجابوو و بە هیوای دۆزینەوەی شوێنێ بۆ رۆژگاری پیری پەنای بۆ
ماکۆندۆ هێنابوو. لە لایەکی مەیدان ژوورێکی گچکەی بەکرێ گرتبوو کە پڕ
بوو لە بوتری و شووشە دەرمان. ماوەی حەوت ساڵان، بە پووڵی ئەو
نەخۆشانە ژیا کە هەموو دەرمانێکیان تاقی کردبۆوە و کەڵکی نەدابوو و
سەرەنجام خۆیان بە حەبەکانی ئەو دڵخۆش دەکرد. لەو ماوەیەی کە دۆن
ئاپۆلینار مۆسکوتە هێزێک بوو بۆ رازانەوە، وردەی شۆڕشگێری لە ئارامی
و بێدەنگیدا خەوتبوو و هەموو کاتی خۆی بۆ چارەی هەناسەتەنگی بەکار
دەهێنا. نزیکبوونەوەی هەڵبژاردن جارێکی دیکەش سەرەداویشۆڕشی

داتەوە دەست. پەیوەندیی بەو گەنجانەوەکرد کە شارەزاییەکی ئەوتۆی سیاسییان نەبوو، پێوەندیی گرت و هانی دان.
وەرەقەی سوور کە لە سندووقی دەنگداندا دەبینران و بە پێی بڕوای دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە تەنیا لایەنی هاندانی وردبینی لاوانی هەبوو، بەشێک بوو لە نەخشەی ئەو. لایەنگرانی خۆی ناچار بە دەنگدان کرد هەتا دەرکەوێ هەڵبژاردن قسەی خوڕاییە و بەس. دەیوت: "تەنیا کردەوەی کاریگەر. شۆڕشە." زۆربەی هاوڕێکانی ئۆرلیانۆ موافیقی لە نێوبردنی ئەو شارەوانە پارێزەرە بوون، بەڵام هیچ کامیان نە لە بەر ئەوە ئۆرلیانۆ خزمی شارەوان بوو، بەڵکو لە بەر ڕەوشتی دوورەپەرێزی و ئاڵۆزیی ئەو، نەیانوێرا ئەو لەو نەخشەیەدا بەشدار بکەن. لە لایەکیشەوە دەیانزانی کە ئەو بە دەستووری خەزووری بە ڕەنگی شین دەنگی داوە. لەو بارەوە تەنیا بە ڕێکەوت بوو ئۆرلیانۆ بیروڕای ساسیی خۆی دەربڕی و هەروەها لە بەر پشکنینی چاوی بۆ نەخۆشییەکی کە نەیبوو، بۆ چاوپێکەوتنی دکتۆر ڕۆیشت. لە ژوورێکی گچکە کە ڕایەڵەی جاڵجاڵوکەکان بۆنی کافووریان لێدەهات خۆی لە بەرامبەر ئیگوانایەکدا دیت کە کاتێک هەناسە هەڵدەکێشێ سییەکانی فیکە لێدەدا. دکتۆر پێش هەموو شتێک بردییە لای پەنجەرە و پێڵووی چاوەکانی چاو لێکرد. ئۆرلیانۆ لە سەر سپاردەی هاوڕێکانی وتی: "ئەوێ نییە." پەنجەی لە سەر جگەری داگرت و لێی زیاد کرد "دەردێک کە هەتا ڕۆژ ناهێڵێ بخەوم ئێرەیە." ئەو کات دکتۆر نوگرا بەوبیانووە کە تینی هەتاو زۆر توندە پەنجەرەی داخست و بە وتەی ساکار بۆی باس کرد کوشتنی پارێزەران لە ئەرکەکانی نیشتمانپەروەرییە. هەتا چەند ڕۆژان ئۆرلیانۆ شووشەیەکی حەب لە گیرفانی کراسیدا بوو و هەر بە دوو سەعاتان دەری دێنا و سێ حەبی لە سەر دەستی دادەنا و دەیهاویشتنە دەمی هەتا لە سەرەخۆ بە زمانییەوە بتوێنەوە. دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە گاڵتەی بە بیروباوەڕی ئەو سەبارەت بە دکتۆر و دەرمان دەکرد، بەڵام پیلانگێران ئەویان لە خۆیان دەزانی. نزیک بە تەواوی کوڕەکانی دامەزرێنەری گوند لەو مەسەلەیەدا بەشدا بوون، بەڵام هیچ کامیان بەڕوونی نەیاندەزانی بۆ چ شتێک پیلان دەگێڕن؟ بە هەر حاڵ ڕۆژێک، کە دکتۆر نهێنیی ئەو پیلانەی بۆ

ئۆرلیانۆ ئاشکرا کرد، ئەو بەشداریی نەکرد. هەر چەندە بڕوای بە پێویستیی لەنێوبردنی حکوومەتی پارێزەران هەبوو، بەڵام ئەو نەخشەیە ترساندی. دکتۆر نوگرا بڕوای بە کوشتنی کەسان هەبوو. بۆچوونی ئەو بریتی بوو لە زنجیرەیەک جینایەتی فەردی کە لە پڕ سەرتاسەری وڵاتی دادەگرت و سەرانی حکوومەت بە بنەماڵەوە، بەتایبەتی مناڵان دەکوژران، مناڵان لە بەر ئەوە کە پارێزەران بەتەواوی ریشەکێش بن و نەمێنن. دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە، ژن و شەش کچەکەی، بە ئاسایی، بە بەشێک لەو لیستەیە دەژمێردران.
ئۆرلیانۆ بێ ئەوەی لە سەرەخۆیی خۆی لە دەست بدا، پێیگوت: "ئێوە نە ئازادیخوازن نە هیچ شتێک، قەسابن و بەس."
دکتۆر بەئارامی وەڵامی دایەوە: "کەوابوو شووشە حەبەکەم بدەوە ئیتر پێویستت پێی نییە." ئۆرلیانۆ شەش مانگ دوایی تێگەیی کە دکتۆر لە بەر گیانی هەڵەشەیی و نەسازاو و گۆشەگیری ئەو، وەک پیاوێکی تێکۆشەر و بەکەڵک دەستی لێ شۆردووە. تێدەکۆشان هەمیشە لە ژێر چاوەدێردا بێ، چونکە دەترسان پیلانەکەیان ئاشکرا بێ. ئۆرلیانۆ دڵنیای کردن و قەولی دا لەو بارەوە هیچ نەدرکێنێ، بەڵام شەوێک کە بۆ قەڵاچۆی بنەماڵەی مۆسکوتە رۆیشتن، ئەویان لە بەر دەرگای ماڵەوە بینی ئامادەی بەرگرییە. وەها لێبڕاوانە بۆ بەرگری ئامادە بوو، کە جێبەجێکردنی نەخشەکەیان بۆ ماوەیەکی نادیار بەدوا خرا. لەو رۆژانەدا بوو ئۆرسوڵا سەبارەت بە زەماوەندی پیترۆکرێسپی و ئامارانتا پرسیاری لێ کرد، ئەو وەڵامی دایەوە ئەو کاتە بۆ ئەو جۆرە مەسەلانە لەبارنییە. هەفتەیەک بوو دەمانچەیەکی کۆنی لە بن کراسیدا شاردبۆوە و هەمیشە وریای هاورێکانی خۆی بوو. دوای نیوەڕۆیان بۆ قاوەخواردنەوە دەڕۆیشتە ماڵی خوزێ ئارکادۆ و ڕێبیکا، کە بەرە بەرە سەروسامانێکیان بە وەزعی خۆیان دابوو. لە سەعاتی حەوت بەدواوە لەگەڵ خەزووی دومینەی دەکرد. لە سەر نەهاریێ لەگەڵ ئارکادیۆ، کە ببوو بە کوڕێکی باڵابەرز، قسەی دەکرد و وای دەهاتە بەرچاو کە رۆژ بە رۆژ مەیلی بۆلای شەڕ دەکشا. لە قوتابخانەی ئارکادیۆ، کە قوتابیی لە خۆی گەورەتر لەگەڵ منداڵی تازەزمان گرتوو تێکەڵ بوون،

ئاگری حیزبی ئازادیخواز هەمووی وەجۆش هێنابوون. قسە لە کوشتنی نیکانور و کردنی کڵێسا بە قوتابخانە و دامەزراندنی ئەوینی ئازادانە دەکرا. ئۆرلیانۆ تێدەکۆشا بلێسە و تینی ئەو دامرکێنێتەوە. ئامۆژگاریی دەکرد کە لە سەرەخۆ بێ و وریای کردەوەکانی بێ. ئارکادیۆ کە گوێی نەدەدایە دەلیل و بۆچوونی دروست و واقیعبینی ئەو،لە لای هەمووان لاوازیی رەوشتی ئەوی سەرزەنشت دەکرد. ئۆرلیانۆ چاوەڕوان مایەوە. سەرەنجام رۆژێک لە رۆژەکانی سەرەتای مانگی دێسەمبەر ئۆرسوڵا بە پەرێشانی هاتە کارگە – شەڕ بووە!

لە راستیدا شەڕ سێ مانگ پێشتر دەست پێکرابوو. لە سەرتاسەری وڵات حکوومەت نیزامی دامەزراندبوو. تەنیا کەسێک کە دەستبەجێ زانیبووی، دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە بوو، بەڵام تەنانەت بە ژنەکەشی نەوت کە دەستەی ئەرتەشی، کە بڕیارە شار داگیر بکا، بەڕێوەیە. بەرەبەیان نەبوو هاتنە نێو شار. دوو تۆپخانەی سووک بە سەر پشتی هێسترانەوە بوو. ستادی خۆیان لە مەدرەسە دامەزراند، هاتووچۆی شەوانیان دوای سەعاتی شەشی ئێوارە قەدەغە کرد. لە جاری پێشوو وردتر گەڕان. ماڵ بە ماڵیان پشکنی ئەوجار تەنانەت کەلوپەلی کاری وەرزێڕیشیان داگیر کرد.

دکتۆر نۆگرایان کێشایەدەر و لە مەیدانێ بە دارێکیان بەستەوە و بێ هیچ دادگایەکی یاسایی تیرەبارانیان کرد. قەشە نیکانور تێکۆشا بەرپرسایەتی ئەرتەش بخاتە ژێر کارتێکردنی موجیزەی فڕین لە خودا. بەڵام سەربازێک قۆنداخێکی تفەنگی بە سەردا دا. گوڕ و تینی ئازادیخوازان لە ترسێکی تێکەڵاو لەگەڵ بێدەنگیدا خنکێنرا. ئۆرلیانۆ رەنگپەڕێو و مەرموز، وەک جاران لەگەڵ خەزووری دومینەی دەکرد. دەیزانی کە دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە هەر چەند رێبەری نیزامی و غەیرە نیزامیی شارە، بەڵام لە راستیدا جارێکی دیکەش بۆتە خاوەن پلەیەکی بێ نێوەڕۆک. فەرماندە هەگ بڕیارەکانی دەدا کە بۆ نەزمی گشتی هەموو رۆژێ بەیانیان باجیان کۆ دەکردەوە. چوار سەرباز، کە لە ژێر فەرمانی ئەودا بوون، ژنێک کە سەگی هار گرتبووی، بەزۆر لە ماڵەوەیان هێنادەرێ و بە قۆنداە تفەنگان کوشتیان. رۆژێکی یەکشەممە دوو حەفتە دوای داگیرکردنی شار ئۆرلیانۆ رۆیشتە

ـالی خرینیلدۆمارکیز و بە ڕەفتاری خۆماڵیی هەمیشـەیی داوای فنجانێکی قاوەی بێ شەکری کرد. کاتێک دوو بە دوو لە ئاشپەزخانە بەتەنیا مانەوە، ئۆرلیانۆ بە دەنگێک کە تا ئێستا هێزێکی ئەوتۆی تێدا نەبینرابوو، وتی: "هاوڕێیان ئامادە کە، هەتا بڕۆین بۆ شەڕ." خرینیلدو مارکیز باوەڕی بە قسەکانی نەکرد.

پرسی: "بە کام چەک؟"

ئۆرلیانۆ وتی: "بە چەکی ئەوان."

نیوەشەوی سێ شەممە، بیست و یەک پیاوی گەنج، کە لە سی ساڵ کەمتر بوون، بە ڕێبەریی ئۆرلیانۆ بویندیا و چەکدار بە چەقۆی ئاشپەزخانە و شتانی تیژی دیکە، هێرشیان بۆ پادگان برد. دەستیان بە سەر چەکەکاندا گرت و لە حەوشە سەروان و چوار سەربازەکەی ژنە سەگی هارگرتووەکەیان کوشتبوو، گوللەباران کرد.

هەر ئەوە شەوە، کاتێک دەنگی تیرەباران دەبیسترا، ئۆرلیانۆ بە ڕێبەری نیزامی و غەیرەنیزامی هەڵبژێرا. شۆڕشگێڕانی خاوەن ژن دەسبەجێ لە هاوسەرەکانیان خواحافیزییان کرد و بەرەبەیانی لە نێو شادی و خۆشحاڵیی خەڵکانێک کە لە ترس و وەحشەت ڕزگارییان ببوو، شاریان بەجێ هێشت هەتا بچنە پاڵ هێزی ژەنەراڵی شۆڕشگێڕ، ویکتۆریۆ مێدینا، کە بەپێی ئاخرین هەواڵ لە شاری مانائورە نزیک دەبۆوە. ئۆرلیانۆ، پێش حەرەکەت دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتەی لە خەڵوەتی دەرهێنا و پێیگوت: " خەزوور دڵنیابە، حکوومەتی تازە قەولی شەرەف دەدا کە لە مافی تۆ و بنەماڵەکەتان بەرگری بکا."

دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە بەزەحمەت دەیتوانی باوەڕ بکا کە ئەو پیلانگێڕە چەکمەپۆشەی تفەنگی بە شانەوەیە، ئەو کەسەیە هەتا سەعاتی نۆی شەو لەگەڵ ئەو دومینەی کردووە.

بە سەر سوورمانەوە وتی: "ئۆرلیانۆ ئەوە بەتەواوی مانا شێتییە."

ئۆرلیانۆ وتی: "شێتی نییە، شەڕە. لەوە بەدواوە پێم مەڵێ ئۆرلیتۆ، لێرە بەدواوە من سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیام."

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا سی و دوو کەرەت راپەڕی و، لە هەمووشیاندا تێ شکا. لە حەڤدە ژنی جۆراوجۆر بوو بە خاوەنی حەڤدە کوڕ، کە هەر هەموویان پێش ئەوەی بگەنە تەمەنی سی و پێنج ساڵی، یەک لە دوای یەک کوژران. لە چاردە تەمای کوشتن و حەفتا و سێ داو و ، تیرەبارانێک گیانی بە سلامەت دەرکرد. لە خواردنەوەی پیاڵەیەک قاوە کە (ستیرکنین)ی تێکرابوو و کەڵی دەکوشت، نەمرد. نیشانی لیاقەت، کە سەرکۆمار بۆی دانابوو وەری نەگرت. بوو بە فەرماندەی هێزی شۆڕشگێڕان. مەڵبەندی فەرماندەیی لەو سنوورەوە هەتا ئەو سنوورە درێژەی هەبوو. پیاوێک کە دەوڵەت لە هەموو کەس زۆرتری لێ دەترسا، بەڵام هیچ کات رێگەی نەدا وێنەی لێ بگرن، مووچەی خانەنشینیی نەویست کە دەوڵەت دوای شەڕ بۆی بڕیبۆوە و، هەتا تەمەنی پیری بە فرۆشی ئەو ماسییە چکۆڵە زێڕانە ژیا کە لە کارگای خۆی لە ماکۆندۆ دروستی دەکردن. لەگەڵ ئەوەشدا، وەک فەرماندە هەمیشە لەگەڵ هاورێکانی بەشداری شەڕ بوو و قەت بریندار نەبوو. تەنیا جارێک کە بریندار بوو، دوای مۆرکردنی پەیماننامەی نێئرلاندیا بوو کە کۆتایی بە شەڕەکانی بیست ساڵە دەهێنا. بۆ خۆی خۆی بریندار کرد. دەمانچەیەکی لە سینگی خۆیدا، بەڵام گولله لە پشتی چووەدەرێ و نەیکوشت. تەنیا شتێک کە لەو هەموو بەسەرهاتە مایەوە، شەقامێکی ماکۆندۆ بوو کە بۆ رێزگرتن ناوی ئەویان لە سەر دانابوو. بەڵام هەر بەو شێوە کە بۆخۆی چەند ساڵ پێش مردنی وتی، بەیانیی ئەو رۆژە کە لەگەڵ بیست و یەک پیاو شاریان بەجێ هێشت، هەتا لەگەڵ هێزی ژەنەراڵ ویکتۆر یومیدینا تێکەڵ بن، هەرگیز چاوەڕوانی هیچ کام لەو رووداوانەی نەدەکرد.

پێش رۆیشتن، تەنیا بە ئارکادیۆی وت: "ماکۆندۆ بە تۆ دەسپێرم، ئەو لە وەزعێکی چاکدا دەدەمە دەست تۆ. تێبکۆشە کاتێک ئێمە دەگەڕێینەوە، وەزعەکەت چاکتر کردبێ."

• ئارکادیۆ سپاردەی ئەوی بە پێی سەلیقەی خۆی بەکار هێنا. بەکەڵک وەرگرتن لە وێنەکانی یەکێک لە کتێبەکانی مێلکیادێس ئۆنیفۆرمی نیزامیی بۆخۆی دروست کرد کە سەرشانەکانی چندرابوون، شمشیری سەروانی

تیرەباران کراوی بە گوڵێنگەی زێڕکفتەوە بە قەدییەوە هەڵاوەسی. دوو تۆپی لە دەروازەی شار دابەستن و لیباسی نیزامیی دەبەر قوتابیانی، کە بزخۆی هانی دابوون، کرد و بە چەکەوە بەرەڵڵای شەقامی کردن هەتا لە بەرامبەر بێگانانادا بێز بنوێنن. فێڵێکی دوو لایەنە بوو. هێزی دەوڵەتی هەتا دە مانگان نەیوێرا هێرش بکا و سەرەنجام کاتێک هێرشی کرد، لەشکرێکی ئەوتۆی ناردبوو کە لە ماوەی نیو سەعاتدا شاریان داگیر کرد. ئارکادیۆ لە هەوەڵین رۆژی حکوومەتی خۆی پێشانی دا کە زۆر حەز لە بڕیارنامە دەکا. رۆژی چوار بڕیارنامەی دەخوێدنەوە و هەرچی بە مێشکیدا هاتبا لەوێدا دەیگونجاند. خزمەتی سەربازیی بۆ کوڕانی زیاتر لە هەژدە ساڵ کردە ئیجباری. رایگەیاند هەر حەیوانێکی دوای سەعاتی شەشی ئێوارە لە شەقام ببیندرێ، دەستی بە سەردا دەگیرێ. پیرەپیاوەکانی ناچار کرد قۆڵبەندی سوور ببەستن. رۆیشتە ماڵی قەشە نیکانور و بە هەڕەشەی گوللەبارانکردنی ڕێوڕەسمی نوێژیان قەدەغە کرد و ناقووسی کڵێسایان تەنیا بۆ راگەیاندنی سەرکەوتنی ئازادیخوازان لێدەدا. بۆ سەلماندنی راستی نەخشەکانی، دەستەیەکی گوولەبارانی پێکهێنا و فەرمانی دا داوەڵێکیان لە مەیدانی شار گوللەباران کرد. لە پێشدا کەس پێی وا نەبوو کارەکە راستییە، بە چاوی کۆمەڵێک قوتابی تەماشایان دەکردن کە لاسایی گەوران دەکەنەوە، بەڵام شەوێک کە ئارکادیۆ رۆیشتە مەیخانەی کاتارینۆ و، شەیپوورچی دەستەی موسیقاژەنان، بە شێوەیەکی گاڵتە، بە دەنگی شەیپوور سڵاوی لێکرد و مشتەرییەکان پێکەنین، ئارکادیۆ فەرمانی دا بە تاوانی سووکایەتی بە کاربەدەستانی بەرز گوللەبارانی کەن. نارازییەکانیشی لە ژوورێکی قوتابخانەدا بەند کرد و پێی دەزنجیر کردن و تەنیا نان و ئاوی دانێ. هەر جارەی کە ئۆرسوڵا هەواڵی رووداوێکی دەبیست بە سەریدا دەقیژاند: پیاوکوژ! ئەگەر ئۆرلیانۆ بزانێ دەستووری دەدا تیرەبارانت کەن، ئەو کات من لە پێش هەموو کەسدا جێژن دەگرم!" بەڵام ئەو گوێی قەرزداری ئەو قسانە نەبوو. ئارکادیۆ ئەوەندەی درێژە بە زۆرداریی خۆیدا هەتا بە زاڵمترین حاکمی شاری ماکۆندۆ ناوبانگی دەکرد. جارێکیان دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتە وتی: "لێگەڕێ با ئازاری ئەو گۆڕانی

ڕێـژیمە بکێشـن، ئەوە هەمـان بەهەشـتی ئـازادیخوازانە کە ئارەزوویـان دەکـرد". ئارکـادیۆ ئەوەی بیسـت و لەگەڵ دەسـتەیەک سەربازپاسـدار هێرشـی کـردە ماڵیـان. مۆبـڵ و کەلـوپەلی مـاڵەوەی ورد و خاشـکرد و کچەکانی شێلاقکاری کرد و دۆن ئاپۆلینار مۆسکوتەیان لە ماڵەوە دەرکێشا. کاتێـک ئۆرسـۆلا بە هـاوار هـاوار و بە راکـردن و لە حاڵێکـدا شـێلاقێکی قیلاویـی هەڵدەسـووراند و لە شـار تێـپەری و خـۆی گەیانـدە حەوشـەی سەربازخانە، ئارکادیۆ بۆخۆی راوەستابوو فەرمانی گوللەباران بدا.

ئۆرسۆلا هاواری کرد: "حەرامزادە! ئەگەر پیاوی ئەو کارە بکە."

پێش ئەوەی ئارکادیۆ دەرفەتی دژکردەوەیەکی هەبێ، یەکەم شێللاقی لێدا.: "پیـاوکوژ ئەگەر پیـاوی ئەو کـارە بکە. بیـژوو! منـیش بکـوژە هەتـا چـاوی ئەوەم نەبێ لە خەجاڵەتی گەورەکردنی دێوێکی وەک تـۆ فرمێسـک بڕێژم." بە بێ بەزەیـی لێـی دەدا. هەتـا ئەولای حەوشـەکە راوی نـا. ئارکـادیۆ وەک شـەیتانۆکە لە قـاپێلکی خۆیدا خڕ ببۆوە. دۆن ئاپۆلینـار مۆسـکوتەیان بە بێ هۆشـی بە دارێـکەوە، بەسـتبۆوە، کە پێشـتر داوەڵەکەیـان لـێ گوللەبـاران کردبـوو و لە بەر گـوللان ببـووە هەزار تـیکە. کوڕەکـانی دیـکە لە ترسـی ئەوەی ئۆرسۆلا راویان نەنێ بڵاو بوون، بەڵام ئۆرسـۆلا هەر چاویشـی لـێ نەکـردن. ئارکـادیۆی بە جلـی نیزامیـی دڕاو، لە کاتێکـدا لە بەر ژان و رق دەینەڕانـد بەجـێ هێشـت. دۆن ئاپۆلینـار مۆسـکوتەی لە دارەکە کـردەوە بـردییەوە مـاڵێ و پـێش ئەوە سـەربازخانە بەجـێ بێڵـێ زنجیـری لە پێـی گیراوەکان دەرهێنا.

لەوە بەدواوە بەڕێـوەبەریی شـار کەوتە ئەسـتۆی ئۆرسـۆلا. دیسـان ڕێوڕەسـمی نوێژی دامەزرانـدەوە، قۆڵبەنـدی سـووری لە قـۆڵی پیرەپیـاوان دەرهێنـا و بڕیارنامەکـانی هەڵوەشـاندن. بەڵام لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەشـدا کە بووی، هێشتا فرمێسکی بۆ چارەنووسی خۆی دەڕشت. ئەوەندە هەستی بە تەنیایی دەکرد کە پەنای بۆ هاودەمیی بێ کەڵکی مێردەکەی برد، کە لە بن داربەڕووەکە فەرامۆش کرابوو. هەروا کە بـارانی مـانگی ژوویەن هەڕەشـەی رووخاندنی لە سێبەر کەپرەکە دەکرد، بە مێردەکەی وت:"بزانە گەیشـتووینە چ رۆژێکی. ماڵی چۆڵ تەماشاکە. منداڵەکانمان لە هەموو دونیایە بڵاو بوون

و ئێمە دووکەس وەک پێشوو دیسان بە تەنیا ماوینەوە." خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا کە بەتاڵایەکی نادیار دا رۆچووبوو، گوێی بیستنی سکاڵای ئەوی نەبوو. لە سەرەتای شێتیدا، پێویستییەکانی رۆژانەی بە زمانی لاتین دەردەبڕی و ،کاتێک ئامارانتا خواردنی بۆ دەهێنا، بە تێگەیشتنێکی زوو تێپەڕبوو، نارەحەتی خۆی پێدەگوت و باکێش و شڵتەی خەردەلی بە رووخۆشی لێ وەردەگرت. بەڵام کاتێک ئۆرسوڵا دەچوو بۆ لای و دەردی دڵی بۆ دەکرد، ئیتر مێشکی هەموو جۆرە هەستێکی لە دەست دابوو. ئۆرسوڵا هەروا کە ئەو لە سەر تەختەی دانیشتبوو، وردە وردە دەیشۆرد و هەر لەو حاڵەشدا هەواڵی بنەماڵەی بۆ دەگێڕانەوە.

پشتی بە فڵچە و سابوونی دادەماڵێ و دەیگوت: "ئۆرلیانۆ چوار مانگ پێش چۆتە شەڕ و ئیتر هیچ هەواڵێکمان لێی نییە. خۆزێ ئارکادۆ گەڕاوەتەوە، بۆتە پیاوێکی هەیکەڵ گەورە، باڵای لە تۆش بەرزترە، هەموو لەشی خاڵکوت کردووە، بەڵام تەنیا بۆتە هۆی ئابرووبردنی ئێمە و بەس." هەستی کرد مێردەکەی بە بیستنی خەبەری ناخۆش خەمبار دەبێ، ئەو کات بڕیاری دا درۆی لەگەڵ بکا. هەروا کە خۆڵەمێشی بە پیساییەکەدا دەکرد هەتا بە خاکەنازی هەڵیگرێ، وتی: "بێگومان باوەڕ بە قسەکەم ناکەی. خواستی خوا ئەوە بوو کە خۆزێ ئارکادۆ و ڕێبێکا بە یەکەوە زەماوەند بکەن. ئێستاش بە یەکەوە زۆر بەخۆشی دەژین." ناچار بوو لە درۆکردندا راستی بەکار بێنێ، هەر ئەوەش دەبوو بە هۆی ئەوە درۆکانی ببێتە هۆی دڵدانەوەی خۆشی. وتی: "ئارکادیۆ بۆتە پیاوێکی حیسابی و کۆشا، پیاوێکی زۆر بەوردە، بە ئۆینفۆرم و شمشێرەکەیەوە، بۆتە لاوێکی زۆر خۆش قیافە." تەواو وەک ئەوە لەگەڵ مردوو قسە بکا، چونکە خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا گەیشتبووە قۆناخێک مێشکی نیگەرانیی هەست پێ نەدەکرد. بەڵام ئۆرسوڵا دیسان وازی نەدەهێنا. لە بەرامبەر قسەکانی ئۆرسوڵا هێندە ئارام و بێ هەڵوێست بوو ،کە ئۆرسوڵا بڕیاری دا لە دارەکەی بکاتەوە. بەڵام ئەو تەنانەت لە سەر کورسییەکەشی نەبزووت، هەر لەوێ لە بەر هەتاو و باران مایەوە. دەتگوت ئەو بەنانەش کەڵکێکی ئەوتۆیان لە بەستنەوەی ئەودا نەبووە، لەبەر ئەوە کە هێزێکی لە توانابەدەر ئەویان بەو قایشانەوە بە

قەدی داربەڕووەکەوە نووسـاندبوو. نزیـک مـانگی ئـووتی کە زسـتان نیـازی بـوو بـۆ هەمیشـە بمێنێتەوە، ئۆرسـۆلا تـوانی هەواڵیکی پـێ بڵـێ کە کەمێـک بۆنی راستیی لێ بێ.

پێیگوت: "هیچ باوەڕ دەکەی کە هێشتا بەختمان مـابێ؟ ئامارانتا و ئەو پیـاوە ئیتالیـاییە، کە نـوێنەر و وەسـتاکاری پیـانۆلا بـوو، نیازیـان هەیە بە یەکەوە زەماوەند بکەن."

لە راسـتیدا خۆشەویسـتیی نێـوان ئامارانتـا و پیترۆکرێسـپی لە پەنـای لایەنگریـی ئۆرسـۆلادا، کە ئەو جارەیـان بە پێویسـتی نەدەزانـی لە چاوپێکەوتنەکانیانـدا بەشـدار بـێ و چاوەدێرییـان بکـا، قـووڵتر ببـۆوە. دەسـگیرانییەکی ئێـوارانەیی بـوو. پیـاوە ئیتالیـاییەکە لای رۆژئـاوا دەهـات، گـوڵێکی یاسـەمەنی لە یەخەی کـۆتەکەی دەدا و غەزەڵەکـانی پیتـراک ی بـۆ ئامارانتـا وەرگێـرایەوە. مبالاتیـان بە هەواڵە نـاخۆش و خراپەکـانی شـەڕ نەدەدا. لە هەیوانێ، کە هەواکەی لە بۆنی خۆشی نیگەلە و گوڵی سوور پڕ ببوو، دادەنیشتن و ئەو کتێبی دەخوێندەوە و ئامارانتاش سەردەستی تۆڕی دەدروو، هەتا پێشگە ناچاری دەکرد پەنا بۆ ساڵۆن بەرنەوە.

هەستیاریی ئامارانتا و دڵسۆزیی بەپارێز و لە هەمـان کاتدا داگیرکەرانەی، وردە وردە وەک داوی جاڵجـاڵووکەی نادیـار لە دەوری دەسـگیرانەکەی دەتەنـرا، بە جۆرێـک کاتێـک سـەعات هەشـت دەردەکەوت، ناچـار دەبـوو بە سـەری ئەنگوسـتە رەنگپەڕیوەکـانی و بـێ ئەنگوسـتیلە، ئەو داوەی لە رووی خـۆی لابـدا. لەو کـارت پۆسـتە جوانـانەی کە لە ئیتالیـاوە بـۆ پیترۆکرێسـپی دەهــات، ئالبۆمێکیــان دروســت کردبــوو: وێــنەی ئاشــقان لە پــارکە دوورکەوتووەکان، بە دڵـی تیـر وێکەوتـوو و رووبـانی تەلایـی بە دنـدووکی کـۆترانەوە. پیترۆکرێسـپی هەروا کە ئـالبۆمەکەی هەڵدەدایەوە، دەیگـوت: "لە فلۆرانس چوومە ئەو باخە، مرۆڤ دەست رادەگرێ باڵندە لە سـەر دەسـتی دانـێ دەخـۆن." هێنـدێک جـار، بە دیتنـی کـارت پۆسـتێک لە وێنیـز کە بە ئاورەنـگ نەخـش کرابـوو، دڵتەنگییەکی بـۆنی قـوڕ و لیـتەی ئاوەڕۆیـانی بە بـۆنی گـوڵێکی بـۆن خـۆش دەگـۆڕی. ئامارانتـا هەناسـەی هەڵدەکێشـا و پێـدەکەنی و بیـری لە وڵاتێکـی دیـکە بۆخـۆی دەکـردەوە، کە ژن و پیـاوی

جوانچاک، بە زمانی منداڵان بە یەکەوە لە گەورەیی رابردووی شارە کۆنەکان دەدوان کە ئێستا تەنیا چەنە پشیلەیەک لە نێو کەلاوەکانیاندا دەخولانەوە. پیترۆکریسپی لە گەڕانی خۆیدا دوای پەڕینەوە لە دەریای گەورە و دوای بە هەڵەوەرگرتنی شەهوەتی ڕێبێکا لە جیاتی ئەوین، ئێستا ئەوینی دۆزیبوەوە. خۆشبەختیی ئەو هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ سامان دەرۆیشتە پێش. دووکانەکەی ئێستا کۆشکێکی گەورە بوو. خەیاڵاوی، چەند نموونەیەک لە ناقووسی فلۆرانسی بە هەوای مۆسیقای کاریلۆن سەرەسەعاتیان رادەگەیاند و، بە کردنەوەی قوتووی مۆسیقی سورنتۆ و جێگا پۆدرانی ولاتی چین، ئاهەنگەکانی پێنج نۆتی بە گوێ دەگەیشت. هەموو ئامێزەکانی مۆسیقای کە بە بیردا دەهات و تەواوی ئەسبابی کاتبەسەربردن کە ئیمکان بوو ببینێ، لە دووکانەکەی دەست دەکەوت. برا چکۆلەکەی بیرنۆکریسپی بەرپرسایەتی دووکانەکەی بەئەستۆ گرتبوو، چونکە پیترۆکریسپی ئیتر کاتی ئەوەی نەبوو تەنانەت بە دەرسەکانی مۆسیقاش رابگا. بە هیممەتی ئەو، شەقامی تورکان بە درەوشانەوەی شتی سەیر و جۆراوجۆر ببوو بە مەیدانێکی پڕ لە موۆسیقا، کە حکوومەتی زۆرداری ئارکادیۆ و مۆتەی شەڕی لەبیر هەمووان بردبۆوە. کاتێک ئۆرسولا جارێکی دیکە رێورەسمی نوێژی لە کلێسا دامەزراندەوە، پیترۆکریسپی ئۆکۆردیۆنێکی ئاڵمانی پێشکەش بە کلێسا کرد و، دەستەیەکی رێککەوتووی لە منداڵان پێکهێنا و بە ئاهەنگی گریگۆریان رێوڕەسمی نوێژی ئارامی قەشە نیکانوری رازاندەوە. هیچ کەس شک و گومانی نەبوو کە ئامارانتا بە زەماوەند لەگەڵ ئەو بەختەوەر دەبێ. بێ ئەوە هەستەکانیان زۆر دەکار بێنن، لە رەوتی سروشتی دڵی خۆیاندا بە قۆناخێک گەیشتن کە تەنیا کارێک دەبوایە بکرێ، دیاریکردنی رۆژی زەماوەند بوو. تووشی گیروگرفتێک نەبوون.

ئۆرسۆلا لە دڵی خۆیدا، خۆی مەحکووم دەکرد بە دواخستنی یەک لە دوای یەکی رۆژی زەماوەندی ئامارانتا ، چارەنووسی ئەوی گۆڕیوە و پێی خۆش نەبوو جارێکی دیکەش بە خاتری کارەساتی شەڕ و نەبوونی ئۆرلیانۆ و وەحشیگەریی ئارکادیۆ و دەرکردنی خۆزێ ئارکادۆ و ڕێبێکا لە ماڵەوە،

پرسەی بە بۆنەی مردنی ڕێمیدیۆس بخاتە پلەی دووهەمی گرینگی. بە نزیکبوونەوەی زەماوەند، پیترۆکرێسپی ڕایگەیاند کە ئۆرلیانۆ خۆزێی وەک منداڵی خۆی خۆش دەوێ و ئەو وەک کوڕی گەورە قبووڵ دەکا. هەموو شتێک وای دەنواند کە ئامارانتا بەرەو خۆشبەختی بێ ترس دەچێتە پێشەوە. ئەو بە پێچەوانەی ڕێبێکا چکۆڵەترین نیگەرانی لە خۆی نیشان نەدەدا. بەو سەبر و حەوسەڵەی ڕێبێکا کە ڕوومێزی ڕەنگ دەکرد، شاکاری تۆڕی دەدروو و تاوسی ڕەنگاوڕەنگی گوڵدۆزی دەکردن. چاوەڕوان بوو کە پیترۆکرێسپی بێ تاقەت بێ. سەرەنجام وەها ڕۆژێک لەگەڵ بارانی شوومی مانگی ئوکتوبەر گەیشتێ. پیترۆکرێسپی قەرتاڵەی بەرگدرووی لە باوەش دەرهێنا و دەستی لە نێو دەستی خۆی گرت و گوشی و پێیگوت: "لەوە زیاتر توانام نییە. مانگی دیکە زەماوەند بکەین." ئامارانتا لە پێوەندیی دەستە ساردەکانی نەلەرزی دەستی خۆی وەک گیانلەبەرێکی لووسکە لە دەستی ئەو دەرکێشا و خەریکی کاری خۆی بوو. بزەیەکی هاتێ و وتی: "کرێسپی، هێندە ساکار مەبە، من ئەگەر بشمرم لەگەڵ تۆ زەماوەند ناکەم."

پیترۆکرێسپی دەسەڵاتی نەما. بێ ئەوەی شەرم بیگرێ گریا و نزیک بوو پەنجەکانی لە بەر بێچارەیی بشکێن، بەڵام نەیتوانی بڕیاری ئامارانتا بگۆڕێ. ئامارانتا تەنیا وتی: "کاتت بە فیڕۆ مەدە. ئەگەر بەڕاستی منت خۆش دەوێ ئیتر پێ مەنێ ئەو ماڵەوە." ئۆرسوڵا کەمی مابوو لە شەرمان دێوانە بێ. پیترۆکرێسپی بۆ هەر ڕێگایەک ئیمکانی هەبوو پەنای برد. هەتا ئەوپەڕی پلەی نزمی خۆی زەلیل و زەبوون کرد. تەواوی پاشنیوەڕۆ لە باوەشی ئۆرسوڵادا کە ئامادە بوو گیانی خۆی بۆ ئەهوەن کردنەوەی ئەو بدا، گریا. لە شەوانی بارانیدا دەیانبینی کە بە چەترێکی ئاوریشمی بە دەوری ماڵیدا دەگەڕێ و چاوەڕوانە پەنجەرەی ژووری خەوی ئامارانتا بەڕووناکی ببینێ. هەرگیز وەک ئەو کاتە پۆشتە نەبوو. سەری، کە وەک سەری ئیمپراتۆرێکی ئازاردیتوو دەچوو، سەیرێکی شکۆداری بە خۆوە گرتبوو. لە بەر دۆستانی ئامارانتا، کە لەگەڵ ئەو لە هەیوانی گوڵدۆزییان دەکرد، پاڕاوە بەڵکو بتوانن ڕازی بکەن. مەیلی بە کارەکەیەوە نەما. هەموو

ـۆژی بە نامەنووسینی پڕ سۆز لە خەڵوەتی دوکانێدا دەگوزەراند، کە بە
یەکە گوڵ و بە پەپوولەی وشککراوە دەیرازاندەوە و بۆ ئامارانتای دەنارد.
ـەویش نامەکانی بە نەکراوەیی بۆ دەناردنەوە. چەند سەعات بەتەنیایی سێ
ـاری لێدەدا. شەوێک گۆرانیی گوت.

شاری ماکۆندۆ بە سەرسووڕمانەوە لە خەو هەڵسا. دەنگی سێ تاری بۆ
ـەو جیهانە زیاد بوو و گۆرانییەکەی ئەوەی دەگەیاند کە هیچ کەس لە سەر
ـەو زەوییە بە رادەی ئەو ئاشق نەبووە. ئەو کات پیترۆکرێسپی بینی کە
هەموو پەنجەرەکانی شار هەڵکران، بێجگە لە پەنجەرەی ئامارانتا. ڕۆژی
ـووهەمی نۆڤەمبەر، ڕۆژی مردووان، براکەی دوای کردنەوەی دووکان
بینیبووی کە هەموو چراکان ڕۆشنن، دەرگای قوتووی هەموو موسیقاکان
ئاوەڵایە و، هەموو سەعاتەکان، سەعاتێکی دیاریکراو لێدەدەن. لە نێوان ئەو
کۆنسێرتە شێتانەیەدا، پیترۆکرێسپی لە خەڵوەتی دووکانێدا لە پشت مێزی
نووسین دانیشتبوو و ڕەگەکانی جومگەی دەستی خۆی بە تیغ بڕیوە و
دەستی لە نێو لەگەنێکی بینزوئین ڕۆ کردووە.

ئۆرسۆلا رایگەیاند کە لە ماڵەوە، لە سەر مردوو دەمێننەوە و نانوون و
پرسەی بۆ دادەنێ. قەشە، لەگەڵ ڕێورەسمی ئایینی و گۆڕکردنی لە زەوی
دژایەتیی هەبوو، بەڵام ئۆرسۆلا لێبڕاوانە لە بەرامبەریدا ڕاوەستا و وتی:
"نە تۆ و نە من توانای تێگەیشتنمان نییە، بەڵام ئەو پیاوێکی پاک بوو. لەو
بارەوە، پێچەوانەی ئیرادەی تۆ، ئەوی لە نزیک گۆڕی مێلکیادیس بە خاک
دەسپێرین."

بە پشتیوانیی هەموو شار ئەو کارەی کرد و ڕێوڕەسمی بەڕێکردنی
جەنازەی بەشکۆوە بەڕێوە برد. ئامارانتا لە ژوورەکەی نەهاتەدەرەوە. لە
سەر تەختی نووستنی خۆی گوێی دەدایە شیوەن و گریانی ئۆرسۆلا و
دەنگی هاتووچۆ و زەنای خەڵک و شیوەنی پرسەگێڕان ماڵەوەی داگرتبوو.
دوایی ماڵ لە بێدەنگییەکدا نوقم بوو کە بۆنی گوڵی پێشێلکراوی دەدا. هەتا
ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە، لای ئێواران، بۆنی عەتری پیترۆکرێسپی بە بەر
لووتیدا دەهات، بەڵام بە توانایەکی هەرچی زۆرتر تێکۆشا دیوانە نەبێ.
ئۆرسۆلا وازی لێ هێنا. تەنانەت پاش نیوەڕۆیەک کە ئامارانتا ڕۆیشتە

ئاشپەزخانە و دەستی خستە نێو ڕەژێی داگیرساوی سۆبە، ئەوسەری بەرز نەکردەوە کە هەتا چاوێکی بە بەزەوە لێ بکا. دەستی ئامارانتا وەها دەژانەوە چوو کە هەستی بەژان نەکرد، تەنیا بۆنی گۆشتی سووتاوی کرد. سووتاندنی دەستی چارەیەکی گەوجانە بوو بۆ ڕاکردنی لە پەشیمانی. چەند ڕۆژان لە سەریەک شلّتەی سپێنەی هێلکەی لە سەر دانا و کاتێک سووتاوی دەستی تەواو بوو، دەتگوت سپێنەی هێلکە دلّیشی داپۆشیوە. تەنیا نیشانەیەکی دەرەوە کە لەو ڕووداوە مایەوە، باندێکی ڕەش بوو کە لە دەستی سووتاوی هالاند و هەتا کۆتایی تەمەنی نەیکردەوە.
ئارکادیۆ بە ڕاگەیاندنی پرسەی ڕەسمی بۆ پیترۆکرێسپی دلّئاوالّەییەکی بێ وێنەی لە خۆی نیشان دا. ئۆرسۆلا ئەو کردەوەی ئەوی وا دانا کە جارێکی دیکە دەبێتەوە بەرخێکی گوێ لە مست، بەلام لە هەلّەدا بوو. ئەو ئارکادیۆی نەک ئەو کاتە کە لیباسی نیزامی دەبەر کردبوو، بەلّکو هەر لە هەوەلّەوە لە کیس دابوو.
ئۆرسۆلا وایدەزانی وەک کوڕی خۆی گەورەی کردووە، بەلام ئارکادیۆ لە گەرماوگەرمی تاعوونی بێ خەوی و زەوق و شۆقی ئۆرسۆلا شتی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا و گۆشەگیریی ئۆرلیانۆ و مل بە ملەی پرمەترسیی ئامارانتا و ڕێبێکا، منداڵێکی تەنیا و ترساو بار هاتبوو. ئۆرلیانۆ فێری خوێندن و نووسینی کردبوو، بەلام بیری لە شتێ دەکردەوە و، دروست وەک بێگانەیەک ڕەفتاری لەگەڵ دەکرد. کاتێک دەیویست لیباسەکانی لە بەر بکا و فڕێیان بدا، دەیدایە دەست ئەو، وێسیتاسیۆن ئەندازەی بۆ دەگرت. ئارکادیۆ لەو کەوشانەی کە بۆی گەورە بوون و شەلّوارەکەی کە پڕ بوو لە پینە و سمتی کە وەک سمتی ژنان دەچوو، ئازاری دەکێشا. هەرگیز نەیتوانی لەگەڵ کەسێک باشتر لە وێسیتاسیۆن و کاتائۆرە بە زمانی خۆیان پێوەندی دابمەزرێنی. تەنیا کەسێک کە بەڕاستی پێی ڕاگەیشتبوو مێلکیادێس بوو. نووسراوەکانی خۆی بۆ دەخوێندەوە و فێری هونەری وێنەگریی کردبوو. ئیمکانی نەبوو هیچ کەس بزانێ کە بەتەنیایی چەندە بۆ مێلکیادێس گریابوو و، چۆن وەکو شێتان بە خوێندنەوە و دەستوورەکانی ئەو تێکۆشابوو زیندووی بکاتەوە. قوتابخانە کە قسەی لێ وەردەگرت و

ـڕێزی بۆ دادەنا، وەدیهێنانی دەسەڵات، بڕیارنامەکانی بێ کۆتایی و، ئەو ئۆنیفۆرمە پڕ شانازییە، باری قورس و تاڵی رابردووی لە سەر شان هەڵگرت. شەوێک لە مەیخانەی کاتارینۆ کەسێک وێرای و پێیگوت: "تۆ شیاوی ناوی بنەماڵەی خۆت نیت." پێچەوانەی چاوەڕوانیی هەمووان، ئارکادیۆ دەستووری گوللەبارانی نەدا.

لە بەرامبەردا وتی: "بەوپەڕی شانازییەوە دەبێ بڵێم ناوی خانەوادەگیی من، بویندیا نییە.: ئەو کەسانەی کە لە نهێنی لە دایکبوونی ئەو ئاگادار بوون، بە بیستنی ئەو وەڵامە وایان بیر کردەوە کە ڕەنگە خۆشی بزانێ، بەڵام ئەو نەیدەزانی. پیلار تێرنێرا دایکی ئەو، کە لە تاریکخانەی وێنەگری وەزگی کەوتبوو، بۆی ببووە وەسواسێک، دروست هەروەک لە رابردوو بۆ خۆزێ ئارکادیۆ و دوایی بۆ ئۆرلیانۆ وەسوەسە بوو. ئەگەرچی جوانی و گیرایی پێکەنینی لەدەست دابوو، بەڵام ئارکادیۆ، دوای دەکەوت و بە بۆنی دووکەڵ شوێنی هەڵدەگرت و دەیدۆزییەوە، کەمێک پێش هەڵایسانی شەڕ، پیلار تێرنێرا، ڕۆژێک نیوەڕۆ درەنگتر لە جاران بە دوای کوڕە کچکەکەیدا ڕۆیشت بۆ قوتابخانە. ئارکادیۆ لە ژوورێک کە نیوەڕۆیان لێێ دەخەوت و دوایی ببوو بە زیندان، چاوەڕوانی بوو. هەروا کە کوڕە چکۆڵە لە حەوشە یاری دەکرد، ئەو لە جۆلانەدا ڕاکشابوو بە ئاگادارییی لەوە کە پیلار تێرنێرا دێتە ئەوێ لە نیگەرانی و دڵەکوتە دەلەرزی. کاتێک هاتە ژووری ئارکادیۆ جومگەی دەستی گرت و کۆشا ڕایکێشێتە نێو جۆلانەکە. پیلار تێرنێرا بە ترسەوە وتی: "ناتوانم، ناتوانم، نازانی چەندم پێ خۆشە داوای تۆ بەجێ بێنم بەڵام خوای بە شاهید دەگرم ناتوانم."

ئارکادیۆ بە هێزی لەبن نەهاتووی میراتی خۆی پشتێندی گرت و کە دەستی بە پێستی لەشی کەوت هەستی کرد دونیا ژێر و ژوور دەبێ، وتی: "بە خۆرایی بەرماڵ ڕامەخە، هەموو خەڵکی شاری دەزانن تۆ قەحبەی." پیلار بە سەر ڕقێک کە لە چارەنووسی خۆیدا هەیبوو زاڵ بوو و بە ئەسپایی وتی: "منداڵەکان دەزانن. ئەوشەو دەرگای قفڵ مەکە."

لەو شەوە، ئارکادیۆ تاگرتوو و لەرزان لە جۆلانەی خۆیدا بە چاوەڕوانی مایەوە. لە بێدارییی خۆیدا گوێی دایە دەنگی جیرجیرەی سیسران لە کاتی

بەیانی و ماسیگران کە کات و زەمانیان رادەگەیاند. دروست لەو کاتەدا کە دڵنیا بوو فریوی خواردووە و نیگەرانییەکەی دەبوو بە رک و تووڕەیی، لە پڕ دەرگای ژووریٚ کرایەوە. چەند مانگ دواتر کە لە بەرامبەر دەستەی گوللەباران راوەستابوو، جارێکی دیکە ئەو کاتانەی لە مێشکی خۆیدا هێناو برد. دەنگی پێیەک کە لە ژوورەکەدا ون بوو، دەنگی بە کورسییەکاندا کەوتن و سەرەنجام هەستکردن بە لەشێک کە لە تاریکایی ژوورەکە و قووتدانی هەوا بە دڵێک کە دڵی خۆی نەبوو. دەستی درێژکرد و لە تاریکیدا دەستێکی دیتەوە کە دوو ئەنگوستیلەی لە قامکێکدا بوو و لە تاریکایی ژوورەکەدا ون دەبوو. دەست، رەگەکانی هەست پێ کرد، دڵەکوتەی بەدبەختی ئەوی هەست پێ کرد و بەری دەستی تەڕی ئەوی کە لەودا خەتی ژیان بە پەنجەی مەرگ برابۆوە بە خۆوە نووساند. ئە وکات ئارکادیۆ تێگەیشت کە ئەوە ئەو ژنەنییە کە چاوەڕوانی کردووە. بۆنی دووکەڵی لێ نەدەهات، بۆنی عەتری گوڵانی کێوی لێ دەتکا. سەرگۆی مەمکە خڕەکانی وەک مەمکی پیاو بوو، خوارەوەی زگی وەک بەرد رەق و وەک گوێز خڕ بوو و لە بێ ئەزموونی بە جوانییەکی تایبەتی هان درابوو. کچێکی بە پەردەبوو و ناوی بێ موسەممای سانتا سۆفیا دێلا پێداد بوو. پیلار تێرنێرا پەنجا پیزۆ، واتە نیوەی سەرمایەی ژیانی پێدابوو کارێک بکا کە خەریک بوو دەیکرد. ئارکادیۆ چەند جار لە دووکانی چکۆڵەی خاروبارفرۆشیی دایک و باوکی دیتبووی، بەڵام نەیتوانیبوو سەرنجی بۆ لای خۆی راکێشێ، چونکە ئەو تەنیا لە کاتی لەباردا خۆی پێشان دەدا و وجوودی هەبوو. بەڵام لەو رۆژە بەدواوە، ئارکادیۆ وەک پشیلە لە باوەشی گەرمیدا تلایەوە. بە ئیجازەی دایکو بابی کە پیلار تێرنێرا پاش ماوەی پاشەکەوتەکەی دابوونێ، کاتی خەوی پاش نیوەڕۆیان دەڕۆیشتە قوتابخانە. پاشان، کاتێک هێزی دەوڵەتی ئەوانی لە شوێنی ئەوینداری دەرکرد، لە پشت دووکان لە نێو تەلیسە زوورەت و تەنەکە رۆنان خەریکی ئەوینداری خۆیان بوونەوە. کاتێک ئارکادیۆ فەرماندەیی نیزامی و غەیرەنیزامیی شاری بەدەستەوە گرت، کچێکیان بوو.

ـە ماڵەوەیان تەنیا ڕێبێکا و خۆزێ ئارکادۆ لەو کارە ئاگادار بوون، لەو
کاتدا ئارکادیۆ زۆرتر بە خاتری هاوکاری نەوەک خزمایەتی – لەوان زۆر
ـزیک بوو. خۆزێ ئارکادۆ ژیانی ژن و مێردایەتی ببوو ـ ڕەوشتی بەهێزی
ـێبێکا، هەوەسی زۆری و، پلەویستی توندی، هەموو توانای مێردەکەی
ـژیبوو، ئەوی لە پیاوێکی تەمبەڵ و مێبازەوە کردبوو بە دێوێکی هەیکەل
گەورەی کرێکار، ماڵێکی خاوێن و ڕێکوپێکیان هەبوو. لەگەڵ بەیانیان،
ـێبێکا دەرگا و پەنجەرەی لە سەر پشت دەکردنەوە. بایەکی کە بە سەر
گۆڕستاندا دەهات لە پەنجەرەکانەوە دەڕۆیشتە حەوشە و کەلوپەلی ماڵێ و
ـیوارە گەچەکانی بە خۆڵی مردووان سواخ دەدا. مەیلی گڵخۆری و خلەخلی
ئێسکانی دایک و باوکی و بێ قەراریی خوێنی ئەو لە بەرامبەر
پیترۆکرێسپیدا، لە گۆشەی بیرەوەرییەکانی دا نەمان. دوور لە هەڵڵا هەڵڵای
شەڕ، هەموو ڕۆژێ لە بەر پەنجەرەی خەریکی گوڵدۆزی دەبوو، هەتا قاب
و دەوری لە تاقەیدا دەستیان بە لەرینەوە دەکرد. ئەو کات زۆر پێش ئەوە
سەگە ناقۆڵا و پیسەکان و بە دوایاندا غولێک کە چەکمەی مامزەداری لە
پێیە و تفەنگێکی دوولوولەی بە شانییەوە وەژوور کەون، بۆ
گەرمکردنەوەی خواردن لە جێگای خۆی هەڵدەستا. جاری وابوو شوورێک
و هەمیشەش چەند کەروێشکێک و یا مراویی کێوی بە سەر شانیدا دابوو.
ئارکادیۆ ڕۆژێک ئێوارە لە سەرەتای فەرماندەیی خۆیدا، ڕۆیشت بۆ
چاوپێکەوتنیان. لە کاتێکەوە ماڵەوەیان بەجێ هێشتبوو ئیتر ئەوانی
نەدیتبوو. ئارکادیۆ وەها دۆستانە و بە میهرەبانی ڕەفتاری لەگەڵ کردن کە
بۆ شام لە لای خۆیان هێشتیانەوە.

کاتێک دوای شام قاوەیان خواردەوە، ئارکادیۆ هۆی هاتنی بەڕاستی ئاشکرا
کرد. خەڵک لە لای ئەو لە خۆزێ ئارکادۆ سکاڵایان کردبوو. دەیانگوت
دوای کێڵانی باخچەی خۆی ڕاستەوڕاست بە زەوەییەکانی دەورووبەردا
چۆتە پێشەوە و بە گاکانی کۆخی جووتیارانی لەگەڵ زەوی تەخت کردووە
و، سەرەنجام بە زەبر و زۆر باشترین زەوی ئەو ناوچەی داگیر کردووە.
لەو دێهاتیانەش کە تەمای لە زەوەییەکانیان نەکردبوو، باجی دەستاند.
شەممە بە تفەنگی دوولوولە و سەگەکانی ڕاوییەوە بۆ کۆکردنەوەی باج و

ســـەرانە وەڕێ دەکەوت. خــۆزێ ئارکــادۆ حاشــای کــرد. لە مــافی خــۆی بەوجۆرە دیفاعی دەکرد کە ئەو زەوەییانە هەر لە سەرەتای بنیاتنانی گوند بە دەستی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا دابەش کرابوون و ئەو بەباشــی دەیتوانی بیسەلمێنێ کە باوکی ئەو کاتیش شێت بووە، چونکە سامانێکی زۆری، کە لە راستیدا تەنیا هــی بنەمــاڵەی ئەوان بــووە، بەبا داوە. بەرگریــی ئەو، لەو کاتیدا زۆریش پێویست نەبوو ،چونکە ئارکادیۆ بۆ گرتنــی ئەو نەهاتبوو. بە پێچەوانە، ئەو پێشنیاری کرد کە دەفتەرێکی بەڵگەنامەی رەسمی دامەزرێنن. هەتــا خــۆزێ ئارکادیۆ بتوانێ ملکەکان بە نێوی خــۆی تۆمــار بکــا، دیــارە بە مەرجێک حکوومەتی ناوچەیی بۆ وەرگرتنی ماڵیات بکاتە وەکیل.

بە یەکەوە سازان. چەند ساڵ دوایی کاتێک سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە قەباڵە و (تاپۆ)ی ملکەکانی کۆڵییەوە، بۆی دەرکەوت هەمــوو ئەو زەوییانەی نێــوان حەوشــەی مــاڵی خــۆزێ ئارکــادۆ هەتــا چــاو هەتەر دەکــا تەنــانەت گۆڕستانیش بە ناوی براکەی تۆمار کراوە و، ئاشکرای کرد لە ماوەی یازدە مانگ فەرماندەیی ئارکادیۆدا نەتەنیا لە خەڵک ماڵیاتی وەرگرتووە، بەڵکو بــۆ ناشتنی مردووانیش لە زەوەییەکانی خۆزێ ئارکادۆ پارەی لێوەگرتوون.

ئەوەی کە هەمــوو دەیــانزانی، بەڵام بــۆ ئەوەی دەردێــک لە دەردەکــانی زیــاد نەکەن لە ئۆرســۆلایان شــاردەوە، چەنــد مانــگ دواتــر پێــی زانــی. ســەرەتا گومــانی هەبــوو لە شــتەکە. هەر ئەو جــۆرە کە هەوڵــی دەدا کەوچکێــک شــەربەتی ئاڵووبــاڵوو بە دەمــی مێردەکەیــدا بکــا، بە فیزێکــی ســاختە بە مێردەکەی وت: "ئارکادیۆ خەریکە خانوو دروست دەکا." ئەوجار بێ ئیرادە هەناسەیەکی هەڵکێشا و درێژەی دایە : "نازانم بۆ چی لام وایە ئەو ماستە بێ مــوونییە." دوایــی کاتێــک زانــی ئارکــادیۆ نەتەنیــا خــانوویەکەی بۆخــۆی دروســت کــردووە، بەڵکــو مــۆبلی دەســکاری ڤینیســیای بــۆ بە دروســتکردن داوە، گومــانەکەی بــوو بە دڵنیــایی کە ئارکــادیۆ لە ســەرمایەی گەل کەڵکــی خــراپ وەردەگرێ. رۆژێکــی یەکشــەممە، دوای رێورەســمی نوێژ چاوی لــێ بوو کە لە ماڵەکەی لەگەڵ ئەفســەران قومــاری وەرەقــان دەکا، قیژانــدی: "تــۆ مــایەی نەنگــی بنەمــاڵەی ئــێمەی." ئارکــادیۆ گرینگیــی بە قســەکەی نەدا. ئەو کــات بــوو ئۆرســۆلا تێگەیشــت ئارکــادیۆ کچێکــی شــەش مانگــانەی هەیە و

سانتا سۆفیا دیلا پێداد، کە لەگەڵ ئەو دەژی دیسان ئاوسە. بڕیاری دا سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە هەر کوێ بێ نامەیەکی بۆ بنووسێ و لە رووداو ئاگاداری کاتەوە، بەڵام ئەو رووداوانەی، کە یەک لە دوای یەک قەومان، نەتەینا بوونە کۆسپ کە بڕیارەکەی بەجێ بێنێ، بەڵکو لە بڕیارەکەش پەشیمانی کردەوە. هەتا ئەو کات شەڕ، کە تەنیا وشەیەک بوو بۆ لێکۆڵینەوەی وەزعێکی نادیار و دوورەدەست، بوو بە راستییەکی داسەپاو و تاڵ. کۆتایی مانگی فێوریە پیرەرێژنێک کە سەروسیمایەکی خۆڵەمێشی هەبوو و سواری وڵاخێک ببوو بە بارێک گەسکەوە هاتە ماکۆندۆ. ئەوەندە هەژار هاتە بەرچاو ،پاسەوانەکان بێ ئەوەی هیچی لێ بپرسن، رێگەیان دا بێتە ژوور. ئەویش یەکێک لەو فرۆشیارانە بوو کە زۆر جار لە شارەکانی ناوچەی زەلێوە بۆ ئەوێ دەهاتن.یەک راست رۆیشتە سەربازخانە. ئارکادیۆ ئەوی لە شوێنێک، کە زەمانێک کلاسی مەدرەسە بوو و ئێستا ببوو بە ئۆردوگا، قبووڵ کرد. چەند جۆلانەی کۆکراوە بە دیوار هەڵاوەسراو و لە گۆشەیەکی ژوورەکە دۆشەک لە سەر یەک داندرابوون و تفەنگ و دەمانچەکان لێرە و وێ لە نێو هۆدەکە هەڵڕژابوون. پیرێژن پێش خۆناساندن بە سەلامێکی نیزامی قیت راوەستا.

_ من سەرهەنگ (گریگۆری ستیڤنسۆن)[°] . م

هەواڵی ناخۆشی هێنابوون. زۆری نەمابوو ئاخرین ناوەندی بەرگریی ئازادیخوازان تێک بشکێ. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، کە لە نزیک رێوهاشا خەریکی پاشەکشە بوو، پەیامێکی بۆ ئارکادیۆ ناردبوو. ئەو دەبوایە بێ بەرگری شاری تەسلیم کا. دیارە بەو مەرجەی زیانێک بە ژیان و ماڵی ئازادیخوازان نەگا. ئارکادیۆ ئەو پەیکە سەیرەی کە بەچاکی دەیتوانی نەنکێکی راکردوو بێ، بە بەزەوە چاو لێکرد.

وتی: "سروشتییە تۆ لەلایەن ئەوانەوە بەڵگەی نووسراوت لەگەڵ خۆت هێناوە."

پەیک وتی: "شتێکی ئەوتۆم نەهێناوە. خۆت دەزانی بە وەزعی ئێستا ناتوانین بەڵگەیەکمان پێ بێ کە گومانی لێ بکرێ." هەروا کە قسەی دەکرد،

°– Gregorio Stevenson

لە گیرفانی جلەکەی ماسییەکی زێڕی چکۆڵەی دەرهێنا و لە سەر مێزەکەی دانا و وتی: "وا بزانم ئەوە بەس بێ." ئارکادیۆ سەلماندی کە ئەو ماسییە یەکێک لە ماسییە زێڕەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایە، بەڵام لەوانەیە کەسێک پێش شەڕ کڕیبی یان دزی بی، کەوابوو تەواو نەبوو. بۆ ئەوەی قسەکەی وەربگیرێ تەنانەت یەکێک لە نهێنییە نیزامییەکانیشی ئاشکرا کرد. وتی پێی سپێردراوە بچێتە کوراسائو و هیوادارە لەوێ دوورخراوەکانی دورگەکانی کاریبی کۆبکاتەوە و  چەک و تەداروکات بکرێ و لە کۆتایی ساڵ هێرشێک دەست پێ بکا. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ کە بڕوای بەو نەخشەیە هەبوو، هەر جۆرە فیداکارییەکی ئەوی لەو کاتەدا بە کەڵک دەزانی. لەگەڵ هەمووی ئەوانە ئارکادیۆ نەرم نەدەبوو، دەستووری دا هەتا کاتێک پەیک نەناسراوە بەندی کەن و بڕیاری دا هەتا مردن لە شار بەرگری بکا. ئەنجامی بڕیاری ئەو زۆری نەخایاند. خەبەری شکانی ئازادیخوازان ڕۆژ بە ڕۆژ لە ڕاستی نزیک دەکەوتەوە. لە کۆتایی مانگی مارس لە بەرەبەیانییەک کە بارانی بێ وادە دەباری، هێمنیی حەفتەکانی رابردوو لە پڕ بە دەنگی شەیپوور و دەسبەجێ تەقەی تۆپێک کە بورجی ناقووسی کڵێسای وێران کر دتێکچوو. بەرگری ئارکادیۆ کردەوەیەکی شێتانە بوو. تەنیا پەنجا سەربازی بەدەستەوە بوو کە زۆریش پڕ چەک نەبوون و هەر یەکە بیست فیشەکیان هەبوو، بەڵام شاگردەکانی پێشووی لە نێو ئەو کۆمەڵەدا بوون و چونکە بەیاننامە درێژەکانی کاری تێکردبوون، وەجۆش هاتبوون، ئامادەبوون گیانی خۆیان فیدا بکەن. لە نێو دەنگی هاتووچۆی چەکمان و دەستوور و فەرمانی جۆربەجۆر و ئەو تۆپانەی زەوییان دەلەرزاند و دەسڕێژی ناخۆش و بۆرەی خۆرایی شەیپووران، کەسێک کە دەیگوت سەرهەنگ گریگۆڕی ستیڤنسۆن ـ ە توانی لەگەڵ ئارکادیۆ قسە بکا. پێیگوت: "مەهێڵە بە لیباسی ژنانەوە لەوپەڕی بێ شەرافەتیدا لە زیندان بمرم. ئەگەر قەرارە بمرم باشتر ئەوەیە لە شەڕدا بکوژرێم."
ئارکادیۆی رازی کرد.
فەرمانی دا تفەنگێکی بە بیست فیشەکەوە بدەنێ، پێنج سەربازیشیان لەگەڵ خست لە سەربازخانە دیفاع بکا. بۆخۆی لەگەڵ دەستە بۆ ڕێبەری بەرەی

بەرگری رۆیشت. نەیتوانی بگاتە ئەو جادەیە کە دەگەیشتەوە گۆلاوان. سەنگەرەکانی شکابوون و بەرگریکەرەکان لە کۆڵانان دەجەنگان، هەوڵێ بە تفەنگەکانیان هەتا فیشەکیان هەبو و، دوایی بە دەمانچە لە بەرامبەر تفەنگی دوژمندا و سەرەنجام بێ چەک ئامبازیان دەبوون. بە نزیکبوونەوەی تێکشکان چەند ژن بە دارەدەست و چەقۆی ئاشپەزخانە هاتنە کۆلان. ئارکادیۆ لەو شلۆقی و هەرەج و مەرەجەیدا چاوی بە ئامارانتا کەوت، کە شێتانە بە دوای ئەودا دەگەڕێ، تەنیا کراسی خەوی لەبەردا بو و دوو دەمانچەی قەدیمی خۆزێ ئارکادۆ بویندیای بەدەستەوە گرتبوو. ئارکادیۆ دەمانچەکەی خۆی دایە ئەفسەرێک کە لەو نێوەدا چەکەکەی خۆی بەدەستەوە نەمابوو و، لەگەڵ ئامارانتا هەلاتنە کۆلانێکی لاوەکی هەتا ئەوی بەرێتەوە ماڵێ. ئۆرسۆلا بێ مبالات بە تەقەی تۆپان کە کونێکی گەورەیان لە سەردەرانەی ماڵی هاوسێ کردبوو، لە نزیک دەرگا چاوەڕوانی دەکرد. باران خەریک بوو دەیکردەوە، بەلام شەقامەکان وەک سابوونی تەڕ خلیسک و نەرم بوون و دەبوایە مەودا لە تاریکیدا بەراورد کرابا. ئارکادیۆ ئامارانتای دایە دەست ئۆرسۆلا و لەگەڵ دوو سەربازان، کە لە گۆشەیەکەوە دەرپەڕیبوون و تەقەیان دەکرد رووبەڕوو بوو. دوو دەمانچە قەدیمییەکان کە لەمێژ ساڵ بوو لە نێو دەربیچە کەوتبوون کاریان نەکرد. ئۆرسۆلا کە خۆی بە سەر ئارکادیۆدا کێشابوو، هەوڵی دا ئەو راکێشێتە ژووری ماڵەوە. هەرای کرد؛ "تۆ خوا وەرە، بە رادەی پێویست شێتانە جوولاوییەوە."

سەربازەکان رووی تفەنگیان تێکردبوون. یەکێکیان وتی: "خانم لە پێشی لاچۆ ئەگینا هەرچی بە سەرت هات تاوانی خۆتە."

ئارکادیۆ، ئۆرسۆلای بۆ ژووری ماڵەوە پاڵ پێوە نا و خۆی تەسلیم بوو. کەمێک دوایە تەقە راوەستا و ناقووسی کلێسا زەنگیان لێدا. بەرەی بەرگری بە کەمتر لە نیو سەعات تێکشکابوو. تەنانەت یەک سەربازی ئارکادیۆ لەو شەڕەدا دەرنەچوو، بەلام پێش کوژران، سێ سەد سەربازیان کوشتبوو. ئاخرین جەبهە، سەربازخانە بوو. ئەو کەسەی دەیگوت سەرهەنگ گریگۆری ستیڤنسۆنە، پێش ئەوە هێرش بکەنە ئەوێ گیراوەکانی ئازاد

کردبــوو و دەســـتووری دابـــوو بە پیاوەکـــانی خـــۆی بچـــنەدەرێ و لە شـــەقامەکان شـــەڕ بـــکەن. نیشـــانەگیری لە ســـەر و تەقە لە پەنـــجەرە جۆربەجۆرەکانەوە، ئەوەی دەگەیاند کە سەربازخانە بەچاکی لە خۆی دیفاع دەکا.

سەرەنجام دوژمن ئەوێی تۆپباران کرد. ئەفسەرێک کە فەرماندەیی هێزی دوژمنـــی بەدەســـتەوە بـــوو، لە چۆڵبـــوونی ســـەربازخانە بەتونـــدی ســـەر ســـوورمابوو. تەنیـــا پیاوێـــک لە ســـەر زەوی کەوتبـــوو و کوژرابـــوو. ژێرشەڵواری دەپێدا بوو و تفەنگە بەتاڵەکەی هێشتا بەو دەستەیەوە بوو کە تۆپ پەڕاندبووی. پرچی ژنانەی بە شانەیەک لە پشت ئەستۆی کۆببۆوە و بە ملییەوە ماسییەکی بچکۆلانەی زێڕ بە زنجیرێکەوە هەڵواسرابوو. کاتێک بە نووکە چەکمە هەڵیگێڕایەوە چرایەکی لە دەموچاوی گرت، واقی وڕما و وتی: "پیای" ئەفسەرەکانی دیکەش لێی نزیک بوونەوە."

ســـەروان وتـــێ: "تەماشـــا کەن ئەو پیـــاوە لە کـــوێی ســـەر هێنـــاوەتەدەر. گریگۆری ستیڤنسۆنە".

بەرەبەیان، دوای دادگایەکی نیزامیی کورت، ئارکادیۆ لە بەرامبەر دیواری گۆڕستان گوللەباران کرا. لە دوو سەعاتی دوایی تەمەنی نەیدەتوانی بزانێ کە ترسێکی لە منالییەوە نارەحەتی کردبوو بۆچی نەماوە. بێ خەجاڵەت و بێ ئەوەی تەنانەت تێبکۆشـی بە ئـازایەتیی دوایـی خـۆی بنـازێ، گـوێی بـۆ تومەتەکانی بێ بڕانەوە راگرت. فکری لە ئۆرسـۆلا کردەوە کە بێگومـان لەو ســـەعاتەدا لە ژێـــر داربەڕووەکەدا لەگەڵ خـــۆزێ ئەرکـــادۆ بوینـــدیا قـــاوەی دەخواردەوە. فکری لە کچە هەشت مانگەکەی کە هێشتا ناوێکی نەبوو، لە منالەکەی دیکە کە لە مانگی ئووت دەهاتە دونیاوە، کردەوە. بیری لە سانتا سۆفیا دیلا پێداد کردەوە، کە شـەوی پێش، کاتێ بەجێی هێشتوو خەریک بـوو بـۆ نەهـاری رۆژی دوایـی گۆشـتی ئاسـکی خـوێ دەکرد. دڵـی بـۆ ئەو پرچانە کە بە سەرشانیدا بڵاوببوون و بۆ ئەو مژۆڵە بڵێندانە کە پێی وابوو دەسـکردن، وەتەنـگ هـاتبوو. بـێ ئەوەی تووشـی هەڵەشـەیی بـێ، بیـری لە کەسـوکاری دەکـردەوە. کاتێـک بـۆ ئـاخرین جـار لەگەڵ حیسـابی ژیـان رووبەڕوو بـوو تـازە تێگەیشـت ئەو کەسـانەی کە لە هەمـوو کەس زۆرتـر

رکی لێیان بوو، لە هەموو کەس زۆرتری خۆش ویستوون. سەرۆکی دادگای نیزامی ئاخرین وتاری خۆی دەست پێکردبوو، کە ئارکادیۆ زانی دوو سەعات رابردووە. سەرۆکایەتی دەیوت: "هەرچەند بۆ تۆمەکانی هاتوو سەربارەت بە مەحکووم بەڵگەی تەواو بەدەستەوە نین، بەڵام بێ بەندوباری تاوانبارانە و کەم بوونی هەستی بەرپرسایەتیی تۆمەت لێدراو، کە ژێردەستەکانی بەرەو مەرگی بێهوودە راکێش کرد، بەسە بۆ ئەوە حوکمی ئیعدامی بە لەبەر چاو بگیرێ." لە قوتابخانەیەکی نیوەوێران، ئەو جێگایەی کە بۆ هەوەڵین جار هەستی توانایی کردبوو، لە چەند قەدەمی ئەو ژوورەی کە بۆ هەوەڵین کەڕەت لەگەڵ ئەوین ئاشنا ببوو، ڕێورەسمی مردن بە گاڵتە دەهاتە بەرچاوی، لە راستیدا ژیان بۆی گرنگ بوو نەک مەرگ. لەو بارەوە کاتێک حوکمی ئیعدامیان پێراگەیاند نەترسا و تەنیا هەستی بە دڵتەنگی کرد.

هەتا کاتێک ئاخرین ئاواتیان لێ پرسی، قسەی نەکرد.

بە دەنگێکی سەنگین وەڵامی دایەوە: "بە ژنەکەم بڵێن ناوی کچەکەمان بنێ ئۆرسوۆلا." هەڵوێستەیەکی کرد و ناوەکەی دووپات کردەوە: "ئۆرسوۆلا وەک ناوی نەنکی. هەروەها بە خێزانم بڵێن کە ئەگەر منداڵەکەی کوڕ بوو، ناوی بنێ خۆزێ ئارکادیۆ، نە وەک مامی، بەڵکو وەک ناوی باپیری."

پێش ئەوەی بۆ لای دیواری بەرن، قەشە نیکانور ویستی خۆی بگەیەنێتێ، بەڵام ئارکادیۆ وتی: "تاوانێکم نەکردووە هەتا راستی بڵێم." دوای خواردنەوەی پیاڵەیەک قاوەی رەش خۆی نایە ئیختیار دەستەی ئیعدام. فەرماندەی دەستە کە لە گوللەبارانـدا پسپۆر بوو، ناوێکی هەبوو کە بە رێکەوت ئەو ناوەیان لێ نابوو: سەروان رۆکە کارنیسێرۆ[1]. بەو جۆرە کە لەژێر وردەبارانـدا بەرەو گۆڕستان دەچوون، ئارکادیۆ بۆی دەرکەوت رۆژێکی چوارشەممەی جوان لە ئاسۆ دەردەکەوێ. دڵتەنگیی ئەو لەگەڵ مژدا دەڕۆیی و وردبینییەکی گەورە جێگای دەگرتەوە.کاتێک فەرمانیان پێدا پشتی بە دیوارەوە بنووسێنێ چاوی بە ڕێبێکا کەوت کە بە قژی تەڕ و کراسی گوڵداری ئەرخەوانییەوە پەنجەرە و دەرگاکانی ماڵەوە لە سەر پشت

---

[1]- AoqueCarnicero و بە مانای قەساب.

دەکاتەوە. ئەوی حاڵی کرد. ڕێبێکا بە هەڵکەوت چاوێکی لە دیوار کرد و لە جێگای خۆی وشک بوو. بە سەختی توانی کردەوەیەک نیشان بدا و دەستی بۆ خواحافیزی بۆ لای ئارکادیۆ راوەشان. ئارکادیۆش دەستی بۆ لای ئەو راوەشاند.
لەوکاتەدا لە لوولەی ئەو تفەنگانە کە بۆ لای ئەو نیشانگری کرابوون دووکەڵ هەڵدەستا، ئەو نووسراوانەی کە میلکیادیس بۆی خوێندبووەوە بەچاکی گوێی لێبوو، دەنگی هەنگاوەکانی سانتا سۆفیا دیلا پیدادی بە پەردەی لە کلاسی گوێ لێبوو و لە مێشکی خۆیدا هەمان سەختیی سەهۆڵ بەستووی هەست پێکرد کە لە مێشکی لاشەی ریمیدیۆسی دیبوو. دیسان توانی بیر بکاتەوە: "ئاخ لەبیرم چوو بڵێم ئەگەر منداڵەکەم کچ بوو ناوی بنێن ریمیدیۆس." ئەو کات هەروەک پەنجەی جانەوەرێکی گەورە لە بەریەکی هەڵدڕێ، هەموو ئەو سامەی کە لە ژیاندا ئازاری دابوو هەست پێکرد. سەروان فەرمانی تەقەی دا. ئارکادیۆ توانی سینگ بێنێتە پێش و سەر بەرز کاتەوە، بێ ئەوەی بزانێ ئەو ئاوە سووتێنەرە کە رانەکانی دەسووتێنێ لە کوێی لەشی دەڕژێتە خوار.
نەڕاندی: "قورمساخینە! بژی حیزبی ئازادیخواز."

شەڕ لە مانگی مای کۆتایی هات. دوو حەفتە پێش ئەوەی دەوڵەت بە بڕیارنامەیەکی دووردرێژ بە رەسمی راگەیەنێ کە ئەو کەسانەی شۆڕشیان کردووە، بێ بەزەییانە و بەتوندی سزا دەدرێن، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کە بۆ ئەوەی نەناسرێ، جلکی جادووگەرانی سوورپێستی دەبەر کردبوو، دروست لەو کاتەیدا کە دەگەیشتە بەرەی رۆژئاوا دەسگیر کرا. لەو بیست و یەک پیاوەی کە لەگەڵ ئەو چووبوونە شەڕێ، چاردەیان کوژرابوون و شەش کەسیش برینداربوون. لە ئاخر تێشکاندا تەنیا کەسێکی لەگەڵ بوو: سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز. هەواڵی دەسگیربوونی بە راگەیەندراوێکی تایبەتی لە ماکۆندۆ راگەیەنرا. ئۆرسۆلا بە مێردەکەی وت: "ئەو زیندووە، دەبێ لە خوامان بوێ دوژمنان بەباشی رەفتاری لەگەڵ بکەن." دوای سێ رۆژ گریان و زاری رۆژێکیان دوای نیوەڕۆ، کاتێک

هەویری بە شیری دەشێلا، دەنگی کورەکەی بەئاشکرا بیست. بە دەنگێکی بەرز وتی: "ئۆرلیانۆ بوو." رایکرد بۆ لای داربەڕووەکە هەتا خەبەر بدا بە میردەکەی." نازانم ئەو موجیزە چۆن رووی دا، بەڵام دەزانم ئەو ماوە و ئێمە بەوزووانە دەیبینین." بڕوای بە وتەی خۆی هەبوو. ژوورەکانیان شۆرد و جێگای مۆبڵەکانیان گۆڕی. حەفتەیەک دوایی، هەواڵێک کە روون نەبوو لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە، پێشبینییەکەی بە شێوەیەکی سامناک وەڕاست گێڕا، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە ئیعدام مەحکووم ببو و قەرار بوو بۆ چاوترساندنی خەڵک لە گوندی ماکۆندۆ ئیعدام بکرێ. رۆژی دووشەممە، سەعات دە و بیست دەقیقەی بەیانی، ئامارانتا لیباسی دەبەر ئۆرلیانۆ خۆزێ دەکرد کە لە دوورەوە دەنگی هەوهەوی دەستە سوارێک و لێدانی شەیپووری گوێ لێ بوو. دروست یەک ئان پێش ئەوە ئۆرسۆلا خۆی بە ژوورێ دا کا و هاوار بکا:"ئەوە دەیهێنن" سوارەکان بە زەبری قۆنداخە تفەنگ دڕیان بە خەڵک دا و هاتنە پێشەوە. ئامارانتا و ئۆرسۆلا بۆ ئەو شوێنە رایان کرد و هەروا کە دڕیان بە حەشیمەت دەدا، چاویان بەو کەوت. وەک سواڵکەران دەهاتە بەرچاو، لیباسەکانی هەڵدڕاو و چڵکن و مووی سەر و ریشی ئاڵۆز و پێ پەتی بوو.

بێ ئەوە هەست بە زەوی سوورەوەبووی ژێر پاپەتییەکانی بکا، بە رێگادا دەڕۆیشت. دەستیان لە پشتەوە بە تەنافێکی بەستبۆوە و سەری تەنافەکەش بە ئەسپێکەوە گرێ درابوو. لەگەڵ ئەو سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزیان بە سووکایەتی پێکردن رادەکێشا. هیچ کام لەو دووانە خەمبار نەدەهاتنە بەرچاو، دەتگوت نارەحەتیی ئەوان تەنیا لە بەر ئەوەیە خەڵک جوێن بە سوارەکان دەدەن. ئۆرسۆلا لە نێو ئەو هەرا و هوریایەدا هاواری کرد: "کورەکەم!" زللەیەکی توندی لە بناگوێی سەربازێک دا کە دەیەویست بۆ دواوەی بگێڕێتەوە. ئەسپی ئەفسەرەکە سەری هەڵبڕی و سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا راوەستا.لە حاڵێکدا لە باوەشی دایکی خۆی دەپاراست، مۆڕەیەکی لێ کرد و وتی: "دایە بگەڕێوە ماڵەوە. لە فەرمانبەران ئیجازە وەربگرە و وەرە بەندیخانە بۆ چاوپێکەوتنم."

چـــاوێکی لە ئامارانتـــا، کە لە دوو قەدەمیـــی پشـــت ســـەری ئۆرســـۆلا راوەسـتابوو، کـرد و بزەیەکـی هـاتێ و لێـی پرسـی: "دەسـتت چـی بـووە.' ئامارانتـا دەسـتی بانـدپێچکراوی خـۆی هەڵێنـا و وتـی: "سـووتاوە.' ئەوجـار ئۆرسـۆلای لادا هەتـا بەرپێـی ئەسـپان نەکەوێ. دەسـتەی سـواران ڕۆیشـتنە پێشەوە. گاردی تایبەتی گیراوەکانی بە قەتارە بەرەو زیندان برد.
لای ڕۆژئاوا، ئۆرسۆلا بۆ چاوپێکەوتنی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ ڕۆیشـتە زیندان. تێکۆشـــابوو لە ڕێگـــای دۆن ئاپۆلینـــار مۆســـکوتە ئیجـــازەی چـــاوپێکەوتن وەربگرێ، بەڵام لە بەرامبەر دەسەڵاتی نیزامییاندا بەتەواوی نرخـی خـۆی لە دەست دابوو. باوە نیکانوریش یەرەقانی گرتبوو و لە جێدا کەوتبوو. بـاوک و دایکـی سـەرهەنگ خرینیلـدۆ، کە مەحکووم بە ئیعـدام نەبـو و کۆشـابوون چاویان پێ بکەوێ، بە قۆنداخە تفەنگ دەریـان کردبوون. ئۆرسـۆلا کاتێـک ئەو ڕاستییەی بۆ دەرکەوت کە کەس لەو بـارەوە نـاتوانێ یـارمەتیی پـێ بکـا و بەرەبەیـانی بـێ ئەو لا و ئەو لا کـوڕەکەی گوللەبـاران دەکـرێ، هەرچـی دەیویســت بــۆی بەرێ لە بــوخچەیەکییەوە پێچــا و تــاک و تەنیــا ڕۆیشــتە بەندیخانە.
ڕایگەیاند: "من دایکی سـەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیام."
پاســەوانەکان ڕێگەیــان پێگــرت. ئۆرســۆلا پێیگــوتن: "مــن بە هەر جــۆر بــێ دەچــمە ژوورەوە. کەوابــوو ئەگەر پێتــان ســپێراوە تەقە بــکەن، بــیکەن، ڕامەوەسـتن." یەکێ لە پاسـەوانەکان دایە دواوە و ڕۆیشـتە ژووری کلاسـی قوتابخـــانەی پێشـــوو. چەنـــد ســـەربازی ڕووتەوەبـــوو چەکەکانیـــان خـــاوێن دەکردەوە. ئەفسەرێک کە لیباسـی کاری دەبەردا بـوو و سـوورکارە بـوو، بە چاویلکەی زەرەبینـی ئەسـتوور و ڕەفتـاری ڕەسـمی ئامـاژەی پاسـەوانەکانی کرد برۆنە دەرەوە.
ئۆرسۆلا دووپاتیکردەوە: "من دایکی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیام."
ئەفسـەر بە زەردەخەنەیەکی دۆسـتانە رسـتەکەی ڕاسـت کـردەوە و وتـی: "مەبەستتان ئەوەیە کە سەرکار خانم دایکی ئاغای ئۆرلیانۆ بویندیایە."
ئۆرسۆلا لە زاراوەی تێگەیی خەڵکی باکوورە.

وتی: "هەر جۆرێک دەفەرمووی. ئاغای ئۆرلیانۆ بویندیا، تەنیا دەمەوێ چاوێکم پێی بکەوێ."

فەرمانی سەروو، چاوپێکەوتنی گیراوەکانی مەحکووم بە ئیعدامی قەدەغە دەکرد. بەڵام ئەفسەرەکە بەرپرسایەتییەکەی بەئەستۆ گرت و رێگەی دا چارەگە سەعاتێک کوڕەکەی ببینێ. ئۆرسوڵا شتومەکی نێو بوخچەکەی بە ئەفسەرەکە نیشان دا. دەستێک لیباسی خاوێن، ئەو چەکمانەی کە کوڕەکەی بۆ رۆژی زەماوەند دەپێی کردبوو و، پارچە شیرینییەک کە لەو رۆژەوە لای وابوو کوڕەکەی دەگەڕێتەوە بۆی جیا کردبۆوە. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای لە ژوورێک، کە کردبوویانە زیندان، جیا چاوپێکەوت. لە سەر تەختەخەوێکی سەفەری راکشابوو و دەستی لێک بڵاو کردبوون. بن هەنگڵی بریندار ببوون. رێگەیان دابوویە ریش بتاشی. سمێڵە پڕەکانی، کە سەریان بادرابوو، زەقی روومەتەکانی دوو هێندە کردبوو. لە بەر چاوی ئۆرسوڵا لەو کاتەوە کە ئەوێی بەجێ هێشتبوو شەمزاوتر بوو. کەمێک باڵابەرزتر و تەنیاتر لە هەمیشە دەهاتە بەرچاو. لە هەمووی ئەو رووداوانە کە لەماڵێ قەومابوون ئاگادار بوو. خۆکوشتنی پیترۆکرێسپی، حکوومەتی ئارکادیۆ، گوللەباران کردنی ئەوی، بێ خەیاڵی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە ژێر دارەبەڕوو و دەیزانی کە ئامارانتا وەک بێوەژنێکی پاکیزە ئەرکی گەورەکردنی ئۆرلیانۆ خۆزێی بەئەستۆ گرتووە و دەرکەوت کوڕە چکۆڵە منداڵێکی گەیشتووە. خوێندن و نووسین هاوکات لەگەڵ زمان گرتن فێر ببوو. ئۆرسوڵا لە دەمی چوونەژوورەوەی کەوتە ژێر کارتێکردنی گەورەیی کوڕەکەی و شەبەقی فەرماندەیی و بریسکانەوەی هێز، کە لە لەشی دەتکا. زۆر سەری سووڕمابوو کە چۆن لە هەموو رووداوەکان ئاگادارە. ئۆرلیانۆ بە گاڵتە وتی: "ئەتۆ هەمیشە دەتزانی کە من جادووگەرم." دوایی هەر بەڕاست وتی: "کاتێک ئەورۆ بەیانی منیان هێنا ئێرە، بەبیرمدا هات کە پێشتر هەموو ئەو بەسەرهاتانەم بینیوە." لە راستیدا کاتێ خەڵک لە کەنار ئەو هاواریان دەکرد، ئەو نوقمی خەیاڵاتی خۆی ببوو، سەری سووڕمابوو کە شار لە ماوەی ساڵێکدا هێندە گۆڕاوە. لقی دار باداماں شکاون، رەنگی

خانووەکان، کە شین بوون و دوایی رەنگی سووریان لێدابوو و جارێکی دیکە شینیان کردبوونەوە و دەنگێکی تێکەڵ و پێکەڵ و ناقۆڵایان هەبوو.
ئۆرسۆلا هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: "چاوەڕوانیت چ بوو؟ کات تێپەڕ دەبێ."
ئۆرلیانۆ سەلماندی: "راستە بەڵام ئاوهاش خێرا نا."
چاوپێکەوتنی ئەوتۆ کە هەر دووکیان ئەو هەمووە چاوەڕوانی بوون و پرسیارانێکی کە هەر دوو ئامادەیان کردبوون و وەڵامێک کە دەبوو بدرێنەوە، جارێکی دیکە بوونەوە وتوێژێکی ئاسایی رۆژانە.
کاتێ پاسەوان کۆتایی چاوپێکەوتنی راگەیاند، ئۆرلیانۆ لوولەکاغزەیەکی ئارەقاوی لە ژێر دۆشەکەکەی دەرهێنا، شیعرەکانی بوون. ئەو شیعرانە کە بە ئیلهام لە ریمیدیۆس داینابوون و کاتی ئەوێی جێ هێشتبوو لەگەڵ خۆی بردبوون لەگەڵ ئەو شیعرانەی کە دوایی لە کاتی شەر داینابوون، وتی: "قەولم پێ بدە کە کەس نەیانخوێنێتەوە. ئەوشەوە ئاگردانیان پێ گەرم کە."
ئۆرسۆلا قەولی پێدا. لە جێگای خۆی هەستا کە بۆ ماڵئاوایی ماچی کا، بە پەرتی وتی: "دەمانچەکەم بۆ هێناوی." سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کاتێ دڵنیابوو پاسەوان ئاگای لێیان نییە، بە ئاسپایی وتی: "بە کارم نایە، بەڵام بە هەر حاڵ بمدەیە چونکە کاتێ لێرە چوویە دەرەوە لەوانەیە بتگەڕێن."
ئۆرسۆلا دەمانچەکەی لە نێو سینگی دەرهێنا و ئۆرلیانۆ لە ژێر دۆشەک شاردییەوە و دوایی لە سەرەخۆ وتی: "ماڵئاواییم لێ مەکە. لە هیچ کەس مەپاڕێوە و داوا مەکە. خۆت لە لای کەس چکۆڵە مەکەوە. هەروا بزانە لەمێژ ساڵە منیان گوللەباران کردووە." ئۆرسۆلا بۆ ئەوەی پێش بە گریانی خۆی بگرێ، لێوی خۆی گەزت و وتی: "بەردی سوورەوەبوو لە سەر برینەکانت دابنێ."
گەڕایەوە و لە ژوورەکە دەرچوو. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئەوەندە بە فکرانەوە بە سەر پێ مایەوە هەتا دەرگا داخرا. ئەو کات گەڕایەوە شوێنی خۆی لە سەر تەختە راکشا و دەستی لێک بڵاوکردن. لە منداڵییەوە، لەو کاتەوە کە پێشگۆیی رووداوەکانی دەکرد، وایدەزانی مەرگ بە نیشانەیەکی روونی بێ ئەولاو ئەولا بە بێ هەڵەی قەرەبوونەکراوە، بەو ئیلهام دەکرێ،

بەڵام ئێستا ئەگەرچی چەند سەعاتی زۆرتر بۆ مردن نەماوە، نیشانەی مردن خۆی پیشان نادا. جارێک لە توکورینکا[1] ژنێکی زۆر جوان هاتە ئۆردوگا و لە پاسەوانەکان داوای چاوپێکەوتنی ئەوی کرد. ئیجازەیان پێ دا، لە دەمارگرژی هێندێک دایکان ئاگادار بوون کە بۆ چاککردنی نەوەی داهاتوو کچەکانیان دەنارده جێ خەوی جەنگاوەرانی ناودار. ئەو شەوە کاتێ کچە هاتە ژوورەکەی، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا شیعری پیاوێکی دەهۆندەوە کە لە بارانەدا ڕێگای ون کردووە. پشتی لە کچەکە کرد هەتا ئەو وەرەقە کاغەزە و شیعرەکانی دیکەی لە کەشەوی مێزەکە بنێ و دەرگای داخا و ئەو کاتە بوو کە لە پڕ هەستی بە نیشانە و ئیلهام کرد. دەمانچەی لە کەشەو دەرهێنا و بێ ئەوەی ڕووی خۆی وەرگێڕێ، بە کچەی وت: "تکایە مەیتەقێنە."
کاتێ دەمانچە بە دەست وەرسووڕا کچە دەمانچەکەی دانواند و نەیدەزانی چ بکا.
بەم شێوەیە چوار جار لە یازدە داوێک کە بۆیان نابۆوە، ڕزگاری هات. لە لایەکی دی کەسێک کە نەیانتوانیبوو دەسگیری بکەن شەوێک هاتبووە سەربازخانەی شۆڕشگێڕانی مانائورە و هاوڕێی خۆشەویستی ئەو، سەرهەنگ ماگنیفیۆ ویسبالی کە تای هاتبوویە و بۆ ئارەقەکردن خۆی لە جێگا خزاندبوو بە زەبری خەنجەر کوشتبوو. ئەو ، کە هەر لەو ژوورە چەند مێتر ئەولاتر لە جۆلانەی خۆیدا نووستبوو، نەیزانیبوو. هەوڵی ئەو بۆ ڕێکخستنی پێشبینییەکانی بێ فایدە بوو. بە شێوەی کوتوپڕ لە نێو شەبەقێک لە ئیلهامی سەرووی سروشت ئاگاداریان دەبوو، وەک دڵنیایی بێ خەوش و ئانی کە دەست بەسەرداگرتنی ئیمکانی نەبوو، جاری وابوو ئەوەندە سروشتی بوو کە هەتا کاتێک نەقەومابان ئەوانی بە حیسابی پێشگۆیی دانەدەنا. جاری واش هەبوو بێجگە لە خورافات شتێک نەبوون. بەڵام کاتێک مەحکووم بە ئیعدامیان کرد و ئاخرین ئاواتیان لێ پرسی بە بێ بچووکترین گیروگرفت پێشبینی خۆی، کە وەڵامی پرسیارەکەی پێ ئیلهام کردبوو، هەڵدا.

---

[1]- Tucurinca

وتی: "داوا دەکەم حوکمی ئیعدامی من لە ماکۆندۆ بەڕێوە بچێ."
سەرۆکی داداگای نیزامی نارەحەت و تووڕە بوو، وتی: "بویندیا زرینگی مەکە. ئەوە تەنیا فێڵێکە بۆ دزینی کات."
سەرهەنگ وتی: "ئێوە لە بۆچوونی خۆتاندا خاوەن دەسەڵاتن، بەڵام ئاخرین ئاواتی من لە ژیاندا هەر ئەوەیە کە وتم."
لەوە زیاتر شتێکی دیکەی پێشبینی نەکردبوو. ئەو ڕۆژە کە ئۆرسوڵا بۆ چاوپێکەوتنی چووبووە بەندیخانە، دوای ئەوەی ماوەیەک بیری کردەوە، ئاخرەکەی بەو ئەنجامە گەیشت کە ئەو جارەیان ڕەنگە مەرگ ئامادەیی خۆی پێ ڕانەگەیەنێ، چونکە مەرگی ئەو پێوەندیی بە ڕووادوەوە نەبوو. بە بڕیاری ئیعدام کەران بەسترابۆوە. بە درێژایی شەو نەخەوت و لە ژانی برینەکانی ئازاری کێشا. هێندەی بۆ ڕۆژێ نەمابوو کە لە ڕێڕەوی پێش ژوورەکە دەنگی قەدەم لێدانێ دەهات. بە خۆی وت: "ئەوە دێن." بە بێ هیچ هۆیەک بیری کەوتە سەر خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا کە لەو دەمەدا و بەو بەرەبەیانییە سامناکە لە ژێر داربەڕوەکەدا فکر لەو دەکاتەوە. نە هەستی بە ترس کرد و نە بە دڵتەنگی. لە بریدا، بە خاتری ئەوە کە مەرگی داسەپاو ڕێگەی پێ نادا کۆتایی ئەو شتە ببینێ کە بە ناتەواوی هێشتوویەتەوە، هەستی بە تووڕەیی کرد. دەرگا کرایەوە و پاسەوان بە قۆرییەک قاوەوە هاتە ژوورێ. سبەی ئەو ڕۆژە، سەری هەمان سەعات، وەزعەکە هەر بەو حاڵە بوو. لە ژانی برینەکانی بن هەنگڵی وڕێنەی دەکرد. ڕۆژی پێنج شەممە شیرینییەکەی لەگەڵ پاسەوانان بەش کرد و لیباسی خاوێنی، کە بە بەری تەنگبوو، پۆشی و چەکمە قایشەکانی دە پێکرد. ڕۆژی هەینی هێشتا گوللەبارانیان نەکردبوو.
ڕاستی ئەوە بوو کە نەیاندەوێرا حوکمی ئیعدامەکە جێبەجێبکەن. نیزامییەکان دەیانزانی کە خەڵک دژی ئەوانن و گوللەباران کردنی سەهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا نەتەنیا لە ماکۆندۆ بەڵکو لە هەموو ئاوابییەکانی دەورووبەری زەلاوەکان ئەنجامێکی سامناکی سیاسیی بەدواوە دەبێ. لەو بارەوە لەگەڵ کاربەدەستانی مەرکەزیی ئوستان بیروڕایان گۆڕییەوە. شەممەشەو، کاتێک چاوەڕوانی وەڵام بوون، سەروان ڕۆگە کارنیسێرۆ و

چەند ئەفسەری دیکە رۆیشتنە مەیخانەی کاتارینۆ. تەنیا ژنێک لە ترسی هەڕەشەی ئەوان ملیدا ئەو بەرێتە ژووری نووستنی خۆی. ژنە پێیگوت: -یانەویێ لە باخەڵ پیاوێکدا بنوون کە بەزوویی دەمرێ. هیچ کەس نازانێ چۆن، بەڵام هەموو دەڵێن ئەفسەرێک کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا گوللەباران بکا، لەگەڵ تەواوی سەربازەکانی دەستە، یەک بە دوای یەکدا زوو یان درەنگ دەکوژرێن و تەنانەت ئەگەر بۆ ئەوسەری دونیاش رابکەن، بێ فایدەیە." سەروان رۆکە نیسێرۆ ئەفسەرەکانی دیکەی ئاگادار کرد و ئەفسەرەکانیش کاربەدەستانی سەرەوەتر. رۆژی یەکشەممە هەر چەندە کەس بە ئاشکرا بڵاوی نەکردبۆوە و لە لایەن نیزامیانیشەوە کردەوەیەک نەبینرابوو کە هێمنایەتیی پڕنیگەرانی تێک بدا، هەموو شار زانیبوویان کە ئەفسەرەکان پەنا بۆ هەموو بیانوویەک دەبەن کە خۆیان لە ژێر باری بەرپرسایەتی ئیعدام بدزنەوە. دەستووری رەسمی بە پۆستی رۆژی دووشەممە راگەیشت. حوکمی ئیعدام دەبوایە هەتا بیست و چوار سەعاتی دیکە جێبەجێ کرابا. ئەو شەوە ئەفسەرەکان حەوت تیکە کاغەزیان لە کلاوێک هاویشت و چارەنووسی شێواوی سەروان رۆکە کانیسێرۆ بە دیتنی ناوەکە لە سەر پارچە کاغەزێک کە لە کڵاوەکە دەریان هێنابوو دیاری کرا. بە گریی وتی: "لە بەختی بەد راکردن ناکرێ. بە بیژوویی لە دایکبووم و بە بیژووییش دەمرم." سەعات پێنجی بەیانی سەربازەکانی دەستەی هەڵبژارد و لە حەوشە بەڕیزی کردن و بە دوایدا مەحکوومی بەورستە ئیلهامبەخشە لە خەو هەستاند.

پێیگوت: "یالڵا بویندیا. هەستە برۆین وەختی هاتووە."

سەرهەنگ وەڵامی دایەوە: "کەوابوو نیشانەی ئەوە بوو، کە خەونم دەدیت برینەکانم چاک بوونەوە." ڕێبێکا بویندیا لەو کاتەوە زانیبووی کە قەرارە ئۆرلیانۆی گوللەباران بکەن، هەموو شەوێک سەعات سێێ دوای نیوەشەو لە خەو هەڵدەستا. لە ژوورەکەی خۆیدا بە تاریکی دەمایەوە و لە پەنجەرەی نیوەکراوەوە دەیڕوانییە قەبرستان. ئەو تەختەی کە لە سەری دانیشتبوو لە بەر پرخ و هۆڕی خۆزێ ئارکادیۆ دەلەرزییەوە. هەموو حەوتووی بەو جۆرە بە چاوەڕوانی تێپەڕ کردبوو، بە هەمان سەرسەختی

نهێنی، کە زەمانێک بە تەمای گەیشتنی نامەکانی پیترۆکریێسپی چاوەڕوان بوو. خۆزێ ئارکادۆ پێیگوت: "ئەو لێرە گوللەباران ناکەن. نیوەشەو ئەو لە سەربازخانە گوللەباران دەکەن هەتا کەس نەزانێ سەربازەکانی دەستە چ کەسانێکن. پاشان هەر لەوێ دەینێژن."
ڕێبێکا هەروا لە چاوەڕوانیدا مایەوە. دەیگوت: "دەیبینی کە ئەو جانەوەرانە ئەو لێرە گوللەباران دەکەن." ئەوەندە بڕوای بە قسەی خۆی هەبوو کە تەنانەت چۆن دەرگا دەکاتەوە هەتا بۆ ماڵئاوایی دەستی بۆ بەرز بکاتەوە. خۆزێ ئارکادۆ سوور بوو لە سەر ئەوە و دەیگوت: "ناهێڵن ئەو بە شەش سەربازی ترساو بە شەقامدا رابڕێ. دەزانن خەڵکی ئامادەن گیانی خۆشیان فیدای ئەو بکەن." بەڵام ڕێبێکا کە گوێی نەدەدایە بەڵگە و دەلیلی مێردەکەی، لە پەنجەرە جیا نەدەبۆوە. بە چەنەبازی دەیگوت: "دەبینی کە ئەو کۆمەڵە چ جانەوەرانێکی پیسن."
ڕۆژی سێ شەممە سەعات پێنجی بەیانی، خۆزێ ئارکادۆ قاوەکەی خواردبۆوە و سەگەکانی بەڵلا کردبوون کە ڕێبێکا پەنجەرەی داخست و بۆ ئەوەی بە زەویدا نەکەوێ دەستی بە لێواری تەختەکە گرت. هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: "ئەوە دەیهێنن، چەند جوانە!" خۆزێ ئارکادۆ سەری لە پەنجەرە بردەدەرێ و چاوی پێ کەوت کە وێنەی لە ڕووناکایی بەیانیدا دەلەرزی. پشتی بە دیوارەوە بوو و دەستی لە بەر برینەکانی بن باڵی لە سەر کەمەر دانابوون. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە بەر خۆیەوە زەمزەمەی دەکرد کە: "مرۆڤ دەبێ چەندە نەرم و زەبوون بێ و چەندە بێچارە بێ کە بهێڵێ ئەو شەش سەربازە قووندەرە بیکوژن و ئەو نەتوانێ هیچ کارێک بکا." ئەوەندە بە توورەیی ئەو ڕستەیەی دووپات کردەوە، کە سەرەنجام توورەبوونەکەی بوو بە جۆرێک خۆشی. سەروان ڕۆکە کارنیسێرۆ، بەو خەیاڵەی دوعایان دەکا، بەزەیی گرتبووی. کاتێ سەربازەکان ڕووی تفەنگەکانیان تێ کرد، ڕقەکەی بوو بە مادەیەکی تاڵ کە زمانی کڕ کرد و ناچاری کرد چاو لە سەریەک دابنێ. ئەو کات بریسکانەوەی کازیوەی بەرەبەیان کۆتایی هات و جارێکی دیکەش خۆی بینی پانتۆڵێکی کورتی دەبەر دایە و کراواتی بەستووە. باوکی چاوپێکەوت

کە لە پاش نیوەڕۆیەکی خۆشدا ئەو دەباتە نێو چادرێک، کە لەوێ سەهۆڵی بینی. کاتێ دەنگی هاواری بیست، وایزانی کە ئاخرین فەرمانی ئاگر بووە. چاوەکانی بە بە هەستێکی موچوڕکاوی کردەوە. چاوەڕوان بوو بڵاچەی ئاگری تفەنگەکان ببینێ،کەچی تەنیا سەروان رۆکە کارنیسێرۆی دیت دەستی بە نیشانەی تەسلیم بوون بەرز کردۆتەوە و خۆزێ ئارکادۆ بە تاپری دوولوولەی بەسام و سوارەوە، بە شەقامدا رادەبرێ.
سەروان بە خۆزێ ئارکادیۆی وت: "تەقە مەکە خوای گەورە تۆی ناردوە."
شەوێکی دیکە دەست پێکرا. سەروان رۆکە کانیسێرۆ و شەش سەربازەکەی لەگەڵ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بۆ رزگاریی ژەنەراڵی شۆڕشگێڕ، ویکتۆریۆ مێدینا کە لە ڕیۆهاشا مەحکووم بە ئیعدام ببوو رۆیشتن.
تا ئەوەندە کات بە فیرۆ نەڕوا، بڕیاریان دا بە چیادا بڕۆن، رێگایەکە خۆزێ ئارکادۆ پێیدا رۆیشتبوو و گوندی ماکۆندۆی بنیات نابوو. هێشتا حەفتەیەک تێپەڕ نەببوو کە تێگەیشتن ئیمکانی نییە، بۆیە ناچار بوون بێبردنی تەقەمەنی بە چەکی سەربازەکان لە جادەی خاکی پڕمەترسیی سەرەوەی چیا تێپەڕن. لە نزیک گوندەکان ئۆردویان لێ دەدا و یەکێک لەوان لیباسی دەگۆڕی و بە ماسییەکی چکۆڵەی زێڕ بەملەوە بە رۆژی رووناک دەرۆیشتەدەرێ، هەتا لەگەڵ ئازادیخوازن پێوەندی بگرێ. ئازادیخوازان بەیانیی رۆژی دواتر بۆ راو دەردەکەوتن و ئیتر نەدەگەڕانەوە. کاتێ لە بەرزایی چیا ڕیۆهاشایان بینی، ژەنەراڵ ویکتۆر یومیدینا گوللەباران کرابوو. شۆڕشگێڕەکان سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایان بە دەرەجەی ژەنەراڵ بە فەرماندەی شۆڕشگێڕانی کەنارەکانی کارییبی راگەیاند. ئەو کارەی قبووڵ کرد، بەڵام چوونەسەری دەرەجەی وەرنەگرت. لەگەڵ خۆی مەرجی کرد هەتا حکوومەتی پارێزەران لە سەر کاربێ، ئەو دەرەجەی قبووڵ نەکا. لە ماوەی سێ مانگدا توانیان هەزار کەس چەکدار بکەن، کە هەموویان کوژران و چەند کەسێکیش کە مابوونەوە خۆیان گەیاندە بەرەی رۆژهەڵات. ئاخرین هەواڵ ئەوە بوو کە ئەوان لە دوورگەکانی بچووکی

ئانتیل گەیشتوونەتە کاپۆدێلا ڤێلا[2] و لەوێ دامەزراون. لە لایەن دەوڵەتەوە بڵاوکراوەیەک تێلگراف کرا، کە دەیگەیاند سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا مردووە و لە هەموو وڵات بڵاوکرایەوە، بەڵام دوو رۆژ دواتر، هاوکات لەگەڵ تێلگرافی پێشوو، تێلگرافێکی دیکە گەیشت کە راپەڕینێکی دیکەی لە دەشتەکانی باشوور رادەگەیاند. بەوجۆرە ئەفسانە و ناوبانگی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، کە لە هەموو شوێنێک و هاوکات وجوودی هەبوو دەست پێکرا. هەواڵەکان هاوکات بە دژ و کەمووری رایاندەگەیاند کە ئەو لە ڤێلا نوێڤا[3] سەرکەوتووە. لە گواکامایاڵ[4] تێشکاوە. سوورپێستەکانی مۆتیلۆن[5] لە بەریەکیان هەڵدڕیووە. لە گوندێک لە گوندەکانی زەلّێ مردووە و، دیسان، بە چەکداری، لە ئورمیتا سەری هەڵێناوەتەوە. رێبەرانی حیزبی ئازادیخواز، کە لەو کاتدا بۆ هەڵبژاردنی پارلمان خەریکی وتوویژ بوون، ئەویان بە گێرەشێوێنێک دەزانی کە ئەندامی حیزب نەبوو. حکوومەتی نیشتمانی ئەوی لە ریزی رێگران دانا و، بۆ سەری خەلاتێکی بەرامبەر پێنج هەزار پیزۆی دیاری کرد. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، دوای شازدە جار شکان، لەگەڵ دوو هەزار سوورپێستی چەکدار لە گوندان هاتەدەر و دوای هێرش بۆ پادگان، رێۆهاشای داگیرکرد. ستادی شەڕی لەوێ دامەزراند و شەڕی لەگەڵ رێژیم راگەیاند. یەکەم پەیامێک کە لە دەوڵەتەوە وەریگرت ئەوە بوو ؛ ئەگەر بە هێزەکانی خۆیەوە هەتا چل و هەشت سەعاتی دیکە بۆ لای جەبهەی رۆژئاوا پشەکشە نەکا، سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزی گوللەباران دەکەن.

سەرهەنگ رۆکە کارنیسێرۆ، کە لەو کاتدا فەرماندەی دەستەی بە عۆدە بوو ، بە حاڵەتێکی تاساو تێلگرافەکەی دایە دەستی ئەو، بەڵام، ئەو تێلگرافەکەی بە خۆشحاڵییەکی چاوەڕواننەکراو خوێندەوە.

---

[2]- Capo Dela Vela

[3]- Villa Nueva

[4]- Guacamayal

[5]- Motilon

بە سەرسوورمانەوە وتی: "چەند بەرزە، ئێستا لە ماکۆندۆش تێلگرافخانەمان هەیە."
وەڵامەکەی بڕابۆوە. هیوادار بوو بتوانێ هەتا سێ مانگی دیکە دیسان ستادی خۆی لە ماکۆندۆ دامەزرێنێتەوە و ئەگەر لەو کاتەدا سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزی بەزیندوویی دەست نەوکەوتایە، هەموو ئەو ئەفسەرانەی، کە هەتا ئەو کاتەی گیرابوون، گوللەباران دەکرد. ئەویش لە ژەنەراڵەکانەوە دەستی پێکرد و دوایی بە ئەفرادی خۆی دەستوور دەدا هەتا کۆتایی جەنگ ئەو کارە درێژە پێ بدەن. دوای سێ مانگ کاتێک سەرکەوتووانە گەیشتە ماکۆندۆ، هەوەڵین کەس کە لە سەر جادەی زەلی، ئەوی لە باوەش گرت، سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بوو.
ماڵ پڕ ببوو لە منداڵ. ئۆرسۆلا، سانتا سۆفیا دێلا پێدادی بە خۆی و کچەکەی و دووانەکەیەوە، کە پێنج مانگ دوای گوللەبارانی ئارکادیۆ هاتبوونە دونیاوە، هێنابوونیە ماڵەوە. پێچەوانەی ئاخرین ئارەزووی ئارکادیۆ، ناوی کچەکەی نا رێمیدیۆس. دەیگوت: "دڵنیام مەبەستی ئەوە بووە. ئەگەر ناوی ئۆرسۆلای لێ بنێم لە ژیاندا زۆر ئازار دەچێژێ." ناوی دووانەکانی نا خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم و ئۆرلیانۆی دووهەم. ئامارانتا بەرپرسایەتیی گەورەکردنی هەموویانی بەئەستۆ گرت. کورسیی داری چکۆڵەی لە ساڵۆن دانان و لەگەڵ منداڵەکانی بنەماڵەی دراوسێ، هەموویانی لەوێ کۆکردەوە. کاتێ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە نێوان تەقینەوەی فشفشەی ئاگربازی و دەنگی ناقووسەکانی کڵێسا گەڕایەوە، دەستەیەک کوڕی منداڵانە، هاتنەوەی ئەویان بۆ ماڵەوە بەخێر هاتن وت. ئۆرلیانۆ خۆزێ، کە وەک باوکی باڵای بەرز ببوو و ئۆنیفۆرمی نیزامی شۆڕشگێری دەبەر کردبوو، سڵاوی نیزامیی لەو کرد.
هەموو رووداوەکان زۆر خۆش هات نەبوون. ساڵێک دوای راکردنی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، خۆزێ ئارکادیۆ و رێبێکا گوێزتیانەوە ئەو خانووەی کە ئارکادیۆ دروستی کردبوو. هیچ کەس نەیدەزانی کە ئەو دەستێلەوکارەدا هەبووە و نەیهێشتووە براکەی تیرباران بکرێ. خانووی نوێ لە باشترین شوێنی مەیدان هەڵکەوتبوو. دار بادامێک کە لە سەری

سێ هێلانەی سینەسرخ دەبینران سێبەری لە خانووەکە دەکرد. دەرگای خانووەکە گەورە بوو و چوار پەنجەرەی گەورەی هەواگری هەبوو و بۆ هەموو کەس ئاوەڵا بوو. هاورێکانی پێشووی ریبێکا ، لە نێو ئەواندا چوار کچی بنەماڵەی مۆسکوتە، کە هێشتا میردیان نەکردبوو، جارێک دیکە گوڵدۆزیی سالانی پێشوویان کە لە هەیوانی گوڵانی بگۆنیا دەستی لێ هەڵگیرابوو، دەست پێکردەوە.

خۆزێ ئارکادۆ وەک پێشوو مشەخۆریی زەوی و زاری دەکرد. حکوومەتی پاریزەران ئەو زەوی و زارانەی بە ناوی ئەوەوە بەرەسمی ناسیبوو و هەموو رۆژێ ئێواران بە سواری ئەسب و لەگەڵ سەگەکانی راوی و تفەنگی دوولوولە و ریزێک کەروێشک، کە بە فیتراک زینی ئەسبەکەیەوە هەڵواسرابوون، دەگەرایەوە ماڵەوە. سڵاوی لە ریبێکا کرد کە لە نەهارخۆری بوو و سەگەکانی لە حەوشە بەستەوە و کەروێشکەکانی بردە ئاشپەزخانە خوێیان بکا. ئەو جار رۆیشتە ژووری نووستن جلەکانی بگۆرێ. ریبێکا پاشان دەیگوت کاتێک مێردەکەی چووبووە ژووری نووستن، ئەو دەرگای حەمامی لە سەر خۆی داخستووە و ئاگای لە هیچ نەبووە. باوەرکردن بە قسەکانی زۆر ئاسان نەبوو، بەڵام قیافەی حەقبەدەستی ئەو بێ تاوانیی ئەوی دەسەلماند و دەلیلێکیش نەبوو کە ریبێکا پیاوێک بکوژێ کە بەو جۆرەی ئەوی لە ژیاندا بەختەوەر کردووە. ئەو رووداوە رەنگە تەنیا رووداوێک بوو کە راستییەکەی هەرگیز لە ماکۆندۆ ئاشکرا نەبوو. هەر لەو کاتەدا کە خۆزێ ئارکادۆ دەرگای ژووری خەوی داخست، دەنگی تەقەی دەمانچەیەک بە سەرتاسەری ماڵێدا گەرا. جۆگەلە خوێنێکی باریک لە ژێر دەرگای ژوورەکە هاتەدەر و لە ساڵۆن تێپەری و گەیشتە شەقام و بە درێژایی پیادەرەوەکانی نارێک خەتێکی راستی بری و، لە پلیکانان سەرکەوت و لە شەقامی "تورکان" گوزەرا و لە سەر پێچی هەوەڵ بە لای راست و دوایی بە لای چەپدا بای دایەوە و بۆ لای ماڵی بنەماڵەی بویندیا رۆیشتە پێش و بە بن دەرگای داخراودا وەژوور کەوت و گەیشتە ساڵۆنی و، بە دەوری مێزی نەهارخۆریدا گەرا و بە هەیوانی گوڵە بگۆنیاکاندا درێژەی بە رێگای خۆیدا و بێ ئەوە ببیندرێ لە

ژێر کورسیی ئامارانتا، کە خەریکی دەرسی حیساب وتنەوە بە ئۆرلیانۆ خۆزێ بوو، رابرد و بە نێو عەمبارێدا گەیشتە ئاشپەزخانە. ئۆرسۆلا، کە بۆ نانکردن سێ و شەش هێلکەی شڵەقاندبوو، هاواری کرد: "یا مریەمی پیرۆز."

بە دوای جۆگەلە خوێندا رۆیشت. بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی خوێنەکە، بە نێو عەمبار و هەیوانی گوڵە بگۆنیایاندا رابرد کە دەنگی گۆرانیی ئۆرلیانۆ خۆزێی گوێ لێ بوو کە سێ و سێ، شەش و شەش و سێی نوێی دەگوت و لە ژووری نەهارخۆری و ساڵۆنی تێپەڕی و هەتا کۆتایی شەقام رۆیشت و سەرەتا بە لای راست و پاشان بە چەپدا وەرسووڕا و گەیشتە شەقامی تورکان. نەیزانیبوو کەوشی رەحەتی دەپێ دایە و بەرهەڵبێنەی ئاشپەزی لە خۆ نەکردۆتەوە. گەیشتە مەیدانێ و، چووە بەر دەرگای ماڵێک کە هەرگیز پێی تێنەنابوو. پاڵی بە دەرگای ژوورەوە نا، بۆنی توندی باروت هێندەی نەمابوو بیخنکێنێ.

خۆزێ ئارکادۆی لە ژووری خەوتن بینی کە لە سەر زەوی کەوتووە و سەرچاوەی خوێنەکەی دۆزییەوە، لە گوێی راستی لاشەکە کە ئێستا مەیی بوو و نەدەهات. برینێکیان لە لەشیدا نەدۆزییەوە، نەیانتوانی ئامێری کوشتنیش بدۆزنەوە، هەروا کە نەیانتوانی بۆنی توند و تیژی باروت لە نێوبەرن. سەرەتا کەلاکەکەیان سێ جار بە لفکە و سابوون شووشت و پاشان بە خوێ و سرکە و دوایی بە خۆڵەمێش و لیمۆ دایانماڵی و، سەرەنجام لە بۆشکەیەک ئاوی کلێسایان رۆکرد و شەش سەعات بەو جۆرە هێشتیانەوە، ئەوەندەیان داماڵی، خاڵکوتییەکانی لەشی کاڵ بوونەوە. بە بیریان داهات ئاڵەت و زەردەچێوە و گەلای داری غاری لێبدەن و رۆژێکی تەواو لە سەر ئاگرێکی هێدی بیکوڵێنن، بەڵام لاشەکە خەریک بوو دەگەنی، بۆیە ناچار بوون یەکجار بە پەلە بە خاکی بسپێرن. لە تابووتێکی تایبەتییان نا کە دوو میتر و سێ سانتیمیتر درێژایی و میترێکو دە سانتیمیتر پانایی بوو، لە ناوەوە بە وەرەقەی ئاسن و پێچی پۆلا توند کرابوو، بەوحاڵەش بۆنی توندی باروت لە شەقامەکانی رێڕەوی جەنازەکە دەهاتە بەر لووت. قەشە نیکانور بە جەرگی هەڵمساو وەک تەپڵی، کە

نەخۆش بوو و لەجێگادا کەتبوو دوعای لێخۆشبوونی بۆکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە مانگەکانی دواییدا لە دەوری گۆڕەکەی چەند دیواریان کێشا و خۆڵەمێش و قسڵیان لە نێو دیوارەکان کرد، بەڵام گۆڕستان هەتا ساڵانی دواییش بۆنی بارووتی لێدەهات، هەتا سەرەنجام موهەندیسانی شیرکەتی مۆز سەرگۆڕەکەیان بە چیمەنتۆ دارشت. هەر کە لاشەکەیان لە ماڵەوە بردەدەر، ڕێبێکا دەرگای ماڵەوەی داخست و خۆی لەوێ زیندەبەگۆڕ کرد. بەندکراو لە توێژێکی ئەستوور کە هیچ وەسوەسەیەکی سەرزەوی نەتوانێ کاری تێ بکا. تەنیا جارێکیان، زەمانێک کە پیر و داکەوتوو ببوو، لە ماڵەوە چووەدەرێ. کەوشێکی بە ڕەنگی زیوی کۆن دەپێدا بوو و کڵاوێکی لە گوڵانی بچکۆڵە بە سەرەوە بوو. کاتێک بوو کە یەهوودیی سەرگەردان بە شاردا رادەبرد و گەرمایەکی کە بە دوای خۆیدا هێنابوو ئەوەندە بەتین بوو، باڵندان تۆڕ پشتی پەنجەرانیان دەدراند و لە ژووری خەوتنی ماڵاندا دەمردن. کەرەتی ئاخر کە بەزیندوویی بینیان، کاتێک بوو کە دزێک ویستبووی بچێتە ژوورێ، بە گولله کوشتبووی. دوای ئەو، بێجگە لە ئارخنیدا[٦] کە خزمەتاکر و هاودەمی بوو، کەسی دیکە پێوەندیی پێوە نەگرت. جارێک زانیان کە نامە بۆ قەشە دەنووسێ. دەیگوت کە قەشە کوڕی مامیەتی، بەڵام هیچ کات ڕوون نەبۆوە، لە وەڵامدا نامەیەکی پێ دەگا یان نا. شار ئەوی فەرامۆش کرد.

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتووانە گەرابۆوە، زۆر لە وەزعەکە رازی نەدەهاتە بەرچاو. دەستەکانی دەوڵەتی بێ بەربەرەکانی تەسلیم دەبوون و ئەو کارە ئازادیخوازانی بە سەرکەوتنێکی وەهمی هیوادار دەکرد، هیوایەک کە لە نێوبردنی لە بەرژەوەندیدا نەبوو.

بەڵام شۆڕشگێران و لە هەموویان زۆرتر سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، ڕاستییەکەیان دەزانی. هەر چەند لەو کاتەدا زۆرتر لە پێنج هەزار کەسی لە ژێر فەرماندا بوو و بە سەر دوو مەڵبەندی کەناری دەریادا حکوومەتی دەکرد، بەڵام هەستی دەکرد وەک لە دەریایەکدا گەمارۆ درابێ. وەزعی ئەوەندە پەرێشان بوو کە کاتێک فەرمانی دا بورجی ناقووسی کڵێسا کە بە

---

[٦]- Argenida

تـۆپ ویـران ببـوو چـاک بـکەنەوە، قەشـەنیکانور بە نەخۆشـی لە جێگـادا رایگەیاند: "کارێکی گەوجانەیە. پەیرەوانی عیسا کڵێسا خراپ دەکەن و چەند وەسـتایەک دروسـتی دەکەنەوە." بـۆ دۆزیـنەوەی ڕێگـای ڕزگـاری لە تێلگرافخانە دەمایەوە و لەگەڵ فەرماندەی ناوچەکانی دیکە پێوەندیی دەگرت و هەمـوو جـارێ زۆرتـر بـاوەڕی دەهێنـا کە شـەڕێکی دۆڕاو دەکەن. کـاتێ هەواڵـی سـەرکەوتنەکانی تـازەی ئـازدیخوازان گەیشـت، بە بڵاوکـردنەوەی بڕیارنامەیەک جێژنیان گرت، بەڵام ئەو لە رووی نەخشە پێشڕەوییی ئەوانـی سـەیر دەکـرد و دەیزانـی هێزەکـانی گەیشـتوونەتە دارسـتان و لە بەرامـبەر پێشکەی مالاریا و مێشوولەی دیکە لەخۆیان بەرگری دەکەن و بە شـوێنێکدا دەڕۆنە پـێش کە نـابی بـڕۆن. لەگەڵ ئەفسـەرەکانی دەردەدڵـی دەکـرد، دەیگـوت: "بەخـۆڕایی وەخـت بە فیـرۆ دەدەیـن. ئەو قورمسـاخانەی ئەنـدامی حیـزب بـۆ کورسـیی پارلەمـان گەدایـی دەکەن و ئێمەش لێرە وەختەکەمـان بەفیـرۆ دەدەیـن." لە شـەوانی بێداریـدا، لەو ژوورە کە بەمەرگ مەحکـووم ببوو، لە جۆلانەیەکدا رادەکشا و نوێنەرانی پارلەمـانی دەهێنا بەرچـاوی، کە لبـادێکی رەشـیان دەبەر کـردووە و لە هەوای سـاردی بەیـانیی زوودا لە کاخی سـەرکۆمار دێنە دەرێ، یەخەی کۆتەکەیـان هەڵدەدەنەوە و دەسـتیان ڕێـک دەخەن، بە ورتەورت دەچـنە ئەو کـاخە تاریـک و پیسـانەی بەیـانی زوان، هەتا سەبارەت بە قسەکانی سەرکۆمار وتوویژ بکەن، کاتێ وتبووی: "بەڵـێ" مەبەسـتی چ بـووە، کـاتێ وتبـووی: "نـا" چ مەبەسـتێکی هەبـووە و تەنـانەت مەبەسـتی سـەرکۆمار لە وتنـی شـتانێک بێجگە لە "بەڵـێ" و "نـا"ش. تێدەگەیشت نوقمی ئەو خەیاڵاتە، لە ژووری گەرمی خۆی کە پلەی گەرمـای دەگەیشـتە سـی و پێـنج درێـژ ببـوو، هەروا کە مێشـوولەی لە خـۆی دوور دەخستنەوە، دەیدی کە بەرەبەیـانێکی سـامناکی لەپێشـە و ئەو بە پیاوەکـانی خۆی فەرمان دەدا خۆیان لە دەریا باوێن.

لە یەکێک لە شەوەکانی گوماندا، وەختێک پیلار تێرنێرا لەگەڵ سـەربازەکان لە حەوشە گۆرانیی دەگوت، داوای لێکرد فـاڵی وەرەقـی بـۆ بگرێتەوە. پیلار تێرنێرا دوای ئەوەی سـێ جـار وەرەقەکـانی ڕیـز کـردن و کـۆی کـردنەوە تەنیـا شـتێکی بەوی گـوت ئەوە بـوو: "مانـای بەوردی نـازانم، بەڵام زۆر

روونە. ئاگات لە دەمت بێ." دوو رۆژ دواتر کەسێک قوورییەکی قاوەی بێ شەکری دا بە سەربازیاوەرێک و ئەویش دایە دەستی کەسێکی دیکە و ئەو کەسەش بە کەسێکی دیکە هەتا ئەو قۆرییە دەست بە دەست گەڕا و گەیشتە دەفتەری سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا.
ئەو قاوەی داوا نەکردبوو، بەڵام چونکە قاوە هاتبووە بەردەمی، خواردییەوە. ئەو ستیرکنینە کە لە قاوەکە کرابوو بۆ کوشتنی ئەسپێک دەبوو. کاتێ بردیانە مالەوە بە سەر یەکدا نوشتابۆوە و لێک ترازابوو. زمانی هاتبووە دەرێ. ئۆرسولا بۆ رزگاریی ئەو لەگەڵ مەرگ بەربەرەکانیی کرد، دوای ئەوەی زگی بە داودەرمانی رشانەوە شۆردەوە، ئەوی لە پەتوویەکی گەرمەوە پێچاو و دوو رۆژان سپێنەی هێلکەی دەخوارد دا هەتا لەشی تێشکاوی پلەی گەرمای ئاسایی خۆی هاتەوەدەست. رۆژی چوارەم لە مەترسیی مردن رزگاری بوو. بە پێچەوانەی ویستی خۆی، ئۆرسولا و ئەفسەرەکانی ناچاریان کرد حەفتەیەکی دیکەش لە جێگادا بمێنێتەوە. ئەو کات بوو زانی شیعرەکانیان نەسووتاندووە. ئۆرسۆلا بۆی باس کرد کە: "ئەو دەویست پەلە بکەم، ئەو شەوە کاتێ ویستم ئاگردان هەڵکەم  بە خۆم وت باشترە سەبر بگرم هەتا تەرمەکەی دەهێننەوە." لە گێژی تەماویی چاکبوونەوەدا، هەروا کە بووکەڵەکانی تۆز و خۆڵگرتووی ریمێدیۆس دەورووبەریان گرتبوو، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە خوێندنەوەی شیعرەکانی دەورانی تێکۆشانی ژیانی خۆی جارێکی دیکەش زیندوو کردەوە. سەر لە نوێ خەریکی نووسین بۆوە. لە سنووری شەڕێکی بە دواڕۆژدا، بە سەعات ئەزموونی خۆی لە گێژاوی مەرگدا بە شێوەی شیعری جوان دەربڕی. بیرەکانی ئەوەندە روونااک بوون، کە دەیتوانی لە هەر لایەکەوە درێژەیان پێبدا. شەوێک لە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزی پرسی: "هاوڕێم بڵێ بزانم ئامانجی تۆ لە شەڕکردن چییە؟"
سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز وەڵامی دایەوە: "بۆ حیزبی گەورەی ئازادیخواز شەڕ دەکەم، دەلیلی لەوە  باشتر؟"

ئەو وتی: "خۆش بە حاڵت، تۆ لانی کەم هۆی شەڕکردنت دەزانی، بەڵام من تازە تێگەیشتووم کە تەنیا بۆ غورووری خۆم بەشەڕ دێم."
سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز وتی: "زۆر خراپە."
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کە لە ترسی هاورێکەی هاتبۆوە سەرحاڵ، وتی: "ئەرێ، بەڵام باشـتر لەوەیە کە مـرۆڤ هەر نەزانـێ بـۆ گەیشـتن بە چ ئامانجێک شەڕ دەکا." چاوی لە چاوی بڕی و بە پێکەنینەوە وتی: "یان وەک تۆ، شەڕکردن بۆ شتێک کە لە لای هیچ کەس مانایەکی نییە."
بوغرایی نەیهێشت لەگەڵ دەستە چەکدارەکانی نێو وڵات پێوەندی بگرێ، لانی کەم هەتا ئەو کاتە کە ڕێبەرانی حیزب بەڕەسمی ئەویان وەک ڕێگر نەناسـاندبوو، ئەوەی نەکـرد. بە هەر حـاڵ دەیزانـی هەر کە دەسـت لەو بوغراییە بێ کەڵکە
هەڵگرێ، دیسان شەڕ دەست پێدەکاتەوە. دەورەی نەخۆشی هەلێک بوو هەتا لەو بارەوە بیر بکاتەوە.
ئۆرسۆلای ڕازی کرد پاش ماوەی میراتە شاراوەکەی خۆی لە ئیختیار بنێ. ئەوجار سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزی کردە فەرماندەی نیزامی و غەیرە نیزامیـی ماکۆنـدۆ و بۆخـۆی بـۆ پێوەنـدی لەگەڵ هێـزی شۆڕشـگێڕانی ژوورەوە ڕۆیشت.
سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز نەتەنیا باشترین دۆستی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا
بـوو، بەڵکـو ئۆرسـۆلایش ئەوی بە یەکێـک لە ئەنـدامانی بنەمـاڵەی خۆیـان وەردەگـرت. پیـاوێکی بەڕووان جـوان و شـەرمێون بـوو و خۆشـڕەفتاریی دەروونیـی بـۆ شـەڕ زۆرتـر دەشـا هەتـا بـۆ حکـوومەت کـردن. ڕاوێژکـارە سیاسـییەکانی بەئاسـانی توانیـان ئەو لە خـوارەپێچەکەی باوەڕەکانـدا گێـژ بـکەن. بەوحـاڵەش تـوانی ئاشـتی و هێمنـایەتی بە جۆرێـک لە ماکۆنـدۆ دامەزرێنێ کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بتوانێ ساڵانی پیریی خۆی لەوێ بەئاسـوودەیی بە دروسـتکردنی ماسـییە زێـڕە بچکۆڵەکـان تێپەڕ بکـا. هەر چەنـد لە مـاڵی دایـک و بـاوکی دەژیـان، بەڵام حەوتـووی دوو سـێ ڕۆژ لە مـاڵی ئۆرسـۆلا نەهـاری دەخـوارد. شـێوەی بەکارهێنـانی چەکە

جۆرەبەجۆرەکـانی فێـری ئۆرلیـانۆ خـۆزێ دەکـرد. هەوەڵـین مەشـقە نیزامییەکانی پێوت و بە ئیجازەی ئۆرسـۆلا، بۆ ئەوەی ببێتە پیاوێکی لێهاتوو چەنـد مانگـان بـردییە سـەربازخانە. خرینیلـدۆ مـارکیز چەنـد سـاڵ پێشـتر، کاتێـک زۆر گەنـج بـوو ئامارانتـای خـۆش ویسـتبوو، بەڵام ئەو کـات، کە ئامارانتـا غەرقـی ئەوینـی پیترۆکریسـپی بـوو، گـاڵتەی پێکردبـوو. خرینیلـدۆ مارکیز چاوەڕوان مایەوە. جارێکیان لە بەندیخانەوە نووسـراوێک و هێنـدێک پارە و دەدوازدە دەسرەی بۆ ئامارانتا نارد هەتا پیتی هەوەڵـی نـاوی بـاوکی لە سـەر گوڵدۆزی بکا. حەفتەیەک دواتر ئامارانتـا دەسـرە گوڵـدۆزیکراوەکانی لەگەڵ پووڵەکە بۆ ناردەوە بەندیخانە. چەنـد سـەعات سـەبارەت بە رابـردوو بەیەکەوە قسـەیان کـرد. کـاتێ ئامارانتـا لەوێ دەرۆیشـت خرینیلـدۆ مـارکیز پێیگـوت: "کـاتێ لێـرە بـێمە دەرێ لەگەڵ تـۆ زەماوەنـد دەکەم." ئامارانتـا پێکەنی، بەڵام هەروا کە دەرسی بە مناڵەکان دەگوت، بیـری لەوە دەکردەوە و هەولی دەدا ئەوینی لاوی خـۆی سـەبارەت بە پیترۆکریسـپی لەودا زینـدوو بکـاتەوە. رۆژانـی شـەممە، کە رۆژی چـاوپێکەوتنی زینـدانیانبوو، دەرۆیشـتە مـاڵی داک و بـاوکی خرینیلـدۆ مـارکیز و لەگەڵ ئەوان دەرۆیشـتە بەندیخانە. لە یەکێک لەو شـەممەیانەدا، ئۆرسـۆلا لە چـاوپێکەوتنی ئەو لە ئاشـپەزخانەدا سـەری سـوورما. چـاوەڕوا بـوو بیسـکویتەکان لە تەنـدوور دربـێن هەتـا باشـترینی ئەوان لە دەسـرەکەیەوە بپێچـێ کە بـۆ ئەو مەبەسـتە گوڵـدۆزیی کردبوو.

ئۆرسـۆلا پێیگـوت: "لەگەڵ ئەو زەماوەنـد بـکە. دۆزینـەوەی پیـاوێکی دیـکەی وەک ئەو زۆریش هاسان نییە."

ئامارانتا وای نواند کە دژکردەوەیەکی توورە لە خۆی پیشان دەدا.

وەڵامـی دایەوە: "مـن پێویسـتیم بە راوەپیـاونییە. ئەو بیسـکویتانەش بۆیە بـۆ خرینیلـدۆ دەبەم کە زگـم پێـی دەسـووتێ، چـونکە زوو یـان درەنـگ ئیعـدامی دەکەن."

ئەوەیـانی بەڕاسـتی بـێ ئەوە فکرێکـی ئەوتـۆی کـردبێتەوە، وت. بەڵام لەو کاتەدا دەوڵەت هەرەشـەی کردبـوو کە ئەگەر هێـزی شـۆڕشـگێر لە ڕیـۆهاشـا نەچیـتەدەر سـەرهەنگ خرینیلـدۆ مـارکیز ئیعـدام دەکەن. چاوپێکەوتنەکـان

قەدەغەکران. ئامارانتا دەرگای لە سەر خۆی داخستبوو و دەگریا. هەست بە تاوان، راست وەک ئەو کاتەی ریمیدیۆس مردبوو، ئەوی ئازار دەدا. هەر وەک ئەوە چەند قسەیەکی ساکاری ئەو دیسان بووبێتە هۆی قەتڵێکی دیکە. دایکی دڵخۆشیی دەدایەو و دڵنیای دەکرد کە بێگومان سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا

بۆ پێشگیری لە ئیعدام کردنی چارەیەک دەدۆزێتەوە و، قەولی پێدا کاتێک شەر تەواو بوو بۆخۆی کارێک دەکا خرینیلدۆ مارکیز لێی نزیک بێتەوە. پێش بەسەرچوونی زەمانی وادەکە، وەفای بە قەولی خۆی کرد و کاتێک خرینیلدۆ مارکیز لە پلەی فەرماندەی نیزامی و غەیرە نیزامیی خۆی باغر بوو جارێکی دیکەش هات بۆماڵیان، ئەوی وەک منداڵی خۆی وەرگرت و بە زیرەکییەکی زۆرەوە دەستی بە پێهەڵاگوتنی کرد. کۆشا زۆرتر بمێنێتەوە و، لە قووڵایی دڵییەوە ئاواتەخواز بوو ئەو بەڵێنی زەماوەند لەگەڵ ئامارانتای بێتەوە یاد. دوعاکانی قبووڵ بوو. ئەو رۆژانەی کە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بۆ نەهار دەهاتە ماڵیان، دوای نەهار لە هەیوانی گوڵە بگۆنیاکان لەگەڵ ئامارانتا تەختەنەردی دەکرد. ئۆرسوڵا شیرقاوەی بۆ دەبردن و بە منداڵەکان رادەگەیشت هەتا لێیان تێک نەدەن. ئامارانتا هەموو کۆششی خۆی بەکار دەهێنا هەتا جارێکی دیکە ژیلەمۆی ئەوینی لاوی هەست پێ بکاتەوە. بە نیگەرانی و دڵەکوتەیەکی کوشندەوە چاوەڕوانی رۆژانی چاوپێکەوتن و پاش نیوەڕۆیانی تەختەنەرد بوو و، زەمان لە هاودەمیی ئەو شەڕکەرە بە توندی تێدەپەڕی کە ناوەکەی وەها ئەوی خەمبار دەکرد، پەنجەی لە ئالوگۆڕی مۆرەکانی ختەختەدا دەلەرزی. رۆژێک کە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز جارێکی دیەکش داوای لێ کرد مێردی پێ بکا، ئامارانتا داواکەی رەت کردەوە.

پێیگوت: "من لەگەڵ هیچ کەس زەماوەند ناکەم، بەتایبەتی لەگەڵ تۆ، تۆ ئەوەندە ئاشقی ئۆرلیانۆی کە چونکە ناتوانی لەگەڵ ئەو زەماوەند بکەی، دەتەوەێ لە جێگای ئەو لەگەڵ من زەماوەند بکەی."

سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز پیاوێکی لەسەرەخۆ بوو، وتی: "ئەوەندە پێ دادەگرم هەتا سەرەنجام رازی دەبی." درێژەی بە چاوپێکەوتنەکانی دا.

ئامارانتـا دەرگـای ژوورەکەی دادەخسـت و خـۆی دەخـواردەوە نەگـری و قـامکی دەگوێیـان دەنـا گـوێی لە دەنگـی نەبـێ، کـاتێ هەواڵەکـانی شـەڕ بـۆ ئۆرسـۆلا دەگێڕێتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا، کە بۆ چاوپێکەوتنی هەراسـان بـوو، لە ژوورەکەی دەرنەکەوت.
لەو کـاتەدا، سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بویـنـدیا هەر بە دوو حەوتـوو جارێـک راپۆرتێکی چڕوپڕی بۆ ماکۆندۆ دەنارد، بەڵام تەنیا جارێک ئەویش پاش هەشت مانگان شتێکی بۆ ئۆرسـۆلا نووسی. پەیکی تایبەتی، پاکەتێکی لاک و مـۆرکراوی بـۆ ئۆرسـۆلا هێنـا مـاڵێ و، لە لاپەڕی کـاغەزی نێـو پـاکەتەکەدا دەسـتخەتە جـوانەکەی سـەرهەنگ دەبینـرا، کە نووسـیبووی: "لە قەشـە بە چاکی ئاگاداری بکە، چونکە بەوزووانە دەمرێ." ئۆرۆسـۆلا بەترسەوە وتـی: "چـونکە ئۆرلیـانۆ دەڵـێ، بێگومـان راسـتە، ئەو دەزانـێ." بە یـارمەتی ئەوانـی دیکە، خۆزێ ئارکادۆ بویندیایان بردە ژووری خەوتـن. لەو مـاوەیەدا کە لە ژێـر داربەڕووەکەدا مـابۆوە، توانیبـووی هەر چەنـد حەز بکـا وەزنـی خـۆی بەرێـتە سـەرێ، بەجۆرێـک کە حەوت پیـاو نەیـانتوانی لە زەوی بەرزی کەنەوە. ناچار بوون هەتـا سـەرتەختی خەوتن رایکێشـن. کـاتێ پیرەمێردی بەکەلەش بە دەموچـاوی سـووتاوەبوو لە بەر هەتـاو و بـاران هەناسـەی دەکێشا، بۆنی کارگی تازە و برش و بۆگڵ بە ژوورێدا بڵاو دەبۆوە. سبەی ئەو رۆژە لە سـەر تەخـتە خەوەکەی نەمـابوو. دوای ئەوەی هەمـوو ژوورەکانیـان پشـکی ئۆرسـۆلا دیسـان لە بـن داربەڕوەکە دۆزیـیەوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەهێز بوو. خـۆزێ ئارکـادیۆ بویـندیا حەوسـەلەی کێشەکێشـی نەبـوو. لە لای ئەو هـیچ شـتێک جیـاوازیی نەبـوو. گەرانەوە بـۆ ژێـر داربەڕووەکە بە مەیلی خۆی نەبوو، تەنیا لە بەر ئەوە بوو کە بەدەنـی بێ ئیرادە و لە بەر خووپێگرتن بۆ ئەوێ گەڕابۆوە.
ئۆرسـۆلا ئاگـاداریی لێدەکرد و خـواردنی دەدایە و ئۆرلیـانۆش هەواڵـی بـۆ دەبردن. بەڵام لە راستیدا تەنیا کەسێک کە دەیتوانی پێوەندیی پێوە بگرێ، پرودینسیۆ ئاگیلار بوو. پرۆدینسیۆ ئاگیلار کە لەو زەمانەیدا چـی بە بەرەوە نەمـابوو، رۆژی دوو جـار دەهـاتە لای و بە یەکەوە دەدوان، لە کەڵەشـێری جەنگی دەدوان و قەولیان بە یەکتر دەدا بۆ سـەیری سـەرکەوتنی خۆیـان و،

بە خاتری ئەوە لە رۆژانی یەکشەممەی ماندووکەرەی دەورانی مردندا حەوسەلەیان نەچێ، مەزرایەک بۆ پەروەردەکردنی باڵندەی جوان دروست بکەن. پرسۆدینیسیۆ ئاگیلار دەیشۆرد و خواردنی بۆ دەهێنا و لە پیاوێکی نەناسراو بە ناوی ئۆرلیانۆ کە پلەی سەرهەنگی لە شەردا هەبوو، داستانی سەیری بۆ دەگێڕایەوە. خۆزێ ئەرکادۆ بوێندیا کاتێ بەتەنیا دەمایەوە، بێ پسانەوە خۆی بە بیرەوەریی ژوورەکانی خەریک دەکرد: لە خەیاڵا دەیدیت کە لە جێگا دەچێتەدەر و دەرگای دەکاتەوە دەچێتە ژوورێک دروست وەک ژوورەکەی پێشوو بە هەمان تەختەخەوی ئاسن، بە هەمان کورسییە داربییەکەوە و، بە هەمان وێنەی مریەمی چارساز لە دیواری رووبەروو. لەو ژوورەوە بۆ ژوورێکی دیکە کە هەروەک ئەوبوو دەڕۆیشت و دەرگای دەکردەوە و پێی دەنایە ژوورێک وەک ئەو ژوورە و دوایی ژوورێکی دیکە و هەروا هەتا بێ برانەوە. حەزی دەکرد کە لەو ژوورەوە بۆ ئەو ژوور بڕوا.

وایدەزانی بە کۆشکی ئاوێنە بەنددا دەڕوا کە دیوارەکانی بە ئاوێنەی بەرامبەری یەک داپۆشراوە. سەرەنجام پرۆدینیسۆ ئاگیلار دەستێکی لە شانی دەدا. ئەو کات لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی دیکە دەگەڕایەوە و رێگەی خۆی بە پێچەوانەوە دەبڕییەوە و سەرەنجام پرۆدینسیۆ ئاگیلاری لە ژووری راستیدا دەدیتەوە. بەڵام شەوێک، دوو حەوتوو دوای ئەوەی بردییانە سەر تەختەخەوەکەی، پرۆدینیسۆ ئاگیلار لە ژوورێکی تەنیشت ژوورەکەی دەستێکی لە شانی دا و بەو خەیاڵەی ئەوێ ژووری خۆیەتی، لەوێ مایەوە. بەیانیی رۆژی دوایی کاتێک ئۆرسۆلا بەرچایی بۆ دەبرد، لە کۆتایی رێرەوەکەدا چاوی بە پیاوێکی قەڵەو و کورتەباڵا کەوت لیباسێکی رەشی دەبەردا بوو و لێواری کڵاوە رەشەکەی هەتا سەر برۆیان داکێشابوو. ئۆرسۆلا وایزانی:خودایە! ئامادەم سوێند بخۆم میلکیادیسە."

بەڵام ئەو پیاوە کاتائورە بو، برای ویسیتاسیۆن کە لە ترسی نەخۆشیی بێ خەوی لە ماڵەوە رایکردبوو، ئیتر کەس نەیزانیبوو لە کوێیە. کاتێ ویسیتاسیۆن هۆی گەڕانەوەی لێ پرسی، بە زمانی خۆیان وەڵامی داوە:"بۆ بەڕێکردنی جەنازەی سوڵتان هاتوومەوە."

ئەو کات رۆیشتنەژووری خۆزێ ئارکادۆ بویندیا. بە هەموو هێزیانەوە رایان تەکاند و بە گوێیدا هاواریان کرد و ئاوێنەیان لە بەردەم راگرت، نەیانتوانی لە خەو راستی کەنەوە. دوایی کاتێ دارتاش بۆ دروستکردنی تابووتەکەی قەدی دەپێوا، لە پەنجەرەوە سەیریان کرد لە ئاسمانەوە گوڵی بچکۆلانە و زەردرەنگ دەبارێ. بارانی گوڵ تەواوی شەوێ وەک تۆفێکی هێدی بە سەر شاردا باری. بانیماڵەکانی داپۆشی و دەرگای ماڵەکانی گرت. ئەو جانەوەرانەی لە دەرەوە دەخەوتن لە گوڵاندا نوقم بوون. ئەوەندە لە ئاسمانەوە گوڵ داکەوت بۆ بەیانی هەموو شەقامەکان بە گوڵ داپۆشران، کە ناچار بوون بۆ رێورەسمی بەرێکردنی جەنازە بە پێمەرە و شەنە شەقامەکان بماڵن.

ئامارانتا لە کورسیی رەحەتی دارەبیدا دانیشتبوو، گوڵدۆزییە نیوەکارەکەی لە سەر کۆشی دانابوو و تەماشای ئۆرلیانۆ خۆزێی دەکرد، کە بە چەنەگەی کەفاوی، تیخەکەی بە گەڵای کاکتۆس تیژ دەکرد هەتا بۆ یەکەم جار ریش بتاشێ. لە عەزەبی روومەتەکانی خوێن دەهاتە خوارێ و کاتێ ویستی سمێڵە تەنک و زەردەکەی لە بار بکا لێوی سەرەوەی بڕی. ریش تاشین تەواو بوو، لەگەڵ پێچی پێشووی هیچ فەرقێکی نەکردبوو، بەڵام ئامارانتا بە دیتنی ئەو ریش تاشینە پڕ ئازارە، هەستی کرد لێرە بە دواوە وردە وردە پیر دەبێ.

وتی: 'بۆخۆت بوویە پیاوێک، هەروەک ئۆرلیانۆ کە لە تەمەنی تۆدا بوو." ئەو دەمێک بوو ببوو بە پیاو" لەو رۆژە دوورەوە کە ئامارانتا پێی وابوو هێشتا منداڵە و وەک جاران لە حەمامێ لە لای ئەو خۆی رووت کردەوە، لەو کاتەوە پیلار تێرنێرا گەورەکردنی ئەو منداڵەی بەو سپاردبوو لە لای ئەوخۆی رووت دەکردەوە.

ئۆرلیانۆ جاری یەکەم کە چاوی بە لەشی رووتی کەوت، هەوەڵین شت کە سەرنجی راکێشا دەرزی قووڵی نێو مەمکانی بوو. ئەوەندە پاک بوو پرسی بۆچی وای لێهاتووە؟ ئامارانتا دەستی خستە نێو دەرزی مەمکانی و وەڵامی دایەوە: "سینگیان بڕیوم." چەندێک دوایی، کاتێ لە نارەحەتی خۆکوشتنی پیترۆکرێسپی هاتەدەر و سەر لە نوێ حەمامکردنی لەگەڵ ئۆرلیانۆ دەست

پێکردەوە، ئیتر ئەو نەیرِوانییە دەرزی سینەی، بەڵکو بە دیتنی مەمکە جوانەکانی ئامارانتا و گۆی قیت و ئەرخەوانییان بە هەستێکی نەزانراو ئەرزی گرت. سەرنجی دەدایە لەشی، بست بە بست لەگەڵی ئاشنا دەبوو و ئەو هەستە نەزانراوەدا پێستی لەشی دەکزایەوە، هەروەکو پێستی لەشی ئامرانتا لە ئاوی گەرمدا سووتا. لە منالییەوە خووی بەوەوە گرتبوو شەوانە لە جێگای خۆی بێتەدەر و لە باوشی ئامارانتادا بنوێ. لە باوەشی ئەودا ترسی لە تاریکی دەشکا. بەڵام لەو رۆژەوە چاوی بە لەشی رووتی ئامارانتا کەوتبوو، ترسی تاریکی نەبوو ئەوی بۆ نێو کوللەبەندی ئامارانتا دەکێشا. بەڵکو خولیای ئەوە بوو کاتێک لە خەو هەڵدەستێ هەناسەی گەرمی ئامارانتا هەست پێ بکا.

بەیانیی رۆژێک لە رۆژانی دەورەیەک، کە ئامارانتا داوای زەماوەندی سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزی رەتکردەوە، ئۆرلیانۆ لە خەو هەڵسا و هەستی کرد ناتوانێ هەناسە هەڵکێشێ. هەستی کرد ئەنگوستەکانی ئامارانتا وەک هەزار پێیەکی بچکۆلانە، گەرم و پەرێشان بە سەر زگیدا دەخزێ. خۆی لە خەو خست، خۆی وەرگێرِا هەتا بەئاسانی بگەرِێ. ئەو کات دەستی بێ باندی رەشی هەست پێکرد، کە وەک ماسی کوێر بە نێو قەوزەی نیگەرانیدا دەروا. لەو شەوە بەدواوە، ئەگەرچی وا دەهاتە بەرچاو شتێکی کە هەردووک دەیزانن خۆی لێ گێل کەن، بەڵام هەر دوو لا دەیانزانی کە ئەوی دیکەشیان دەزانی. بە شێوەیەک هاودەستی پتەو بە زنجیرێکی قایم بە یەکەوە بەسترانەوە. ئۆرلیانۆ هەتا کاتێک کە لە ساڵۆن دەنگی ئاهەنگی واڵسی نیوەشەوەی گوێ لێ نەدەبوو، نەیدەتوانی بخەوێ و، قەیرەکچیش، کە پێستی لەشی وردەوردە چرچ دەبوو، تەنیا کاتێک سێبووری دەهات کە هەستی دەکرد ئەو کەسەی کە لە خەودا دەگەرِێ، لە ژێر پەشەبەندەوە دەخزێتە نێو جێگایەوە، کەسێکە کە بۆخۆی گەورەی کردبوو و نەیدەزانی دەبێتە چارەسازی رۆژانی تەنیایی. دوایی نەتەنیا بەرووتی لەگەڵ یەک دەنووستن و یەکتریان دەلاواندەوە و لە ئامێزی دەگوشی، بەڵکو لە گۆشە و قولێنچکی ماڵدا بە دوای یەکتردا رایاندەکرد و لە خۆشییەکی ئەبەدی و بێ پسانەوەدا لە زۆربەی سەعاتەکانی رۆژێدا

دەرگای ژووری خەویان لە سەر خۆیان دادەخست. رۆژێک پاش نیوەڕۆ، کاتێ لە عەمبار دەیانویست یەکتر ماچ بکەن، هێندەی نەمابوو ئۆرسۆلا بە سەریاندا بچێ. بە شێوەیەکی پاکانە لە ئۆرلیانۆ خۆزێی پرسی: "پوورت زۆر خۆش دەوێ؟" ئەو وەڵامی دایەوە، بەڵێ. ئۆرسۆلا وتی: "ئافەرین" و ئاردێکی کە بۆ نانکردن پێویست بوو کێشای و گەڕایەوە بۆ ئاشپەزخانە. ئەو رووداوە ئامارانتای لەشێتی خۆی هێنادەر. تێگەیشت کە زۆر لە رادەی پێویست رۆیشتۆتە پێشەوە. ئەوە ئیتر ماچ و مووچ لەگەڵ مێرمنداڵێک نەبوو، بەڵکو پەلەقاژەی هەوەسی پیری بوو، هەوەسێکی سامناک و بێ دواڕۆژ. بۆیە بە زەربەیەکی کوتوپڕ پاشەکشەی کرد و پێوەندییەکەی بڕی، ئۆرلیانۆ، کە لەو کاتەدا فێربوونی کاری نیزامیی تەواو دەکرد، سەرەنجام لە راستییەکە گەیشت و بۆ نووستن رۆیشتە سەربازخانە. رۆژانی شەممە لەگەڵ سەربازەکانی دیکە دەچووە مەیخانەی کاتارینۆ و بە بلووغی زووپێگەیشووی خۆی بۆ دەربازبوون لە تەنیایی خۆی، لە نێوان ئەو ژنانە، کە بۆنی گڵی مردوویان لێدەهات و ئەو لە تاریکیدا بەزەحمەت دەیتوانی لە جێی ئامارانتایان دابنێ، بە دوای دڵدانەوەی خۆیدا دەگەڕا.

دوای ماوەیەک، هەواڵی جۆراوجۆری شەڕ گەیشت. لە لایەک دەوڵەت خۆی پێشڕەویی شۆڕشگێڕانی دەسەلماند و لە لایەکی دیکەشەوە ئەفسەرانی ماکۆندۆ سەبارەت بە وتوویژی نزیکبوونەوەی دامەزرانی ئاشتی راپۆرتی نهێنیان پێ دەگەیشت.

لە سەرەتای مانگی ئاوریلدا، سەربازێکی تایبەتی خۆی بە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز ناساند و پێیگوت؛ رێبەرانی حیزبی لەڕاستیدا کە لەگەڵ رێبەرانی شۆڕشگێر پێوەندییان گرتووە و خەریکی کۆتایی هێنان بە شەڕن و بڕیاریان وایە لە بەرامبەر هەر سێ کورسی لە حیزبی ئازادیخواز لە پارڵماندا، نوێنەرێکی کەمایەتی بنێرن بۆ پارلمان و، بۆ شۆڕشگێڕانێک کە خۆیان بەدەستەوە بدەن، داوای لێبووردنی گشتی بکەن. سەربازی تایبەتی هەروەها لە لایەن سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کە بە ئاگربەس رازی نەبوو، دەستوورێکی زۆر نهێنیشی پێ بوو: سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز دەبوایە پێنج کەس لە باشترین ئەفسەرەکانی خۆی هەڵبژێرێ و لەگەڵ ئەوان وڵات

بەجێ بێڵێ. فەرمان بە شێوەیەکی زۆر نهێنی جێبەجێ کرا. حەفتەیەک پێش ڕاگەیاندنی بەیەک گەیشتن و لە نێوان تۆفانێک لە دەنگۆی جۆراوجۆر، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، دوای نیوەشەو، لەگەڵ دەکەس لە ئەفسەرەکانی کە سەرهەنگ رۆکە کانیسێرۆشیان لەگەڵ بوو، بە نهێنی هاتە ماکۆندۆ. پادگانیان گرت و چەکەکانیان شاردەوە و پەروەندەکانیان لەنێو برد و دوایی پێش بەرەبەیان لەگەڵ سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز و پێنج ئەفسەرەکەی شاریان بەجێ هێشت. ئەو کردەوە ئەوەندە نهێنی و خێرا بوو کە ئۆرسۆلا تەنیا لە ئاخرین دەقیقەدا پێی زانی. کەسێک لە پەنجەرەیدا و بە سرتە وتی: "ئەگەر دەتەوێ چاوت بە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بکەوێ، دەسبەجێ بڕۆ شەقام." ئۆرسۆلا لە تەختەکەی دەرپەڕی و بە کراسی خەوەوە لە ماڵ دەرکەوت، بەڵام تەنیا ئەو ئەسپانەی بینی کە بە غاردان دوور دەکەونەوە و شاری لە بێدەنگییەکی پڕ لە تۆز و خۆڵدا بەجێ دێڵن. سبەی ئەو رۆژە زانی کە ئۆرلیانۆ لەگەڵ باوکی رۆیشتووە.
دە رۆژ دوای راگەیاندنی کۆتایی شەڕ بە هۆی نوێنەری دەوڵەت و دەستەی کەمایەتیی نەیار، هەواڵی هەوەڵین راپەرینی چەکدارانەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە بەرەی رۆژئاوا گەیشت، بەڵام هێزەکانی ئەو، کە چەکی پێویستیان پێ نەبوو، لە کەمتر لە حەفتەیەک لێک بڵاوبوون. بە درێژایی ئەو ساڵە لە حاڵێکدا ئازادیخوازان و پارێزەران تێدەکۆشان لە لای خەڵک وا بنوێنن کە بەرە بەرە بەیەک دەگەن، ئەو حەوت جاری دیکەش راپەڕی. شەوێک لە کەشتییەکی چارۆکەدارەوە ڕیۆهاشای بەر تۆپ دا. پادگان بۆ تۆڵە چاردەکەسی لە ناسراوترین ئازدیخوازانی وڵاتی لە جێگا دەرهێنا و گوللەبارانی کردن. یەکێک لە ئیدارەکانی گومرکی سنووری بۆ ماوەی زۆرتر لە پازدە رۆژان داگیر کرد و لەوێوە داوای لە هەموو میللەت کرد شەڕی گشتی دەست پێ بکەن. یەکێک لە دەستەکانی نێردراوی ئەو، لە کردەوەیەکی شێتانەدا، یانی بڕینی هەزار و پێنج سەد کیلۆمیتر بۆ راگەیاندنی شەڕ لە سەرووی پێتەخت، بۆ ماوەی سێ مانگ لە نێو جەنگەڵدا ڕێگای لێ ون بوو. جارێکی دیکەش گەیشتە بیست کیلۆمیتری ماکۆندۆ، بەڵام لە بەر ترسی پاسدارانی دەوڵەتی ناچار بوو لە کێوەکانی

نزیک ئەو ناوچە جادووییە کە دەمێک ساڵ لەوەپێش باوکی فوسیلی شەرکەرێکی ئیسپانیۆلی دیتبۆوە، خۆی بشاریتەوە.
ویسیتاسیۆن لەو کاتەدا مرد. دوای ئەوەی لە ترسی نەخۆشیی بێ خەوی دەستی لە تاج و تەختی هۆزەکەی خۆی هەڵگرت، گەیشتە بەختەوەریی مەرگی سروشتی. ئاخرین ئاواتی ئەوە بوو ئەو پارەیەی کە زۆرتر لە بیست ساڵ کۆی کردۆتەوە لە ژێر تەختی خەوتن لە بن زەوی دەربێنن و بیدەن بە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، بۆ ئەوەی بتوانێ درێژە بە شەڕ بدا. بەڵام ئۆرسوڵا خۆی زەحمەت نەدا ئەو پارەی لە ژێر خاک دربێنێتەوە، چونکە دەنگۆ بڵاو ببۆوە، کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە نزیک ناوەندی ئوستانی، کاتی پیادەبوون لە کەشتی کوژراوە. راگەیەنراوی رەسمی مەرگی ئەو (ئەوە چوارەمین راگەیەنراو لە ماوەی کەمتر لە دوو ساڵدا بوو) نزیک بە شەش مانگ بەراست زانرابوو، چونکە بێ سەروشوێن بوو. کاتێ ئۆرسوڵا و ئامارانتا پرسەی تازە و کۆنیان تێکەڵ کردبۆوە، لە پڕ خەبەر هات سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا زیندووە. بەڕواڵەت لە نارەحەت کردنی دەوڵەت دەستی هەڵگرتبوو و چووبووە پاڵ هێزە سەرکەوتووەکانی فیدراڵی کۆمارەکانی دیکەی دوورگەی کاریبی. هەر جارەی دوورتر و دوورتر لە وڵاتی خۆی، بە ناوی جۆراوجۆر رادەپەڕی. دوایە زانیان ئامانجی یەکگرتنەوەی هەموو هێزە فیدراڵییەکانی ئەمریکای ناوەندی بووە، بۆ لە نێوبردنی رێژیمی پارێزەران لە ئالاسکاوە هەتا پاتاگۆنیا.[1] ساڵەها دوای رۆیشتنی لە ماکۆندۆ، هەوەڵین خەبەرێکی راستەوخۆ کە ئۆرسوڵا وەریگرت نامەیەکی کاڵەوەبوو و ژاکاو بوو کە لە سانتیاگۆی کووباوە دەست بە دەست هاتبوو.
ئۆرسوڵا لەو حاڵەدا کە نامەکەی خوێندەوە، وتی: "ئەومان بۆ هەمیشە لە دەست داوە. ئەگەر هەروا بڕوا جێژنی کریسمەس لەوسەری دونیا دەگوزەرێنێ."

---

[1]– Patagonia باشووریترین بەشی ئەمریکای باشووری

هەوەڵین کەسێک کە ئەو قسەی پێگوت و دیارە هەوەڵین کەسیش بوو کە نامەکەی پێدا، ژەنەراڵ مۆنکادا[٢] شارەداری پارێزەری ماکۆندۆ، دوای کۆتایی شەڕ بوو. ژەنەراڵ مۆنکادا وتی: "مخابن کە ئەو ئۆرلیانۆیە پارێزەرنییە!"
دڵسۆزانە تاریفی کرد. خۆزێ راکویل مۆنکادا، وەک زۆر لە پارێزەرانی غەیرەنیزامی بۆ دیفاع لە حیزبی خۆی جەنگابوو و پلەی ژەنەراڵی لە مەیدانی شەڕدا بەدەست هێنابوو.لە نیزامیگەری سەری دەرنەدەچوو و وەک زۆری دیکە لە هاوکارەکانی خۆی و ئەندامانی حیزب دژی نیزامی بوو.
لای وابوو نیزامییەکان کەسانی بێکارە و بێباوەڕ و پیلانگێڕ و پلەویستن، کە غەیرەنیزامییەکان سەرکوت دەکەن، بۆ ئەوە لە دەورانی هەرا و هەرەج و مەرەجدا بە قازانجی خۆیان کەڵک وەربگرن. پیاوێکی بەهۆش و خوێن شیرن و سوورکارە بوو، خواردن و شەڕە کەڵەبابی پێ خۆش بوو. پیاوێک، کە زەمانێک بەتوندی بەربەرەکانیی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای دەکرد، توانی لە بەشی زۆری کنارەدا دەسەڵاتی خۆی بە سەر نیزامییە رەسمییەکاندا بسەپێنێ. جارێک کە بە پێی هەڵکەوتی شەڕ ناچار بوو قەڵایەک بۆ هێزەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بەجێ بێڵێ، دوو نامەی بۆ بەجێ هێشت، یەکێ لە نامەکان کە درێژتر بوو، داوای لێکردبوو لەگەڵ ئەو کەوێ و شەڕەکە نەختێ ئینسانیتر بکا. نامەکەی دیکە بۆ خێزانی بوو کە لە ناوچەی ئازادکراودا دەژیا. داوای لێکردبوو نامەکەی بە دەست ژنەکەی بگەیەنێ. لەوە بەدواوە تەنانەت لە توندترین دەورانی شەڕدا، هەر دوو فەرماندە بۆ گۆڕینەوەی دیل و گیراوەکان دەستووری راگرتنی شەڕیان دەدا. ئەو ئاگربەسانە ببوونە جێژنە، ژەنەراڵ مۆنکادا لەو دەرفەتانە کەڵکی وەردەگرت و سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای فێری شەترەنج دەکرد. بەیەکەوە بوونە هاوڕێی خۆشەویست. تەنانەت هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە کەسانی نیشتمانپەروەری هەر دوو حیزبەکە لێک نزیک بکەنەوە و، دەسەڵاتی نیزامی و سیاسەتبازان لە نێو بەرن و حکوومەتێکی مرۆڤانە

---

[٢]- Jose Raquel Moncada

دابمەزرێنن، کە خاوەنی باشترین ئوسوولی دوو حیزبەکە بێ. لەگەڵ کۆتایی شەڕ، هەروا کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە نێو دەربەندەکانی نابوودیی هەمیشەییدا بەرەوپێش دەچوو، ژەنەراڵ مۆنکادا ببوو بە شارەداری ماکۆندۆ. لیباسی مەدەنیی پۆشی و لە جێگای نیزامییان گاردی بێ چەکی دانا. یاسای لێبووردنی بەهێز کرد و یارمەتیی چەند بنەماڵەیەکی ئازادیخوازی دا کە گەورەی ماڵیان لە شەڕدا کوژرابوون. توانی بۆ ماکۆندۆ بەڕێوەبەری شارەداری دابمەزرێنێ و لە ئەنجامدا بە هەوەڵین شارەدار هەڵبژێردرا. وەزعێکی ئەوەندە خۆش و دۆستانەی دامەزراند کە خەڵک شەڕیان بە کابووس و مۆتەکەیەکی پووچی رابردوو دانا. قەشەنیکانور کە بە نەخۆشیی زەردوویی زەلیل و لە جێدا کەوتبوو، جێگای خۆی دا بە قەشەکورونیل کە لە هەوەڵین شەڕی فیدراڵدا سەرباز بوو و پێیان دەگوت "تولەسەگ". برونۆ کرێسپی لەگەڵ ئامپارۆ مۆسکوتە زەماوەندی کردبوو و دووکانی ئەسبابازی و ئامێری مۆسیقای هەروەک جاران بەرمێن بوو، تیاترۆیەکی دروست کرد کە دەستە ئیسپانیۆلییەکان لەوێ بەرنامەیان بەڕێوە دەبرد. تیاترۆ لە سالۆنێکی گەورەی بێ میچ پێک هاتبوو کە کورسیی دارینی تێدا دانابوو، پەردەیەکی مەخمەری بە وێنەی یۆنانی و سێ شوێنی بیتاقەفرۆشتن بە شکلی کەڵەشێر کە لە دەمی کراوەی کەڵەشێرەکان بیتاقەیان دەفرۆشت. لەو دەورەدا خانووبەرەی قوتابخانەشیان چاک کردەوە.

دۆن میلچۆر ئیسکانۆلا[٢] مامۆستایەکی پیری خەڵکی دێهاتی ناوچەی زەلێ، بوو بە بەڕێوەبەری قوتابخانە. قوتابییە تەمبەڵەکانی ناچار دەکرد لە سەرچۆکان بە حەوشەدا بڕۆن و لە سەر رەزامەندیی دایک و باوکیان بیبەری سووری دەرخواردی قوتابی زۆربلێ دەدا. ئۆرلیانۆی دووهەم و خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم دووانەکەی سەربزێوی سانتاسۆفیا دیلا پێداد، گەردنبەند و گێچ و لیوانی ئالۆمینیۆمی کە ناویانی لە سەر نووسرابوو، هەوەڵین شاگردانێک بوون کە لە کلاسی قوتابخانە دانیشتن. رێمیدیۆس کە جوانییەکی بێ هاوتای بەمیرات بۆ بەجێ مابوو، بە ناوی رێمیدیۆسە

---

[٢]- MelchorEscalona

جوانکیله ناوبانگی دەرکرد. ئۆرسۆلا بە تێپەرینی زەمان و پرسەی یەک بە دوای یەک و خەمی کوورەبوو لە دڵدا پیر نەدەبوو. بە یارمەتیی سانتا سۆفیا دێلا پێداد، برەوێکی تازەی بە شیرنیدروستکردنی خۆیدا و لە ماوەی چەند ساڵاندا نەتەنیا ئەو سەروەت و سامانەی کورەکەی بۆ شەر خەرجی کردبوو پەیدا کردەوە، بەڵکو جارێکی دیکەش کەدووەکانی لە زەوی خراوی بن تەختەکەشی پرکردن لە زێری خالیس. دەیوت: "هەتا کاتێ گیانمان لە بەردابێ لەو شیتخانەیەدا پارە دەبێ." ئۆرلیانۆ خۆزێ فیدرالیستەکانی وڵاتی نیکاراگوای بەجێ هێشت و لە کەشتییەکی ئاڵمانیدا بوو بە جێشۆر. رۆژێک بە سەروسیمایەکی رەش و بە قەدەر ئەسپێک، پرچی درێژی وەک سووریپێستان، بە تەمای زەماوەند لەگەڵ ئامارانتا وەژوور ئاشپەزخانە کەوت.

ئامارانتا هەر کە چاوی پێکەوت بێ ئەوەی شتێکی گوتبێ دەسبەجێ لە مەبەستی گەرانەوە گەیشت. لە سەر مێز نەیاندەوێرا چاو لە یەک بکەن. بەڵام دوو حەفتەی دوای گەرانەوە ،جارێکیان لە لای ئۆرسۆلای ئۆرلیانۆ خۆزێ چاوی لە چاوی ئامارانتا بری و پێیگوت: "هەمیشە بیرم لە تۆ دەکردەوە." ئامارانتا لە دەستی رایدەکرد. وریا بوو تێ هەڵنەنگوێ و هەموو هەوڵی خۆی دەکار دێنا لە رێمیدیۆسە جوانکیله جیا نەبێتەوە.

رۆژێک، کە برازاکەی لێی پرسی هەتا کەی باندە رەشەکەی دەستت ناکەیەوە، ئەو بەومانایە کە مەبەستی کچێنییەتی کوڵمەی لەشەرمان سوور هەڵگەران. بە گەرانەوەی ئەو دەرگای ژووری خەوتنی داخست، بەڵام دوای چەند شەوان کە لە سەریەک دەنگی پرخ و هۆرِی ئەوی لە ژووری تەنیشتی گوێ لێ دەبوو پارێزی لە دەست دا و ئیتر دەرگای ژوورەکەی دانەخست. نزیک بە دوو مانگ دوای گەرانەوە، رۆژێک بەیانی زوو زانی کە هاتۆتە ژووری خەوتنەکەی. لە جیاتی ئەوە کە بۆخۆی دانابوو رابکا، بێ هات و هاوار خۆی بەوهەستە شیرنە سپارد. هەستی کرد بۆ نێو کوللەبەندەکەی دەخزێ، دروست وەک ئەو کاتەی منال بوو، وەک پێشوو کە دەخزییە نێو کوللەبەندەکەی.

کاتێ زانی سەر تا خوار رووتە، بێ ئیختیار ئارەقەی کرد. لێوەلەرزەی هاتێ و لە کاتێکدا دەنگی لە خۆشیان لە گەروویدا گیرابوو، بە ئەسپایی وتی: "برۆ، برۆ دەنا هاوار دەکەم." بەڵام ئۆرلیانۆ خۆزێ ئێستا منالێ نەبوو کە لە تاریکی بترسێ و دەیزانی دەبێ چ بکا. لەو شەوە بەدواوە شەڕی بێدەنگ و بێ ئەنجامی ئەو دووانە کە هەتا بەرەبەیانیان درێژەی هەبوو، دیسان دەستی پێکردەوە. ئامارانتا بە ماندوویی دەیگوت: "من پووری تۆم، نەتەنیا لە باری تەمەنەوە لە جێێ دایکتم، بەڵکو تۆم گەورە کردووە، تەنیا شیرم پێ نەداوی." ئۆرلیانۆ خۆزێ بەرەبەیانی رایدەکرد و شەوی دوایە پێش بەرەبەیان دەگەڕایەوە، هەر جارەی کە دەیبینی دەرگای ژوورەکەی قفڵ نەکردووە، زۆرتر هان دەدرا. لەو ماوەیەدا تەنانەت یەک ساتیش دەستی لە ویستی ئەو نەکێشابۆوە. لە خەوگەی تاریکی شارە داگیرکراوەکان بە دوایدا دەگەڕا، بەتایبەتی لەو خەوگانەدا کە لە هەموویان نەرمتر بوون. لە بۆنی وشکەوەبووی باندی برینەکاندا، لە سامی کوتوپڕی مەرگدا، لە هەموو شوێنێک و هەموو جێگایەک دەیدۆزییەوە. لە بەر ئەوە رایکردبوو. تێکۆشابوو یادی ئەو نەتەنیا لە رێگەی مەوداوە، بەڵکو بە رقێکی نادیار فەرامۆش کا، کە هاوسەنگەرەکانی بە حیسابی ئازایەتییان دادەنا. بەڵام هەرچی زۆرتر وێنەی ئەو لەگەڵ کۆگای کۆدی شەڕ تێکەوە دەگلان، شەڕ زۆرتر وەک ئامارانتا دەچوو. بە جۆرێک لە دوورخراوەیی خۆیدا ئازاری دیبوو کە دەیەویست رێگایەک بدۆزێتەوە بۆ کوشتنی خۆی هەتا ئەو بکوژێ. سەرەنجام کەسێک داستانی کۆنی پیاوێکی بۆ گێڕابۆوە کە لەگەڵ پلکی خۆی زەماوەندی کردبوو، پوورێک کە لە هەمان کاتدا کچی مامیشی بوو.

ئۆرلیانۆ بە سەرسوورِمانەوە پرسیبووی: "مەگەر کەس دەتوانێ لەگەڵ پلکی زەماوەند بکا."

سەربازێک وەڵامی دابۆوە: "دیارە کە دەتوانێ، ئێمە بۆیە لەگەڵ قەشان بەشەڕ دێین کە هەر کەس ویستی لەگەڵ دایکی خۆشی زماوەند بکا ئازاد بێ."

پازدە رۆژ دواتر، شەڕی بەجێ هێشت. ئامارانتای لەوە کە لە خەیاڵی دا بوو، ژاکاوتر، خەمبارتر و شەرمێونتر لە سەرەتای کۆتایی ساڵەکانی گەنجیدا بینی، بەوحاڵەش لە تاریکایی ژووری نووستنیدا داگیرساوتر لە جاران و لە تووڕەیی خۆڕاگرانەیدا خوێن شیرنتر لە هەمیشە دەهاتە بەرچاو. ئامارانتا کە لە پرکێشی ئەو وەگیان هاتبوو، دەیوت: "تۆ جانەوەری. محاڵە کەس بتوانێ ئەو کارە لەگەڵ پووری بکا، مەگەر لە پاپی گەورە ئیجازەی تایبەتیی وەرگرتبێ.: ئۆرلیانۆ خۆزێ قەولی دەدا بچێتە رۆمێ و قەولی دەدا هەموو قارەی ئورووپا بە سەر چۆکانەوە بگەڕێ و دەمپایی پاپی گەورە ماچ بکا، هەتا ئامارانتا کۆسپەکانی لە سەر رێگا هەڵگرێ. ئامارانتا دووپاتی دەکردەوە کە: "ئەوجار ئەگەر منالمان بوو کلکی دەبێ."

ئۆرلیانۆ خۆزێ گوێی بەوقسانە نەدەبزووت. بە پاڕانەوەوە دەیوت: "تەنانەت ئەگەر ئارمایۆش‌مان [٤] بین، قەی ناکا."

رۆژێک بەیانی، کە لە دەردی هەوەسی پیاوەتیی خۆی وەگیان هاتبوو، رۆیشتە مەیخانەی کاتارینۆ ژنێکی هەرزان‌بایی و مەمک داچۆڕاوی پەیدا کرد کە بۆ ماوەیەک تینوایەتیی شکاند. کۆشا لە رێگای بێ تەفاوەتیی رواڵەتی، سەرنجی ئامارانتا راکێشی. دەیدیت کە لە هەیوانێ دانیشتووە و بە چەرخی بەرگدروون، کە بەباشی لێی شارەزا ببوو، خەریکی بەرگدروونە. ئامارانتا کە هەستی بەوە دەکرد لە دەست ئەو رزگاری بووە، جارێکی دیکە بێ ئیرادە بیری لە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکێز دەکردەوە، ئەو پاشنیوەڕۆیانەی کە لەگەڵ ئەو تەختەنەردی دەکرد بە دڵتەنگی بیری خۆی دەهێنایەوە و تەنانەت ئیشتیای دەکرد لە ژووری خەوی بووایە. ئۆرلیانۆ خۆزێ نەیدەزانی هەتا چ رادەیەک دۆڕاندوویەتی. شەوێک کە زۆر بێ تاقەت ببوو، گەڕاوە ژووری ئامارانتا. بەڵام ئامارانتا بەڕاستی دەریکرد و بۆ هەمیشە دەرگای ژوورەوەی لێ داخست.

---

Armadiuo – ٤– گیانلەبەرێ کە لە ئەمریکای ناوەندی و باشووری پەیدا دەبێ و بەدەنی بە تۆ وەرەق داپۆشراوە کە لە کاتی هەستکردن بە مەترسی دا بۆ بەرگریکردن بە سەر خۆیدا دەکێشێ– و

چەند مانگ دوای گەڕانەوەی، ئۆرلیانۆ خۆزێ ژنێکی شۆخ کە بۆنی عەتری یاسی لێدەهات لەگەڵ کوڕێکی چوار پێنج ساڵانە وەژوور ماڵی کەوتن. ژنە دەیگوت کە کوڕەکە منالّی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایە. ئەوی هێنابوو کە ئۆرسولا (غسل تعمید)ی بدا. لە بنەچەکەی کوڕە بێ ناوەکەدا شک و گومانێکیان نەکرد. هەر دەتگوت سەرهەنگە، ئەو کات کە بۆ چاوپێکەوتنی سەهۆڵیان بردبوو. ژنە تاریفی دەکرد کە منالّەکە بە چاوی کراوەوە هاتۆتە سەر دنیا و وەک مرۆڤی گەورە تەماشای دەوروبەری خۆی کردووە. لەوە کە چاو لێکنانێ و بە جۆرێک تەماشا دەکا، دەترسا. ئۆرسولا وتی: "هەر دەڵێی خۆیەتی. هەر ئەوەندەی ماوە بە چاوان کورسییەکان وەجولە بخا." ناوی ئۆرلیانۆیان لە سەر دانا لەگەڵ ناوی بنەماڵەی دایکی.

تا کاتێ باوکی بەرەسمی نەیناسیبا قانوون رێگەی نەدەدا ناوی بنەماڵەی باوکی بەسەردا بدەن. ژەنەراڵ مۆنکادا بوو بە باوکی تەعمیدی ئەو، لەگەڵ ئەوەشدا ئامارانتا پێی دادەگرت پەروەردەکردنی بەئەستۆ بگرێ، بەڵام دایکی کوڕەی قبووڵی نەکرد.

لەو زەمانیدا، ئۆرسولا لە دابی ناردنی کچان بۆ پاڵ سەربازان، هەروەکو چۆن مریشکان لە کەڵەشێری رەسەن چاک دەکەن، بێ خەبەر بوو، بەڵام لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا لەو دابە ئاگادار بوو. نۆ کوری دیکەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایان بۆ (غسل تعمید) هێنا ماڵەوە. لە هەموویان گەورەتر کوڕێکی سەوزەی دە ساڵانە بوو ،کە بە چاوە سەوزەکانییەوە دیار بوو هیچ وەک رەسەنی باوکی ناچێ.

لە سەر رەنگێک و بە هەر تەمەنێک منالّیان بۆ ماڵەوە دەهێنان کە هەموویان کوڕ بوون و حاڵەتی تەنیایی ئەوان شکی لە رەسەنییاندا نەدەهێشتەوە. تەنیا دوو دانە لە نێو ئەواندا بەرچاو بوون. یەکێکیان کە لە تەمەنی خۆیی زۆرتری هەڵدابوو و دەستی هێزێکی ئەوتۆیان هەبوو وە هەر شتێک کەوتبا دەیشکاند. گوڵدانە گوڵەکان و سرویسی نانخواردنی دەشکاند. ئەوی دیکەیان کوڕێکی موورەزەردی چاوشین وەک دایکی و پرچی درێژ و لوولدراوی وەک پرچی ژنان دەچوو. بە شارەزایی تەواوەوە هاتە ژوور، هەروەک لەو ماڵە گەورە بووبێ، لە ژووری خەوی ئۆرسولا راست

بۆ لای سندووقێک رۆیشت و ، بووکەڵەی قورمیشی کە پیترۆکریسپی هێنابوویەوە ماڵەوە و کەس بە بیری نەمابوو لە نێو جووتە گۆرەوییەکدا پێچرابۆوە دۆزییەوە. لە ماوەی دوازدە ساڵدا تەواوی ئەو کوڕانەی، کە سەرهەنگ بە پانایی و درێژایی مەیدانەکانی شەڕدا تۆی چاندبوون، بە ناوی ئۆرلیانۆ و ناوی خانەوادەگیی دایکیان (غسل تعمید) کران. حەڤدە کوڕ. سەرەتا ئۆرسولا گیرفانی پڕ دەکردن لە پارە و ئامارانتا هەموو کۆششی خۆی بەکار دەهێنا لە لای خۆی رایانگرێ، بەڵام دوایی تەنیا بە دانی هێندێک دیاری وازیان دەهێنا و دەبوونە دایکی تەعمیدی ئەوان. ئۆرسولا بەو جۆرە کە ناونیشانی دایکەکان و شوێن و مێژووی لەدایکبوونی منداڵەکانی لە دەفتەرچەیەک دەنووسی دەیگوت: "ئێمە ئەرکی خۆمان بە (غسل تعمید)ی ئەوان جێبەجێ کردووە. ئۆرلیانۆ حیسابەکانی خۆی کردووە. کاتێک بگەڕێتەوە خۆی لە بارەی ئەوان بڕیار دەدا." رۆژێک لە سەر نەهار-نانی نیوەڕۆ- لەگەڵ ژەنەراڵ مۆنکادا سەبارەت بە تۆ و تۆرەمەی تێکەڵوپێکەڵی کورەکەی قسەی کرد و، وتی زۆری پێ خۆشە کە رۆژێک سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بگەڕێتەوە هەموو کوڕەکانی لە ماڵەوە کۆکاتەوە.

ئەوەی ژەنەراڵ مۆنکادا دەیزانی و پێی خۆش نەبوو لە سەر مێزی نەهارخواردن ئاشکرای کا ئەوە بوو، کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا دەمێک بوو هەوڵی دەدا درێژترین و خوێناویترین و ریشەکێشترین راپەڕینی خۆی دەست پێبکا.

وەزع دیسان وەک مانگەکانی پێش شەڕی یەکەم ئاڵۆز ببوو. ئیجازەی شەڕە کەڵەشێر، کە بە هۆی شارەدار خۆی درابوو، پووچەڵ کرایەوە. سەروان ئاکیولر ریکاردۆ° فەرماندەی سەربازخانە، دەسەڵاتی شارەداری بەدەستەوە گرت.

ئازادیخوازان ئەویان بە پیاوێکی فیتنەگێڕ دەزانی. ئۆرسولا بە ئۆرلیانۆ خۆزێی دەگوت: "دوای سەعاتی شەش مەڕۆ شەقام، رووداوێکی سامناک دەقەومێ." بەڵام پاڕانەوەی ئەو بێ سوود بوو. ئۆرلیانۆ خۆزێ ئیتر هی

°– Aquiles Ricardo

ئەو نەبوو. وەها بوو کە دەتگوت گەڕانەوە بۆ وڵات، ژیانی بێ نیگەرانی سەبارەت بە پێویستییەکانی رۆژانە و مەیلی تەمبەڵانە و هەوەبازانەی خۆزێ ئارکادیۆی مامی لەودا زیندوو کردۆتەوە. هەوەسی سەبارەت بە ئامارانتا، بێ ئەوە برینێکی لە سەر مێشکی بەجێ هێشتبێ، دامرکابۆوە. هەروا دەسووڕایەوە، بیلیاردی دەکرد و چارەی تەنیایی خۆی لە ژنانی فاحیشەدا بەدی دەکرد. ئەو پووڵانەی، کە ئۆرسۆلا لێرە و لەوێ دایدەنان و لە فکری دەچوون، دەیدزین. سەرەنجام تەنیا بۆ گۆڕینی جلەکانی دەهاتەوە ماڵێ. ئۆرسۆلا سکاڵای بوو کە : "هەموویان سەروبنی جاوێکن، هەتا منالن خۆشرەفتار و بەگوێ و بەئەدەبن، مێشیان لە بەردەم هەڵنافڕێ، بەڵام کە ریشیان هات دەست دەکەن بە خراپە." بە پێچەوانەی ئارکادیۆ کە هەرگیز نەیزانی دایکی کێیە، ئۆرلیانۆ خۆزێ زانیبووی کوڕی پیلار تێرنێرایە. دایکی لە ماڵەوە جۆلانەیەکی هەڵخستبوو هەتا ئەو بتوانێ پاشنیوەڕۆیان لەوێ ئیسراحەت بکا. بێجگە لە هەستی دایک و کوڕایەتی، لە تەنیاییەکی تریشدا شەریک بوون. پیلار تێرنێرا هیچ هیوا و هۆمێدێکی نەمابوو. دەنگی قاقای پێکەنینی دەتگوت تەپڵی دڕاوە، مەمکی لە هەڵکوشینی دەستی بێگانە داچۆڕابوون و زگی و رانەکانی ببوونە قوربانی چارەنووسی نەپرینگانەوەی ژنێکی بەرەڵلا. دڵی بە بێخەم پیر دەبوو. لەو ماڵەی ئۆرلیانۆ خۆزێ دوای نیوەڕۆیان دەحەسایەوە، کچانی گەرەک، ئاشقانی چەند سەعاتەی خۆیان لەوێ دەبینی. دەڕۆیشتنە ماڵەوە و دەیانگوت: "پیلار ژوورەکەتم بە قەرز بدەیە." پیلار وەڵامی دەداوە: "هەڵبەتە" و ئەگەر کەسێک لەوێ با، دەیگوت: "لەوە کە دەبینم خەڵکی لە نوێن و بانمدا رادەبوێرن هەست بە خۆشبەختی دەکەم."

بۆ خزمەتی خۆی پووڵی وەرنەدەگرت و تکای ئەوانیشی هەرگیز رەت نەدەکردەوە. هەروەها خەڵکێکی بێ ئەژمار، لەگەڵ ئەوە کە تەمەنی لە رۆژاوابووندا بوو دیسان دەهاتنە لای، دەری نەدەکردن، ئەوانە بە جێگای پارە و ئەوین وەختایەک تەنیا کەمێکیان خۆشی پێ دەبەخشی. پێنج کچی کە هەوەسی ئاگرینیان لە دایکیانەوە بۆ بەمیرات هاتبوو، لە زەمانی بلووغەوە، خۆیان لە جادەکانی پەرتی ژیاندا ون کردبوو. لە دوو کوڕان کە

توانیبووی گەورەیان بکا، یەکیان کاتی شەڕ لە نێو هێزەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کوژرابوو و ئەوی دیکەیان لە تەمەنی چاردە ساڵیدا کاتێ دەیویست قەفەسی چەند مریشکان لە یەکێک لە دێهاتەکانی ناوچەی زەلێدا بدزێ، دەسگیر و بریندار بوو.

بۆ ئەو، ئۆرلیانۆ خۆزێ هەمان پیاوە باڵابەرز و سەوزەڕوویەکە بوو کە شادڵی فاڵەکانی وەرەق، زۆرتر لە نیو سەدە وادەی پێدەدا و وەک هەموو ئەو کەسانەی کە وەرەقەکانی بۆیان دەنارد و کاتی گەیشتبووە دڵی ئەو کە ئەجەل نزیک بوو. مەرگی ئەوی لە فاڵی وەرەقدا بینی.

پێیگوت: "ئەوشەو مەڕۆ دەرەوە و لێرە بخەوە. کارمێلیتا مۆنتێل[٦] زۆرجار لە منی داوا کردووە لەگەڵ تۆی بخەوێنم."

ئۆرلیانۆ خۆزێ لە مانای راستەقینەی پاڕانەوەی نهێنی ئەو پێشنیارە نەگەیی. لە وەڵامدا وتی: "پێی بڵێ نیوەشەو چاوەروانم بێ."

رۆیشتە تیاترۆ. دەستەیەکی ئیسپانیۆلی شانۆی (خەنجەری زۆرۆ[٧])یان هێنابووە سەر شانۆ. سەردێری ئەسڵیی شانۆی زۆریلا[٨] (خەنجەری بەربەران) بوو، بەڵام لە بەر ئەوە کە ئازادیخوازەکان بە پارێزەوانیان دەگوت: "بەربەر" سەردێری ئەو بە دەستووری سەروان ئاکیولر ریکاردۆ گۆڕابوو. ئۆرلیانۆ خۆزێ کاتێ دەیویست بلێت بدا بە دەستی ئەو کەسەی بلیتان دەدڕینێ، بینیی سەروان ئاکیولر ریکاردۆ لەگەڵ دوو سەربازی چەکدار خەڵکی دەپشکنن. ئۆرلیانۆ خۆزێ وریایی دایە کە: "سەروان وریابە، ئەو کەسەی دەست لە من دەدا هێشتا لە دایکی خۆی نەبووە."

سەروان دەیویست بەزۆر بیپشکنێ. ئۆرلیانۆ خۆزێ، کە چەکی نەبوو، رایکرد. سەربازەکان فەرمانی تەقەیان بەڕێوە نەبرد و یەکێکیان وتی: "لە بنەماڵەی بویندیایە." سەروان کە لە رق و توورەییان کوێر ببوو، تفەنگی لە دەست دەرهێنا. لە نێوەڕاستی شەقامدا لینگی لە بەریەک ئاوەڵا کرد و

---

[٦]– Carmelite Montiel

[٧]– Zorro

[٨]– Jose Sorilla Y Moral (١٨١٧ -٩٣) شاعیر و شانۆنووسی ئیسپانیۆلی

نیشانەی لێ گرت، نەراندی: "قورمساخینە! بژیا سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە جیاتی ئەو بایە."
کارمێلیتا مۆنتیل، کچی بیست ساڵە، عەتری بەهارنارنجی لە خۆی دابوو و نوێن و بانی پیلار تێنێرای بە پەلکە گوڵی بۆنخۆش رازاندبۆوە، کە دەنگی تەقەی بیست.چارەنووسی ئۆرلیانۆ خۆزێ ئەوە بوو کە ئەو بەختەوەرییەی ئامارانتا پێی رەوا نەدیبوو لە باوەشی ئەودا بیدۆزێتەوە و ببێتە خاوەنی حەوت کوڕان و بە پیری لە باوەشی ئەودا بمرێ. بەڵام ئەو گوللەی کە لە پشتەوە لێی درابوو و لە سینگی هاتبووە دەرێ، لە بەر هەڵەی خاڵی وەرەق هاوێژرابوو. لە راستیدا بە پێی فاڵی وەرەق ئەو کەسەی کە دەبوایە ئەو شەوە بکوژرێ، سەروان ئاکیولر رێکاردۆ بوو. هەرواش بوو. چوار سەعات دوای مەرگی خۆزێ ئارکادۆ خۆزێ، ئەویش کوژرا.
بە تەقەی دوو گوللە لە سەریەک کە هیچ کات روون نەبۆوە لە کوێرا هات، کەوتە سەر زەوی و دەنگی هەراوهوریای خەڵک، شەوی لەرزاندەوە.
ـ بژی حیزبی ئازادیخواز! بژی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا!
سەعاتی دوازدەی شەو، کە ئۆرلیانۆ خۆزێ هەموو خوێنەکەی لە بەر رۆیی و گیانی دا، کارمێلیتا مونتیل زانی کە وەرەقەی ژیانی دوارۆژی هەموو سپین. لە چوارسەد کەس زۆرتر لە پشت دەرگای تیاترۆ ریزیان بەست و دەمانچەی خۆیان لە لاشەی سەروان ئاکیۆلر ریکاردۆ خاڵی کرد. دەستەی پاسداران ناچار بوون لاشەکەی لە چەرخێکی دەستی دابنێن.لاشە وەک نانێکی لە نێو ئاوادا خووساندبیان لە بەریەک هەڵوەشابوو.
ژەنەراڵ خۆزێ راکیل مۆنکادا، کە لە دەستدرێژیی ئەرتەش قەڵس ببوو،لە بڕشتی سیاسیی خۆی کەڵکی وەرگرت و جارێکی دیکە ئۆنیفۆرمی نیزامیی دەبەر کرد و دەسەڵاتی نیزامی و غەیرەنیزامیی لە ماکۆندۆ بەدەستەوە گرت. بەهەر حاڵ چاوەڕوانی ئەوەش نەبوو کە رەفتاری ئاشتیخوازانەی پێشی ئەو شتەی بگرێ کە دەبوو روو بدا. هەواڵەکانی مانگی سێپتەمبەر جۆراوجۆر بوون، لە لەلایەک دەوڵەت رایدەگەیاند کە دەسەڵاتی بە سەر هەموو وڵاتدا هەیە و لە لایەکی دیکەشەوە ئازادیخوازان هەواڵی نهێنییان سەبارەت بە راپەڕینی چەکدارانەی ناوەوە پێ دەگەیشت. رێژیم حاشای لە

شـەڕ دەکـرد، هەتـا ئەوەی دوای دادگـایەکی نیزامـی، بڕیارنـامەی حـوکمی ئیعدامی پاش ملەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای راگەیاند. هەوەڵین دەستە کە ئەوی بەزیندوویی گرتبا دەیتوانی حوکمی ئێعدام بەڕێوەبەرێ. ئۆرسـۆلا بە خۆشـحاڵییەوە بە ژەنەراڵ مۆنکـادای وت: "وا دیـارە گەڕاوەتەوە" بەڵام ژەنەراڵ لەو بارەوە ئاگادارییەکی نەبوو.'
لەڕاستیدا لە مانگێک پتر بوو کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە وڵات دابوو. هەواڵە جۆراوجۆرەکان، لە یەک کاتدا ئەویان لە شوێنەکانی دوورەدەست و جیاجیـا رادەگەیانـد. تەنـانەت ژەنەراڵ مۆنکـاداش گەرانەوەی ئەوی بـاوەڕ نەدەکرد، هەتا بەرەسمی رایانگەیاند کە ئەو دوو ناوچەی کەناری دەریای داگیـر کـردووە. تێلگـرافەکەی بە ئۆرسـۆلا نیشـان دا و وتـی: "دۆسـتی خۆشەویست، پیرۆزباییت لێ دەکەم، ئەو بەوزووانە دەگەڕێتەوە." ئەو جار ئۆرسۆلا بۆ یەکەم کەرەت نیگەرانیی دەربڕی و پرسـی: "باشـە هەڤاڵی من، تـۆ چ دەکەی؟" ژەنەراڵ مۆنکـاداش زۆر جـار ئەو پرسـیارەی لە خـۆی کردبوو.
وەڵامی دایەوە: "هەر ئەو کارەی کە ئەو دەیکا، بەڕێوەبردنی ئەرک."
بەرەبەیـانی هەوەڵـی ئوکتـوبەر، سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بوینـدیا بە هەزار سـەربازەوە هێرشـی کـردە ماکۆنـدۆ. بە سـەربازخانەیان فەرمـان دا هەتـا گیانیـان دەبەر دایە بەرگری بکەن. وەختـی نیوەڕۆ، کاتێ ژەنەراڵ مۆنکـادا لەگەڵ ئۆرسۆلا نانیان دەخوارد، تەقەی تۆپێک کە لە هەموو گەڕەکێ دەنگی دایەوە رووکاری خەزێنەداری شارەداریی وێران کرد.
ژەنەراڵ مۆنکادا هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: "ئەوانیش بە ئەندازەی ئێمە چەکدارن و، لە قـووڵایی دڵیشـیانەوە شـەڕ دەکەن." سـەعاتی دووی پـاش نیوەڕۆ کاتێک لە بەر شریخەی تۆپان زەوی دەلەرزی، ژەنەراڵ مۆنکـادا بەو دڵنیاییەوە کە لە شەڕەکەدا سەرناکەوێ، ئۆرسۆلای بەجێ هێشت.
پێیگـوت: "لە خـوام دەوێ ئەوشـەو ئۆرلیـانۆ نەیەتەوە مـاڵی. ئەگەر هـات لە بـری مـن مـاچی بکە، چـونکە لەو بـاوەڕەدا نـیم جـارێکی دیـکە چاوم پێـی بکەوێتەوە."

ئەو شەوە ژەنەراڵ مۆنکادا، لە دوای نووسینی نامەیەکی دوورودرێژ بۆ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، لە کاتی راکردنی لە ماکۆندۆ دەسگیر کرا. لە نامەکەدا ئامانجی هاوبەشی خۆیانی سەبارەت بە ئینسانیترکردنی شەڕەکەی وەبیر هێنابۆوە و سەرکەوتنی یەکجاریی ئەوی بە سەر ئەو نیزامیگەرییە بێ مانا و نێوەرەۆکە و پلەویستی سیاسەتمەدارانی هەر دوو حیزبەکە ئارەزوو کردبوو. سبەی ئەو رۆژە،سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە ماڵی ئۆرسۆلای نانی نیوەڕۆی لەگەڵ ئەو خوارد. ئەویان هەتا بڕیاری داداگای نیزامی چاوەڕوان لەوێ راگرتبوو. کۆڕێکی دۆستانە بوو، لە هەمان حاڵدا کە دوو کەسی دژیەک شەڕیان لەبیر چووبۆوە هەتا بیرەوەرەیی رابردوو یاد بکەنەوە، ئۆرسۆلا بە شێوەیەکی خەمهێنەر هەستی کرد کورەکەی لەوێ کۆسپێک نییە. هەر لەو دەمەوە کە گەیشتبۆوە ئەوێ، ئەو هەستەی کردبوو. لەگەڵ چەند گاردێکی نیزامی، بە هەراو هۆریا هاتنە ژووری و ژوورەکانیان سەرەونێو کرد هەتا دڵنیا بن مەترسییەک روویان تێ ناکا. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، نەتەنیا خۆی ئەو ئیجازەیەی دا، بەڵکو فەرمانی توندی دەرکرد هەتا دەوراندەوری ماڵێ سەربازی چەکداری لێ دانەندرێ هیچ کەس، تەنانەت ئۆرسۆلاش، مافی ئەوەی نییە لە سی میتر زۆرتر لێی نزیک بێتەوە. ئۆنیفۆرمێکی کە دەبەریدا بوو هیچ دەرەجەیەکی پێوە نەبوو. چەکمە لاسک درێژەکانی بە قوڕ و خوێنی وشکەوەبوو سواخ درابوو. دەمانچەیەکی بە قەدەوە بوو کە زارکی کیفەکەی ئاوەڵا بوو. دەستی، کە دایمە لە سەر دەسکی حەوت تیرەکەی بوو، حیکایەتی لە نیگەرانیی ئاڵۆزی چاوەکانی دەکرد. سەری، کە مووەکانی هێندێک وەریبوون و پێستی وشکهەڵاتبوو، دەتگوت لە سەر ئاگرێکی هێدی کوڵاوە. پێستی دەموچاوی کە بە ئارەقەی دەریاکانی کاریبی سووتابۆوە. نەوعێک سەختی ئاسنی بە خۆیەوە گرتبوو و لەگەڵ شێوەیەک دڵزینـدوویی کە بێگومان لەگەڵ لەسەرەخۆیی ناوەوەی پێوەندیی هەبوو لە پیربوون دوور کەوتبۆوە. لەو کاتەوە ئەوێی جێ هێشتبوو، باڵابەرزتر، لەڕتر و رەنگپەڕیوەتر ببو و هەوەڵین نیشانەی بەرگریی لە بەرامبەر خەمی دووریدا لێ وەدەر کەوتبوو. ئۆرسۆلا لە بەر خۆیەوە وتی: "خودایە، بۆتە پیاوێک

هەموو کارێکی لە دەست دێ." هەرواش بوو، شاڵی سوورپێستانی "یازتی" کە بۆ ئامارانتای هێنابوو، بیرهێنانەوەی یادەکانی رابردوو، گێڕانەوەی داستانی سەیر، کە لە سەر سفرەی نانخواردن باسی دەکردن، هەموو ئەو ژیلەمۆ خامۆشانە، حیکایەتی لە خۆشمەشرەبیی زەمانێکی دیکە دەکرد.
هەر کە فەرمانی ناشتنی مردووان لە گۆڕی هاوبەشدا بەڕێوەچوو، دادگای بزۆزانەی شەڕی دایە دەست سەرهەنگ رۆکە کارنیسیرۆ و خۆی ئەرکی قورسی بەڕێوەبردن و چاککردنی کارە بنەڕەتییەکانی بەئەستۆوە گرت. هەتا نەهێڵێ لە رێژیمی پارێزەران تەنانەت پووشکێکیش بمێنێتەوە. بە هاوکارەکانی دەوت: "دەبێ کارەکان بەچاکی بەڕێوە بەرم هەتا سیاسەتمەدارانی حیزب بخاتە بەرامبەر کارێکی کە تازە ئیدی جێبەجێکراوە." لەو کاتەدا بوو کە بڕیاریدا بەو تاپۆ و قەبالانەدا بچێتەوە کە پێوەندییان بە سەد ساڵ لەومەوبەر هەیە. دەستدرێژیی قانوونیی براکەی خۆزێ ئارکادیۆی بۆ دەرکەوت، قەباڵەکانی هەڵوەشاندەوە و بۆ بەڕێوەبردنی ئاخرین کردەوە، بەئەدەبانە، سەعاتێک خۆی لە کاردەستی کێشایەوە و رۆیشت بۆ چاوپێکەوتنی رێبێکا هەتا لە بڕیارەکانی خۆی ئاگاداری بکاتەوە.
بێوەژنی گۆشەگیر، کە زەمانێک رازداری نهێنییەکانی ئەوینی ئەو بوو و، چەند جار ئەوی لە تەنگژە رزگار کردبوو، لە تاریکایی ماڵەوەدا، ببوو بە تارماییەک لە رابردووان. کراسی رەشی سەردەستدرێژ ئەوی وەک زرێ لەخۆی پێچابوو. دڵی خۆڵەمێش بووی ئاگادارییەکی لێل و نادیاری سەبارەت بە شەڕ هەبوو، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وای هاتە بەرچاو کە شەبەقی فۆسفۆری ئێسقانەکانی لە ژێر پێستەوە دیارن و، لە چوارچێوەیەکی مەگرهێنەردا دەجوولێتەوە، کە هێشتا بۆنی نهێنی بارووتی لێ دێ. پێشنیاری پێکرد کە پرسەی کەم کاتەوە و دەرگا و پەنجەران ئاوەڵا بکا و بە خاتری مەرگی خۆزێ ئارکادیۆی لە جیهان ببووری. بەڵام رێبێکا ئێستا لەوپەڕی هەر شیوە باغری و لەخۆبایی بوونێکدا بوو. دوای گەڕانێکی زۆر و بێ سوود لە تامی گڵ، لە نامەکانی بۆنخۆشی پیترۆکرێسپیدا و، لە باوەشی تۆفانێکی مێردەکەیدا، سەرەنجام هێمنایەتیی

لە ماڵێکدا دۆزیبـوّوە کە بیرەوەرییەکـان زینـدوو ببـوونەوە و بە شـێوەی مـــرۆڤ لە نێــو ژوورەکـــانی کـــوێر و کـــوتردا دەگەڕان. لە کورســـی راحەتییەکەیدا دانیشـتبوو و چاوی لە سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بویندیا بڕیبـوو، دەتگـوت کەسـێکە کە لە تارمـایی رابـردوو دەچـێ. رێبێکـا لەو هەواڵەی زەوییەکانی خـۆزێ ئارکادیۆ دەدەنەوە و بە خـاوەنە یاساییەکانی، تەنـانەت نارەحەتیش نەبوو.
هەناسـەیەکی هەڵکێشـا و وتـی: "ئۆرلیـانۆ، تـۆ هەر بڕیارێک بدەی جێبەجـێ دەبێ، من هەمیشە دەمزانی و ئێستا بۆم روونە کە تۆ پیاوێکی خوانەناسی."
پێداچوونەوەی بەڵگەکانی زەوی و زار، هاوکات لەگەڵ داداگاکانی نیزامی بە سـەرۆکایەتیی سـەرهەنگ خرینیلـدۆ مـارکیز کە حـوکمی ئیعـدامی هەمـوو ئەفسـەرانی نیزامـی، کە شۆڕشـگێڕ دیلیـان کردبـوون، دەرکردبـوو کۆتـایی هاتبوو. ئاخرین داداگی نیزامی، داداگای خۆزێ راکیل مۆنکادا بوو.
ئۆرسوّلا خۆی تێهەڵقورتاند و بە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای وت: "ئێمە تـا ئێستا شارەدارێکمان بەو چاکییە لە ماکۆنـدۆ نەبـووە، پێویسـتنییە لە دڵپاکی و خۆشەویسـتییەکی کە سـەبارەت بە هەمـوو ئێمەی هەبـووە، بـاس بـکەم، چونکە خۆت باشتر لە هەمـوو کەس دەیناسـی." سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بویندیا چـــاوێکی ناڕازییـــانەی لێکـــرد و وەڵامـــی دایەوە: "مـــن لە توانامـــدانییە بەرپرسایەتیی عەداڵەت بەئەستۆ بگرم، ئەگەر لەو بارەوە قسـەیەکت هەیە لە داداگای نیزامی دا بیڵێ."
ئۆرســـوّلا نەتەینـــا ئەو کـــارەی کـــرد، بەڵکـــو دایکـــی هەمـــوو ئەفســـەرانی شۆڕشـــگێڕی خەڵکـــی ماکۆندۆشـــی بـــۆ شـــایەدی لەگەڵ خـــۆی بـــرد. ئەو پیرێژنـانەی کە دامەزرێنەری شـاری ماکۆنـدۆ بـوون و زۆر لەوان لە بڕینـی چیـادا بەشـدارییان کردبـوو، یەکە بە یەکە تـاریفی خـوو و خـدەی باشـی ژەنەراڵ مۆنکادایـانکرد. ئۆرسـوّلا لە ریـزی ئـاخردا دانیشـتبوو. بـاغریی خەمبـاری، گرانـایی نـاوی و گەرمـایی قەنـاعەت پێکردنـی رسـتەکانی، بـۆ دەمێک تەرازووی عەداڵەتی شلۆق کرد و پایەکانی بەرز و نـزم دەبوونەوە، وتـی: "ئێـوە ئەو قومـارە سـامناکەتان زۆر بەجیـددی گرتـووە، دیـارە مـافی خۆتـانە چـونکە ئەرکـی خۆتـانە، بەڵام لە بیرتـان نەچـێ هەتـا ئێمە مـاوین و

نایکی ئێوەین، هەر چەند شۆڕشگێڕیش بن، مافی خۆمانە لەگەڵ هەوەڵین بێ حورمەتی دەرپێتان لە پێ دامالین و شیلاقکاریتان بکەین." رستەکانی هێشتا لە ساختومانی قوتابخانەکە کرابوو و بە سەربازخانەدا دەنگی دەدایەوە کە دادگا بۆ ئالوگۆڕی بیرورا پشووی دا. نیوەشەو، ژەنەراڵ خۆزێ راکیل مۆنکادایان مەحکووم بە ئیعدام کرد. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوێندیا سەرەرای نارەزایی و تووڕەیی ئۆرسۆلا حوکمی ئیعدامی کەم نەکردەوە. هێشتا نەببوو بە رۆژ لەو ژوورەی کە وەک زیندان کەڵکیان لێوەردەگرت، بۆ چاوپێکەوتنی مەحکووم بە ئیعدام رۆیشت.

پێیگوت: 'هەڤاڵی من، لە بیرت نەچێ ئەوە من نیم کە تۆ بە ئیعدام مەحکووم دەکەم، بەڵکو شۆڕشە کە تۆ گوللەباران دەکا."

ژەنەراڵ مۆنکادا، بە هاتنەژووری ئەو تەنانەت لە سەر تەختەکەشی هەڵنەستا.

وەڵامی دایەوە: "هەڤاڵی من، لێرە وەدەرکەوە."

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوێندیا، لەو کاتەوە گەڕابۆوە هەتا ئەو دەمە ماوەی نەببوو بە باشی تەماشای بکا، لەوە کە هێندە پیر ببوو، لە رزینی دەستی و تەسلیم بوونی لە بەرامبەری مەرگدا، کە کەمێکیش وەک ئەوکەسانەبوو کە مل بۆ مردن دەدەن، سەری سووڕ نەما. هەستی بە کەمزانینی خۆی بە حیسابی بەزەیی دانا، وتی: "تۆ لە من باشتر دەزانی کە هەموو دادگا نیزامییەکان قسەی مفتە. تۆ لە راستیدا تۆڵەی چینایەتی کەسانی دیکە دەدەیەوە. چونکەی ئێمە ئەوجار بە هەر نرخێک بێ، لە جەنگدا سەردەکەوین. ئەگەر تۆ لە جێگای من بای، ئەو کارەت نەدەکرد؟"

ژەنەراڵ مۆنکادا لە جێگای خۆی هەستا، هەتا شووشەی ئەستووری چاویلکەکەی بە دواێنی کراسەکەی خاوێن کاتەوە، وتی: "رەنگە، بەڵام ئەوەی من نیگەران دەکا ئەوەنییە کە تۆ من گوللەباران بکەی یان نا. چونکە تیرەباران بۆ من وەک مەرگی سروشتی وایە."

چاویلکەی لە سەر تەخت دانا و سەعات و زنجیرەکەی کردەوە و درێژەی دایە: "نیگەرانیی من لەوەدایە کە دەبینم تۆ بەو هەموو بێزارییەی کە لە نیزامیانت هەبوو و، ئەو هەموو خەباتەی دژی ئەوان و ئەو هەموو فکرە لە

بارەی ئەوان، خۆت سەرەنجام وەک ئەوانت لێهات. هیچ ئامانجێک لە ژیاندا نرخی ئەو هەموو سەرشۆڕی و نزمییەی نییە." ئاڵقەیزەماوەند و میداڵی مریەمی چارسازی دەرهێنا و لە لای عەینەک و سەعاتەکی دانا و بەو جۆرە کۆتایی بە قسەکانی هێنا: "ئەگەر بەوجۆرە بڕۆیە پێشەوە، نەتەنیا دەبیتە زۆردارترین و خوێنڕێژترین دیکتاتۆری مێژووی ئێمە، بەڵکو بۆ ئاسایشی خەیاڵیی خۆت، تەنانەت ئۆرسوڵاش مەحکووم بە ئیعدام دەکەی."
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وەک دیوارێکی پتەو لە جێگای خۆی راوەستابوو. ژەنەراڵ مۆنکادا عەینەک و میداڵ و سەعات و ئاڵقەی زەماوەندی خۆی بەودا و هەوای دەنگی گۆڕی.
وتی: "من تۆم بانگ نەکردووە سەرزەنشتت بکەم، تەنیا دەمەویست تکات لێ بکەم ئەوانە بۆ خێزانم بنێری."
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئەوانی لە گیرفانی نا.
_ هێشتا لە ماناورەیە؟
ژەنەراڵ مۆنکادا وتی: "هێشتا لە ماناورەیە، هەر لەوماڵەوی پشتی کڵێسا، ئەو شوێنە کە نامەکەت بۆ نارد."
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وتی: "خۆزێ راکیل، ئەو کارە بە دڵنیاییەوە جێبەجێ دەکەم."
کاتێ پێی نایە هەوای شینی مژاوی، دەموچاوی وەک بەرەبەیانێکی دیکە لە رابردوودا تەڕ بوو و تازە ئەو کاتە بیری کەوتەوە کە دەستووری داوە حوکمی ئیعدام لە جیاتی پێش دیواری گۆڕستان، لە حەوشەی بەڕێوە بەرن. دەستەی ئیعدام کە لە پشت دەرگا ریز ببوو بە تەشریفاتی تەواو، وەک ئەوە گرنگترین کاربەدەستی وڵات بێ، ریورەسمی ریزلێنانیان سەبارەت بەو بەجێ هێنا.
فەرمانی دا: "ئێستا دەتوانن ئەو بهێننە دەرێ."
سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکێز پێش هەمووان بە پووچیی شەڕی زانی. لە پلەی فەرماندەیی نیزامی و غەیرەنیزامیی ماکۆندۆدا حەفتەی دووجار لەگەڵ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وتوویژی تێلگرافیی هەبوو. سەرەتا، پێوەندی تەنیا ڕێڕەوی شەڕی دیاری دەکرد. گەڵاڵەی وردی جەنگ لە هەر کات و

هەر شوێنێک دیاری کرابوو و ڕێڕەوی داهاتووش پێشبینی کرابوو. هەر چەند سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئینجازەی بە کەس نەدەدا، خۆمانی لەگەڵی بدوێ، تەنانەت نزیکترین دۆستانی خۆشی، بەوحاڵەش دەنگی دۆستانەی بەس بوو بۆ ئەوەی لەولای دیکەی خەت بناسرێتەوە. زۆر جاران وتووێژی زۆرتر لە ماوەی دیاریکراو درێژەی پێدەدا و لەگەڵ باس و ڕووداوەکانی بنەماڵەی تێکەڵ دەکرد. وردە وردە کە شەڕ هەروا توند دەبوو و پەرەی دەستاند، شێوەی ئەویش لە خەیاڵیدا کەمرەنگتر دەبۆوە. ڕوونی دەنگی دوورتر و، بەگومانتر و وتەی بێ ماناتر دەبوو. ئەو کاتە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز تەنیا گوێی دەدایە و لە بەر ئەو بیرە، کە لەگەڵ نەناسیاوێک لە دونیایەکی دیکە لە پێوەندیی تێلگرافی دایە، نارەحەت دەبوو. لە مێزی تێلگرافەکەی دەدا و بەو جۆرە کۆتایی پێ دەهێنا: "ئۆرلیانۆ، تێگەیشتم، بژی حیزبی ئازادیخواز."

بەم جۆرە سەرەنجام خرینیلدۆ مارکیز هەر شێوە پێوەندییەکی لەگەڵ شەڕ لەدەست دا. ئەوەی کە زەمانێک دروستترین تێکۆشان و توندترین دڵبەستەیی لاوییەتی بوو، بە پێوەندییەکی دوورەدەست بە پووچی (بەتاڵایی) گۆڕدرایەوە. تەنیا پەناگەی ژووری بەرگدرووی ئامارانتا بوو. هەموو ڕۆژێ پاشنیوەڕۆیان بۆ بینینی دەچوو. تەماشای دەستەکانی ئەو کە بەوردی کۆمەڵە هەوری تۆڕی گوڵدۆزی دەکرد و ڕێمیدیۆسی جوانکیلە بە دەست چەرخەکەی بۆ دەسووڕاند بۆی خۆشیهێنەر بوو. بە سەعات بێ ئەوەی قسەیەک لەگەڵ یەکتر بکەن، دادەنیشتن و تەنیا بە هاودەمی یەکتر ڕەزا بوون.

بەڵام هەروەک ئامارانتا لە ناخی دەروونییەوە لە نەکووژانەوەی ئاوری وەفاداریی ئەو هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد. بۆخۆی لە گەڵاڵە و نەخشەی لێڵی دڵی بێخەبەر بوو. کاتێ هەواڵی گەڕانەوەی ئەوی بیستبوو، ئامارانتا هەستی بەوە کردبوو کە خەریکە لە نارەحەتییان بخنکێ، بەڵام کاتێ ئەوی بینی لەگەڵ گاردەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وەژوور ماڵی کەوت، هەستی بەو کرد کە ڕەنگە لە بەر ناهومێدی بەربێتەوە سەر زەوی. ئەوی بینی کە لە ژێر تین و تەوژمی دوورخراوەیی تێکڕووخاوە و بە هۆی

تێپەڕبوونی زەمان و فەرامۆشی پیر بووە و داکەوتووە. باسکی چەپی بە ملیەوە هەڵواسرابوو، لە بەر ئارەقەی زۆر و تۆز و خۆڵ ناحەز و پیس بووە و بۆنی پەزی لێ دێ. ئامارانتا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "خوایە ئەوە ئەو پیاوەنییە کە چاوەڕوانی بووم."

سبەی ئەو رۆژە، بە ریش تاشراوی و پاک و خاوێن، کۆڵەنیای لە سمێلان دابوو و هاتە ماڵیان. باندی خوێناویی لە ملی کردبۆوە و کتێبێکی دوعای بە بەرگی سەدەف بۆ ئارمانانا بەدیاری هێنابوو.

ئامارانتا وتی: "پیاو چەند سەیرن! لە لایەک هەموو تەمەنی خۆیان بۆ شەڕ لەگەڵ قەشان تێپەڕ دەکەن و لە لایەکی دیکەشەوە کتێبی دوعا بەدیاری دێنن."

بێجگە لەو رستەیە چیدیکەی بەبیردا نەهات.

لەوەودوا، تەنانەت لە دژوارترین دەورەی شەڕیشدا، هەموو دەهاتنە دیدەنی ئامارانتا و ، کاتێک کە رێمیدیۆسی جوانکیلە لەوێ نەدەبوو، ئەو، دەستەی چەرخی بەرگدرووی هەڵدەسووڕاند. ئامارانتا لە خۆڕاگری و پاکی و خۆبەکەمگریی پیاوێک کە ئەو هەمووە خاوەنی دەسەلات و حوکم بوو، هەستی بە نارەحەتی دەکرد. دەیدیت کە ئۆنیفۆرمی نیزامیی لە سالۆنی لەبەر دەکردەوە هەتا بێ چەک بێتە ژووری خەیاتیی. بەوشێوەیە ئەگەرچی چوار ساڵان ئەوینی خۆی دەربڕی و دووپاتی کردەوە، ئامارانتا هەر جارە بە جۆرێک داواکەی رەت کردەوە و بە بێ ئەوەی لە خۆی برەنجێنێ. هەر چەندە نەیتوانیبوو ئاشقی بێ، بەڵام بە بێ ئەویش نەیدەتوانی بژی. رێمیدیۆسی جوانکیلە کە ئەو هەمووە سەبارەت بە هەموو شت بێ موبالات بوو، کە وایاندەزانی مێشکی هەڵی نەداوە، سەبارەت بەوهەموو وەفادارییە بێلایەن نەبوو و مافی بە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز دەدا. لەپڕ ئامارانتا تێگەیشت کە ئەو کچە چکۆڵەی بۆخۆی گەورەی کردووە و گەیشتۆتە نزیک تەمەنی بلووغ، جوانترین کەسێکە کە هەتا ئەو رۆژە لە ماکۆندۆ هاتۆتە دنیاوە. هەستی کرد رقێکی کە سەبارەت بە رێبێکا هەیبوو، دیسان دەگەڕێتەوە نێو دڵی. لە خوا داوای کرد ناچار نەبێ ئارەزووی مەرگی رێمیدیۆسی جوانکیلە بکا و، ئەوی لە ژووری بەرگدروون دەرکرد. لەو

دەورەیەدا بوو کە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز هەستی بە پووچی و بێزراویی شەڕ کرد. هەتا ئەو جێگای دەیتوانی دڵی ئامارانتای دایەوە و دڵسۆزیی بۆ کرد وئامادە بوو بە خاتری ئەو شانازییەک لە دەست بدا کە باشترین ساڵەکانی تەمەنی بۆ گەیشتن بەو شانازییە لەدەست دابوو، بەڵام نەیتوانی ئامارانتا بە زەماوەند رازی بکا.

لە دوای نیوەڕۆی رۆژێک لە رۆژەکانی مانگی ئووت، ئامارانتا کە لە قورسایی لە توانانەهاتووی سەرسەختیی خۆی ماندوو ببوو، دوای ئەوەی ئاخرین وەڵامی دایەوە، دەرگای ژوورەکەی لە سەر خۆی داخست بۆ ئەوەی هەتا کۆتایی تەمەنی بۆ تەنیایی خۆی بگری.

پێیگوت: "باشترە یەکتر فەرامۆش بکەین، ئێمە ئیتر بۆ ئەو شتانە زۆر پیر بووین."

هەمان رۆژ پاشنیوەڕۆ، سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز وەڵامی تیلگرافێکی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای دایەوە، وتوویژێکی تێلگرافیی ئاسایی بوو. سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز، بێ ئەوەی بتوانێ کۆتایی بە شەڕ بێنێ، چاوێکی لە شەقامە خرابووەکان و لە نمە ئاوە بریسکاوەکانی سەرداره بادامەکان کرد و هەستی کرد لە تەنیاییدا نوقم دەبێ.

خەمبار و پەرێشان مستێکی لە کلیلەکانی دەزگای تێلگراف کوتا و وتی: "ئۆرلیانۆ لە ماکۆندۆ باران دەبارێ."

بۆ ماوەیەکی درێژ بێدەنگی لە سەر خەت بەرقەرار بوو، پاشان دەزگا بە تیپی بێبەزەییانەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە جێگا دەرپەڕی.

نیشان ئەوەیان دەگوت: "خرینیلدۆ، بۆ گەوج بووی! سروشتییە لە مانگی ئووت باران بباری."

زۆر دەمێک بوو ئەوی نەدیبوو، دوای دژکردەوە رەزیلانەی ئەو بەتوندی تێکچوو. دوو مانگ دواتر کاتێ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا گەڕاوە بۆ ماکۆندۆ ئەو تێکچوونە بوو بە سەرسوورمان. بە بێدەنگی و بە بێ پاسەوان گەڕایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر گەرم بوو، شتێکی لە خۆیەوە پێچاوبوو و سێ گراویشی لەگەڵ خۆی هێنابوون. هەرسێکیانی لە خانوویەکدا دانا و زۆرتری کاتەکانی لە ماڵەوە لە نێو جۆلانە رادەبوارد.

بەرامبەر بەو تێلگرافانە کە وەزعی ئاسایی شەڕیان بۆ باس دەکرد هێندە مەیلی پێشان نەدەدا. جارێکیان، سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز سەبارەت بە چۆلکردنی شوێنێک لە سنوور دەستووی ویست. مەترسیی ئەوەهەبوو شەڕ لەو شوێنە ببێتە نێونەتەوەیی. ئۆرلیانۆ وتی: "بەم جۆرە قسە پڕ و پووچانە وەختم مەگرە، پرس بە خواوەندی گەورە بکە."

ڕەنگە بکرێ ئەو دەورەیە بە ناسکترین دەورەی شەڕ حیساب بکرێ. مالیکە ئازادیخوازەکان کە سەرەتا خۆیان ڕاپەرینیان دەست پێکرد، لە بنەوە لەگەڵ مالیکە پارێزەرەکان سازان هەتا لە چاوپێداخشاندنەوەی تاپۆ و قەباڵەکانی زەوی و زار پێشگیری بکەن. ئەو پیاوە سیاسییانەی کە لە شوێنی دوورخراوەیی خۆیان سەرمایەگوزارییان لە شەڕدا کردبوو، بەهێزی و کاریگەرییەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ڕەت کردەوە، بەڵام تەنانەت پاشەکشەی ئەو، بەهێزە بەدەسەڵات و کاریگەرەکەشی ئەوی نارەحەت نەکرد. شیعرەکانی کە زۆرتر لە پێنج دەفتەر دەبوون و نەیخوێندەوە و ئەوانی لە بنی سندووقدا فەرماۆش کردن.

لەکاتی شەو یان خەوی دوای نیوەڕۆیان یەکێک لە ژنەکانی بانگ دەکردە نێو جۆلانەکەی و هەوەسی حەیوانیی خۆی پێ دادەمرکاند و ئەو جار بە خەیاڵێکی ڕاحەت دەچووە نێو خەوێکی قورسەوە. بەتەنیا شتێک کە دڵنیایی هەبوو ئەوە بوو کە دڵی گێژی هەتا ئەبەد مەحکووم بە دوودڵی دەبێ. ئەو کە لە شانازییەکانی گەڕانەوە و سەرکەوتنە بەرچاوەکانی سەرمەست بوو، سەرەتا چاوێکی لە هەڵدێری مەزنایەتی کردبوو. لەوەی کە دوک مارڵبووی، کە لە هونەری شەڕدا مامۆستای ئەو بوو، لە دەستی ڕاستی خۆیدا داناوە حەزی دەکرد. کەسێک بوو کە پەنجەی پڵینگی و لیباسە پێستەکانی دەبووە هۆی ڕێزی گەوران و پێداهەڵگوتنی گچەکەکان. لەو کاتەدا بوو کە دەستووری دا تەنەنات ئۆرسۆلاش لە سی میتر زۆرتر نزیکی نەکەونەوە. چووبایە هەر جێگایەک پاسەوانەکانی بازنەیەکی گەچیان لە زەوی دەکێشا و تەنیا ئەو مافی هەبوو بچێتە نێو ئەو بازنەوە، بە فەرمانی کورت و غەیرەمومکینی لە ناوەندی ئەو بازنەوە چارەنووسی جیهانی دیاری دەکرد. دوای گوللەبارانی ژەنەراڵ مۆنکادا، بۆ بەجێهێنانی ئاواتی

ئـاخرین قوربـانیی خـۆی بە پەلە رۆیشـتە مانـاورە. بێـوەژنەکە چـاویلکە و میداڵ و گەردنبەند و سەعات و ئاڵقەی زەماوەندی لێوەرگرت، بەڵام رێگەی نەدا بچێتە ژوورەوە.
پێیگوت: "سـەرهەنگ مەیە ژوورەوە، لە شـەڕدا تۆ فەرمـان دەدەی، بەڵام لە ماڵی خۆم من فەرمان دەدەم."
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا رکی خۆی پێشان دا، تەنیا کاتێک حەسـایەوە کە چەکـدارەکانی مـاڵە بێوەژنیـان تـاڵان کـرد و سـووتاندیان و کردیـان بە کۆگایەک خۆڵەمێش. ئەو کاتە بوو کە سەرهەنگ خرینیلدۆ مـارکیز پێیگوت: "ئۆرلیانۆ ئاگات لە دڵت بێ، خەریکە بە زینـدوویی بـۆگەن دەبێ!" لەو کـاتەدا ئۆرلیانۆ دووهەمـین کۆبـوونەوەی فەرمانـدە گرینگەکـانی شـۆڕشـگێڕانی پێـک هێنـا. لە هەمـوو چـین و توێژێـک لەو کۆبوونەوەیـدا هەبـوو: ئایدیالیسـت، پۆپۆلیست، گێرەشێوێن، بێزراو لە کۆمەڵ و تەنـانەت تاوانبـاران و بەرەڵڵای ئاسـایی. کەسـێکی دیکەشـیان لە نێـو بـوو کە پێشـتر ئەنـدامی حیزبـی پارێزەران بوو بۆ رزگاری لە داداگا بە هـۆی خواردنی سـامانی خەڵک پـاڵی بە شۆڕشگێڕانەوە دابوو. هێندێک لەوانە تەنانەت نەیاندەزانی بۆچی خەبـات دەکەن. لە نێـو کۆمەڵێـک کە نـاکۆکیی چینـایەتیی زۆریـان هێنـدەی نەمـابوو تەقینـەوەی نێوخـۆیی پێـک بێنـێ، دەسـەڵاتدارێکی بەهێـز دەبینـدرا: ژەنەراڵ تیۆفیلـۆ ڤارگـاس سـوورپێسـتێکی ئەسڵ، وەحشـی و بێسـەواد. دەروونپیس، بێـدەنگ و حـاڵەتی وەک مەسـیحی پیاوەکـانی ناچـار دەکـرد فیـداکاریی بـۆ بکەن. سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بوینـدیا ئەو کـۆڕەی بـۆ یەکیەتیی فەرمانـدەکانی شـۆڕش دژی سیاسـەتمەداران پێـک هێنـابوو. ژەنەراڵ تیۆفیلـۆ ڤارگـاس لە ماوەی چەند سەعاتدا یەکگرتوویی فەرماندە هەڵبژاردەکانی تێک دا و، خـۆی بوو بە فەرماندەی گشتیی هێزی ناوەندی.
سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بوینـدیا بە ئەفسـەرەکانی وت: "دەبـێ وریـای ئەو جانەوەرە بین، ئەوە بۆ ئێمە لە وەزیری جەنگیش سامناکترە."
ئەو کـات سـەروانێک کە شـەرمێونیی بـۆ هەمـووان دیـار بـوو، بە پـارێزەوە دەسـتی هەڵێنـا، پێشـنیاری کـرد: "زۆر ئاسـان، جەنـاب سـەرهەنگ، دەبـێ بکوژرێ."

بێباکیی ئەو پێشنیارە نەبوو کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای نارەحەت کرد، بەڵکو لە بەر ئەوە ترسا کە چرکەیەک پێشتر بۆخۆی هەر ئەو فکرەی بە مێشکدا هاتبوو.
وتی: "ئەو چاوەڕوانییەتان لە من نەبێ دەستووریکی ئەوتۆ بدەم."
لە راستیشدا فەرمانێکی ئەوتۆی نەدا. بەڵام دوو حەفتە دواتر ژەنەراڵ تێۆفیلۆ ڤارگاس لە حەشارگەی خۆی بە ساتۆر لەت و کوت کرا و ،سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بوو بە فەرماندەی گشتیی هێزی مەرکەزی. ئەو شەوە کاتێک هەموو هێزەکانی شۆڕش دەسەڵاتی ئەویان بە رەسمی ناسی، لەپڕ لە خەو راپەڕی و بە هاوار هاوار دەستووری دا پەتوویەکی بۆ بێنن. سەرمایەکی دەروونی، کە هەموو لەشی وەلەرز هێنابوو ، تەنانەت لە بەر خۆرەتاویش حەجمینی نەبوو، چەند مانگان نەیهێشت بنوێ، هەتا سەرەنجام بۆی بوو بە عادەتێکی ئاسایی. سەرمەستیی دەسەڵات وردە وردە لە ژێر شەپۆلی ئازاردا تێک دەشکا. بۆ چارەسەری سەرمای دەروونی، دەستووری دا ئەو ئەفسەرە لاوە کە پێشنیاری کوشتنی ژەنەراڵی کردبوو، گوللەباران بکەن. هەر فەرمانێکی دەیدا، پێش ئەوە مۆڵەتی چاوپێداخشاندنەوەی هەبێ، دەست بەجێ بەڕێوە دەچوو و هەمیشەش دەستوورەکانی ناخۆشتر لەوە کە دەیویست جێبەجێ دەکران. هێدی هێدی لە گۆشەی دەسەڵاتی بەربڵاوی خۆیدا بزر بوو و ریژەی خۆی لە کیس دا. لە خۆشی و شادمانیی خەڵکی ئەو ئاواییانەی داگیر کرابوون نارەحەت دەبوو و، پێیوابوو ئەوانە پێش هاتنی ئەو، بۆ دوژمنیش شادمانیان کردووە. دەچووە هەر جێگایەک کوڕانی گەنجی دەدیت کە بە چاوی خۆی چاوی لێ دەکەن و بە دەنگی خۆی قسەی لەگەڵ دەکەن و هەر بەو شک و گومانەوە سەیری دەکەن کە ئەو سەیریان دەکا، دەیانوت کە کوڕانی ئەون، هەستی دەکرد وجوودی وەک دووپاتی وێنەیەکە بۆ هەموو لایەک بڵاوبۆتەوە و زیاد کراوە. زۆر لە جاران پتر هەستی بە تەنیایی دەکرد. لای وابوو ئەفسەرەکانی فریوی دەدەن. لەگەڵ دوک مارڵبۆرۆ بەشەڕ هات، دەیوت: "باشترین دۆست ئەو کەسەیە کە هەر ئەو دەمە مردبێ." لە گومانی خۆی و لە چوارچێوەی ئەو شەڕە ئەبەدییەی کە

هەر ئەوان پیرتر و ماندووتر رێکی دەکوشی، ماندوو ببوو. جار لە جار زۆرتر هەستی دەکرد لە دەورەوەی ئەو بازنە گەچەشدا کەسێکی دیکە هەیە.
کەسێک کە پێویستی بە پووڵ بوو، کەسێک کە کورەکەی کۆخەرەشەی گرتبوو، کەسێک کە ئاواتی دەخواست هەتا ئەبەد خەوی لێ بکەوێ، چونکە ئیتر لەوە زیادتر توانای چێشتنی تامی قێزەونی شەڕی لە دەمیدا نەبوو، کەسێک کە لەگەڵ هەموو ئەو قسانەدا، خەبەردار لە پێشی رادەوەستا و رایدەگەیاند: "جەناب سەرهەنگ بارودۆخ ئاساییە." ئاسایی بوون دروست سامناکترین بەشی ئەو شەڕە بێ کۆتاییە بوو. ئیتر هەواڵێک نەدەهات و رووداوێک نەدەقەوما. پێشگۆییەکانیش بەجێیان هێشتبوو. تەنیا، لەگەڵ سەرمایەک کە هەتا کۆتایی تەمەنی دەستی لێ هەڵنەگرت حەشارگەی خۆی لە ماکۆندۆ لە گەرمای بیرەوەرییەکانی رابردوودا دۆزییەوە. بێ مبالاتییەکەی گەیشتە جێگایەک، کاتێ هەواڵی هاتنی نوێنەرانی حیزبیان پێدا کە بۆ وتووێژ سەبارەت بە برانەوەی شەڕ هاتبوون لە جۆلانەیەکدا خۆی لەقاند و بێ ئەوە بەتەواوی بەخەبەر هاتبێ، وتی: "بیانبەنە لای فاحیشەکان!"
شەش نوێنەری فراک لەبەر و کڵاوی سیلیندر لە سەر، گەرمای کوشندەی مانگی نۆڤەمبەریان بە لەسەرەخۆییەکی فەیلسوفانە دەبردەسەر. ئۆرسۆلا لە ماڵی خۆی جێگەی دانێ. بە درێژایی رۆژێ لە ژووریدا خەریکی وردە کونفرانسان بوون و، لای تاوپەڕان لەگەڵ چەند پارێزگار و هونەرمەندی ئۆکۆردیۆن دەچوونە مەیخانەی کاتارینۆ.
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا فەرمانی دەدا: "لێیان گەڕێن، چونکە من دەزانم ئەوان چییان دەوێ." لە سەرەتای مانگی دێسەمبەر، وتووێژێکی کە ئەو هەمووە چاوەڕوان بوون و پێشبینییان دەکرد وتووێژێکی دووروودرێژ بێ، لە ماوەی کەمتر لە سەعاتێکدا کۆتایی هات.
ئەو رۆژە لە سالۆن، لە لای تارمایی پیانۆلا، کە مەلافەیەکی سپی وەک کفنیان بە سەردا دابوو، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە نێوەڕاست بازنەی کەچی دا دانیشت، پەتوویەکی خوری لە خۆیەوە پێچا و لە نێو

راوێژکارەکانی لە سەر کورسییەک دانیشت و بە بێدەنگی گوێی دایە کورتە پێشنیارەکانی نوێنەران. پێشنیاری یەکەم ئەوە بوو کە بە خاتری لەکیس نەچوونی پشتیوانیی مالیکانی ئازادیخواز، لە چاوخشاندنەوە بە سەر تاپۆکانی زەوی و زاردا چاوپۆشی بکرێ. داوای دووهەمی ئەوان ئەوە بوو، کە دەست لە خەبات نەدەن و، سەرەنجام واز لە مافی بەرامبەری منالآنی غەیرەشەرعی و بیژوو بهێندرێ هەتا چوارچێوەی بنەماڵەیی تێک نەچێ.

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بزەی هاتێ و وتی: "کەوابوو هەمووی ئێمە بۆ بەدەستهێنانی یەک شت خەبات دەکەین: دەسەلآت."

یەکێ لە نوێنەرەکان وەلآمی دایەوە: "ئەو بەرژەوەندییانە پێوەندییان بە تەگبیری شەڕەوە هەیە، لە کاتی ئێستا نەخشەی سەرەکیی بەربلآوکردنی لایەنی نەتەوەیی شەڕەکەیە، لە دوایەدا بزانین چمان بۆ دەکرێ."

یەکێ لە راوێژکارەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بەپەلە هاتە نێو قسەکانەوە و وتی: "تۆ هەڵە و پەڵە دەدوێی، ئەگەر ئەو بەرژەوەندییانە بەکەڵکن، کەوابوو حیزبی پارێزەران حیزبێکی باشە. ئەگەر بتوانین بەهۆی ئەوانەوە لایەنی نەتەوەیی شەڕەکە پەرە پێ بدەین، ئەو کات بە قسەی تۆ ئەو رێژیمە لایەنی نەتەوەیی بەربلآوی دەبێ، بەجۆرێکی سادەتر، مانای ئەوەیە کە ئێمە نزیک بە بیست ساڵ دژی هەستی نەتەوایەتی شەڕمان کردووە."

دەیەویست قسەکانی درێژە پێ بدا، بەلآم سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە ئاماژەی دەست بێدەنگی کرد.

وتی: "دکتۆر بەخۆڕایی کاتی خۆتان بە فیڕۆ مەدەن. مەسەلە ئەوەیە کە لێرە بەدوا ئێمە تەنیا بۆ دەسەلآت خەبات دەکەین." ئەو بەڵگانەی کە نوێنەرەکان بۆیان راداشتبوو، بە زەردەخەنەوە وەریگرتن و خۆی بۆ مۆرکردنیان ئامادە کرد و وتی: "ئێستا کە وەزعەکە بەوجۆرەیە رەخنەیەکمان نییە."

خەڵکەکەی خۆی بە سەرسامییەوە سەیری یەکتریان کرد.

سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز لە سەرەخۆ وتی: "جەناب سەرهەنگ زۆر داوای لێبووردن دەکەم، بەلآم ئەو کارە خیانەتە."

سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بوینـدیا قەڵەمـی مەرەکەبـاویی لە هەوا راگـرت و بە هەموو هێزییەوە بە سەریدا رووخا و دەستووری دا: "خۆتان چەک کەن."
سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز هەستا و چەکەکەی خۆی لە سەر مێز دانا.
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا فەرمانی پێدا: "خۆتان بە سەربازخانە بناسێنن و بچنە ژێر دەسەڵاتی دادگای شۆڕشگێڕان."
ئەو جار بەڵگەکانی مۆر کرد و دایە دەست نوێنەران و وتی: "فەرموون ئاغایـان. ئەوەش کـاغەزی ئێـوە، هیـوادارم بتـوانن ئەوپەڕی کەڵکـی لـێ وەربگرن."
دوو رۆژ دوایی، سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بە تۆمەتی خیانەت مەحکووم بە ئیعدام بوو. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کە لە جۆلانەی خۆیدا درێژ ببوو، گوێی نەدەدایە پاڕانەوەی کەمکردنەوەی سزاکە. شـەوی پێش بەڕێوەبردنی حـوکمەکە ئۆرسـۆلا لەو دەسـتووورە کە کەس نـابێ بچێتە لای سـەرهەنگ، سەرپێچیی کرد و رۆیشتە ژووری خەوەکەی، جلی رەشـی پۆشیبوو و بە رێزی زۆرەوە لە ماوەی سێ دەقیقەدا کە قسەی لەگەڵ دەکرد بە سەر پێوە راوەستا. بە ئارامی وتـی: "دەزانـم کە خرینیلدۆ گوللەبـاران دەکەی، دەزانـم کە ناتوانم پێشی ئەو کارە بگرم، بەڵام پێت دەڵێم:
"بە گـۆڕی دایـک و بـابم، بە روحـی خـۆزێ ئارکـادۆ بوینـدیا، سـوێند بە خواوەند چاوم بە لاشەی ئەو بکەوێ، بۆ هەر جێگایەک راکەی بەدواتدا دێم و بە دەستی خۆم دەتکوژم." پێش ئەوەی لە ژوورەکە دەرکەوێ و بێ ئەوە چاوەڕوانی وەڵام بێ بەوجۆرە کۆتـایی بە قسـەکەی هێنـا: "بۆ من دروسـت وەک ئەوەیە بە کلکداری هاتبێتە سەر دونیا."
لەو شـــەوە بـێ کۆتـــاییەدا، کە ســـەرهەنگ خرینیلـدۆ مـارکیز بیـری لە پاشنیوەڕۆیانی مردووی خۆی لە ژووری بەرگدروونی ئامارانتا دەکردەوە، سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بوینـدیا بـۆ لە بەریەک هەڵدڕینی تـوێژی تەنیـایی چەنـد سـەعات خـۆی دەخورانـد. تەنیـا کاتەکـانی بەختەوەریـی ژیـانی دوای ئەو نیـوەڕۆیە زۆر کـۆنە بـوو کە بـاوکی بردبـووی بـۆ دیتنـی سـەهۆڵ و ئەو کاتـانەی کە لە کارگـای زێڕنگەریـدا تێپەڕیبـوون، ئەو جێگـایەی، کە کـاتی خۆی بە دروستکردنی ماسی زێڕی بچکۆلانە دەبردەسەر. ناچار ببوو سێ

و دوو شەڕ دەست پێبکا، ناچار ببوو تەواوی پەیمانەکانی بە مەرگ و ئیعدام لە ژێر پێ بنێ و وەک بەرازێک لە زبڵدانی شانازییەکاندا بتلێتەوە، هەتا سەرەنجام پاش چل ساڵ دواکەوتن دەستی بگاتە ژیانێکی ساکار.
بەرەبەیانێ، خەستە و ماندوو لە بێ خەویی شەوی پێشوو، سەعاتێک پێش بەڕێوەبردنی حوکمی ئیعدام رۆیشتە ژووری زیندان و بە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزی وت: "هاوڕێی من، ئەو گاڵتەبازییە تەواو بوو. وەرە پێش ئەوە "مێشوولە"تەپیان لێرە گوللەبارانت بکەن، بڕۆین." سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز توانای قبووڵی سووکایەتی ئەوی نەبوو.
وتی: "نا ئۆرلیانۆ، مردنم پێ باشترە لەوە ببینم تۆ بوویتە پیاوێکی زۆردار و خوێنخۆر."
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وتی: "ئاوام نابینی. هەستە کەوشەکانت دەپێ کە و یارمەتیم بدە هەتا ئەو شەڕە نەگریسە کۆتایی پێ بهێنین."
کاتێ ئەوەی وت نەیدەزانی کە کۆتایی پێهێنانی شەڕ زۆر گرانترە لە دەستپێکردنی. نزیکەی ساڵێکی خوێناوی درێژەی کێشا هەتا توانی دەوڵەت ناچار بکا مەرجەکانی ئاشتی بە قازانجی پارتیزانەکان بسەلمێنێ. مەرجەکان لەبار و بەجێن، بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینی ئەفسەرەکانی کە خۆیان دەگرت و خوازیاری سەرکەوتن بوون، دەستی دایە زۆردارانەترین کردار و سەرەنجام بۆ سەرکوتیان ناچار بوو پاڵ بە هێزی دوژمنەوە بدا.
هیچ کاتێک بەو چاکییە شەڕی نەکردبوو. بەو خەیاڵە کە لە جیاتی شتێکی پووچ، سەرەنجام بۆ رزگاریی خۆی خەبات دەکا، شۆق و زەوقی لێ دەباری.
سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بە هەمان باوەڕ و پاکیی لە رابردوودا بۆ سەرکەوتن شەڕی پێدەکرد، ئێستا بۆ شکان دەجەنگا. سەرکۆنەی ئەوی دەکرد بەڵام ئەو لە وەڵامدا بە زەردەخەنەوە دەیگوت: "نیگەران مەبە مردن لەوە کە بیری لێ دەکەیەوە زۆر گرانترە." ئەو قسەیە سەبارەت بەو راست بوو. دڵنیایی بەوە کە هێشتا ئەجەلی نەهاتووە، پارێزراوییەکی سەیری پێ دەبەخشی. پارێزراوییەک لە بەرامبەر مەترسیی شەڕێکی بەردەوامدا، وایدەکرد نە گرتن و نە لەناوبردنی هاسان نەبێ. بەجۆرێک کە توانی لە

شکسـتێدا سـەرکەوێ کە زۆر گرانتـر و خوێنـاویتربوو لە سـەرکەوتنی سەرکەوتن.

بە درێژایی نزیکەی بیست ساڵ جەنگ، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا چەند جـار گەڕایەوە شـاری خـۆی، بەڵام هەمـوو جـارێ بەپەلە و بەتونـدی دەگەیشـتێ. پـارێزەرانی کە بـۆ هەمـوو شـوێنێک لەگەڵیـدا بـوون و،ئەو خەرمـانە ئەفسـانەییەی ئۆرسـۆلاش هەسـتی پێکردبـوو و بـوونی ئەوی لە هەموو جێگـایەک روونـاک دەکردەوە، سـەرەنجام کردی بە بێگـانە. جـاری ئـاخر کە هـاتە ماکۆنـدۆ و خـانووی بـۆ سـێ گـراوییەکە گـرت، تەنیـا دوو کەرەت رۆیشـتەوە مـاڵی خۆیـان، ئەویـش لە بەر ئەوە بـۆ شـام دەعوەتیـان کردبوو. ریمیدیۆسی جوانکیلە و دووانەکەی کە لە جەنگەی شـەڕدا لە دایک ببوون زۆر بەزەحمەت دەیانناسییەوە. ئامارانتـا نەیدەتوانی وێنەی بـراکەی، کە سـاڵانی گەنجـی بـۆ دروسـتکردنی ماسـی چکـۆڵەی زێـڕ تێـپەڕ کردبـوو لەگەڵ وێنەی ئەو شـەڕەکەرە ئەفسـانەییە بەراورد بکا کە لە نێوان خـۆی و خەلکـی دیـکە مەودایەکـی سـی میتـری دانـاوە. کاتێـک کە شـەڕ نزیـک بەتەواوبـوون بـوو، وایـانزانی کە دیسـان بـۆتەوە مـرۆڤ و سـەرەنجام بە خـاتری خۆشەویسـتیی کەسـوکاری دەگەڕێـتەوە، هەسـتی بنەمـاڵەیی کە سـاڵەها بـوو لە دڵانـدا نووسـتبوو، جـارێکی دیـکە بەهێزتـر لە هەمیشـە هەستایەوە.

ئۆرسۆلا وتی: "ئاخرەکەی پیاوێکمان لە ماڵەوە دەبێ."

ئامارانتـا، بەپێچەوانە، هەوەڵـین کەس بـوو کە تێگەیـی ئەویـان بـۆ هەمیشـە لەدەست داوە. حەفتەیەک پێش شەڕراوەستان، کاتێک ئەو بێ پاسـەوان و نیگابـانی هەمیشـەیی وەژوور مـاڵی کەوت، دوو خزمەتکـاری پـاپەتی، کە لە پێشەوەی دەڕۆیشتن، باری یەستر و سندووقی شیعرەکانی، کە پاشماوەی دەزگـا پـڕ کەوکەبە و دەبـدەبەکەی بـوو، لە پـێش هەیـوانێ بەئەرزیانـدا دا. ئامارانتا چاویی پێکەوت بە بەر ژووری بەرگدرووندا رادەبرێ، گازی کرد، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە زەحمەت توانی بیناسێتەوە.

ئامارانتـا بە خۆشـحاڵییەوە وتـی: "مـن ئامارانتـام." دڵشـاد لە گەرانەوەی، دەستی باندپێچی خۆی نیشان دا و وتی: "بڕوانە."

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، وەک ئەو رۆژە دوورەی مەحکووم بە ئیعدام ببوو و گەڕابۆوە ماکۆندۆ و دەستی سووتاوی ئەوی بینیبوو، پێی پێکەنی و وتی: "چەند سامناکە، زەمان چەند بەپەلە رادەبرێ."
نیزامیانی حکوومەت ناچار بوون پارێزگاری لە ماڵەکەی بکەن، ئەو مەحکووم بەوە کە ئاگری شەڕی خۆش کردووە، هەتا بتوانێ گرانتری بفرۆشێ، لە نێو جنێو و نەفرینی خەڵکدا گەڕابۆوە ئەوێ. لەبەر تینی تاو و سەرما دەلەرزی و بن هەنگڵەکانی دیسان برنیدار ببوونەوە. شەش مانگ پێشتر، ئۆرسۆلا، کە زانیبووی شەڕ رادەوەستێ، ژووری زاوایەتیی
ئەوی کردبۆوە و خاوێنی کردبۆوە، گەسکی لێدابوو و دەرگا و پەنجەرەی ئاوەڵا کردبوون هەتا با لێی دا. وایدەزانی دەگەڕێتەوە هەتا لە نێو بووکەشووشەکانی ریمیدیۆس بەئارامی پیر بێ. بەڵام ئەو لە دوو ساڵی رابردوو قەرزێکی کە بە مردنی هەبوو و پیرییشی دەگرتەوە، دابوویەوە. کاتێک بە بەر کارگای زێڕنگەریدا رابرد کە ئۆرسۆلا بە تێبینی و زیرەکییەوە ئامادەی کردبوو، تەنانەت نەیزانی کلیل لە سەر دەرگایە. ئەو وێرانییە رواڵەتی و لە هەمان کاتدا قووڵانەی نەهاتە بەرچاو کە بە تێپەڕبوونی زەمان بەسەر خانووەکەدا هاتبوون و، دوای ون بوونێکی ئاوا درێژ کە بە چاو کەسێکی بیرەوەریی لە یاد نەبردبێتەوە ئیمکان بوو کارەسات بێ. لە دیتنی گەچی وەریوی دیواران و تاری پیسی جاڵجاڵۆکەی گۆشەی دیواری ژوورەکان و تۆز و خۆڵی سەر گوڵە هەمیشە بەهارەکان و رێڕەوی مێروولان بە سەر دارەکانی میچەوە و ژەنگ و کەڕووی سەر لاولاوەی دەرگاکان و داوەکانی دیکە، کە دڵتەنگی بۆ دانابۆوە، دڵی نەگیرا. پەتووی لە خۆیەوە پێچا و بێ ئەوەی چەکمەکانی لە پێ کا لە هەیوانێ دانیشت. دەتگوت چاوەڕوانە باران لێی بکاتەوە. هەموو پاشنیوەڕۆیەی بە تەماشای بارانێ تێپەر کرد، کە بە سەر گوڵە هەمیشە بەهارەکاندا دەهاتەخوار. ئۆرسۆلا دڵنیا بوو کە ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر لە ماڵەوە رایبگرێ. بیری کردەوە: " ئەگەر شەڕ نەبێ، مردنە." ئەوەندە لە فکری خۆی دڵنیا بوو کە بە حیسابی پێشگۆیی دانا.

ئەو شەوە لە سەر شامێ، ئەو کوڕەی کە بە ئۆرلیانۆی دووهەم دانرابوو، نانی بە دەستی راستەوە گرت و سووپی بە دەستی چەپ خوارد. برا دووانەکەی ئەو ،کوڕەک کە بە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم دانرابوو، نانی بە دەستی چەپەوە گرت و سووپی بە دەستی راست خوارد. نەزمی هەڵسوکەوتیان ئەوەندە رێکوپێک و لەبار بوو، دەتگوت لە جیاتی ئەوەی وابزانی دوو برا لە بەرامبەر یەکتر دانیشتوون، یەکێکە و لە بەرامبەر ئاوێنە دانیشتووە. شانۆیەکی کە ئەو دوو برا دووانەیە ئامادەیان کردبوو، کاتێ زانیبوویان وەکو یەک دەچن، ئەوجارەشیان بەشانازیی میوانی تازە دووپاتیان کردەوە. بەڵام سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئەوانیشی بەرچاو نەکەوت. هێند بە هەموو شت بێ موبالات بوو کە تەنانەت رێمیدیۆسی جوانکیلەشی نەدی بەرووتی بۆ لای ژووری خەوی خۆی دەرۆیشت.

ئۆرسۆلا تەنیا کەسێک بوو ئیزنی بە خۆیدا هەودای بیرەکانی بپسێنێ. لە نیوەی نانخواردنی شەو پێیگوت: "ئەگەر بڕیارە دیسان لێرە بڕۆی، لانیکەم ئەوشەوت لە بیر نەچێ."

ئەو کات بوو سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بێ سەرسوورمان تێگەیی ئۆرسۆلا تەنیا کەسێکە توانیویەتی لە بەدبەختیی ئەو تێبگا، دوای ساڵەها سەری بڵیند کرد و رووبەڕوو تەماشای کرد. پێستی دەموچاوی وەک چەرمی کوڵاو بوو و ددانی رزیبوون و پرچی سیس و بێڕەنگ و نیگای سامناک بوو. ئەوی لەگەڵ بیرەوەرییەکی دوورەدەست بەراورد کرد، لەگەڵ پاشنیوەڕۆیەکی پێشبینیی کردبوو مەنجەڵی ئاشی کوڵیو لە سەر مێزی ئاشپەزخانە دەکەوێتە خوارەوە. ئێستا ئۆرسۆلای وەک ئەو مەنجەڵە ئاشە رژاوە و وردبووە دەهاتە بەرچاو. لە یەک ئاندا هەموو ئەو قەڵش و شینبوونەوە و برینانەی چاو پێکەوت کە لە ماوەی نیو سەدە ژیانی رۆژانەی نیشانێکیان لە خۆیانەوە لە سەر ئەو دانابوو و، هەستی کرد کە بەو هەموو زەربەوە، تەنانەت زەررەیەکیش دڵی پێی ناسووتێ. جارێکی دیکەش لە نێو دڵی خۆیدا کۆشا بۆ شوێنێک بگەڕێ نەبوویێتە بەرد، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە. لە رابردوو، لانیکەم لە هەستی بۆنی ئۆرسۆلا لە سەر پێستی خۆی و، لە تێکهەڵەنگوتنی بیرەکانیان لەگەڵ یەک، هەستێکی لێڵی

شەرم دەیگرت. بەڵام شەڕ هەموو شتێکی لەودا لەنێو بردبوو. تەنانەت ڕێمیدیۆسی، ژنیشی بە وێنەیەکی ئاڵۆزاویی کەسێک هاتبۆوە بەرچاوی کە دەیتوانی لە جێگای کچی ئەو بێ. ئەو ژنە زۆرانەی لە بیابانی ئەوینی ناسیبوونی و تۆوەی ئەویان لە سەرتاسەری کەنار دەریا بڵاوکردبۆوە، لە دڵی ئەودا چکۆلەترین شوێنیان بەجێ نەهێشتبوو. زۆرتری ئەوانە بە تاریکی دەهاتنە نێو جێگای ئەو و پێش بەرەبەیان دەڕۆیشتن و ڕۆژی دوایی تەنیا شوێنێک کە لێیان بەجێ دەما، کەمێک ماندووبوون لە بیرەوەریی لەشی ئەودا بوو. تەنیا خۆشەویستییەکی بە شەڕ و زەماندا سەرکەوتبوو، خۆشەویستییەک بوو لە منداڵیدا سەبارەت بە براکەی خۆزێ ئارکادۆ هەستی پێکردبوو، کە ئەویش نە لە بەر ئەوین، بەڵکو لە بەر هاودەستی بوو. لە وەڵامی داوای ئۆرسوڵادا داوای لێبووردنی کرد کە: "بمبوورە"، ئەو شەوە شوێنەواری وجوودی خۆی لە جیهاندا سەرگەرم کرد. کارگای زێڕنگەری وەها هەڵوێژارد کە تەنیا چەند شتی غەیرەشەخسی لەوێدا مایەوە. لیباسەکانی خۆی دان بە خزمەتکارەکان، دروست بەو تۆبەیەی باوکی لە دوای کوشتنی برۆدینسیۆ ئاگیلار نێزەکەی خۆی لە بن گڵێدا شاردبۆوە، چەکمەکانی خۆی لە حەوشە لەچاڵنان. تەنیا دەمانچەیەک و گوللەیەکی بۆخۆی هێشتەوە. ئۆرسوڵا گوێی نەدایە کارەکانی، تەنیا جارێک پێشی گرت کە کوڕەکەی خەریک بوو وێنەی ڕێمیدیۆسی دەدڕاند، کە ئەو لە ژووریی دانابوو و چرایەکی ئەبەدیی لە ژێرەوە داگیرساندبوو.

پێیگوت: "ئەو وێنەیە زۆر دەمێکە پێوەندیی بە تۆوە نەماوە و بۆتە یادگارێکی بنەماڵە." شەوی پێش برانەوەی شەڕ ،کە ئیتر تەنانەت یەک شتی ماڵەوەش نیشانەی ئەوی پێوە نەبوو کاتێک، کە سانتا سۆفیا دیلا پێداد خەریکی هەڵکردنی ئاگردان بوو، سندووقی شیعرەکانی بردە ئاشپەزخانە.

هەوەڵین لوولەکاغەزی زەردهەڵگەڕاوی بۆ لای درێژ کرد و وتی: "بەوەی هەڵکە، کۆنە و زوو دەسووتێ."

ـانتا سۆفیا دیلا پێداد، ژنێک کە بە خۆبەکەمگری و فەرمانبەری ناسرابوو
و هەرگیز دژی کەسێک، تەنانەت منداڵەکانی خۆشی قسەی نەکردبوو،
هەستی کرد ئەو کارە کارێکی قەدەغەیە.
وتی: "ئەو کاغەزانە گرنگن."
ـەرهەنگ وتی: "بە هیچ جۆر، شتانێکی بێ کەڵکن کە هەر کەس لە بەر
خۆیەوە دەینووسێ."
جەناب سەرهەنگ، خۆت بیانسووتێنە."
ەتەنیا بۆخۆی شیعرەکانی سووتاند، بەڵکو سندووەکەشی بە بیوری ورد
کرد و لە ئاگری هاویشت. چەند سەعات پێش ئەوە پیلار تێرنێرا بۆ دیتنی
ۆیشتبوو، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کە لەمێژ ساڵ بوو نەیدیتبوو لە
پیربوون و قەڵەویی ئەو زۆر سەری سوورما. ژنە لە فاڵی وەرەقدا پێیگوت:
ئاگات لە دەمی خۆت بێ." سەرهەنگ ئەو قسەیەی زۆر پێشتریش، کاتێک
ەوپەری دەسەڵات و شانازی دابو، لێ بیستبوو. لە بەر خۆیەوە بیری
کردەوە کەوابوو ئەو وتەیە پێشبینی سەیری چارەنووسی ئەونیە؟
ماوەیەک دواتر، کاتێ پزیشکی برینەکانی ژێر هەنگڵی دەرمان دەکرد، ئەو
بە سادەیی شوێنی دروستی دڵی خۆی لە پزیشک پرسی. دکتۆر بە گوێ
گوێی دایە دڵی ئەو و بە لۆکەیەکی بە یۆد بازنەیەکی لە سەر سینگی کێشا.
سێ شەممەی گەرم و بارانی برانەوەی شەڕ دەست پێکرا. سەرهەنگ
ئۆرلیانۆ بویندیا پێش سەعاتی پێنجی بەیانی رۆیشتە ئاشپەزخانە، وەک
هەمیشە فینجانێکی قاوەی تاڵی خواردەوە. ئۆرسوڵا پێیگوت: "تۆ لە رۆژێکی
ئاوادا لە دایک بووی. هەموو لە چاوەکراوەکانت واقیان ورمابوو." بەڵام
ئەو گوێی نەدایە قسەی ئۆرسوڵا، چونکە هۆشی دابوویە دەنگی ریزبوونی
دەستەکان و شەیپوورەکان و ئەو فەرمانانەی کە بەرەبەیانیان دەلەرزاند.
لەگەڵ ئەوەشدا کە دوای ئەو هەموو ساڵە شەڕکردن، دەبوایە گوێی
بەودەنگانە ئاشنابان، لە ئەژنۆیانیدا هەمان سستی و، لە پێستیدا هەمان
کزەی هەست کرد کە کاتێک زۆر لاو بوو لەلای ژنێکی رووت هەستی
پێکردبوو.

سەرەنجام بوو بە دیلی دڵتەنگیی خۆی و بیری کردەوە ئەگەر لەگەڵ ئەو ژنە زەماوەندی کردبا و رەنگە ببوویایە بە پیاوێکی بێ شەڕ و بێ شانازی، سەنعەتکارێکی بێ ناو، جانەوەرێکی خۆشبەخت. ئەو لەرزە درەنگ گەیشتووە کە لە پێشبینییەکانیدا هیچ کات حیسابی بۆ نەکرابوو نانی بەیانیی لێ تاڵ کرد. سەعات حەوتی بەیانی، کاتێک سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز لەگەڵ چەند ئەفسەری دیکەی شۆڕشگێڕان هاتن بۆ لای، لە هەموو کاتێک بێدەنگتر و لە فکرەوەچووتر، تەنیا ترسیان هاتە بەرچاو. ئۆرسۆلا کە خەریک بوو شنیلێکی دیکەی بە سەر شانیدا دەدا وتی: "دەوڵەت چۆن بیر دەکاتەوە؟" رەنگە وابزانێ چونکە پارەتنییە شنێلێکی تازە بۆخۆت بکڕی تەسیلم بووی." بەڵام ئەو شنێلەکەی فڕێ دا. تەنیا کاتێ گەیشتە نزیک دەرگاکە رێگەی ئۆرسۆلای دا کلاوێکی لبادی کۆنی خۆزێ ئارکادۆ بویندیای لە سەر بکا.
ئۆرسۆلا پێیگوت: "ئۆرلیانۆ بەڵێنێ بدە ئەگەر لەوێ گەیشتیتە سەعاتی ئاخر بیرێک لە دایکت بکەیەوە."
ئەو بزەیەکی هاتێ و دەستی بەرز کردەوە و بێ ئەوەی وشەیەکی بڵێ لە ماڵەوە دەرکەوت و هاوار و جنێو و نەفرینی خەڵک هەتا لە شاریان بردە دەرێ لەگەڵی رۆیشتن. ئۆرسۆلا دەرگای گاڵەدا. بڕیاری دابوو هەتا کۆتایی تەمەنی دەرگا نەکاتەوە. بە بیریدا هات: "لێرە دەرزین و لەو ماڵە بێ پیاوەدا دەبینە خۆڵەمێش، بەڵام بەختەوەریی ئەوە بەو شارە هەژار و نزمە نادەین فرمێسکی ئێمە ببینن." هەموو ئەو بەیانییە گۆشە و کەناری ماڵەوە گەڕا، یادگاریی کوڕەکەی بدۆزێتەوە، بەڵام هیچی دەست نەکەوت.
رێورەسمەکە لە بیست کیلۆمیتر دوورلە ماکۆندۆ لە بن سێبەرەداری گەورەی سیئبا[1] بەڕێوە چوو. شوێنێک کە دوایی شاری نیر لاندیای لێ دروست کرا.
دەستەیەک لە قوتابیی بە هاتوهاوار و سپیپۆش کە وەک دەستەکۆتری هەڵاتوو لەبەر باران دەهاتنە بەرچاو، لە نوێنەرانی دەوڵەت و حیزب و کۆمیسیۆنی شۆڕشگێڕان، کە چەکەکانیان تەسلیم کردبوو، پێشوازییان کرد.

---

[1]- سیئبا- جۆرەدارێکی گەورە کە لە ئارژانتین و کولۆمبیا دەڕوێ.

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە سواری هێسترێکی قوڕاوی گەیشتێ. ریشی نەتاشیبوو و لە ژانی زامەکانی بن هەنگڵی لە شکستی گەورەی ئاواتەکانی زۆرتر ئازاریان دەدا. گەیشتبووە کۆتایی ئاواتەکانی، ئەوپەڕی شانازی و ئارەزووی شانازی. بە دەستووری ئەو، نە مۆسیقا هەبوو، نە ئاگربازی، نە لێدانی ناقووسی کڵێسا و نە هاواری سەرکەوتن "هەر وێنەگرێکی گەڕۆک، کە قەرار بوو تەنیا وێنەیەک بگرێ کە لەو بەجێ دەمێنێ، ناچار بوو پێش شوشتنەوەی وێنەکە، شووشەکانی بشکێنێ".

رێوڕەسمەکە تەنیا بۆ ماوەی پێویستی مۆرکردنی بەڵگەنامەکان درێژەی کێشا. لە چادرێکی پینەکراوی سێرکدا، ئەو ئەفسەرانەی کە بە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وەفادار مابوونەوە، لە دەوری مێزێکی دێهاتیدا کۆبوونەوە. پێش مۆرکردن نوێنەری سەرکۆمار دەیویست راگەیەندراوی خۆبەدەستەوەدان بە دەنگێکی بەرز بخوێنێتەوە. بەڵام سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا رێگەی نەدا و وتی: "چاکترە کاتی خۆمان بەو تەشریفاتە نەگرین." ئەوجار بێ خوێندنەوەی لاپەڕەکان خەریک بوو مۆریان کا. یەکێ لە ئەفسەرەکان بێدەنگیی گرژی چادرەکەی شکاند و وتی: "جەناب سەرهەنگ ئەو چاکەمان لەگەڵ بکە و راوەستە هەوڵێ ئەوان مۆری بکەن."

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا قبووڵی کرد، کاتێ کاغەزەکان لە بێدەنگییەکدا کە دەنگی قەڵەم بە سەر کاغەزدا دەبیسرا، بە دەوری مێزەکەدا گەڕا. هێشتا سەرەوەی کاغەزەکان سپی بوو. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئامادەی مۆرکردن بوو.

یەکێکی دیکە لە ئەفسەرەکان وتی: "هێشتا دەرفەتی پاشگەزبوونەوە ماوە."

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، بێ ئەوەی رەنگی بگۆڕێ،لاپەڕەی یەکەمی مۆر کرد. هێشتا ئاخر وەرەقەی مۆر نەکردبوو، ئەفسەرێکی شۆڕشگێڕ هێسترێکی بەباری دوو سندووقەوە بە دوای خۆیدا رادەکێشا، گەیشتە پێش چادرەکە. لەگەڵ ئەوەشدا گەنج بوو، رواڵەتێکی وشک و قیافەیەکی خۆگری هەبوو. لە شۆڕشی مەڵبەندی ماکۆندۆدا خەزێنەدار بوو. قاترەکەی، کە کە خەریکبوو برسان بتۆپێ، لەو سەفەرە سەختە شەش رۆژەدا بە دوای خۆیدا راکێشابوو، هەتا بەوەخت بگاتە رێوڕەسمەکە. سندووقەکانی هێنایە

خـواردن و بە نالەبـاری دەرگاکـانی کـردنەوە و حەفتـاو دوو خشـتی زێـڕی یەک بە یەک لە سەر مێزەکە دانا. هیچ کەس ئەوەندە سامانەی نەدیبوو. لە کاتی قەیرانی ساڵی ئاخر، کاتێ هێزەکانی ناوەندی لە بەر یەک بڵاوببوون و شۆڕش لە بەر مل بە ملەی فەرماندەکانی لە بەریەک هەڵوەشابوو، کەس ئامادە نەبوو بەرپرسایەتی بەئەستۆ بگرێ، تەڵای شۆڕشیان تواندبۆوە و بە شیوەی کردبووییاننە خشتی داڕێژراو و رووکەشێکی سەفالی کوڵیویـان بە سـەردا کردبـوو، شـتێک نەبـوو بناسـرێتەوە. سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بویندیا دەســــتووری دا ئەو حەفتــــا و دوو پــــارچە تەڵایەش لە پەیماننــــامەی تەسـلیمەکەدا بنووسـن و ئەوجـار بـێ ئەوەی ئیجـازەی وتارێـک بـدا، رێورەسمەکەی کۆتـایی پێ هێنـا. لاوە پیسـکەڵە رووبەرووی ئەو راوەسـتاو و چاوە کاڵەکانی لە چاوی ئەو بڕی.

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا پرسی: "چی ترت دەوێ؟"

سـەرهەنگی لاو ددانەکـانی بە سـەریەکدا گـرتن و وتـی: "نووسـراوی وەرگرتنم بدەیە."

سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بویندیا قەباڵەی وەرگرتنەکەی نووسی و پەرداخێکی ئاوی لیمۆ خواردەوە و بیسکویتێکی، کە تازە سەربازان دەیا گێڕا، خـوارد و دوایی رۆیشتە ئەو چادرەی کە بۆ حەسانەوەی ئەویان هەڵدابوو.

کراسـەکەی لە بەر خـۆی دەرهێنـا و لە سـەر لێـواری تەخـتە سـەفەرییەکە دانیشت. سەعات سێ و چارەگێکی دوای نیوەڕۆ دەمـانچە حەوت تیـرەکەی دەست دایە و تەنیا گوللەکەی بە سینگی خۆیەوە نا، درووست بە نێوەڕاستی ئەو بـازنەی کە پزیشـک بە لـۆکەی یـوداوی لە سـینگی کێشـابووی. هەر لە هەمان کاتدا لە ماکۆندۆ، ئۆرسـۆلا لە ئاشـپەزخانە لەوە کە بـۆچی شـیرەکەی ناکولێ، سەری سوورمابوو و سەری قابڵەمەی هەڵگرت.

قابڵەمەی شیری پڕ کرم بوو.

بە سەرسوڕمانەوە وتی: "ئۆرلیانۆیان کوشت."

بە عـادەتی تەنیـایی خـۆی چـاوێکی لە حەوشـە کـرد و چـاوی بە خـۆزێ ئارکادۆ بویندیا کەوت، کە لە بەر بارانێ تلیساوەتەوە و زۆر لەو کاتە پیرتـر

دیار بوو کە مردبوو، لە ژێر داربەڕووەکە دانیشتووە. ئۆرسۆلا پێیگوت: "لە پشتەوەڕا تەقەیان لێ کرد تەنانەت چاویشیان نەبەست."
لای رۆژئاوابوون، لە نێوان پەردەی فرمێسکدا، چاوی بە ئالقەنووری نارنجی رەنگ کەوتن کە وەک هەڵم بە ئاسماندا دەڕۆیشتن.لای وابوو نیشانەی مردنە. هێشتا لە ژێر داربەڕووەکە لە سەر رانی مێردەکەی فرمێسکی دەڕشت، کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایان لە نێو پەتوویەک دا هێنایەوە ماڵەوە ، زۆری خوێن لەبەررۆیشتبوو و وشک و رەق هەڵاتبوو. لە مەترسیی مردن رزگاری ببوو، گوللە وەها راست چووبووە دەری کە پزیشک توانی پلیتەیەکی یوداوی بە سینگیدا بەرێ و لەپشتی دەری کێشێتەوە. بە خۆشییەوە پێیگوت: "ئەوە شاکاری من بوو. ئێرە تەنیا نوختەیەکە کە گوللە بێ ئەوە زیانێک بگەیەنێ، دەیتوانی دەربچێ."
سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا زانی کە دەوروبەری دەستەیەک قوتابی خزمەتگوزار گرتوویانە کە بۆ لێخۆشبوونی رووحی ئەو بە ناهۆمێدی سروودان دەخوێننەوە. بەداخ بوو لەوە کە بۆچی هەروەک لە بنەڕەتدا خەیاڵی هەبوو، لانیکەم بۆ گاڵتەکردن بە پێشبینی خاڵی وەرەقی پێلار تێرنێرا، دەبووایە گوللەکەی لە زاری خۆیدا نەتەقاندوە.
بە پزیشکی وت: "ئەگەر هێزم دەبەردا مابا، دەستوورم دەدا دەسبەجێ گوللەبارانت بکەن، نە لە بەر ئەوە ژیانت رزگار کردم، بەڵکو لە بەر ئەوە کە گاڵتەت پێکردم و فریوت دام."
سەرکەوتن بە سەر مردندا، لە ماوەی چەند سەعات دا ئابرووی لەدەست چووی بۆ گەڕاندەوە. هەر ئەو کەسانەی بوختانیان پێدەکرد و دەیانگوت شەڕی بە ژوورێک فرۆشتووە کە دیوارەکانی ئاڵتوونن، هەوڵی خۆکوشتنی ئەویان بە کردەوەیەکی شەرافەتمەندانە لە قەڵەم دا و بە پیاوێکی پاکیان زانی، دوایی، کاتێک نیشانەی شیاوی کە سەرکۆمار وەک خەڵات بۆی لەبەر چاو گرتبوو، رەت کردەوە، تەنانەت سەرسەختترین دوژمنەکانیشی لە ژوورەکەیدا ریزیان گرت، هەتا ئەو شەڕبڕانەوەی بە رەسمی نەناسن و شەڕێکی نوێ دەست پێ بکەنەوە.

ماڵ لە دیاری، کە بۆ تێهەڵێنانەوە نێردرابوو، ئاخندرا. سەرەنجام،سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، بە پشتیوانی هاوسەنگەرەکانی پێشووی و بۆ پێ خۆشحاڵیی ئەوان، ئیمکانی شتێکی ئەوتۆی حاشا نەکرد. تەنانەت کاتێ گەیشت کە دەست پێکردنی شەڕێکی تازەی وەها ئەوی هێنایە سەر زەوت، کە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز هاتە سەر ئەو باوەڕەی چاوەڕوانی بیانوویەکە هەتا دەست پێکردنی شەڕێکی تازە راگەیەنێ. بیانوو دەست کەوت. سەرکۆمار لە دانی مووچەی ئەفسەرانی خانەنشینی شەڕ ، چ ئەوانەی ئازادیخواز بوون و چ ئەوانەی پارێزەر، خۆی پاراست، هەتا ئەو کاتە کۆمیسیۆنێکی تایبەتی بە وەزعی ئەوان رادەگەیشت و قانوونی پێویست لە پارلمان پەسند دەکرا. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە نەڕاندن وتی: "ئەوە دەستدرێژییە، ئەو کۆمەڵە لە چاوەڕوانی گەیشتنی پۆستدا پیر دەبن و دەمرن." بۆ یەکەم جار لە سەر ئەو کورسییە راحەتییە، کە ئۆرسۆلا بۆ دەورەی ناسازیی ئەو کڕیبووی، هەستا و هەروا کە لە نێو ژوورەکە قەدەمی لێ دەدا پەیامێکی چاونەترسانە و بێ پەروای بۆ سەرکۆمار نووسی. لەو تێلگرافەدا،کە هەرگیز بڵاو نەکرایەوە، ئەو سەرپێچی لە هەوەڵین مەرجی پەیمانی نیرلاندیا بیر خستەوە و هەڕەشەی کرد کە ئەگەر لە ماوەی دوو حەفتەدا وەزعی خانەنشینی ئەو کۆمەڵە روون نەبێتەوە، شەڕ رادەگەیەنێ. بە بڕوای ئەو ئەو کارە هێندە عادڵانە بوو ، تەنانەت هیوادار بوو خەباتگێڕانی پێشووی حیزبی پارێزەرانیش لەو پشتیوانی بکەن، بەڵام تەنیا وەڵامی دەوڵەت لەو بارەوە ئەوە بوو کە ژمارەی پاسەوانەکانی، کە بە بیانووی پارێزگاری کردن لە ماڵی ئەو دانرابوون زۆر کرد و هەر جۆرە چاوپێکەوتنێکی ئەوی قەدەغە کرد. لە سەرتاسەری وڵاتیش، بۆ فەرماندەکانی دیکەش، کە پێویستییان بە چاوەدێری هەبوو، وەزعێکی بەو شێوە لە بەرچاو گیرا. ئەو کردەوانە ئەوەندە لە کاتی خۆیدا و بە کەڵک بوون کە دوو مانگ دوای کۆتایی شەڕ، کاتێ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بەتەواوی چاک بۆوە، باشترین هاوبیرانی ئەو یان دوور خرابوونەوە یان مردبوون یان لە کاروباری دەوڵەتی وەلا نرابوون.

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە مانگی دێسەمبەردا ژوورەکەی خۆی بەجێ هێشت. چاوێک لە هەیوان بەسبوو تا بیر لە شەڕ نەکاتەوە. ئۆرسۆلا بە کۆششێکی کە لە تەمەن و ساڵی ئەو دوور بوو، ماڵەکەی دیسان نوێ کردبۆوە. کاتێ زانی کوڕەکەی دەژی وتی: "ئێستا بە هەمووان پێشان دەدەم من کێم. لە هەموو دونیا ماڵێک وەک ئەو ماڵە، شێتانە دەرگای ئاوەڵا نابێ." ماڵەکەیان شۆردەوە و ڕەنگیان کرد و مۆبلەکانیان گۆڕی. بە باخەکەدا هات و گوڵی تازەی لێ چاندن، دەرگا و پەنجەرەکانی ئاوەڵا کرد هەتا هەتاوی گەرمی هاوین بگاتە ژوورەکانی خەو و، پرسە زۆرەکانی کۆتایی پێ هێنا و جل و بەرگە کۆن و ڕەشەکانی بە لیباسی شاد و نوێ گۆڕییەوە.

مۆسیقای پیانۆلا جارێکی دیکەش دەماڵێ گەڕا. ئامارانتا، بە بیستنی دەنگی موسیقا دیسان کەوتەوە بیری پیترۆکریسپی. گوڵی یاسەمینی شەوانەی ئەو بۆنی ئۆدکلۆنی پیترۆکریسپی وەبیر هێناوە و لە نێو دڵی سیس بووی، رقێکی نوێی هەست پێکرد کە زەمان مشتوماڵی کردبوو و خاوێنی کردبۆوە. پاشنیوەڕۆی ڕۆژێک، ئۆرسۆلا خەریکی ڕێکوپێککردنی ساڵۆنێ بوو، لە پاسەوانەکانی بەر دەرگای ماڵەوە یارمەتیی ویست. فەرماندەی لاو ئیجازەی پێدان. ئۆرسۆلا بەرەبەرە ئەرکی دیکەشی پێ ئەسپاردن، بۆ شام و نەهار بانگهێشتی دەکردن و کەوش و لیباسی پێدەدان و خوێندن و نووسینی فێر دەکردن. کاتێک دەوڵەت ئەوانی لە نیگابانی ماڵەکە هەڵگرت، یەکێک لەوان زۆر ساڵان مایەوە لەوێ خزمەتی کرد. بەرەبەیانی ڕۆژی ساڵی تازە، لاشەی بێ گیانی فەرماندەی لاویان، کە لە بەر بێ موبالاتی ڕێمیدیۆسی جوانکیلە شێت ببوو، لە بەر پەنجەرەی ئەو دۆزییەوە.

چەند ساڵ دواتر ئۆرلیانۆی دووهەم، لە حاڵی مردندا، ئەو پاشنیوەڕۆ بارانییەی بیر کەوتەوە کە بۆ چاوپێکەوتنی هەوەڵین کوڕی پێی نایە ژووری خەوتن، مناڵێکی ڕیوەڵەی بە واقە واق بوو، بچکۆڵەترین نیشانێکی بنەماڵەی بویندیای لێ دیار نەبوو، بەوحاڵەش بۆ ناونانی مناڵەکەی دڵاودڵی نەکرد.

وتی: "ناوی دەنێم خۆزێ ئارکادیۆ."

فێرناندۆ کارپیۆ،[1] ژنە جوانەکە، کە ساڵی پێشتر زەماوەندی لەگەڵ کردبوو، رازی بوو، بەڵام ئۆرسۆلا نارەحەت بوو. لە مێژووی درێژی بنەماڵەدا، لە دووپاتبوونەوەی ناوەکان گەیشتبووە ئەنجامێک کە لای وابوو بێ ئەولاو ئەولایە ئۆرلیانۆکان هەموویان کۆشا و بەهۆش بوون، خۆزێ ئارکادیۆکان بزۆز و چاونەتەس بوون و هەموویان نیشانەی مەرگیان پێوە دیار بوو، ئەو شتە تەنیا لە بارەی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم و ئۆرلیانۆی دووهەم راست نەدەهاتەوە، ئەو دووانە ئەوەندە وەک یەک دەچوون و لە منالّیدا ئەوەندە شەیتان بوون، کە دایکیان سانتا سۆفیا دێلا پێدادیش نەیدەتوانی لێکیان کاتەوە. ئەو رۆژەی کە ئەوانیان (غسل تعمید) دەدا. ئامارانتا هەریەکەی دەسبەندێکی لە دەستی کردن کە ناوی خۆیانی لە سەر نووسرابوو و هەر یەکە جۆرە لیباسێکی دەبەر کردن پیتی هەوەڵی ناوی خۆیانی لێ دوورابوو. ئەو کاتەی تازە چووبوونە قوتابخانە، دوو منالّەکە بڕیاریان دا لیباس و دەسبەندەکان لەگەڵ یەک بگۆڕنەوە و هەر یەک ئەوی دیکە بە ناوی خۆی بانگ بکا. مامۆستای قوتابخانە، میلچوراسکالۆرنا، کە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی بە کراسە سەوزەکانییەوە دەناسییەوە، کاتێ زانی کە دەسبەندی ئۆرلیانۆی دووهەمی لە دەست دایە و، ئەوی دیکەیان، لەگەڵ ئەوەشدا کە کراسی سپی پۆشیوە و دەسبەندی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی لە دەست دایە و دەڵێ کە ئۆرلیانۆی دووهەمم، هێندەی نەمابوو شێت بێ. لەوەدوا ئیتر هیچ کەس دڵنیا نەبوو کە کامیان، کامیانە، تەنانەت ئەو کاتەش کە گەورە بوون و ژیان لێکی جیاکردنەوە.

ئۆرسۆلا بیری کردەوە، کە رەنگە خۆشیان لەو دیارییە ئالۆز و بادراوەدا بۆ دەمێک تووشی هەڵە هاتبن و بۆ هەمیشە لەگەڵ یەک گۆڕابن. هەتا ساڵەکانی سەرەتای بلووغ وەک دوو دەزگای قورمیش بەوردی کاریان دەکرد، هەردووک لە یەک ئاندا بەیەکەوە لە خەو هەڵدەستان، لە یەک ئاندا بەیەکەوە بۆ لای ئاودەست رایاندەکرد و، لە یەک ئاندا بە یەکەوە نەخۆش دەبوون، تەنانەت ئەو خەونانەی دەیانبینی یەک بوون. لە ماڵەوە وایاندەزانی کە ئەو دوو منالّە کارەکانی خۆیان بۆیە بەتایبەتی بەو جۆرە

[1]- Fernando Carpio

هاوکات جێبەجێ دەکەن، هەتا ئەوانی دیکە گێژ کەن، هیچ کەس راستییەکەی بۆ نەزانرا هەتا رۆژێک سانتا سۆفیا دێلا پێداد لیوانێکی لیمونادی دا بە یەکێک لەوان، لەگەڵ ئەوە کە ئەو لێی چێشت ئەویتریان وتی شەکری کەمە، سانتا سۆفیا دێلا پێداد لە راستیدا لە فکری چووبوو شەکری تێبکا. رووداوەکەی بۆ ئۆرسۆلا گێڕایەوە و ئۆرسۆلا بە بێ ئەوەی سەری سوڕ بمێنێ، وتی: "هەموویان ئاوان، بەشێتی لەدایک دەبن." بە تێپەڕبوونی زەمان لە ئاڵۆزیی ئەو مەسەلەیە کەم بۆوە. ئەو کوڕەی کە لەو یارییە گێژاوییەدا بە ناوی ئۆرلیانۆ هاتەدەر، وەک باپیری هەیکەل گەورە و ئەوی دیکە کە بە ناوی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم مایەوە، وەک سەرهەنگ لاواز بوو. تەنیا حاڵەتی هاوبەشیان، تەنیایی بنەماڵەیی بوو. رەنگە وەزعی لەش و رەوشتی ئەوان بوو ،کە ئۆرسۆلای هێنابووە سەر ئەو باوەڕەی ئەوان لە زەمانی منالییەوە وەک دەستە وەرەقێک تێکهاڵابوون و لەگەڵ یەک گۆڕاون.

جیاوازیی ئاخری ئەوان لە نێوەڕاستی شەڕدا ئاشکرابوو. کاتێ خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم تکای لە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز کرد بۆ سەیری بەڕێوەچوونی حوکمێکی ئیعدامی بەرێ، هەر چەند ئۆرسۆلا دژی داواکەی بوو، تکاکەی جێبەجێ کرا. بەپێچەوانەوە، ئۆرلیانۆی دووهەم لە ترسی خەیاڵی بەشداربوون لە رێوڕەسمی ئیعدامدا لەرزی گرت و لە ماڵەوە مایەوە. کاتێ بوو بە دوازدە ساڵە، لە ئۆرسۆلای پرسی ئەو ژوورەی دەرگای قفڵ کراوە چی تێدایە؟ ئۆرسۆلا لە وەڵامی ئەودا وتی: "کاغەز و کتێبەکانی میلکیادێس، ئەو شتە سەیر و سەمەرانە کە لە کۆتایی تەمەنیدا دەینووسین." ئەو وەڵامە لە جێگای ئەو دیمناڵەکە قەناعەت پێ بێنێ، کۆڵینەوەی زۆرتر کرد، ئەوەندەی پێداگرت و بە شۆق و زەوقێکەوە بەڵێنی دا کارێکی بە کتێب و کاغەزەکانی نەبێ، هەتا ئۆرسۆلا کلیلی دەرگای ژوورەکەی دایە. لەو کاتەوە لاشەی میلکیادێسیان لەو ژوورە بردبووە دەرێ و دەرگایان قفڵ کردبوو کەس پێێ تێ نەنابوو. قفڵی دەرگاکە ژەنگی هێنابوو، بەڵام کاتێک ئۆرلیانۆی دووهەم پەنجەرەکانی کردەوە نوورێکی ئاشنا هاتەژوورەوە و هەروەک عادەتی بێ هەموو رۆژێ ئەو ژوورەی

رووناک کاتەوە. بچووکترین نیشانەی تۆز و خۆڵ و تاری جاڵجاڵووکەی لێ نەدەبینرا، هەموو شوێنێک خاوێن بوو، زۆر خاوێنتر لەو رۆژەی مێلکیادێسیان ناشتبوو، مەرەکەب لە دەوات دا وشک نەببوو.
ئاسنەواڵەکان، هەرچەند ژەنگیان گرتبوو ، بریسکانەوەیان هەر مابوو. ئاگری ژێر ئەنبیق، ئەو جێگایەی کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا جیوەی لێ بوخار کردبوو، نەکوژابۆوە. کتێبەکان بە بەرگی مقەوایی و کەمرەنگ وەک پێستی بەدەنی ئینسان لە کتێبخانەدا دەبیندران و، نووسراوەکان لە شوێنی خۆیان دەستیان لێ نەدرابوو. هەرچەند ساڵەها بوو دەرگای ژوورەکە نەکرابۆوە، بەڵام هەواکەی لە بەشەکانی دیکەی ماڵەوە خاوێنتر دەهاتە بەرچاو. هەموو شتێک ئەوەندە تازە بوو کە کاتێک ئۆرسۆلا چەند حەفتە دوایی بە سەتڵێک ئاو و گەسک رۆیشتە ژووری، ئەرزەکەی بشوا، تەماشای کرد هەموو شتێک ئەوەندە خاوێنە پێویستی بە خاوێن کردنەوەنییە.
ئۆرلیانۆی دووهەم نوقمی خوێندنەوەی کتێبێک بوو. کتێبەکە بەرگی نەبوو و سەردێڕەکەشی لە هیچ جێگایەک دیار نەبوو، بەوحاڵەش کوڕیژگە خوێندنەوەی داستانی ژنێکی، کە لە سەر مێزیک دانیشتووە و دەنکە برینجان بە نووکی دەرزی هەڵدەگرێتەوە و دەدەمی داوێ، کەوتبووە بەردڵ. لە داستانی پیاوێکی ماسیگر کە کوتەئاسنێک لە دراوسییەکەی وەردەگرێ، بە تورەکەیەکەوە هەڵیدەوەسێ و دوایی بۆ سپاس لە جیرانەکەی ماسییەکی دەداتێ کە لە نێو زگی ماسییەکەدا ئەڵماسێک دەبیندرێتەوە، لە داستانی چرایەک کە هەموو ئاواتەکان دێنێتەدەی و، لە داستانی قالیچەی سولەیمان واقی ورما. لە ئۆرسۆلای پرسی کە ئایا ئەو داستانانە راستین؟، ئۆرسۆلا لە وەڵامدا وتی کە ساڵەها پێشتر کاولییەکان چرای جادوو و قالیچەی پەرەندەیان هێنابووە ماکۆندۆ. دوایی هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: 'راستییەکەی ئەوەیە کە دونیا هێدی هێدی کۆتایی دێ. ئێستا ئیتر ئەو شتانە بۆ ئێرە ناهێنن."
ئۆرلیانۆی دووهەم کاتێ کتێبەکەی تەواو کرد، چەند داستانێک چونکە لاپەڕەکانی کەوتبوون، کۆتاییان نەبوو، ئەوجار خەریکی ئاشکراکردنی

نهێنیی نووسراوەکان بوو. کارێک بوو کە نەدەکرا، پیتەکان وەک ئەو لیباسانە دەچوون کە بۆ وشککردنەوەی بە تەنافێکی ئاسندا هەڵاوەسرابن، زۆرتر وەک نۆتی کۆسیقا دەچوون هەتا نووسراوێکی ئاسایی. لە پاشنیوەڕۆیەکی یەکجار گەرم ، کە نووسراوەکانی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد، هەستی کرد لە ژوورەکەدا تەنیانییە. لە بەرامبەر شۆقی پەنجەرە میلکیادێس هەردوو دەستی لە سەر ئەژنۆیان داناوە و دانیشتووە، تەمەنێک لە چل ساڵیش کەمتر بوو. هەمان نیوتەنە کۆنەکەی پۆشیبوو و کڵاوەکەی هەمان کڵاوێک بوو کە بە باڵی قەلەڕەشە دەچوو. ڕۆنێکی کە لە بەر تینی گەرما لە مووەکانی دەچکایەوە، بە لاجانگە کاڵەکانیدا دەهاتە خوارێ. ڕاست وەک ئەو کاتە بوو کە ئۆرلیانۆ و خۆزێ ئارکادۆ بە منالی ئەویان دیتبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم دەسبەجێ ناسی. ئەو بیرەوەرییە میراتییە لە نەوەیەکەوە گەیشتبووە نەوەیەکی دیکە و لە ڕێگای باپیرییەوە بەو گەیشتبوو.

ئۆرلیانۆی دووهەم وتی: "سەلام."

میلکیادێس وەڵامی دایەوە: " سەلام لاوە."

لەوەدوا، هەتا چەند ساڵان هەموو ڕۆژێ پاشنیوەڕۆیان چاویان بە یەک دەکەوت، میلکیادێس لە شتانی سەیری جیهان بۆی باس دەکرد و هەرچەند پێی خۆش بوو زانستی کۆنی فێر کا، بەڵام ئامادە نەبوو نووسراوە ئاماژەییەکانی بۆ وەرگێڕێ، وتی: "تا زەمانێک کە کابرا نەگاتە سەد ساڵی نابێ مانای ئەوە ئاشکرا بکا." ئۆرلیانۆی دووهەم نهێنیی ئەو چاوپێکەوتنانەی هەرگیز بۆ کەس ئاشکرا نەکرد. جارێک هەستی کرد دونیای لێ وێران دەبێ، چونکە کاتێک میلکیادێس لە ژوورەکە بوو، ئۆرسۆلا هات، بەڵام ئەو مێلکیادێسی نەدیت.

پرسی: "لەگەڵ کێ قسەت دەکرد؟"

ئۆرلیانۆی دووهەم وتی: "لەگەل هیچ کەس."

ئۆرسۆلا وتی: "باپیریشت هەروابوو. ئەویش وەک تۆ لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد."

لەم نێوەدا خـۆزێ ئارکـادیۆی دووهەم ڕێوڕەسـمی گوللەبـارانێکی دیبـوو. بریسـکانەوە شـینی شـەش گولله ویکرا و دەنگدانەوەی لە کێـو و ڕوانینـی خەمبار و تاساوی کابرای گوللەباران کراوی هەتا کۆتایی تەمەنی فەرامۆش نەکـرد. پیـاوەکە هەروا کە بە پێـوە ڕاوەسـتابوو، ورده ورده کراسـەکەی لە خوێندا شەلاڵ بوو و، دوایی کاتێ دەستیان کردەوە و لە سـندووقێکی پڕ لە قسـڵیان هاویشت بزەی سەرگۆشـەی لێوی هەر مـابوو. خـۆزێ ئارکـادیۆی دووهەم وایزانـی: "زینـدووه و بە زینـدوویی دەینێـژن." دیتنـی گوللەبـاران ئەوەنـدە بە قـوولی کـاری تێکـرد، کە لەوەدوا لە نیـزامیگەری و شـەڕ بێزارییەکی سەیری پەیدا کرد، نە لە بەر گوللەباران کردنی مەحکوومەکان، بەڵکو لە بەر خـاتری زیندەبەگۆڕکردنی مەحکوومەکان. هیچ کەس نەیزانـی کە لە چ کـاتێکەوە دەسـتی کـردووە بە لێدانی ناقووسـان و پەروەردەکردنـی کەڵەشیری شەڕکەر، لە ماڵی قەشەئەنتۆنیۆ ئیزانێک لە نزیک کڵێسـا بـوو و، دەسـتی بە یارمەتیـدانی قەشـە کـرد. کاتێـک سـەرهەنگ خرینیلـدۆ مـارکیز ئەوەی زانی ئەوی سەرزەنشت کرد، چونکە خەریکی کارێک ببوو کە دژی باوەڕی حیزبی ئازادیخواز بوو. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم لە وەڵامدا وتـی: "ڕاستی وا بیر دەکەمەوە کە بوومەتە پارێزەر." ئەوەنـدە بە قسـەکەی خـۆی بـاوەڕی هەبـوو کە دەتگوت چارەنووس بـۆی دیـاری کـردووە. سـەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بە پەرێشانی مەسەلەکەی بۆ ئۆرسـۆلا گێڕایەوە.

ئۆرسـۆلا سـەلماندی کە: "باشـتر، خـۆزگە دەبـوو بە قەشـە، بەڵکـو خـوا بەوشێوەیە ڕێی بکەوێتە ئەو ماڵەوە."

زۆری پێ نەچوو، زانیان قەشە ئەنتۆنیۆ ئیزابێل خەریکە خـۆزێ ئارکـادیۆی دووهەم بـۆ ڕێوڕەسـمی (غسـل تعمیـد) ئامـادە دەکـا. هەر لەو کـاتەی ملـی کەڵەشێرەکانی شەڕی دەتاشی، فێری ئوسوڵی دینیشـی دەکـرد، مریشـەکانی لە قەوزە دەکـرد وبە مەتەڵـی سـاکار بـۆی ڕوون دەکـردەوە کە چـۆن لە ڕۆژی دووهەمی پەیدابوونی جیهان بە بیری خوایدا هـات جووجکە دەبێ لە هـێلکەدا دروسـت بـێ. لەو زەمـانەدا بـوو نیشـانەی شـێتیی پیـری لە قەشـە دەرکەوت. شێتییەک کە چەند ساڵ دوایی بـوو بە هـۆی ئەوەی بڵـێ شـەیتان لە شەڕی خۆی لەگەڵ خـودا ڕەنگە سـەرکەوتبێ و، ئێسـتا شـەیتان لە سـەر

تەختی خوایی دانیشتووە. بێ ئەوەی خۆی بناسێنێ لەوێ دانیشتووە هەتا نەزانان لە داو بنێ. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم، لە ژێر کارتێکردنی هاودەمی زۆری لە ماوەی چەند مانگاندا ڕێبازی ئایینی بۆ فریودانی شەیتانیش بەو لیزانییە فێر بوو، کە کەڵەشێری شەڕی پێ پەروەردە دەکرد. ئامارانتا دەستێک لیباسی کەتانی بە یەخە و کراواتی هێنا و جووتێک کەوشی سپیی بۆ کڕی و ناوی ئەوی بە بەنی زێرکفت لە سەر رووبانی شەم گوڵدۆزی کرد. دەرگای کلیاسی لە سەر خۆی و ئەو داخست، هەتا (بە یارمەتیی ریزی گوناحان) راستی لێ وەربگرێ. ریزی تاوانەکان ئەوەندە درێژ بوو کە قەشەی پیر،کە وەختی ئاسایی سەعات شەش دەخەوت، پێش تەواوبوونی ریزەکە لە کورسییەکەیدا خەوی لێکەوت. ئەو لێپرسینەوە بۆ خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم تازە بوو. کاتێ قەشە لێی پرسی کە لەگەڵ ژنان ئەو کارانەی کردووە، سەری سوڕ نەما و بەڕاستی وەلامی نای دایەوە. بەلام بە پێچەوانە کاتێ پرسی: "لەگەڵ حەیوانات چی؟ " ئەو نارەحەت بوو. هەوەڵین هەینی مانگی مای ڕێوڕەسمی (غسل تعمید) بە دڵەکزەیەکی کوشندەی ئەو بەڕێوە چوو. ماوەیەک دوایە، هەر ئەو پرسیارەی لە پیترۆنیۆ کرد، قوتابییەک کە بیچمێکی ناحەزی هەبوو لە بورجی ناقووسی کڵێسادا دەژیا و دەیانگوت گۆشتی شەمشەمەکوێرە دەخوا. پیترۆنیۆ وەلامی دایەوە: "کەسانێکی لاڕێ هەن کە ولاغ زەحمەت دەدەن!" خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم ئەوەندەی لێ کۆڵییەوە و ئەوەندە لەو بارەوە پرسیاری کرد، پیترۆ نیۆ تاقەتی چوو و راستیی وت کە: "من هەموو سێشەممۆیان دەڕۆم: ئەگەر قەولم پێ بدەی بە کەس نەڵێی، سێشەممەی داهاتوو لەگەڵ خۆمت دەبەم."

سێشەممەی داهاتوو، پیترۆ نیۆ بە چوارپایەکی پایەبەرزی دار کە هەتا ئەو کاتە کەس نەیدەزانی بۆچی بەکار دێ، لە بورجی ناقووس ڕۆیشتەدەرێ و خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی بردە مێرگێک لەو نزیکانە. کوڕێژگە ئەوەندە گەڕانی ئەو شەوانەی پێ خۆش بوو کە زۆری کێشا، هەتا پێی بە مەیخانەی کاتارینۆ کرایەوە.

خەریکی پەروەردەکردنی کەڵەشێری شەڕکەر بوو، هەوەڵین جار کە بە کەڵەشێرە جوانەکانییەوە هاتەوە ماڵ، ئۆرسۆلا دەستووری پێدا کە: "ئەو حەیوانانە بەرە بۆ شوێنێکی دیکە، لەو ماڵەدا بەڕادەی پێویست لە دەست کەڵەشێری شەڕکەر بەدبەختیمان دیوە، ئیتر پێویستنییە تۆش گیروگرفتمان بۆ زیاد بکەی." خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم بێ گێرەوکێشە کەڵەشێرەکانی لەوێ لابردن، بەڵام درێژەی بە پەروەردەکردنی ئەوان لە ماڵی نەنکی پیلار تێرنێرا دا. پیلار تێرنێرا بۆ ئەوەی ئەو لە لای خۆی رابگرێ، هەرچی ویستبای بۆی جێبەجێ دەکرد. بەزوویی کەڵەشێرەکانی خۆی لە مەیدان بەشەڕ دا و زانستێکی، کە لە قەشەئەنتۆنیۆ ئیزابێل فێری ببوو، بەکاری هێنا، ئەوەندەی پارە دەست کەوت کە نەتەنیا توانی پەروەردەکردنی کەڵەشێرانی شەڕکەر پەرە پێ بدا، بەڵکو تەنانەت هەوەسی پیاوەتیی خۆیشی دامرکێنێتەوە. ئۆرسۆلا ئەوی لەگەڵ براکەی بەراورد دەکرد و نەیدەزانی کە بۆچی ئەو دووانە کە لە منالّیدا دەتگوت یەک کەسن، لە گەورەییدا هێندە لە یەک جیاوازن. سەرسووڕمانەکەی زۆری نەخایاند، ئۆرلیانۆی دووهەمیش بەزوویی دەستی بە تەمبەڵی و ئەبلەخەرجی کرد. هەتا کاتێ لە ژووری مێلکیادێس بوو، پیاوێکی لە خۆیدا و تەنیا بوو، دروست وەک دەورانی گەنجییەتی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا. بەڵام زۆری بۆ پەیماننامەی نێرلاندییا نەمابوو کە رووداوێک ئەوی لە گۆشەگیری دەرهێنا و لە بەرامبەر جیهانی راستیی دانا. ژنێکی لاو، کە بۆ لۆتەرییەکی ئۆکوردیۆن بلیتی دەفرۆشت، زۆر بەخۆش و بێژ لەگەڵی رووبەروو بوو. ئۆرلیانۆی دووهەم پێی سەیر نەبوو، چونکە زۆر جار پێیان وابوو براکەیەتی، بەڵام ئەوجاریان، تەنانەت کاتێ کچە دەیویست بە گریان و هاوار دڵی نەرم کا، تێکۆشا هەڵەکەی راست کاتەوە. کچە بردییە ژوورەکەی خۆی و هەر بەو هەوەڵ جارە ئەوەندەی خۆش ویست کە کارێکی کرد لەو بەخت ئەزموونەدا ئۆکوردیۆنەکە بەرێتەوە. دوو حەفتە دوایی ئۆرلیانۆی دووهەم زانی کە کچە هەم لەگەڵ ئەو، هەم لەگەڵ براکەی ئەویندار دەکا و لای وایە هەر دووکیان کەسێکن. لە جیاتی ئەوە جەریانەکەی پێ بڵێ، ئەو شتەی درێژ کردەوە. نەگەڕایەوە ژوورەکەی

میلکیادیس. دوانیوەڕۆیان لە حەوشـە دەمـایەوە و لەگەڵ هـات و هـاواری ئۆرسـۆلای تێدەکۆشـا لە ڕێگـای گوێـوە لێـدانی ئۆکۆردیـۆن فێـر بـێ. لەو زەمانەدا ئۆرسۆلا لە بەر پرسە، لێدانی مۆسیقای لە ماڵەوە قەدەغە کردبوو و سەرەرای ئەوەش رقی لە ئۆکۆردیۆن بوو. ئەو ئامێرە مۆسیقایەی تەنیا شیاوی میراتگرانی وێڵگەردی فرانسیسکۆی پیاو دەزانی. بەڵام ئۆرلیانۆی دووهەم بە هەر جۆر بوو فێری لێدانی ئۆکۆردیۆن بـوو و تەنـانەت دوای ئەوەی زەماوەنـدی کـرد و بـوو بە خـاوەنی منـداڵێک، لە ماکۆنـدۆدا بـوو بە یەکێک لە باشترینی ئەو کەسانەی ئۆکۆردیۆن لێ دەدەن.
نزیک بە دوو مانگان، ئەو ژنەی لەگەڵ براکەی بە شـەریکی هەبوو. وریـای براکەی خۆی بوو، نەخشـەکانی لێ تێک دەدا و کاتێک دڵنیا دەبوو خـۆزێ ئارکادیۆی دووهەم ئەو شەوە ناچێتە لای گراوی هاوبەشیان، دەڕۆیشت و لەگەڵـی دەخەوت. ڕۆژێکیـان بەیـانی تێگەیشـت نەخۆشـە. دوو ڕۆژ دوایـی بـراکەی لە ئاوەدەسـت بینـی کە لە ئـارەقەدا شـەلاڵ بـووە و دەسـتی بە کۆڵەکەیەک گرتووە و فرمێسک بە چاویدا دێتەخوار. ئەو کات لە مەسـەلەکە گەیشت. براکەی ئاشکرای کرد کە ژنەی دەرکردووە و تاوانباری کردووە کە نەخۆشیی گەڕۆکانی بۆ ئەو هێناوە. بۆی باس کرد کە لیلار تێرنێرا چۆن خەریکـــی چارەســـەریتی. ئۆرلیـــانۆی دووهەم بە دزیـــیەوە خـــۆی بە پێرمەنگەنات دەشـووت و خـاوێن دەکردەوە. هەردووکیـان پـاش سـێ مانـگ ئازارکێشـان لە بێدەنگیـدا، جیاجیـا چـارە کـران. خـۆزێ ئارکـادیۆی دووهەم هـیچ کـات بـۆ لای ئەو ژنە نەڕۆیشـتەوە، بەڵام ئۆرلیـانۆی دووهەم داوای لێبووردنی لێکرد و هەتا کۆتایی تەمەنی لەگەڵی مایەوە.
نـاوی ژنەکە پێتـرا کـۆتیس[٢] بـوو. لە نێوەڕاسـتی شـەڕدا لەگەڵ پیاوێـک کە وەک مێردی بـوو و لە ڕێگای فرۆشـتنی بلێتـی (لۆتەریی)"یانەسـیب" خۆیـان بەخێو دەکرد هاتبوونە ماکۆندۆ. دوای مردنی مێردەکەی ئەو کارەی درێژە دەدا. ژنێکـی دووڕەگەی پـاک و خـاوێنی لاو بـوو کە چـاوە بـادامییە زەردەکانی حاڵەتی درندەیی بەوری بە دەموچـاوی دەبەخشـی، بەڵام دڵێکـی سەخی و زانیارییەکی سەیری لە ئەوینداری دا هەبوو. کاتێ ئۆرسـۆلا زانـی

٢– Petra Cotes

کە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم خەریکی پەروەردەکردنی کەڵەشێری شەڕە و ئۆرلیانۆی دووهەم لە میوانداربیەکانی گراوییەکەی ئۆکۆردیۆن لێدەدا، کەمی مابوو لە ترسان شێت بێ، دەتگوت تەواوی خووی خراپ لەو دوو گەنجەدا، کە لە خووی باشی خاووخێزان بچووکترین میراتیان بەر نەکەوتووە، کۆبیوەتەوە. لەو بارەوە بڕیاری دا ئیتر ناوی هیچ کەس لە بنەماڵەی خۆیان نەنێ ئۆرلیانۆ و خۆزێ ئارکادیۆ. لەگەڵ ئەو حاڵەش، کاتێ هەوەڵین منالی ئۆرلیانۆی دووهەم هاتە دونیاوە، ورەی نەبوو دژایەتیی بکا، وتی: 'زۆرباشە بەڵام بەو مەرجە خۆم گەورەی بکەم."
ئۆرسۆلا هەر چەند خۆی لە سەد ساڵی دەدا و چاوی لە بەر ئاوی مرواری خەریک بوو کوێر دەبوو، هێشتا توانای لەش و رێزی خۆی پاراستبوو و هۆشی لە سەرەخۆ بوو. هیچ کەس وەک ئەو نەیدەتوانی پیاوێک، کە دەبوایە ئابرووی ماڵەوە بپارێزێ، پەروەردە بکا، پیاوێک کە هیچ کات لە شەڕ و کەڵەشێری جەنگی و ژنانی بەدکارە و کاری وەحشیانە قسە نەکا. بە بڕوای ئۆرسۆلا، ئەو چوار ئافەتە نەسلی بنەماڵەی بەرەو نەمان دەبرد. بە پۆزێکی زۆرەوە وتی: "ئەو یەکەیان دەبێتە قەشە و ئەگەر خوا تەمەنم بدا، رۆژێک دەبێتە قەشە." ئەوانی دیکە بە بیستنی ئەو قسەیە نەتەنیا لە ژووری خەو، بەڵکو لە هەموو ماڵەوە، جێگایەک کە هەموو دۆستانی بێ بەندوباری ئۆرلیانۆی دووهەم کۆ ببوونەوە، لە قاقای پێکەنینیان دا.
شەڕ کە لە گۆشەکانی تاڵی بیرەوەرییەکاندا خۆی حەشار دابوو، بە هەرا و هوریای کردنەوەی بوتڵەکانی شامپانی جارێکی دیکە لە پڕ خۆی پێشان دا. ئۆرلیانۆی دووهەم جامی شەرابی خۆی بەرز کردەوە، وتی: "بە سلامەتیی قەشەی گەورە!"
میوانەکان هەموویان پیاڵەکانی خۆیان بە سلامەتی خواردەوە و خاوەن ماڵ ئۆکۆردیۆنی لێدا. ئاگربازی دەستی پێکرد و دەنگی تەپڵ، ئەو رووداوەی لە هەموو شاردا کردە جێژن. لەگەڵ بەیانی، میوانەکان غەرقی شامپانی، شەش گاجووتیان کردە قوربانی و لە خەڵکی کۆڵان و شەقامانیان دابەش کرد. کەس پێی سەیر نەبوو، لەو کاتەوە ئۆرلیانۆی دووهەم بەڕێوەبەریی ماڵەوەی بەئەستۆ گرتبوو، ئەو جێژنانە زۆر ئاسایی بوون. تەنانەت کاتێک

هۆیەکیش وەک لەدایکبوونی قەشە لە گۆڕێدا نەبا. لە ماوەی چەند ساڵاندا، بە بێ هیچ زەحمەتێک و تەنیا لە رووی خۆش شانسی، لە بەرەکەتی بوونی گیانلەبەران، ببوو بە یەکێک لە دەوڵەمەندترین پیاوی ناوچەی زەڵێ. ماینەکانی سێ جوانوویان دەبوو. مریشکەکانی رۆژێ دوو هێلکەیان دەکرد و، بەرازەکانی هێندە بەزوویی قەڵەو دەبوون، کە هیچ کەس نەیدەتوانی هۆی ئەو هەموو نئعمەتە زۆرە، بێجگە لە جادوو و موجیزە، بە شتێکی دیکە بزانێ. ئۆرسوڵا بە نەتیژەی بێ بەندوباری خۆی دەوت: "هێندێک پاشکەوت بکە، ئەو بەختەوری و بەرەکەتە هەتا ئاخری تەمەنت نامێنێتەوە." بەڵام ئۆرلیانۆی دووهەم گوێی نەدەدایە قسەی ئەو. هەرچی زۆرتر دۆستەکانی لە شامپانیدا نوقم دەکرد، ماڵاتەکەشی هەر بەوجۆرە شێتانە زیادیان دەکرد. رۆژ بەرۆژ زۆرتر دڵنیا دەبوو کە ئەستێرەی بەختی هیچ پێوەندییەکی بە کردەوەی خۆیەوەنییە و، سروشت بە خاتری گراوییەکەی ئاوا لەگەڵی بەبەزەیە. ئەوەندە دڵنیا بوو کە پێترا کۆتیس سەرچاوەی سامانی ئەوە، کە هەرگیز ئەوی لە خۆی دوور نەخستەوە و، تەنانەت کاتێک زەماوەندی کرد و بوو بە خاوەنی منداڵ، بە رەزابوونی فێرناندا، درێژەی بە ژیان لەگەڵ گراوییەکەی دا. وەک باوک و باپیری هەیکەلی گەورە بوو، لەگەڵ شێوەیەک خۆشیی ژیان کە ئەوان نەیانبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم، تەنانەت کاتی ئەوەی نەبوو سەر لە ماڵاتەکەی بدا و پێیان رابگا. هەر ئەوەندە بەس بوو پێترا کۆتیس بەرێتە نێو ئەو زەوییانەی حەیوانەکانی لێ پەروەردە کردن، سواری ئەسپێکی دەکرد و بە نێو زەوییەکاندا دەیگێڕا. حەیوانەکان نیشانەداخی ئەویان پێوە بوو، دەتگوت تەسلیمی نەخۆشیی چارەنەکراوی زاوزێی سەرسووڕهێنەر بوون.

وەک رووداوەکانی باشی دیکەی کە لە ژیانیدا بۆی هاتبووەپێش، ئەو سامانە زۆرە سەرچاوەیەکی بەتەواوی هەڵکەوتی هەبوو. هەتا کۆتایی شەڕ، پێترا کۆتیس لە رێگای "ئەزموونی بەخت" خۆی دەژیاند و ئۆرلیانۆی دووهەمیش بە دزینی پاشەکەوتی ئۆرسوڵا رۆژگاری دەبردە سەر.

ژن و مێردێکی بێ بەند و بار بوون، کە کاریان تەنیا ئەوە بوو هەموو شەوێ لە پاڵ یەکتردا بخەون. تەنانەت لە رۆژەکانی حەرامیشدا هەتا رۆژ

خەریکی رابواردن بوون. ئۆرسوۆلا بە دیتنی نەتیژەی خۆی، کە وەک خەوگەردان دەهاتە ماڵەوە، هاواری دەکرد: "ئەو ژنە تۆی لە رێ لاداوە. نووشتووی لێکردووی و بەوزووانە لە ژانی قوڵنج لێک دەهاڵێی و بۆقت لە زگ دێتەدەرێ." زۆری پێچوو هەتا خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم زانیی براکەی جێگای ئەوی گرتۆتەوە، نەیدەتوانی لە هەوەسی براکەی تێبگا. ئەو پێیوابوو پێترا کۆتیس ژنێکی ئاساییە، کە هەمیشە لە جێگادا دەمێنێتەوە و ئەویندار نازانێ. ئۆرلیانۆی دووهەم هات و هاواری ئۆرسوۆلا و گاڵتەپێکردنی براکەی نەدەبیست و نەدەدیت، تەنیا لەو فکرەدا بوو کە هونەرێک فێر بێ و بتوانێ بۆ پێترا کۆتیس ماڵێک بکرێ و لە شەوێکی هەوەسهێنەری تۆبەتاوی لەگەڵ ئەو، لە سەر ئەو، یان لە ژێر ئەودا بمرێ. کاتێ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، سەرەنجام تەسلیمی ئاسوودەیی پیری بوو، جارێکی دیکەش دەرگای کارگای زێڕنگەریی خۆی کردەوە. ئۆرلیانۆی دووهەم کەوتە ئەو بیرە کە ئەگەر کاتی خۆی بەدروستکردنی ماسی بچکۆلانەی زێڕ بەرێتەسەر، کارێکی باش دەبێ. لەو ژوورە گەرم و خەفەیەدا، بە سەعات رادەدەستا و تەماشای ئەو وەرەقە ئاسنانەی دەکرد کە بە لەسەرەخۆیی و هێمنایەتیی تەواو، لە ژێر دەستی سەرهەنگدا وردورده دەکرانە بە پارچەی چکۆڵەی ئاڵتوون. هونەری زێڕنگەری لە بەر چاوی ئەوەندە گران و بیری پێترا کۆتیس لە مێشکیدا ئەوەندە قووڵ بوو، کە دوای سێ حەوتووان کارگای زێڕنگەری بەجێ هێشت. لەو دەورەیەدا بوو کە پێترا کۆتیس لە بیری وەی بۆ هات کەروێشک بکاتە لۆتەری کەوت. کەروێشکەکان ئەوەندە بەتوندی زاوزوویان کرد، کە زۆر بەزەحمەت توانیان وەخت بۆ فرۆشی بلێتەکانی لۆتەریی پەیدا بکەن. ئۆرلیانۆی دووهەم، سەرەتا زۆری گرنگی بە زۆربوونی لەرادەبەدەری کەروێشکەکان نەدەدا هەتا ئەوە شەوێک، کاتێ کەس لە شار، حەوسەڵەی بیستنی ناوی لۆتەریی کەروێشکی نەبوو، لە لای دەرگای حەوشەوە گوێی لە دەنگێک بوو. پێترا کۆتیس وتی: "نیگەران مەبە، دەنگی کەروێشکەکانە."سەرتاسەری شەوێ لە بەر دەنگی حەیوانان خەویان لێ نەکەوت. بەیانی ئۆرلیانۆی دووهەم کە دەرگای کردەوە بینی کە حەوشە لە کەروێشک جمەی دێ و،

لە ڕووناکایی بەرەبەیاندا شین هەڵگەڕاوە. پێترا کۆتیس کە لە بەر پێکەنینان دڵی لە خۆی بېزوە، نەیتوانی خۆ لە هەوەسی ئازاردانی ئەو بدزێتەوە.
وتی: "تازە ئەوانە ئەو کەروێشکانەن کە دوێنێ شەو لە دایک بوون."
ئەو وتی: "چەند سامناکە! بۆچی خەریکی لۆتەریی مانگا نابی؟"
چەند ڕۆژ دواتر، پێترا کۆتیس بۆ بەتاڵکردنی حەوشە کەروێشکەکانی دا بە مانگایەک. دوو مانگ دواتر مانگا سێ گوێلکی بوو. مەسەلەکە پەرەی گرت. ئۆرلیانۆی دووهەم لەپڕ بوو بە خاوەنی زەوی و گاڕان گاڕانی ماڵات، تەنانەت دەرفەتی گەورەکردنەوەی تەویلە و هۆڵەبەرازە تەنگەکانیشی نەبوو.
بەختەوەرییەک کە ڕووی تێکردبوو خۆشی باوەڕی نەدەکرد، هەر بۆیەش خۆی لە پێش هەموو کەسدا پێی پێدەکەنی و، شێتانە گاڵتەی خۆی دەردەبڕی و هاواری دەکرد: "مانگاکان، لێک جیا بنەوە ژیان کورتە!"
ئۆرسۆلا سەری سووڕمابوو، بیری لەوە دەکردەوە کە ئەو چ فێڵێکی کردووە، ئایا دزی دەکا، ئایا ئەو ماڵاتەی دزیوە؟ هەر کاتێک کە ئەوی دەدی سەری بوتڵە شامپانییەکی کردۆتەوە و کەفەکەی بۆ خۆشی بە دەموچاوی هەڵدەپژێنێ، بە سەریدا دەقیژاند و بۆ ئەو هەموو زێدەخەرجییە لۆمەی دەکرد. سەرەنجام ئۆرلیانۆی دووهەم ئەوەندە وەتەنگ هات، ڕۆژێکیان بەیانی بە مەستی لە خەو هەڵسا و بە سندووقێک پارە و سەتڵێک چەسپ و قەڵەممووییەک"فلچە" هاتەوە ماڵی و هەروا کە بە دەنگی بەرز گۆرانیی قەدیمی فرانسیسکۆی پیاوی دەگوت، ماڵەکەی لە دەرەوە و ژوورەوە، لە سەرێ هەتا خوارێ بە ئەسکیناسی یەک پیزۆیی داپۆشی. ماڵە قەدیمییەکە کە لە زەمانی پیانۆلاوە هەمیشە سپی بوو، وەک میحرابی لێهات. لە نێو خۆشحاڵیی خاووخێزان و بێ ئابروویی ئۆرسۆلا و شایی و شادی خەڵکێک کە ڕژابوونە شەقامەکان هەتا تەماشای ئەو دەست و دڵبازی و زێدەخەرجییە کەن. ئۆرلیانۆی دووهەم چەسپاندنی ئەسکیناسی بە ئاشپەزخانە و ژوورەکانی خەو و تەنانەت ئاوەدەستەکانیش تەواو کرد و، ئەو پووڵانەش کە مابوونەوە بە حەوشەی وەرکرد و سەرەنجام وتی:

"ئێستا هیوادارم لێرە بەولاوە لەوماڵەدا سەبارەت بە پارە کەس قسە لەگەڵ من نەکا."
ئەنجام بەوە گەیی: ئۆرسۆلا دەستووریدا پارەکانیان لە دیوار کردەوەو و سەر لە نوێ ماڵەکەیان سپی کردەوە و دوعای دەکرد: "خوایە ئێمە وەک ئەو زەمانە کە ئەو گوندەمان دروست کرد هەژار بکەوە، هەتا لە دونیای دیکە بە تاوانی ئەو زێدەخەرجییانە سزا نەدرێین." وەڵامی دوعاکەی پێچەوانە درایەوە. یەکێک لە کرێکارەکان کاتێک ئەسکیناسەکانی لە دیوار دەکردەوە، لە رووی بێ موبالاتی لەهەیکەلی گێچی تەواو بالای حەزرەتی یوسف هەڵەنگوت، کە کابرایەک لە ساڵەکانی کۆتایی شەڕدا بۆویێ هێنابوو. هەیکەلی بەتاڵ شکا و بوو بە هەزار تیکە، تەماشایان کرد پڕە لە سکەی زێڕ. هیچ کەس بیری نەدەکەوتەوە ئەو هەیکەلە خاوێنە کێ بۆ ئەوێی هێناوە. ئامارانتا باسی کرد کە: "سێ پیاو هێنایان و لە منیان داوا کرد هەتا کۆتایی وەرزی باران بۆیان رابگرم، منیش وتم هەیکەلەکە لەو گۆشەیەدا دابنێن هەتا کەس تێی هەڵنەنگوێ. ئەویان بە وریایی و رێزێکی زۆرەوە لەوێ دانا و لەو کاتەوە تا ئێستا لەوێ ماوەتەوە. کەسێکیش بۆ وەرگرتنەوەی نەهاتۆتەوە." لەو دواییانەدا ئۆرسۆلا بێ ئەوەی بۆخۆی بزانێ لە جیاتی یەکێک لە نزیکانی دەرگای پەروەردگار، دوو سەد کیلۆ زێڕ دەپەرستێ، شەمی لە پێش هەیکەلەکە هەڵدەکرد و لە بەرامبەریدا چۆکی دادەدا.
لەوە کە بێ ئەوەی بۆخۆی بزانێ کافر ببوو، زۆر تووڕە بوو. تفی لەو کۆمەڵە سکە جوانانە کرد و لە سێ گوێنی کردن و بەو چاوەڕوانییە کە زوو یان درەنگ سێ پیاوە نەناسراوەکانی هەیکەکەلەکەیان هێنابووە ئەوێ، بۆ وەرگرتنەوەی دەگەڕێنەوە، هەر سێ تەلیسەکەی لە شوێنێک لە ژێر خاک شاردنەوە. زۆر ساڵ دواتر، لە تەمەنی پیریی خۆیدا، قسەی ئەو میوانە زۆرانەی کە دەهاتنە ماڵیان دەبڕی و لێی دەپرسین کە ئایا لە زەمانی شەڕدا هەیکەلی حەزرەتی یوسفیان نەهێناوەتە ئەوێ، هەتا دوای وەرزی باران بیبەنەوە؟

ئەو ڕووداوانەی لە زەمانی ئەودا ئۆرسۆلایان نارەحەت و پەرێشان دەکرد زۆر ئاسایی بوون. ماکۆندۆ لە سامان و پیتێکی سەرسووڕهێنەردا نوقم ببوو. ماڵەکانی سەرەتای ئاوەدانکردنەوەی گوندەکە، کە بە قوڕ و قامیش دروست کرابوون، گۆڕابوون بە ماڵی خشت و کرکرەی دار، و ئەرزی چیمەنتۆی ژوورەکان باشتر خۆیان لە بەر گەرمای سەعات دووی پاش نیوەڕۆیان ڕادەگرت. لە گوندی قەدیمی خۆزێ ئارکادۆ بویندیا تەنیا دارەبادامە تۆز و خۆڵگرتووەکانی چارەنووسیان ئەوە بوو لە بەر دەورانێکی سووتێنەرتردا خۆڕاگرن و ڕووباری ڕووناو مابوونەوە، کە بەردە پێش مێژووەکانی بن ئاوەکە، کاتێک خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم دەیویست خەتێکی کەشتیرانی دروست بکا، لە ژێر کوتکی ئەودا ورد و خاش بوون. نەخشەی شێتانەی ئەو تەنیا لەگەڵ نەخشەی باپیری بەراورد دەکران. گابەردە زلەکانی چەم و تەگەرەکانی ڕەوتی ئاوی ڕووبار، ڕێی لەوەگرت ماکۆندۆ بگاتە سەر دەریا. بەڵام خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم لە هێرشێکی بێ باکانە و چاوەڕواننەکراودا کەوتە دوای ئەو پرۆژەیە. هەتا ئەو کاتە لە هیچ کارێکدا نەبووە پێشەنگ بێجگە لە پێوەندیی ناپایەداری خۆی لەگەڵ پیتراکۆتیس، لەگەڵ هیچ ژنێکی دیکە پێوەندیی نەگرتبوو. ئۆرسۆلا ئەوی بە ئارامترین نموونەی مێژووی ئەو بنەماڵەیە دەدانا. تەنانەت ئەو نەیدەتوانی لە شەڕەکەڵەبابیشدا لێهاتوویی نیشان بدا، هەتا سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا داستانی ئەو کەشتییە ئیسپانیۆلییەی بۆ گێڕایەوە کە لە دوازدە کیلۆمیتریی دەریادا کەوتبووە سەر ئەرز و ئەو لە زەمانی شەڕ لاشەکەی دیتبوو و ببووە خەڵووز. ئەو داستانە، کە بۆ ماوەیەکی زۆر بۆ کۆمەڵێک خەڵک ببووە داستانێکی سەرسووڕهێنەر، بۆ خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم ببووە دۆزینەوە شتێکی گرینگ. هێندێ کرێکاری بەکرێ گرتن، کەرەسەی پێویستی کڕین و خەریکی کاری سەختی شکاندنی بەرد و گاشە و کانالکێشی و تەنانەت تەختکردنی تاڤگەکانیش بوو.

ئۆرسۆلا دەیقیژاند کە: "من ئەو شتانەم لەبەرە، بەتەواوی وەک ئەوە دەچێ زەمان گەڕابێتەوە دواوە و هەموو شتێکمان دیسان لە هەوەڵەوە دەست پێ کردۆتەوە." کاتێ خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم زانی ڕووبار بۆ کەشتیرانی

دەبێ راپۆرتێکی تێروتەسەلی لە نەخشەی کارەکانی دا بە براکەی و ئەویش ئەو پارەی پێویست بوو پێیدا. بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێ بزر بوو. دەنگۆ هەبوو کە نەخشەی کڕینی کەشتی تەنیا بۆ ئەوە بووە پووڵی براکەی بخوا. بەڵام رۆژێکیان دەم بە دەم خەبەر هات کە کەشتییەکی سەیر و غەریب لە شار نزیک دەبێتەوە. خەڵکی ماکۆندۆ کە کردەوەکانی غوولئاسایی خۆزێ ئارکاریۆ بویندیایان بیر نەدەهاتەوە بەپەلە بەرەو کەنار رووبار رایانکرد و، بە سەر سوورمانێکی ئەوتۆ کە چاویان لە ژێردا هاتبووە سەر، بینیان کە هەوەڵین و ئاخرین کەشتی هاتە ئەو شارە. کەشتی تەنیا هێندێک تەختەداری بەیەکەوە بەستراو بوون کە بیست پیاو بە تەنافی ئەستوور بە کەنار رووباردا رایاندەکێشا. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم لە سەر کەشتییەکە راوەستابوو و بە چاوانێک کە لە بەر بەرازی بوون دەدرەوشایەوە کەشتییەکەی رێنوێنی دەکردن. کۆمەڵێک ژنی جوانی لەگەڵ خۆی هێنابوون کە لە بەر گەرمای بەتینی خۆر چەتری زۆر جوانیان لە سەر خۆیان هەڵدابوو و شاڵی ئاوریشمی جوانیان بە سەر شانانەوە بوو و دەموچاویان بەرۆنی رەنگاوڕەنگ سواخدابوو و ماری زێڕیان لە باسکیان دابوو و ددانی ئەڵماسیان لە نێو دەمدا بوو. ئەو لۆتکە دارە تەنیا کەشتییەک بوو کە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم توانی بیگەیەنێتە ماکۆندۆ، ئەویش تەنیا بۆ یەک جار. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کات دانی بە شکست دا نەهێنا و بەپێچەوانەوە ئەوەی بە سەرکەوتنی ئیرادەی پتەوی خۆی دانا. دوای ئەوەی قەرزەکانی بەتەواوی دایەوە بە براکەی، دەست بەجێ هەمیسان رووی لە کەڵەشێرەکانی خۆی کردەوە، تەنیا شتێک کە لەو رووداوە شکستخواردووە مایەوە نەفەسێکی تازە بوو کە ژنە فەرانسییەکان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. هونەری بێ هاوتای ئەوان لە ئەویندارییدا دابی کۆنی ئەوینی تێک دا و جێگرتوویی باشی ئەوان لە نێو کۆمەڵدا مەیخانەی قەدیمی کاتارینۆی نەهێشت و، ئەو شەقامە بوو بە بازارێک رووناک بە فانۆسی ژاپۆنی و ئۆرگی دەستی خەمهێنەرەوە. ئەو ژنانە بوون بە پێشەنگی کەرنەڤاڵێکی خوێناوی کە سێ رۆژان شاری ماکۆندۆی نوقمی تاو و تویێەکی سووتێنەر

کـرد و، تەنیـا بەرهەمــی بـاش و درێژخـایەنی لەگەڵ یەک ئاشـنابوونی ئۆرلیانۆی دووهەم و فێرناندا کارپیۆ بوو.
ریمیدیۆسی جوانکیلە بە شاژنی ئەو کەرنەڤاڵە هەڵبژێردرا. ئۆرسـۆلا کە لە ترسی جوانی لە رادەبەدەری نەتیژەی خۆی دەلەرزی، نەیتوانی پێشی ئەو هەڵبژاردنە بگرێ. هەتا ئەو کاتی توانیبووی نەهێڵێ بچێتە شـەقام، مەگەر ئەو کاتـانە کە لەگەڵ ئامارانتـا دەچـوو بـۆ رێورەسـمی نـوێژ – ئەو کـاتیش دەموچـاوی بە شـاڵێکی رەش دادەپۆشـی. ئەو پیـاوانەی کە زۆر پێبەنـدی مەزەب نەبوون، تەنیـا بـۆ رێورەسـمی نـوێژ لە مەیخـانەی کاتـارینۆ لیباسـی قەشـەییان دەبەر دەکرد و دەچوونە کڵێسـا بـۆ ئەوەی ئەگەر تەنیـا بـۆ یەک ئانیش با رێمیدیۆسی جوانکیلە ببینن.
ناوبـانگی جـوانیی ئەفسـانەیی سـەیری ئەو لە هەمـوو شـارەکانی نـاوچەی زەلێ گەڕابوو. زۆری کێشا هەتا پیاوەکان بە ئاواتی خۆیـان گەیشـتن، بەڵام باشـتر بـوو هەر پێنەگەیشـتبان، چـونکە زرۆبەیـان خەو و خۆراکیـان لـێ هەڵگیرابوو. پیاوێک کە گیرۆدەی ئەو ئارەزووە بوو، کابرایەکی لاوەکی بوو کە ئـارا و قـاراوی لە دەسـت دا و لەگێـژاوی بەدبەختـی نـوقم بـوو و چەنـد ساڵ دوایی کاتێک لە سەر رێگای قەتـار خەوی لێکەوتبوو بەر قەتـار کەوت و پارچە پـارچە بـوو. هەر لەو کـاتەوە کە بە کۆت و شـەڵواری مەخمەری سـەوز و جلـیقەی گوڵـدۆزییەوە بینیـان، بۆیـان دەرکەوت کە لە شـوێنێکی دوور و، رەنگە لە یەکێک لە شـارەکانی دووری وڵاتـانی دەرەوەڕا هـاتبێ و گیرۆدەی جوانیی ریمیدیۆسی جـوانکیلە بـووبێ. ئەو پیـاوە ئەوەنـدە جـوان و شـیکپۆش و بەرێـز بـوو،ئەگەر پیترکرێسـپی زینـدووبا، لە بەرامبەریـدا وەک منداڵێکی حەوت مانگانە دەینواند. هێندێک لە ژنان بە بزەی رکاوییەوە دەیان بۆلاند کە لە راسـتیدا دەبـوایە ئەو شـاڵی رەشـی بە سـەر دەموچاویـدا دابـا نەک رێمیـدیۆس. لە ماکۆنـدۆ لەگەڵ هـیچ کەس قسـەیەکی نەکـرد. رۆژێکـی یەکشەممە، بەرەبەیانی، وەکو شازادەیەکی ئەفسـانەیی بە سـواری ئەسـپێکی زین و لغاو زیو و مەخمەر دەرکەوت و، دوای رێورەسـمی نـوێژ دەسـبەجێ شاری بەجێ هێشت.

ئەوەندە شەیدابوو، کاتێک بۆ هەوەڵین جار لە کڵێسا چاویان پێکەوت، هەموو زانیان لە نێوان ئەو و رێمیدیۆسی جوانکیلە شەڕێکی بێدەنگ، پەیمانێکی نهێنی و، ململانێیەکی پڕ لە خۆبواردن پێکهاتووە و، کۆتایی بەمردن دێ نەک بە ئەوین. یەکشەممەی شەشەم لاوی ئەسپ سوار بە لکێک گوڵەرۆزی زەردەوە هات و وەک جاران رێورەسمی نوێژی بەتەواوی گوێ گرت و، دوایی بۆ لای ریمیدیۆسی جوانکیلە رۆیشت و گوڵەکەی دایە. رێمیدیۆسی جوانکیلە بە حەرەکەتێکی سادە و ئاسایی گوڵەکەی لێوەرگرت، هەروەک چاوەڕوانی ئەو دیارییە بووبێ، ئەو جار لەچکەیەکەی لە رووی خۆی لادا و بە زەردەخەنەیەک سوپاسی کرد. تەنیا ئەو کارەی کرد، بەڵام ئەو دەمە، نەتەنیا بۆ کابرای ئەسپسوار بەڵکو بۆ تەواوی ئەو پیاوانەی کە دەسکەوتی ئافەتاوی بینینی ئەویان دەست کەوت، دەمێکی ئەبەدی بوو.

لەوەدوا، کابرای ئەسبسوار، بە چەند مۆسیقارێکەوە دەچوونە بەر پەنجەرەی رێمیدیۆسی جوانکیلە و جار هەبوو هەتا رۆژ لەوێ دەمانەوە. ئۆرلیانۆی دووهەم تەنیا کەسێک بوو کە زگی پێ سووتا و هەوڵی دا لەو کارە بیگێڕێتەوە. شەوێک پێیگوت: "لەوە زۆرتر کاتی خۆت بە فیرۆ مەدە، ژنانی ئەو بنەماڵە لە هێستریش چەمووشترن." دۆستایەتی خۆی پێشکەش کرد و بانگهێشتی کرد بۆ حەمامی شامپانی. تێکۆشا حالی بکا کە ژنانی بنەماڵەکەی، لە دەروونەوە لە بەردەچەخماغ دروست بوون، بەڵام نەیتوانی لە جەنەدی کەم کاتەوە.

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوێندیا کە لەو شەوە دووروودرێژ و پڕ لە مۆسیقای شێتانە تووڕە ببوو، هەڕەشەی کرد کە نەخۆشیی ئەوینی ئەو بە چەند گوللەی دەمانچە چارەسەر دەکا، بەڵام هیچ کەس نەیتوانی پاشگەزی بکاتەوە مەگەر وەزعی هەژارانەی ناهۆمێدی خۆی. لە پیاوێکی جوان و کۆک و پۆشتەوە، ببوو بە گەدایەکی پیسەکەی شڕۆڵە، دەنگۆ بوو کە ئەو دەستی لە سەروەت و سامانی خۆی لە وڵاتی خۆی کێشاوەتەوە، ئەگەرچی هەرگیز نەیانزانی لە کوێوە هاتووە. بوو بە پیاوێکی شەڕانی و بەدخوو، کە بەیانیان کاتێ هەموو لەشێ لە پیسایی خۆی وەردابوو، لە خەو هەڵدەستا. ئەوەی کە لە وەزعی هەژارانەی ئەودا لە هەمووی خەمناکتر بوو، ئەوە بوو

کە ڕێمیدیۆسی جوانکیلە تەنانەت ئەو کاتەش کە ئەو وەک شازادەیەک هاتبووە کڵێسا و گوڵەزەردەکەی لێ قبووڵ کردبوو و لەو کارە خۆشحاڵ بوو، شاڵی سەردەم و چاوی بۆ بینینی ئەو لابردبوو نەک بۆ ئەوە خۆی پێشان بدا.

لە ڕاستیدا ڕێمیدیۆسی جوانکیلە لە دروستکراوەکانی ئەو جیهانە نەبوو. هەتا ماوەیەکی زۆریش دوای بلوغ بوونی، سانتا سۆفیا دێلا پێداد حەمامی پێ دەکرد و دەیشووت و جلی دەبەر دەکرد و، تەنانەت ئەو کاتانەش کە دەیتوانی بەتەنیا کارەکانی خۆی ڕاپەڕێنێ، دەبوایە ئاگایان لێی بێ بەو دارە کە لە پیسایی خۆی وەردەدا دار و دیواری ماڵێ نەڕەنگێنێ! بە بێ فێربوونی خوێندن و نووسین و بێ ئەوەی خواردن بە چەقۆ و چەنگاڵ بخوا گەیشتە تەمەنی بیست ساڵی و، لەو جێگایەوە کە سروشتی هیچ بەندوبەستێکی هەڵنەدەگرت لە ماڵەوە بەڕووتی وەک لەدایک ببوو، دەخوولایەوە. کاتێ فەرماندەی گەنجی گارد، دانی بە ئەوینی خۆیدا نا ئەو تەنیا لە بەر نەفامی ئەفسەرەکە وەدەری نا. بە ئامارانتای وت: "دەبینی چەند سادەیە؟" دەڵێ خەریکم لەبەر تۆ دەمرم، وەک من نەخۆشیی قۆڵنج بم." کاتێ فەرماندەی لاویان بە مردوویی لە بەر پەنجەرەکەی دۆزییەوە، باوەڕی ڕێمیدیۆسی جوانکیلە سەبارەت بە وتەی خۆی قایمتر بوو.

وتی: "بینیتان چەندە سافیلکە بوو."

وا دەهاتە بەرچاو کە ئەو، دەتوانێ بە جۆرێک نووری بەهێز، پشتەوە و ناوەوەی هەموو شتێکی ببینێ، لانیکەم باوەڕی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئەوە بوو کە بە پێچەوانەی ڕای گشتی، ڕێمیدیۆسی جوانکیلە کچێکی گەوجنییە، دەیگوت؛ "بەتەواوی پێچەوانە، دروست وەک ئەوە وایە کە لە شەڕی بیست ساڵە گەڕابێتەوە." ئۆرسوڵا بە نۆبەی خۆی شوکری خوای دەکرد کە بنەماڵەکەیانی بە بوونەوەرێکی ئاوا پاک و ساکار ڕازاندۆتەوە، لە هەمان کاتدا لە جوانییەکەی نیگەران بوو، چونکە وایدەزانی ئەو جوانییە دژە و، داوێکی ئاکار شەیتانانەیە لە داوێنی پاکی ئەودا.

هەر بەو هۆیەوە بوو کە بڕیاری دا ئەو لە جیهانی دەرەوە دوور بگرێ و، لە بەرامبەری وەسوەسەکانی سەرزەویدا پشتیوانیی لێ بکا. نەیدەزانی کە

ڕێمیدیۆسی جوانکیلە لەو کاتەوە کە لە زگی دایکیشیدا بووە هیچ شتێکی لاوەکی کاری تێ ناکا. هیچ کاتێک بە بیریدا نەدەهات کە بیکەن بە شاژنی کەرنەڤاڵ. بەڵام ئۆرلیانۆی دووهەم ،کە لە خۆشیی دەبەرکردنی پێستی پڵینگ وەسەما هاتبوو، قەشەئەنتۆنیۆ ئیزابێل_ی هێنایە ماڵەوە هەتا بە ئۆرسۆلا بسەلمێنێ کە بە پێچەوانەی بیری ئەو جێژنی کافران نییە، بەڵکو دابێکی کاتۆلیکییە. سەرەنجام، ئۆرسۆلا بە بێ مەیلی ڕازی بوو کە ڕێمیدیۆسی جوانکیلە ببێ بە شاژنی کەرنەڤاڵ و تاجی لە سەر سەر دابنێن. ئەو هەواڵە، کە بڕیارە ڕێمیدیۆس بویندیا ببێتە شاژنی جێژنەکە، لە ماوەی چەند سەعاتاندا لە شارەکانی ناوچەی زەڵێ تێپەڕی و گەیشتە ئەو شوێنە دوورانە کە تەنانەت هیچ ئاگایەکیان لە جوانیی ئەو نەبوو و، لە نێو ئەو کەسانەش کە هێشتا ناوی بنەماڵەی ئەویان بە نیشانەی ڕووخان و وێرانی دادەنا، هەڵڵایەکی پەیداکرد. نیگەرانییەکی بێ کۆتایی بوو. لەو زەمانەدا ئەگەر کەسێکی لە سەرەخۆ و بێ ئازار ببووایە، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوو کە پیر و ناهۆمێد ببوو و، وردە وردە هەر جۆرە پێوەندییەکی لەگەڵ ڕاستییەکانی ژیانی ڕۆژانەدا لە دەست دابوو. دەرگای کارگای لە سەر خۆی داخستبوو و تەنیا پێوەندیی لەگەڵ دونیای دەرەوە و بازرگانی ماسییە بچکۆڵە زێڕەکان بوو. یەکێک لە سەربازە پیرەکانی لە ڕۆژەکانی هەوەڵی ئاشتییەوە پارێزگاریی ماڵەکەی کردبوو، ماسییەکانی بۆ فرۆشتن دەبردنە دێهاتی ناوچەی زەڵێ و بە کۆڵێک پارە و هەواڵ دەگەڕایەوە. خەبەری دەدا کە دەوڵەتی پارێزەران بە پشتیوانیی ئازادیخوازان خەریکە ساڵژمێر دەگۆڕێ هەتا هەموو سەرکۆمارێک بتوانێ سەد ساڵ حکوومەت بکا. هەواڵی دەهێنا کە سەرەنجام ڤاتیکان پەیماننامەیەکی دۆستانەی مۆر کردووە و لە ڕۆمەوە کاردیناڵێک هاتووە کە لە سەر تەختی ئاڵتوونی خالیس دانیشتووە و تاجێکی ئەڵماسی لە سەر ناوە و وێنەی وەزیرە ئازادیخوازەکانی لە کاتێکدا هاویشتووە، کە چۆکیان داداوە و ئەنگوستیلەی ئەو ماچ دەکەن. خەبەری دێنا کە دەستەیەک پیاوی ڕووبەندەپۆش شانۆگەریی ئەسلیی دەستەیەکی تیاترۆی ئیسپانیۆلییان دزیوە، کە بە پێتەختیدا ڕادەبردن و، هەر ئەو شانۆکارە یەکشەممەی دوایی لە کۆشکی

هاوینی سەرکۆمار بە رووت و قووتی سەمای کردووە. سەرهەنگ پێی دەوت: "کاتێ ئۆرسوڵا بیستی کە خەڵکی دەڵێن؛ چونکە خەریکە لە رێگای فرۆشتنی ماسییە زێڕەکان دەوڵەمەند دەبێ، بۆیە نایەوێ سەبارەت بە سیاسەتی وڵات شتێک ببیستێ، پێکەنی. ئۆرسوڵا قازانجی سەرهەنگی لە فرۆشتنی ماسییەکاندا نەدەدی. ماسییە زێڕەکانی بە سکەی زێڕ دەگۆڕییەوە و سەکە زێڕەکانی دەتواندەوە و ماسی دروست دەکردنەوە. بە جۆرێک کە لە بەر فرۆشی زۆر ناچار ببوو رۆژبەرۆژ زۆرتر کار بکا، هەتا بتوانێ بە دڵنیاییەوە ئەو دەورە زنجیرییەی درێژە پێ بدا.

لە راستیدا مەبەستی کارەکە بوو نەک قازانج. بۆ حاشیەدانانی پارچەبراوەکانی زێڕ و دانانی یاقووتی گچکە لە جیاتی چاوەماسی و بڕینی زێڕ بۆ باڵەماسی، ئەوەندەی پێویستی بە بیرێکی کۆکراوە هەبوو کە تەنانەت یەک دەمیشی بۆ ئاسوودەیی فکر نەهێشتبۆوە تا بە فکری ناخۆشی شەڕ پڕی کاتەوە. وردییەک، کە بۆ ناسکیی هونەری دەستی خۆی بەکاری دەهێنا ئەوەندەی ماندوو دەکرد، لە ماوەیەکی کەمدا زۆرتر لە هەموو ساڵەکانی شەڕدا پیر بوو. پشتی کووڕ بۆوە و پڕکاری سوێی چاوانی برد. لە بەرامبەردا ئەو خۆخەریککردنە دڵڕەقانەیە ئارامییەکی روحیی پێدەدا. ئاخرین جارێک دیتیان سەبارەت بەو مەسەلانەی پێوەندییان بە شەڕەوە هەیە مەیل پێشان دەدا، ئەو زەمانە بوو کە کۆمەڵێک لە ئەفسەرانی قەدیمی لە هەر دوو حیزبەکە، بۆ سەلماندنی مافی خانەنشینی داوای پشتیوانییان لێکرد، کە قەولیان پێ درابوو بەڵام جێبەجێ نەکرابوو. بەوانی وت: "لە بیر خۆتانی بەرنەوە. ئەوەتا دەبینن من بە خاتری ئەوەی ماوەی تەمەنم لە چاوەڕوانیی خانەنشینی ، ئازار نەکێشم، لە خانەنشینی خۆم هەر وازم هێناوە." نزیکی خۆراوا، سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بۆ چاوپێکەوتنی هات، ئەو دوو پیرە پیاوە لە بەر دەرگای دانیشتن تا بیرەوەریی رابردوو بگێڕنەوە. بەڵام ئەمارانتا، نەیتوانی بەرگەی ئەو یادگارییانە بگرێ کە ئەو پیاوە ماندووە- کە سەرکڵاوەکەی سەری ئەوی لە تەمەنی خۆی پیرتر نیشاندەدا- لەودا زیندووی دەکردەوە، ئەوەندە زۆردارانە رەفتاری لەگەڵ کرد و هێندەی ئازاردا، بێجگە لە چەند کاتی تایبەتی، ئیدی پێی نەنایەوە ئەو

ماڵە. سەرەنجام شەپڵە لێی دا و بزر بوو. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئارام و بێدەنگ و بێ موبالات بەو نەفەسە تازەی ژیان کە ماڵەکەی دەهەژاند، تێگەیشت کە رازی بەختەوەریی پیری، بێجگە لە پەیمانی شەرافەتمەندانە لەگەڵ تەنیایی شتێکی دیکەنییە. سەعاتی پێنجی بەیانیان دوای سووکە خەوێک هەڵدەستا، قاوەی تاڵی هەمیشەیی لە ئاشپەزخانە دەخواردەوە، بە دوایدا سەرتاسەری رۆژی لە کارگادا تێپەڕ دەکرد. سەعاتی چواری پاشنیوەڕۆیە چوارپایەیەکی بە دوای خۆیدا دەکێشا و لە هەیوانێ تێدەپەڕی و بێ ئەوەی تەنانەت گرینگی بەو ئاگری بۆتەی گوڵەسوورەکان لە رووناکایی ئەو سەعاتەی رۆژیدا بدا و، بێ ئەوەی گوێ بداتە حاڵەتی خەمباری ئامارانتاش، کە لای ئێواران زۆرتر خۆی نیشان دەدا هەتا ئەو کاتەی مێشوولان تەنگیان پێ هەڵنەچنیبا، لە بەر دەرگای ماڵەوە دادەنیشت. جارێک، پیاوێک وێرای تەنیایی ئەو تێک بدا. کاتێ بەوێدا رادەبرد پرسی: "حاڵت چۆنە سەرهەنگ؟"
لە وەڵامدا وتی: "چاوەڕوانی بەرێکردنی جەنازەکەم دەکەم."
لە بەر ئەوە نیگەرانیی ئەو کەسانەی لایان وابوو بە بۆنەی تاجگوزاریی رێمیدیۆسی جوانکیلە ناوی بنەماڵەی بویندیا دەکەوێتە سەر زمانان، بێ بناخە بوو، بەڵام کۆمەڵێکیش هەبوون پێچەوانەی ئەوەیان بیر دەکردەوە.
خەڵکی شار کە لەو کارەساتەی چاوەڕوانی دەکردن بێ ئاگا بوون، بە شادی و کەیفخۆشی رژانە مەیدانی ئەسڵیی شار. کەرنەڤاڵ گەیشتبووە شێتانەترین قۆناخی خۆی. ئۆرلیانۆی دووهەم سەرەنجام بە ئاواتی خۆی گەیشت، لیباسی پڵینگی دەبەر کردبوو، بە نێو خەڵکە هەڵچووەکەی لە بەر قیژە و هاوار دەنگیان نووسابوو، بە رێگادا دەڕۆیشت، ئەودەم لە لای جادەی زەلێ کۆمەڵێک رووبەندەپۆش دەرکەوتن. کەژاوەیەکی زێڕینیان بە سەر شانیەوەبوو، جوانترین ژنی بەخاڵدا دەهات لەو کەژاوەدا هەڵیانگرتبوو. لە یەک ئاندا خەڵکی ماکۆندۆ وێنەکانیان لە سەر دەموچاوی خۆیان هەڵگرت هەتا ئەو مەوجوودە، کە تاجێکی زومرەدی لە سەر ناوە و شنێڵێکی لە پێستی قاقم بە سەر شانیدا داوە و چاو لە بەر جوانیی هەڵناوە، باشتر ببینن. وا دەهاتە بەرچا کە ئەو ژنە تەنیا شاژنێک لە پوولەک و

کاغەزی رەنگ نییە، بەڵکو بەڕاستی بەڕاستی شاژنە. هێندێکیش کە سەریان لە کاری جادوویی دەردەچوو، گومانیان کرد کە مەبادا نیوکاسەیەک لە ژێر ئەو کاسەیەدا بێ. ئۆرلیانۆی دووهەم دەستبەجێ بە سەر سەرسوڕمانی خۆیدا زاڵ بوو و تازە هاتووەکانی بە میوانانی رێزداری کەرنەڤاڵ بە خەڵک ناساند و بە ئەقڵێکی حەزرەتی سولێمانی، شاژنی لە رێگاهاتووی لە تەنیشت رێمیدیۆسی جوانکیلە لە هەیوان دانا. ئەو بێگانانە، کە لیباسی سەحرانشینانیان دەبەردا بوو، هەتا نیوەشەوێ لە شادی و خۆشیدا بەشدار بوون و، تەنانەت بە ئاگربازی و کردەوەی ئاکروباتیک، کە وەبیرهێنەرەوەی هونەری کاولییەکان بوو، جوانی کەرنەڤاڵەکەیان رازاوەتر کرد. لە پڕ لە گەرماوگەرمی جێژنەکەدا یەکێک ئەو هاوکێشە وردەی تێک دا و هاواری کرد: "بژی حیزبی ئازادیخوا! بژی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا!" بە دوای ئەو دروشمەدا رەگباری چەکەکان بریسکانەوەی ئاگربازی لە نێوخۆیەوە پێچا و هاواری ترس دەنگی مۆسیقای کپ کرد. خۆشی و شادی بوو بە ترس و وەحشەت. هەتا زۆر سالان هێندێک پێیان داگرت و دەیانگوت کە گاردی پاشایەتیی شاژنی لە رێهاتوو، دەستەیەک لە کەسانی ئەرتەشی حکوومەت بوون کە لە ژێر جلە جوانە ئیسپانیۆلییەکانیاندا تفەنگیان شاردبۆوە. دەوڵەت ئەو تۆمەتەی لە راگەیەندراوێکی نائاسایدا رەت کردەوە و، وادەی دا کە لە بارەی ئەو رووداوە خوێناوییەدا بەدروستی لێپرسینەوە و پێراگەیشتن بکا. راستی هەرگیز ئاشکرا نەبوو و، خەڵک بەو ئەنجامە گەیشتن کە ئەوانەی لەگەڵ شاژن لە رێوە هاتبوون بە بێ هیچ هاندەرێک و، تەنیا بە ئاماژەی فەرماندەی خۆیان، بێ بەزەییانە تەقەیان لە خەڵک کردبوو. کاتێ هێمنایەتی بەرقەرار بۆوە ،ئەوانەی بە درۆ خۆیان کردبووەسەحرانشین بزر ببوون. لە مەیدانی شاریدا لە نێو کوژراو و بریندارەکاندا، نۆ لۆتی چەقۆ، چوار کەس بە جلی کۆلۆمبیایی، حەڤدە سەربازی خشت، ژۆکێرێک، سێ مۆسیقار، دوو نوێنەری پارلمانی ئەشرافیی فەرانسە و، سێ شاژنی ژاپۆنی کەوتبوون. لەو هەرەج و مەرەج و قەرەباڵغییەدا، خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم توانی رێمیدیۆسی جوانکیلە رزگار بکا و، ئۆرلیانۆی دووهەمیش

شاژنی تازە لەرێ گەیشتووی، کە لیباسەکانی دڕابوون و شنێلە قاقمەکەی خوێناوی ببوو، بە سەر دەستانەوە بردەوە ماڵ. ناوی فێرناندا کاریپۆ بوو. لە نێو پێنج هەزار ژندا بە جوانترین کچی وڵات هەڵیانبژاردبوو و، بەو وادەیە کە بە شاژنی ماداگاسکار هەڵیدەبژێرن، هێنابوویان بۆ ماکۆندۆ. ئۆرسۆلا وەک کچی خۆی پارێزگاریی لێکرد. خەڵکی شار لە جیاتی ئەوە گومان لە بێ تاوانیی ئەو بکەن، دڵیان پێی سووتا. شەش مانگان دوای ئەو کوشتوبڕە، دوای ئەوە بریندارەکان چار کران و دەسکە گوڵەکان لە سەر گۆڕی گشتی سیس بوون، ئۆرلیانۆی دووهەم بە دوای فرناندا ڕۆیشتە شارێکی دوورەدەست، کە ئەو لەگەڵ باوکی لەوێ دەژیان و، لە ماکۆندۆ لە ئاهەنگێکی کە بیست ڕۆژی خایاند بەیەکەوە زەماوەندیان کرد.

هێشتا دوو مانگ لەو ژن و مێردییەتییە تێنەپەڕیبوو، زۆری نەمابوو ژیانیان لێ تێک بچێ، چونکە ئۆرلیانۆی دووهەم بۆ دڵدانەوەی پیترا کۆتیس لە لیباسی مەلەکەی ماداگاسکاردا وێنەیان لێ هەڵگرتبوو. کاتێ فێرناندا لە ڕووداوەکە ئاگادار بوو، بوخچەی جیازییەکانی خۆی کۆکردەوە و بێ ماڵئاوایی لەگەڵ کەس، ماکۆندۆی بەجێ هێشت. ئۆرلیانۆی دووهەم لە جادەی زەڵێ خۆی گەیاندێ و، دوای پاڕانەوە و قەول و وادەی زۆر گێڕایەوە بۆ ماڵ و دەستی لە گراوییەکەی هەڵگرت.
پیترا کۆتیس کە لە توانای خۆی ئاگادار بوو، هیچ دژکردەوەیەکی نیگەرانیی لە خۆی نیشان نەدا. ئەو پیاوێکی لە ئۆرلیانۆی دووهەم دروست کردبوو، کاتێ ئەو هێشتا منالێک بوو خەیاڵاتی سەیر و غەریبی لە سەر دابوو و هیچ پێوەندییەکی بە جیهانی واقیعیدا نەبوو. سروشت ئەوی بە هەوڵدەر و پڕفکر و گۆشەگیر دروست کردبوو و، پیترا کۆتیس دروست ڕەوشتێکی دژی ئەوەی تێدا گەشاندبۆوە. دڵزیندوویی و لەزەت ویستی و دەستبڵاوی و عەیش و نۆشی تێدا پەروەردە کردبوو، هەتا سەرەنجام توانی بیکا بە پیاوێک کە خۆی لە زەمانی لاویدا ئاواتەخوازی بوو. ئۆرلیانۆی دووهەم، کاتێ سەرەنجام وەک هەموو خەڵکی دیکە زەماوەندی کرد، نەیوێرا هەواڵی

زەماوەندەکەی بە پیترا کۆتیس رابگەیەنێ. رەفتارێکی منالآنەی گرتەبەر، وای دەنواند کە رکی هەستاوە و دلّی ئێشاوە هەتا بە هەر جۆرێک بووە پیترا کۆتیس ناچار بکا پێوەندیی بپسێنێ. رۆژێکیان کە ئۆرلیانۆی دووهەم لە سەر هیچ و خۆڕایی ئەوی سەرکۆنە کرد، ئەو بە خۆی نەبوو راستییەکەی لە مشتی نا و وتی: "مانای تەواوی ئەو کارانە ئەوەیە کە دەتەوێ لەگەڵ شاژن زەماوەند بکەی."

ئۆرلیانۆی دووهەم لە خەجالەتیان سووورهەلگەڕا و وای نواند کە زۆر توورەیە، وتی کە لە بنڕا قسەکانی پێچەوانە تێدەگا و ئیتر بۆ چاوپێکەوتنی نەڕۆیشت. پیترا کۆتیس بێ ئەوەی گۆڕانێک بە سەر حالەتی جانەوەری وەحشی نووستووی خۆیدا بێنێ، گوێی دایە مۆسیقا و تەرەقەی ئاگربازیی جێژنی زەماوەندی ئەو و ، هەروا بگرە ئەو هەموو هەراوهوریایەش یەکێک لە کارە شەیتانییەکانی ئۆرلیانۆی دووهەمە. لە وەلامی ئەو کەسانەدا کە سەبارەت بە چارەنووسی ئەو داخیان دەردەبڕی، بە زەردەخەنەوە دەیگوت: "خەم مەخۆن. شاژنەکان دەبنە کارەکەری من." بە یەکێک لە هاوسێیەکانی، کە چرامۆمی بۆ هێنابوو هەتا لە بەرامبەر وێنەی دلّداری لەدەست چوودا هەلّیکا، بە دلّنیاییەوە وتی: "تەنیا شەمێک کە ئەو بۆلای من دەگێڕێتەوە هەمیشە هەلّکراوە."

هەر بەو جۆرەی پێشبینی دەکرد، ئۆرلیانۆی دووهەم هەر کە مانگی هەنگوینی تێپەڕ کرد، گەڕایەوە بۆ مالّەکەی ئەو و، دۆستایەتی هەمیشەیی، لەگەڵ وێنەگرێکی گەڕۆک و لباس و شنێلی پێستی قاقمی خوێناوی کە فێرنانددا لە کەرنەڤالەکەدا بە شانیدا دابوو لەگەڵ خۆی هێنان. دەگەرماوگەرمی شادی و خۆشیی ئەو شەوەدا، لیباسی شاژنی دەبەر پیترا کۆتیس کرد و، وەک شاژنی بێ ئەولاو ئەولای ماداگاسکار تاجی لە سەر دانا. چەند وێنەیەکیشی لەو وێنەیە دایە دۆستەکانی. پیترا کۆتیس نەتەنیا تەسلیمی ئەو گالتەیە بوو، بەلّکو بەوخەیالّە کە ئەو لە بەر پەشیمانی دەست بەوجۆرە کەرەسانەی ئاشتییەوە دەگرێ، لە دلّەوە زگی پێی سووتا. سەعاتی حەوتی شەو، لە کاتێکدا هێشتا لیباسی شاژنی دەبەردا بوو، هێنایە نێو جێگەی خۆی. هێشتا دوو مانگ لە زەماوەندی ئۆرلیانۆی دووهەم

نەڕۆیشتبوو، بەڵام پیترا کۆتیس دەست بەجێ زانی کە ژیانی ئەو لە نوێنی ژن و مێردایەتیدا زۆر باشنییە و، بە لەزەتێکی شیرن هەستی بەوە کرد کە تۆڵەی خۆی لەو ژنە کردۆتەوە. بەوحاڵەش، کاتێک دوو ڕۆژ دواتر، ئۆرلیانۆی دووهەم نەیوێرا بۆلای بگەڕێتەوە و راسپاردەیەکی نارد هەتا تەرتیبی سەرەتای لێکجیابوونەوە بکا، زانی کە زۆرتر لەوەی بیری لێکردۆتەوە دەبێ سەبر و خۆڕاگریی هەبێ، چونکە وا دەهاتە بەرچاو کە ئۆرلیانۆی دووهەم بۆ پاراستنی ڕواڵەتیش بێ ئامادەیە خۆی فیدا بکا. ئەو جارەشیان لە سەرەخۆیی خۆی لەدەست نەدا و سەر لە نوێ بە حاڵەتێکی تەسلیم و ڕەزابوون، کە بۆچوونی گشتی سەبارەت بە بەدبەخت بوونی ئەو دەسەلماند، کارەکانی هاسانتر کردنەوە. تەنیا یادگارێکی ئۆرلیانۆی دووهەم کە لای خۆی هێشتەوە جووتێکی چەکمەی بریقەدار بوو کە ئۆرلیانۆی دووهەم ئاواتی بوو کاتێک لە نێو تابووتی دەنێن دەپێی بکەن. چەکمەکانی لە پارچەیەکەوە پێچاو لە بنی سندووقی دانان و خۆی بۆ چاوەڕوانییەکی ناهومێدانە ئامادە کرد.

بە خۆی گوت: "درەنگ یان زوو، ئەگەر بۆ پۆشینی ئەو چەکمانەش بێ، دەبێ بگەڕێتەوە."

پێچەوانەی خەیاڵ، چاوەڕوانی زۆری نەخایاند. لە ڕاستیدا ئۆرلیانۆی دووهەم لە هەوەڵین شەوی زەماوەندی تێگەیشتبوو زۆر زووتر لەو کاتەی دەبێ چەکمە بریقەدارەکانی دەپێ بکا، دەگەڕێتەوە باوەشی پیترا کۆتیس.

فێرناندا ژنێک بوو لە جیهاندا بزر ببوو. لە هەزار کیلومیتری دەریا لەدایک ببوو و لە شارێکی خەمهێنەردا گەورە ببوو، کە هێشتا دەنگی هاتوهاواری رابردنی گالێسکەکانی پیاومەاقوولانی دەوڵەتی بە سەر بەردڕێژی شەقامەکاندا دەهاتە گوێ، سەعاتی شەشی ئێوارە سێ و دوو ناقووسی مەرگ لێیان دەدا. لە ماڵە ئەربابی ئەوان، کە بە بەردی وەکو بەردی گۆڕ داندرابوو، هەرگیز نووری خۆرەتاو نەدەبیندرا، هەوا لە دارەکانی سەرووی باخ، لە شتومەکی ڕەنگ بزرکاوی ژوورەکانی خەو و لە ژوورەکانی ئارەقکردووی باخەکانی گوڵی مریەمدا مردبوو. تەنیا زانیارییەک کە فێرناندا هەتا تەمەنی بلووغ لە دنیای دەرەوەی هەبوو، نۆتەکانی خەمهێنەری پیانۆ

بوو، کە یەکێک لە دراوسێیەکانی ساڵانی ساڵ، هەموو رۆژێ پاشنیوەڕۆیان فێری دەکرد. لە ژووری دایکی نەخۆشی، سەوز و زەرد، لە ژێر رووناکایی شووشە تۆزاوییەکانی پەنجەرەکان گوێی دەدایە هەنگاوەکانی وەک یەک و لێبڕاو و دلڕەقی مۆسیقا و، بیری دەکردەوە لە هەمان حاڵدا کە مۆسیقا لە جیهاندا وجوودی هەیە، ئەو لەوێ دانیشتووە و وجوودی لە دروستکردنی گوڵی پرسەدا لەنێو دەچێ. دایکی کە لە تای دوای نیوەڕۆیان لە ئارەقەدا شەلاڵ دەبوو، باسی جوانی و شکۆی رابردووی بۆ دەکرد. کاتێ فێرناندا هێشتا منداڵێکی بچکۆلانە بوو، لە شەوێکی مانگەشەودا ژنێکی زۆر جوانی بینی لیباسی دەبەر دایە و لە باخەوە بۆ لای میحراب دەڕوا. ئەوەی کە ئەوی لەبینینی ئەو دیمەنە خۆش تێپەڕە نارەحەت کردبوو، ئەوە بوو، کە ئەو ژنە دروست وەک خۆی دەچوو، دروست وەک ئەوە وێنەی خۆی بیست ساڵ زووتر بینیبێ. دایکی لە نێو کۆخەکانی خۆیدا پێیگوت: "نەنکی تۆ شاژن بوو، کاتێ چڵەگوڵێکی مریەمی لێدەکردەوە، بە بۆنەکەی مرد." ساڵانی دوایی کاتێ فێرناندا زانیی دروست وەک وێنەی نەنکی دەچێ، لەوەی بە منداڵی دیتبووی، گومانی هەبوو، بەڵام دایکی ئەوی بە هۆی باوەڕنەکردن لۆمە کرد.

پێیگوت: "ئێمە یەکجار دەوڵەمەند و ناسراوین، تۆ رۆژێک دەبیتە شاژن."

ئەو باوەڕی کرد. هەر چەند ئەوان بۆ خواردنەوەی فینجانێک شوکولاتی ئاوەکی و یەک دانە شیرینی لە دەوری مێزێکی گەورە بە روومێزێکی کەتانی و قاپ وقاچاغی زیو دادەنیشتن، فێرناندا هەتا رۆژی زەماوەند هەروا لە خەیاڵی تاج و تەختی ئەفسانەییدا نوقم ببوو. هەر چەند کە باوکی، دون فێرناندۆ، ناچار ببوو بۆ ئامادەکردنی جیازیی ئەو ماڵەکەیان لە گرەو بنێ. ئارەزووی ئەو، نەک لە رووی سادەیی و نە بە خاتری هەوەسی پلە، بەڵکو تەنیا بۆ ئەو مەبەستە بوو ئەویان بەو جۆرە پەروەدە کردبوو.

لەو کاتەوە کە بە بیری دەهاتەوە لە لەگەنێکی زێڕیندا، کە نیشانەی خانەوادەگیی پێوە بوو، دەستی بە ئاو دەگەیاند.

لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا، بۆ یەکەمین جار ماڵەوەی جێ هێشت هەتا بۆ چوونە زیارەتگایەکی چەند هەنگاوێک دوور لە ماڵەوە سواری گالیسکە بێ.

هاوکلاسەکانی لەوە که دەیانبینی لە کورسییەکی پشت بەرزدا دانیشتووە و جێی لە ئەوانی دیکە جودایە، تەنانەت لە کاتەکانی پشوودانیشدا لەگەڵ ئەوان تێکەڵاو، نابێ زۆر سەریان سوڕ مابوو. تەرکە دونیاکان بۆیان روون دەکردەوە کە: "ئەو وەزعی لەگەڵ ئەوانی دیکە جیاوازیی هەیە و رۆژێک دەبێتە شاژن." هاوکلاسەکانی، چونکە ئەویان لە هەموو ئەو کچانەی دیتبوویان جوانتر و بەئەدەبتر و بەشکۆتردەدیت، باوەڕیان بەو قسەیە دەکرد. دوای هەشت ساڵ خوێندن، کاتێک فێر ببوو بە لاتینی شیعر دابنێ و کلاوسین لێ بدا و لەگەڵ ماقوولان لە راو و، لەگەڵ قەشان لە مەزهەب و، لەگەڵ فەرماندەرانی دەرەوە لە بارەی وەزعی سیاسی و، لەگەڵ قەشە سەبارەت بە خوا بدوێ، گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان هەتا بۆ مردووان تاجی گوڵ دروست بکا. ماڵەکەیان دەتگوت دز بردوویە، ئەوەی لە ماڵەوە مابۆوە هێندێک شتی پێویست لەگەڵ چەند شەمدان و قاپ وقاچاغی زیو بوو. شتومەکی پێویستی رۆژانە یەک یەک فروشرابوون هەتا بکرێتە خەرجیی خوێندنی ئەو، دایکی دووچاری نەخۆشیی نۆبەتێ ببوو. باوکی دۆن فێرناندۆ کە کۆت و شەڵوارێکی کەوەیی دەبەر دەکرد و یەخەی ئاهاری دەبەست و زنجیرێکی زێڕی بە جلیقەکەیەوە دیار بوو، دووشەممە بە دووشەممە بۆ خەرجی ماڵەوە سکەیەکی زیوی پێدەدا و ئاڵقە گوڵەکانی پرسە، کە ئەو لە ماوەی حەفتەدا سازی کردبوون لە ماڵەوە دەبردنە دەرێ. زۆرتری کاتەکانی خۆی لە دەفتەری کارەکەیدا دەمایەوە و زۆر کەم لە ماڵەوە دەچووە دەرێ، پێش سەعاتی شەش دەگەڕایەوە هەتا فێرناندای لە رێوڕەسمی تەسبیحدا رێنوێنی بکا.

فێرناندا قەت لەگەڵ کەس نەبوو بە هاوڕێ و هیچ کات سەبارەت بەو شەڕانەی کە خوێنی وڵاتیان دەڕشت شتێکی نەبیست و درێژەی بە دەرسی پیانۆدا، کە لە سەعاتی سێی پاشنیوەڕۆ دەست پێدەکرا. هیوای شاژن بوونیشی لە دڵ دەرهاویشتبوو، کە دەنگی دوو زەربەی توندی لە دەرگای ماڵەوە گوێ لێ بوو. لە سەر روومەتی پیاوەکە جێ برینێک و لە سەر سینگی میداڵێکی زێڕ دەبیندرا. پیاوەکە و باوکی لە دەفتەری کاری باوکیدا بەتەنیا مانەوە. دوو سەعات دوایی، باوکی لە ژووری بەرگدروون هاتە لای

و وتی: "شتەکانت کۆکەوە، دەبێ بڕۆیە سەفەرێکی درێژخایەن." هەر ئەوە بوو کە ئەویان بردە ماکۆندۆ.لە ماوەی رۆژێکدا، قورسایی هەموو ئەو راستییانەی کە دایک و باوکی ساڵەهای ساڵ لێیان شاردبۆوە بە زللەیەکی زەمانە بۆی ئاشکرا بوو. کاتێ گەڕایەوە ماڵەوە، بێ موبالات بە پاڕانەوە و پرسیارەکانی دۆن فێرناندا کە تێدەکۆشا برینی ئەو گاڵتە بڕوا پێ نەکراوە تیمار بکا، دەرگای ژوورەکەی لە سەر خۆی داخست و دەستی کرد بە گریان.

سوێندی خواردبوو هەتا مردن پێ لەو ماڵە نەباتەدەرێ، بەڵام ئۆرلیانۆی دووهەم بە شوێنیدا هات. بەختەوەرییەکی چاوەڕواننەکراو بوو، چونکە فێرناندا، لە هەڵلای زیزبوون و توورەیی شەرمدا بنە و بنەچەکەی خۆی بە درۆ بەو وتبوو. تەنیا نیشانەیەک بۆ ناسینی ئەو کە لە دەست ئۆرلیانۆدا بوو، زاراوەی توندی خەڵکی باکوور و دروستکردنی ئاڵقەگوڵ بۆ بەڕێکردنی جەنازەی مردووان بوو، بێ لەدەستدانی یەک ئانیش بە دوایدا گەڕابوو. بەو بێباکی و لەخۆربووردووییەی کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بۆ دۆزینەوەی ماکۆندۆ لە چیا تێپەڕ ببوو و بەو باغرییە کوڕانەی کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆبویندیا شەڕەکانی دەست پێکردبوو و بە هەمان پێداگرتن و سەرسەختییە شێتانەێ کە ئۆرسوڵا درێژەی نەوەی داهاتووی دەسەلماند، ئۆرلیانۆی دووهەم بە بێ وەستان بە دوای فێرناندا دا گەڕا. کاتێ پرسی باشترین تاجەگوڵ لە کوێ دەفرۆشن، ماڵ بە ماڵ گێڕایان هەتا جوانترین تاجەگوڵ هەڵبژێرێ، کاتێ پرسیاری جوانترین ژنی جیهانی کرد، هەموو ژن و کچەکانیان بە بەرچاودا گێرا. لە جادەکانی تەماوی و لە زەمانەکانی لەبیرکراوە و لە پێچاوپێچەکانی بێ هیوایی و ناهۆمێدی دا خۆی گوم کرد. بە بیابانێکی زەرددا تێپەڕی، کە بیر لەوێدا هەڵدەگەڕایەوە و نیگەرانی تراویلکەی داهاتوونوێنی پێک دەهێنا. دوای رابردنی چەند حەوتووی بێ ئەنجام، گەیشتە شارێکی نەناسیاو کە هەموو ناقووسی کڵێساکان بە هەوای مەرگ وەدەنگ هاتبوون. هەرچەند ئەوێی نەدیتبوو و کەسیش بۆی باس نەکردبوو، بەڵام هەر کە گەیشتێ ئەوێی ناسی. دیوارەکانی بە وردە ئێسقان دروست کرابوون و باڵکونی دار و هەیوانی

وێـران بـوو کە بە کـارگ و گەروو داپۆشـرابوو، لە سـەرووی دەرگـای هاتنەژوور، خەمهێنەرترین تابلۆی دونیا کە لەبەر بارانە کاڵ و شۆڕابۆوە دەبینرا: "تاجەگوڵ بۆ ڕێوڕەسمی گۆڕکردن دەفرۆشرێ." لەو دەمەوە، هەتا بەیـانیی ساردوسـڕ کە فێرنانـدا مـاڵەکەی بە دایکـی ڕۆحـانی ئەسـپارد. خوشکانی ڕۆحانی بەزەحمەت پێڕاگەیشتن جلە جیازییەکانی بۆ بدروون و شـەمدانەکان و قـاپە زیوینەکـان و لەگەنە زێـڕەکە و پاشـماوەی بێکەڵکـی شـتومەکی دوو سـەد سـاڵەی بنەمـاڵە، لە شـەش سـندووق بـاوێژن. دۆن فێرنانـدا داوای ئەوانـی بـۆ ئەوەی لەگەڵـی بچـن ڕەت کـردەوە و قەوڵـی دا دوای یەکلاییکـردنەوەی حیسـابەکان بگەڕێـتەوە بـۆ لایـان. دوای ئەوەی دوعای بۆ کچەکەی کرد، دەرگای دەفتەری کارەکەی لە سەر خۆی داخست هەتا بۆ کچەکەی لە سەر ئەو کاغەزانەی کە نەخشی تازیەبارانەی بنەماڵەی لە سەر بوو نامە بنووسێ، ئەو نامانە هەوەڵین پێوەندیی مرۆڤانە بوون کە لە نێوان فێرنانـدا و بـاوکی دا پێـک هـاتن. بـۆ فێرنانـدا لە دایکبـوونەوەیەکی دیـکە دەسـتی پێکردبوو و، نزیـک بەو زەمـانی لە دایکبـوونە، بـۆ ئۆرلیـانۆی دووهەم دەورانی بەختەوەری کۆتایی هاتبوو.

- فێرنانـدا ڕۆژمێرێکـی جوانی هەبـوو کە دەرگـای بە کلیلێکـی بچکـۆڵانەی زێـڕ دادەخـرا. ئەو ڕۆژژمێـرە ڕاوێژکـاری ڕەوشـتی ئەو بـوو. ئەو ڕۆژانەی کە نەدەبـــوو لەگەڵ مێـــردەکەی خەوتبـــا بە مەرەکەبـــی وەنەوشـەیی نیشـانەی کردبـوون: حەفتەی پیـرۆز، پشـوودانی ڕەسـمی. هەوەڵـین هەینیـی هەر مانگێـک، ڕۆژی شـەهیدبوونی چاکـانی خـودا و. ڕۆژانی عادەتی مانگانە. سـەرەنجام ئەوەی لە سـاڵێکدا بۆ ئەو دەمـایەوە تەنیا چل و دوو ڕۆژ بوو، کە لە نێوان خەتەوەنەوشـەییەکاندا دەتگوت تاری جاڵجاڵۆکەیە. ئۆرلیـانۆی دووهەم بەو بـاوەڕە کە تێپەڕینی زەمـان ڕایەڵ و پـۆی تـوورەیی لە بەریەک هەڵـدەدرێ، جێژنـی زەماوەنـدی دواخست. ئۆرسـۆلا، کە لە فرێدانی ئەو هەموو بوتڵە خاڵییە کۆنیـاک و شـامپانییە مانـدوو ببـوو، کـاتێ زانـی بـووک و زاوا لە کـاتی جیاجـا و ژووری جیادا دەخەون، هەروا کە دەنگی ئاگربـازی و مۆسـیقا دەهـات و حەیوانیـان سـەر دەبـڕین، تـاقیکردنەوەی تـاڵی خـۆی بیـر کەوتەوە و لە

خۆی پرسی؛ رەنگە فێرنانداش تنووکەیەکی دەبەردا بێ کە لە پێشەوە قفڵ بکرێ و زوو یان درەنگ دەبێتە هۆی گەپچاڕی شار و سەرەنجام کارەساتێک دەقەومێنێ. بەڵام فێرناندا راستییەکەی پێگوت کە تەنیا چاوەڕوانە دوو حەوتووی یەکەم رابرێ هەتا ئەو بتوانێ لە لای مێردەکەی بخەوێ. لە راستیشدا لەگەڵ تەواوبوونی ماوەکە، وەک حەیوانی تەسلیم و بێ ئیختیار دەرگای ژووری خەوی بۆ مێردەکەی کردەوە و ئۆرلیانۆی دووهەم چاوی بە جوانترین ژنی سەر رووی زەوی کەوت. چاوە یەکجار جوانەکانی دەتگوت چاوی جانەوەرێکی ترساوە و، بسکی درێژ و بریقەداری لە سەر سەرین بڵاوببۆوە. ئۆرلیانۆی دووهەم ئەوەندە نوقمی ئەو دیمەنە ببوو، بۆ دەمێک نەیزانی فێرناندا کراسێکی خەوی سپی پۆشیوە کە دەگاتە سەر قولەپێیانی و سەردەستەکانی داخستووە و لە خوارەوە، نێوکی کونێکی گەورەی خڕی تێدایە کە دەوران دەوری بە وردی دووراوە. ئۆرلیانۆی دووهەم نەیتوانی پێشی پێکەنینی خۆی بگرێ.

بە قاقایەک، کە لە هەمووماڵەوەدا دەنگی دایەوە، نەڕراندی: 'ئەوە ناحەزترین شتێکە کە لە عومرمدا بینیومە: نەمدەزانی لەگەڵ "تەرکەدنیا"یەک زەماوەندم کردووە.'

مانگێک دواتر، کاتێک نەیتوانی هاوسەرەکەی بە فڕێدانی ئەو کراسە خەوە رازی بکا، وێنەی پیترا کۆتیسی لە لیباسی شاژندا کێشا. دوایی کاتێک فێرناندای رازی کرد بگەڕێتەوە ماڵەوە، ژنەکەی لە بەر خۆشیی زۆری ئاشتبوونەوەدا تەسلیمی هەوەسی ئەو بوو، بەڵام نەیتوانی بەو ئاسوودەییەی بگاتەوە کە کاتێک بە دوای کەوتبوو بۆ شاری سی و دوو ناقووس، ئاواتی بۆ خواستبوو بیدۆزێتەوە. ئۆرلیانۆی دووهەم تەنیا نەوعێک هەستی پەژارەیی قووڵی لەودا بەدی کرد. شەوێک کەمێک پێش ئەوە هەوەڵین منداڵیان ببێ، فێرناندا تێگەیشت کە مێردەکەی گەڕاوەیەوە باوەشی پیترا کۆتیس.

ئۆرلیانۆی دووهەم ددانی پێدا نا و وتی: "بە خاتری فڕێدانی توڵەسەگەکان گەڕاومەوە بۆ لای."

ماوەیەکی پێچوو هەتا توانی ئەو مەسەلەیە، کە بەرژەوەندیی تێدا بوو لەو بگەیەنێ. سەرەنجام بە بەڵگەی حاشاهەڵنەگر پێی سەلماند. تەنیا قەولێک فێرناندا لێی وەرگرت ئەوە بوو کە کارێکی ئەوتۆ نەکا لە جێگا و بانی گراوییەکەیدا بمرێ. بەوجۆرە ئەوانە بێ ئەوەی گیروگرفتێک بۆ یەکتر پێک بێنن درێژەیان بە ژیانی خۆیان دا. ئۆرلیانۆی دووهەم لەگەڵ هەردووکیان دۆست و خۆشرەفتار بوو، پیترا کۆتیس لەو سەرکەوتنە بە خۆی دەنازی و فێرناندا وای دەنواند کە لە راستی رووداوەکە بێ خەبەرە.
لەگەڵ ئەوەشدا، فێرناندا نەیتوانی دڵی بنەماڵەی بەدەست بێنێ. ئۆرسوڵا بە خۆڕایی پێی دادەگرت کاتێک دوای سەرجێیی لە جێگا دێتەدەرەوە، ئەو کراسە خەوە ئاوریشمییەی دابنێ، هەتا نەبێتە هۆی قسە و قسەلۆکی هاوسێکان. نەیتوانی فێری بکا بچێتە ئاودەست یان لەگەنی ئاسایی بەکار بێنێ و لەگەنە زێڕەکە بە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بفرۆشێ هەتا ماسیی زێڕی بچکۆڵەی پێ دروست بکا. ئامارانتا لە زاراوەی ناخۆشی ئەو و ئەو عادەتەی هەموو شتێک بە زمانی زێڕنگەری دەڵێ، نارەحەت بوو، چونکە لە لای ئەو بە زمانێکی زێڕنگەری، کە ئەو نەیدەزانی قسەی کرد.
دەیوت: "ئێڤین ئەفزاوفۆنائۆفسێت کەفە بفەکۆفۆ نفەشۆفۆن میفی گفەن باڤا مفن نەف یافا بووفو میفیدیەفی."
رۆژێکیان، فێرناندا کە دڵی زۆر لەو گاڵتەپێکردنە ئێشابوو، ویستی بزانی ئامارانتا دەڵێ چی و ئامارانتا لە جیاتی زمانی زێڕنگەری بە زمانی ئاسایی وەڵامی دایەوە، وتی: "دەڵێم تۆ لەو کەسانەی کە بە کونگیان دەڵێن لەگەڵمان مەیە بۆنت دێ."
لەوە بەدوا هیچ کات بە یەکەوە قسەیان نەکرد و، لەو کاتانەشدا کە دەبوایە شتیک بڵێن نامەیان بۆ یەکتر دەنووسی. لەگەڵ دژایەتیی ئاشکرای بنەماڵەش، فێرناندا دەستی لەوە هەڵنەگرت رێورەسمی باوانی بە سەر ئەواندا بسەپێنێ. عادەتی "نان خواردن لە ئاشپەزخانە و بە پێی ئیشتیای هەر کەسێک"ی تێک دا. ئەوانی ناچار کرد لە سەعاتی دیاریکراودا، لە سەر مێزێکی گەورە لە ژووری نەهارخۆری، لە سەر روومێزی کەتانی لە بەر رووناکایی شەمدانی زیو، بە کارد و چەنگاڵی زیو نان بخۆن. قرقێنە

هاتنەوە، کە ئۆرسـۆلا پێی وابوو سادەترین کردەوەی ژیانی رۆژانەیە، ئەوەندە وەزعێکی نارەحەتی پێکهێنابوو کە خۆزێ ئارکادیۆی بێدەنگ و گوێ لەمست هەوەڵ کەس بوو سەبارەت بەو وەزعە نارەزایی دەربڕی. بەڵام ئەو دابە وەک دابی تەزبیحات و و دوعاکردنی پێش خواردنی شام دامەزرابوو و سەرنجی هاوسێکانی راکێشابوو. هێندەی پێ نەچوو دەنگۆ پەیدا بوو کە خاو و خێزانی بویندیا بە پێچەوانەی خەڵکی دیکە، نان خواردنیان کردۆتە رێورەسمی نوێژی بە گۆرانییەوە. تەنانەت خورافاتی ئۆرسۆلاش، کە لە لەخواترسیی ئاینەوە سەرچاوەی دەگرت، گەرچی وەک دابیشیان چاولێدەکرا،بەڵام لە بەرامبەر خورافاتی فێرناندا کە لە دایک و باوکی بۆی بەمیرات مابۆوە و، رێزی نەگیرا و تێکشکا. هەتا ئەو کاتەی کە ئۆرسۆلا دەسەڵاتی تەواوی بەدەستەوە بوو هێشتا هێندێک لە داب و رەسمی کۆن بەرێوە دەچوون و، ژیانی بنەماڵە لە ژێر کارتێکردنی ئەودا بوو، بەڵام بە لەدەستدانی توانای بینایی و پیرییەکی پەککەوتەیی، بازنەی نەزمێکی، کە فێرناندا لە رۆژی هەوەڵی هاتنییەوە داینابوو، بەسترا و، چارەنووسی بنەماڵەی بەخۆیەوە گرێ دا. فرۆشی شیرنی و ئاوی نەباتی شێوە ئاژەڵی گچکە، کە سانتا سۆفیا دیلا پێداد لە سەر داوای ئۆرسۆلا درێژەی پێدەدا، فێرناندا بە تەواوی قەدەغەی کرد. بە بڕوای ئەو، ئەو کارە شیاوی بنەماڵەی ئەوان نەبوو. دەرگاکانی ماڵەوە، کە لە بەیانییەوە هەتا شەو کاتی نووستن لە سەر پشت ئاوەڵا بوون، کاتی خەوی پاشنیوەڕۆیان بەوبیانووەی گەرمای هەتاو هەوای ژووری خەوەکان خرا دەکا بەستران و سەرەنجام بۆ هەمیشە داخران. لکی زەیتوونی پیرۆز و کولێرەنانێک، کە لە زەمانی دروست بوونی ماکۆندۆوە بە سەردەرانەی ماڵەوەیان هەڵواسیبوو، بە شەمایلی "دڵی پاکی مەسیح" گۆڕدرا. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کە بەجۆرێک لەو ئالوگۆڕە گەیشتبوو، پاشەرۆژی بنەماڵەی پێشبینی کرد و نارەزایی دەربڕی و وتی: "وا دیارە دەبین بە خەڵکێکی بەرێز. ئەگەر هەر بەوجۆرە بچینە پێش، سەرەنجام جارێکی دیکەش لەگەڵ حکوومەتی پارێزەران بەشەڕ دێین، بەڵام ئەوجارەیان بۆ ئەوەی پاشامان هەبێ." فێرناندا بە زیرەکییەوە وریای ئەوە بوو لەگەڵ ئەو تێوە نەگلێ.لە دڵی

خۆیدا لە سەربەخۆیی ڕەوشتی ئەو و خۆڕاگریی لە بەرامبەر هەر جۆرە نەزمێکی کۆمەڵایەتیدا نارەحەت بوو. لە دەست قۆری قاوەی سەعات پێنجی بەیانیانی و تێکەڵ و پێکەڵی کارگەکەی، لە شەروالی دۆخین بەدەرەوە و عادەتی دانیشتنی بانگی شیوانی لە پێش دەرگا، شێت دەبوو. بەڵام دەیزانی بۆ ڕێکوپێککردنی ماڵەوە نابێ بەنی خۆی لە بەنی ئەو بەستی، چونکە دڵنیا بوو سەرهەنگی پیر، هەر چەندە بە تێپەڕینی زەمان و لە ئەنجامی خەم و ناهومێدیدا ببوو بە جانەوەرێکی ماڵی، بەڵام بەو حاڵەش دەتوانێ بە تەقاندنەوەی ڕاپەڕینی باپیری بناخەی ماڵەوە لە بەریەک هەڵتەکێنێ. کاتێ مێردەکەی بڕیاری دا ناوی باپیری لە منداڵی یەکەمیان بنێ، چونکە تازە ساڵێک بوو هاتبووە ئەوێ، نەیوێرا دژی ڕاوەستێ، بەڵام کاتێک یەکەم کچیان لە دایک بوو ڕای خۆی بەڕاشکاوی دەربڕی و، لێبڕا ناوی دایکی خۆی "ڕێناتا"[1] لە سەر منداڵەکە دابنێ.

ئۆرسۆلا پێی خۆش بوو ناوی منداڵەکە ڕێمیدیۆس بێ. سەرەنجام دوای وتووێژێک کە ئۆرلیانۆی دووهەم بە پێکەنین و گاڵتە بوو بە نێوبژیکەر، ناوی منداڵەکەیان نا ڕێناتا ڕێمیدیۆس[2]، بەڵام فێرناندا تەنیا بە ناوی ڕێناتا بانگی دەکرد و بنەماڵەی مێردەکەی و خەڵکی شار پێیان دەوت مەم، ناوی کورتکراوەی ڕێمیدیۆس.

سەرەتا، فێرناندا لە بنەماڵەی خۆیان نەدەدوا، بەڵام بە تێپەڕبوونی زەمان باسی باوکی دەست پێکرد. لە سەر مێز، وەک کەسێکی نائاسایی باسی دەکرد کە لە هەموو سەروەت و سامانی دونیا چاوپۆشی کردبوو خەریک بوو ببێ بە پیاوێکی پاک. ئۆرلیانۆی دووهەم ،کە لەو هەموو باسەی باوکی ژنەکەی سەری سووڕمابوو، پاشملە سەرزەنشتی ژنەکەی کرد و بنەماڵەکەشی چاویان لەو دەکرد. تەنانەت ئۆرسۆلا کە هەموو کۆششی خۆی بەکار دەهێنا هەتا هاودەنگیی بنەماڵە بپارێزێ و بە دزییەوە لە شێواویی بنەماڵەکەیان نارەحەت بوو، جارێک ئیجازەی بە خۆیدا کە بڵێ

---

[1] – Renata

[2]– RenataRemedios

دوارۆژی قەشــە بە بــوونی نەتیــژەکەی دابــین بــووە. چــونکە: 'ئەوەی پیاوچاکێک و کوڕی شاژن و دژی حەیواناتە." لەگەڵ تەوسی شاراوە لەو زەردەخەنــانەدا منداڵەکــان عادەتیــان بەمەوە گــرت کە باپیریــان بە بــوونەوەرێکی ئەفســانەیی بــزانن، کە لە نامەکانیــدا شــیعری مەزهەبــی دەنووسێ و هەموو جێژنی کریسمەسان سندووقێک دیارییان بۆ دەنێرێ، بەزەحــمەت لە دەرگــای مــاڵەوە دێــتەژوورەوە. لەراســتیدا ئەو دیارییــانە پاشماوەی ســەروەت و سامانی زۆری با و باپیرانی ئەو بوو. منداڵەکان لە ژووری خەودا بەو دیارییانە نوێژگەیەکیان دروست کرد و، ئەوێیــان بە هەیکەلــی پاکــان رازانــدەوە، کە بە ئەنــدازەی سروشــتی و چــاوی شووشەییەوە وەک ئینسان دەچوون و، لیباسی بەنرخی دەست دروویان لە لیباسی هەموو خەڵکی ماکۆندۆ جوانتر بوو. دیمەن و شکۆی تازیەباری ئەو کۆشــکە ســارد و قەدیمیــیە بەرەبەرە بــوو بە کۆشــکێکی پڕنــووری بنەمــاڵەی بویندیا. جارێکیان ئۆرلیانۆی دووهەم وتــی: 'ئێســتا کە هەمــوو گۆڕەکانی بنەماڵەیــان بــۆ نــاردووین، تەنیــا چەنــد بەردی گــۆڕ و دارەبــی مەجنوونمــان کەمە." ئەگەرچــی لەو ســندووقانەدا شــتێک نەدەبینــرا کە منداڵەکان بتوانن یــاریی پــێ بــکەن، بەوحــاڵەش هەمــوو ســاڵێ چاوەڕوانی مــانگی دێســەمبەر بــوون، چونکی دیــاری قەدیمــی و پێشــبینی نەکراو، هەر چۆنێک بێ شــۆر و شــادی لە مــاڵەوە دەخوڵقاند. لە دەهەمــین کریسمەســدا کاتێک خۆزێ ئارکادیۆی بچکۆلانە ئامادە بوو بۆ بۆ خوێندن بچێتە قوتابخــانەی فەقێیــان، ســندووقی گەورەی دیــاری بــاپیری زووتــر لە کــاتی دیــاریکراوی هەمیشــەیی گەیشــتێ. ســندووق، بەوردی بزمــارڕێژ و دژی نمکێشــان قیــل درابــوو و بە دەســتخەتی هەمیشــەیی بە نیشــانی "ســەرکاری بــاڵا خــانمی فێرناندا کارپیۆ بویندیا." نێردرابوو. لەو کاتەدا کە فێرناندا لە ژووری خەودا نــامەکەی دەخوێنــدەوە، منداڵەکــان بەپەلە خەریکــی کــردنەوەی دەرگــای سندووقەکە بوون. هەروەک جاران بە یــارمەتیی ئۆرلیانۆی دووهەم لاکــی قیلەکەیان شکاند و دەرگای بزمــارڕێژی سندووقەکەیان هەڵوەشــاند و دوای ئەوەی ئاردەداریان دەردا، لە نێو سندووقەکەدا سندووقێکی مــزی درێژیــان دۆزییەوە کە دەرگای بە قوفڵی ئاسن داخرابوو. هەروا کە منداڵەکان بە بێ

سـەیری وەسـتابوون، ئۆرلیـانۆی دووهەم هەشـت قوفڵەکـانی کـردەوە و دەرگای سندووقە مزەکەی کردەوە. بە دوایدا هـاوارێکی کرد و مناڵەکانی وەلان. دۆن فێرنانـدۆ کـوت و شــەلواری رەشـی پۆشـیبوو و لە نـاو سندووقەکەدا درێژ ببوو. لە سەر سینگی خاچێک دەبینرا و گۆشتی لەشی کە لە بەر برین رزیبوو، لە نێو ئـاگرێکی هێدی و شـڵەتێنێکی پڕکەفدا کە بڵقەکانی وەک مرواری دەچوون دەکوڵی.

زۆر دەمێـک نەبـوو کچەکەیـان لەدایـک ببـوو کە لە لایەن دەوڵەتەوە دەستوورێکی چاوەڕواننەکراو دەرچوو، کە بۆ رێزگرتنی پەیمانی نێرلاندیا ساڵرۆژی لەدایکبوونی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا جێژن بگرن. ئەو بڕیارە ئەوەندە لەگەڵ وەزعی سیاسی ناجوور بوو کە سـەرهەنگ بە تووڕەییەکی زۆرەوە دژایەتیی خۆی راگەیاند و ئەو رێزگرتنەی رەت کردەوە. دەیوت: "یەکەم جارە کە وشەی ساڵرۆژ بە گوێم دەگا، بەڵام ماناکەی هەرچی دەبێ ببێ، شـتێکی پڕوپووچە." کارگـای زێـڕنگەری ئەو پـڕ بـوو لە نـوێنەرانی دەوڵەت. نوێنەرانێک کە لە رابردوودا بە لیباسی رەشی خۆیان وەک دەستە قەلەڕەشـێک دەوری سـەرهەنگیان دابـوو، پیرتـرین و بەرێزتـر لە جـاران گەڕابوونەوە. کاتێ سەرهەنگ لە هاتنیان ئاگادار بوو، هەروەک ئەو کاتە کە هاتبوون پەیمانی ئاشتی پێشنیار بکەن، نەیتوانی پێ هەڵاگوتنی درۆزنانەیـان هەڵگرێ و دەسـتووری دا وازی لـێ بێنن. لێبـڕاوانە وتـی پێچەوانەی رای ئەوان، ئەو "باوکی نیشتمان"نییە، بەڵکو تەنیا سەنعەتکارێکی بێ بیرەوەرییە کە تەنیـا ئـاواتی ئەوەیە لە نێـو فەرامۆشـی و بەدبەختـی ماسـییە زێـڕە بچکۆلانەکانیـدا لە مانـدووییان بمـرێ. ئەوەی کە لە هەموویـان زۆرتـر تـووڕەی کـرد ئەوە بـوو قەرار درابـوو سـەرکۆمار بۆخـۆی لە رێورەسـمی ماکۆندۆدا بەشداری بکا و نیشانی لێهاتوویی لە سینگی ئەو بدا. سـەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بێ پینەوپەرۆ وەڵامی بۆ ناردەوە کە بەپەلە چاوەڕوانی ئەو رێورەسمەیە کە زۆر درەنگ بەڕێوە دەچوو. هەتا گوللەیەکی لە سینگیدا بەتـاڵ کـا و، ئەو گـوللەیە نەک لە بەر کـردەوەی سـتەمگەرانە و هەڵەکـانی رێژیمی ئەو بێ، بەڵکو بە خاتری بێ ئیحترامی بە پیرەپیاوێکە کە ئازاری بۆ کەس نییە. ئەوەنـدە ئەو هەڕەشـەیەی بەتونـدی بەیـان کـرد سـەرکۆمار لە

دەقیقەی ئاخردا لە بڕیاری خۆی چاوپۆشیی کرد و نیشانەی لێهاتوویی بە هۆی نوێنەرێکی تایبەتییەوە نارد.
سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز لە هەموو لایەکەوە تینیان بۆ هێنابوو، بە نەخۆشی هەستا هەتا دۆستە ئەرتەشییە دێرینەکەی هان بدا. کاتێ کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا چاوی بەو کەوت بە سەر کورسییەکی راحەتییەوە و چوا باڵنجیان لە دەورەیەوە پێچا و لە سەر شانی چوار کەس بەرەوپێش دێ، تەنانەت بۆ یەک دەمیش گومانی لەوەدا نەما کە دۆستی سەردەمی لاویی ئەو، کەسێک کە لە سەرکەوتنەکان و شکستەکانیدا بەشدار بووە، ئەو هەموو زەحمەت و نارەحەتییەی بۆیە کێشاوە هەتا دۆستایەتی و یەکدڵیی خۆی سەبارەت بەو بسەلمێنێ. بەڵام کاتێک لە مەبەستی راستەقینەی ئەو ئاگادار بوو، لە کارگەکەی خۆی دەریکرد و پێیگوت: "بەداخەوە! درەنگم زانی ئەگەر هێشتبام گوللەبارانت بکەن، چاکەیەکی گەورەم لەگەڵ دەکردی."
ڕێوڕەسمی ساڵرۆژ، بەبێ ئامادەبوونی ئەندامانی بنەماڵە پێک هات. جێژنەکە بە هەڵکەوت لەگەڵ حەوتووی کەرنەڤاڵ یەکیان گرتەوە. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لای وابوو دەوڵەت بەتایبەتی ئەو کارەی کردووە، هەتا گاڵتەپێکردنی خۆی دوو بەرابەر بکا، کەس نەیتوانی ئەو بیرەی لە مێشکی بەرێتە دەرێ. لە کارگا خەمهێنەرەکەی خۆیەوە، گوێی دایە ئەو مارشە نیزامی و سەلامی تەقەی تۆپ و دەنگی زەنگی کڵێسا و چەند رستە لە وتارێک کە بە بۆنەی ناونانی شەقامی بەر دەرگای ئەوان بە ناوی ئەو خوێندرابۆوە. چاوی لە سووکایەتی پێکردن و تووڕەیی و بێهێزی پڕبوون لە فرمێسک و بۆ یەکەمین جار دوای تێشکان بەداخ بوو کە توانای گەنجیی لەدەست داوە و، دەسەڵاتی نییە جارێکی دیکەش شەڕێکی خوێناوی هەڵگیرسێنێ و ئاخرین نیشانەی حکوومەتی پارێزەران لە نێو بەرێ.
دەنگدانەوەی ڕێزلێنان لەو، هێشتا تەواو نەببوو کە ئۆرسوڵا لە دەرگای کارگەی دا.
ئەو وتی: "لێم گەڕێن کارم هەیە."

ئۆرسـوڵا بە دەنگی هەمیشـەیی و ئاسـایی خۆی وتـی: " بـیکەوە، ئەوە هـیچ پێوەندییەکی بە ڕێورەسمی جێژنەوەنییە."
ئەو کات سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا قفڵەکەی هەڵگرت و دەرگاکەی کردەوە و لە بەر دەرگا چاوی بە حەڤدە پیاو کەوت. پیاوەکان ڕواڵەتێکی جیاوازیان هەبـوو و بە قیـافەی جۆربەجـۆر و هەمەڕەنـگ بـوون، بەڵام هەموویـان حـاڵەتێکی تەنیاییيان هەبوو کە لە هەموو دونیایە دەناسرانەوە. کوڕەکانی خـۆی بـوون. بێ ئەوەی پێشـتر لەگەڵ یەک قەرارێکیـان دانـابێ و بێ ئەوە یەکتـر بناسـن، بە بیسـتنی ڕێورەسـمی جێـژنەکە، لە دوورتـرین گوشــە و کەنـاری دەریـاوە لە خـۆوە بـۆ ئەوێ هـاتبوون. هەموویـان بە شـانازییەوە ناویان ئۆرلیانۆ بوو و، ناوی بنەماڵەی دایکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو. سـێ ڕۆژان کە بە پێخۆش بوونی ئۆرسۆلا و ریسوایی فێرناندا لە ماڵەوە مـانەوە. وەک سێ ڕۆژ شەڕ وابوو.
ئامارانتـا لە دەفتەرچەیەکی کۆنەدا کە ئۆرسـۆلا نـاوی هەموویـانی بە ڕۆژی لە دایکبوونەوە و مێژووی (غسل تعمید)ەوە نووسـیبوو، ئادرێسـی ئێسـتای هەموویانی لە پێش ناوەکانیان لێ زیادکرد. ئەو ڕیزە ناوە بەچاکی دەیتوانی بیست ساڵی شەڕ بنوێنێ. لە ڕووی ئەو ڕیزە دەیانتوانی ڕێڕەوی ڕۆیشـتنی شەوانەی سەرهەنگ لە بەرەبەیانییەوە، کە لە نەخشی فەرماندەی بیسـت و یەک پیاو بۆ دەست پێکردنی شـۆڕش ماکۆندۆی بەجێ هێشـتبوو، هەتـا ئەو کـــاتەی کە ئـــاخرین جـــار لە پەتـــوویەکی خوێناویـــانەوە پێچـــابوو و هێنابوویانەوە ماڵی، دیـاری بکەن. ئۆرلیـانۆی دووهەم لەو دەرفەرتە کەڵکی وەرگرت، هەتـا بـۆ کوڕە مامەکانی بـاوکی جێژنێک سـاز بکـا، لەو جێـژنەدا دەنگـی کـردنەوەی سـەری شـامپانییەکان لەگەڵ دەنگـی ئۆکۆردیـۆن یەک بگرێتەوە و، بەدوایدا ئەو جێژنە بەو کەرنەڤاڵە حیسـاب کرا کە بە خـاتری ڕێوڕەسمی ساڵڕۆژ کە دواخرابوو. نیوەی دەورییەکانیان شـکاندن، بە دوای گایەکدا کە دەیانویسـت بیخەسـێنن بنە گـوڵە سـوورەکانیان پڵیشـاندنەوە، تەقەیان لە مریشکان کرد و کوشـتیانن، ئامارانتایـان ناچـار کـرد بە ئاهەنگە خەمهێنەرەکانی واڵسی پیترۆکرێسـپی هەڵپەڕێ، پـانتۆڵێکی پیاوانەیـان دەبەر ڕێمیدیۆسی جوانکیلە کرد و ناچاریان کرد بە دارێکی قیلاوییەوە هەڵزنـێ.

بەرازێکیان سەر لە بەر چەور کردبوو و لە ژووری نەهارخۆری بەرەڵڵایان کرد کە فێرناندا بێ بە ئەرزیدا بدا. بەڵام هیچ کەس لەو هەموو خراپکارییە سکاڵای نەکرد، چونکە ماڵەکە لە بەر بوومەلەرزەی خۆشی و شادی دەلەرزییەوە. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوینديا، کە لە سەرەتاوە بە شک و گومانەوە وەریگرتبوون و تەنانەت لە پێوەندیی ئەوان لەگەڵ خۆیدا دوودڵ بوو، ئەوەندە لە دێوانەبازیی ئەوان خۆشیی هاتبوو کە کاتێ لەوێ ڕۆیشتن هەر کامەی ماسییەکی بچکۆڵانەی زێڕی بەدیاری پێدان. تەنانەت خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی بێدەنگ و گۆشەگیریش، پاشنیوەڕۆیەکی بۆ سەرگەرم کردنی ئەوان بۆ شەڕە کەڵەشێر تەرخان کرد، کە زۆری نەمابوو کارەساتێک بخولقێ، چونکە چەند کەس لە ئۆرلیانۆیەکان ئەوەندە لە شەڕە کەڵەباب دا شەرەزا بوون کە دەسبەجێ فێڵەکانی قەشەئەنتۆنیۆ ئیزابێلیان ئاشکرا کرد. ئۆرلیانۆی دووهەم کە بەختەوەریی لەبڕاننەهاتووی ڕۆژانی رابردووی دیسانەوە لەو خزمە شێتانەی خۆیدا دەدیت، پێشنیاری کرد هەموویان لەوێ بمێننەوە و لەگەڵ ئەودا کار بکەن. تەنیا کەسێکی پێشنیارەکەی قبووڵ کرد ئۆرلیانۆ تریستە[1] بوو: پیاوێکی دووڕەگەی هەیکەل گەورە، کە ئازایەتی و ڕەوشتی توێژینەوەی لە باپیرییەوە بەمیرات بۆ بەجێ مابوو و چارەنووسی خۆی لە نیوەی دونیادا بەتاقی کردبۆوە و بۆ ئەو فەرقی نەدەکرد لە کوێ دەژی. ئەوانی دیکە، هەر چەند هەموویان سەڵت و ڕەبەن بوون، بەڵام گومانیان لە بەسەرهات و چارەنووسی خۆیان نەبوو، هەموویان سەنعەتکارێکی لێزان و پیاوی ماڵەوە و، کەسانی ئاشتیخواز بوون.

ڕۆژی "چوارشەممەی خۆڵەمێش" پێش ئەوەی جارێکی دیکە لە کەنارەکانی دەریا لێک بڵاوبن، ئامارانتا ئەوانی ناچار کرد لیباسی میوانی دەبەر بکەن و دوایی لەگەڵیان ڕۆیشت بۆ کڵێسا. زۆرتر لەوە کە مەزهەبی بن، بۆخۆشی لە بەر میحراب ریزیان بەست و قەشەئەنتۆنیۆ ئیزابێل هەریەکە خاچێکی لە نێو چاوانی کێشان. دوای ئەوە گەڕانەوە ماڵەوە، کاتێ لاوترینیان ویستی خاچەکە لە نێو چاوانی بسرێتەوە، تێگەیشت کە خاچی خۆڵەمێش لە نێو

---

[1]– AurelianoTriste

چاوانی ئەو و هەموو براکانی ماوەتەوە و پاک نابێتەوە. بە ئاو و سابوون و فلّچە و خۆل تاقییانکردەوە و سەرەنجام بە قیلە و بەردەپێ نێوچاوانی خۆیان سوی، بەڵام نەیانتوانی نیشانەی خاچ لە سەر نێوچاوانی خۆیان بسڕنەوە. بەپێچەوانەی ئەوە، ئامارانتا و کەسەکانی دیکە کە ڕۆیشتبوونە کڵێسا، بە بێ بچووکترین گیروگرفت نیشانی نێوچاوانیان شووشتەوە. ئۆرسوّلا کاتێ ماڵئاوایی لێدەکردن وتی: "بەم جۆرە باشترە، لێرە بەدواوە هەموو کەس دەزانێ ئێوە چ کەسانێکن." هەموویان بەیەکەوە لەوێ ڕۆیشتن، ئۆرکێسترا لە پێشیانەوە مۆسیقای لێ دەدا و هێشووی ئاوربازی لە ئاسمان دەتەقینەوە. ئەوان ڕاستییەکیان لەشار بەجێهێشت، ئەوەی سەلماند کە بنەماڵەی بویندیا هێشتا بۆ چەند سەدە تۆ و تۆرەمەیان هەیە. ئۆرلیانۆ تریستە، بەخاچی نێوچەوانیەوە کارخانەی سەهۆڵی دروست کرد. کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە وڕێنەی خۆشی داهێنانەکانیدا ئارەزووی دەکرد.

چەند مانگ دوای هاتنی بۆ ئەوێ، کاتێک هەموو ناسیان و ستایشیان دەکرد،بەدوای خانوویەکدا دەگەڕا کە دایک و خوشکە بێ مێردەکەی خۆی. کە کچی سەرهەنگ نەبوو، بەرێتە ئەوێ. خانوویەکی گەورە کە لە گۆشەی مەیدانێکی چۆڵدا کەوتبوو و بەرەو وێرانی دەڕۆیی سەرنجی ڕاکێشا. کاتێک پرسیاری خاوەنی ئەو ماڵەی کرد، کەسێک وتی ئەو خانووە بێ خاوەنە و لە رابردوودا، بێوەژنێکی تەنیا، کە بە خواردنی گڵ و گەچی دیواران دەژیا و، لەوێدا ژیاوە، لەو ساڵانەی دواییدا تەنیا دووجار لە شەقامیان بینیوە، کڵاوێکی بچکۆلەی لە گوڵی دەسکرد لە سەر و کەوشێکی بە ڕەنگی زیوی کۆنە لەپێ، بە مەیدانیدا رابردووە، هەتا نامەیەک بۆ قەشەی گەورە لە پۆستخانە بەڕێ بکا. پێیان وت تەنیا کەسێک کە لەگەڵ ئەو ژنە ژیاوە، کارەکەرێکی دڵڕەق بووە، سەگ و پشیلە و هەر جانەوەرێکی رووی لەو ماڵە کردبێ، کوشتوویەتی و فڕێی داوەتە شەقام، هەتا بۆگەنیویان خەڵکی ئازار بدا. لەو زەمانەوە کە گەرمای خۆرەتاو لاشەی ئاخرین گیانلەبەری مومیایی کردبوو، ئەوەندە تێپەڕ ببوو کە هەموو کەس دڵنیا ببوو ژنە خاوەن ماڵەکە و کارەکەرەکەی زۆر پێش کۆتایی شەڕ مردوون و، تەنیا

هۆیەک کە خانووەکە ماوەتەوە و نەڕووخاوە، ئەوە بووە کە لەو ساڵانەی دواییدا زستانی سارد و باوبۆرانی توند نەهاتووە.
لاو لاوەکان لە بەر ژەنگی رزیبوون، دەرگاکان تەنیا بە پاڵپشتی تۆپەڵەی زۆری داوی جاڵجاڵووکە خۆیان راگرتبوو، پەنجەرەکان لە بەر نم و شەکێشان نەدەکرانەوە، تەختی زەویی ژوورەکان بە گیاوگوڵە کێویلە داپۆشرابوون و مارمێلکە و کرمی جۆراوجۆر کە لە نێو تیک و کەلێن و قەڵشتان خۆیان حەشار دابوو، هەمووی ئەوانە پێشانیان دەدا کە لانیکەم نیو سەدە دەبێ هیچ ئادەمیزادێک پێی نەناوەتە ئەو شوێنە. بەڵام ئۆرلیانۆ تریستە، لە سەر ئامانجی خۆی سوور بوو و پێویستی بەو هەموو بەڵگەیە نەبوو. بە شان پاڵی بە دەرگاوە نا و دەرگای دار کە مۆرانە و کرم کرمۆڵیان کردبوو، بە بێ هیچ تەقە و شەقە بە تۆفانێک تۆز و خۆڵ و هێلانە مێرووله کەوتە خوارەوە.
ئۆرلیانۆ تریستە لە بەر دەرگا چاوەڕوان بوو هەتا تۆز و خۆڵەکە نیشتەوە، ئەو کات لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا ژنێکی پیسی بینی کە هێشتا لیباسی سەدەی پێشووی دەبەر دایە، لە سەر کاسەسەری رووتاوەی تەنیا چەند هەودا مووی زەرد دیارە. ئاخرین ئەستێرەی هیوای لە چاوە گەورەکانیدا کە هێشتا جوانیی خۆیان پاراستبوو، کۆژابۆوە و پێستی دەموچاوی لە بەر کزانەوەی تەنیایی وشک و چرچ هەڵاتبوو. ئۆرلیانۆ تریستە سەرسام لە دیمەنی دونیای مردووان، لە پڕ بینیی ژنە دەمانچەیەکی کۆنی نیزامیی بەدەستەوەیە و نیشانەی لێ گرتووە.
بە پرتە وتی: "داوای لێبووردن دەکەم."
ژنە لە نێوەڕاستی ژووری پڕ لە کەلوپەلی سەیروسەمەرە، بە بێ جووڵە راوەستا و سەرتاپێی ئەو پیاوە غوولپەیکەرە شان پانەی بست بە بست تەماشا کرد، کە خاچێکی خۆڵەمێشی لە نێوچەوانی خاڵکووبی کرابوو و، لە نێو گەرد و غوبارداا ئەوی لە نێو تەمومژی رۆژانی رابردوودا بەدی کردەوە، کە تفەنگێکی دوو لوولەی بەشانەوە و کۆمەڵێک کەرویشکی راوکراوی بە دەستەوەیە. لە بن لێوانەوە وتی: "خوا هەڵناگرێ ئێستا بەو بیرەوەرییە بێنە لام."

ئۆرلیانۆ تریستە وتی: "دەمەوێ ئەو خانووە بەکرێ بگرم."
ئەو کات ژنە بە دەستێکی بەهێز، دەمانچەی هەڵێنا و لە جاچی خۆڵەمێشی نێوچاوانی نیشانەی گرت و بە ورەیەکی لێبڕاوانە چەخماخی کێشا و فەرمانی دا "لێرە برۆ دەرێ."
ئەو شەوە لە سەر نان خواردن، ئۆرلیانۆ تریستە ئەوەی کە هاتبووەپێشەوە بۆ بنەماڵەکەی گێڕایەوە و ئۆرسوڵا لە بەر خەم و پەژارە دەستی کرد بە گریان و بە هەر دوو دەستان سەری خۆی گرت و وتی: "خوایە! هێشتا زیندووە."زەمان، شەڕ و کارەساتی بێ ئەژماری رۆژانە، ڕێبێکای بەتەواوی لە بیر ئەو بردبۆوە. تەنیا کەسێک، کە تەنانەت بۆ یەک دەمیش فەرامۆشی نەکردبوو کە ئەو هەر ماوە و وردە وردە لەو هێلانە کرمەدا دەرزێ، ئامارانتای قین لە دڵ و پیر بوو.
هەموو بەیانیان، کاتێ دڵساردی، ئەوی لە جێگا و بانی تەنیایی لە خەو هەڵدەستاند، بیری لە ڕێبێکا دەکردەوە، کاتێ زگ و مەمکە چرچبووەکانی سابوون لێ دەدا بیری لە ڕێبێکا دەکردەوە، کاتێک ژێرکراسە سپی و رەقەکان و زگبەندی پیریی دەبەر دەکرد بیری لە ڕێبێکا دەکردەوە، کاتێ شاش و قوماشی رەشی برینی ترسناکی دەستی دەگۆڕی، بیری لە ڕێبێکا دەکردەوە، هەموو دەمێک، لە خەو و بێداریدا، لە کاتەکانی خۆش و ناخۆشدا، هەمیشە بیری لە ڕێبێکا دەکردەوە. تەنیایی بیرەوەرییەکانی دیکە ـ بیرەوەرییە تاڵەکانی ـ خاوێنتر و گەورەتر و ئەبەدیتر کردبوون.
ڕێمیدیۆسی جوانکیلە لە ڕێگای ئەوەوە زانیبووی ڕێبیکا هەیە. هەموو جارێک بە بەر ئەو ماڵەدا، کە خەریک بوو دەڕووخا رادەبردن، ئامارانتا داستانێکی تاڵ و پڕ لە بێزاریی بۆ باس دەکرد، هەتا بەوشێوەیە نەوەی براکەی بەشداری ئەو رق و قینە لە زیادبوونەبێ و دوای مردنیشی درێژەی هەبێ، بەڵام لە نەخشەکەیدا سەرنەکەوت، چونکە ڕێمیدیۆسی جوانکیلە سەبارەت بە هەموو جۆرە هەستێکی ئاشقانە، بەتایبەتی هەستی کەسانی دیکە بێ موبالات بوو. ئۆرسوڵا کە بە پێچەوانەی ئامارانتا رەنجی کێشابوو، ڕێبێکای بە یادێکی دوور لە هەموو خراپە و ناپاکییەک یاد دەکردەوە. بیرەوەریی منداڵێکی شایانی بەزەیی، کە بە کیسەیەک پێشە و

ئێسکی دایک و باوکی هاتبووە ماڵەوە، بە سەر بیرەوەریی ئەو نارەحەتییە، کە شایانی نەزانیبوو لە شەجەرەنامەی بنەماڵەدا بیگونجێنێ، زاڵ دەبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم بڕیاریدا بیباتە ماڵی خۆیان و چاوەدێری لێ بکا، بەڵام نەخشەی بێ خەوشی ئەو لە بەرامبەر ورەی سەختی ڕێبێکادا سەری نەگرت. ڕێبێکا کە ساڵانی تەمەنی خۆی لە ڕەنج و چارەڕەشیدا تێپەڕ کردبوو، هەتا بگاتە دەسکەوتی تەنیایی، ئامادە نەبوو دەست لە ژیانی تەنیایی هەڵگرێ و هێمنایەتی ساڵانی تەمەنی پیری بە بەزەیی بە درۆ و ناچاری تێک بدا.

لە مانگی فێورییەدا، کاتێک شازدە کوڕی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، کە هێشتا نیشانەی خاچی خۆڵەمێشیان بە نێوچاوانەوە مابوو، گەڕانەوە، ئۆرلیانۆ تریستە لە نێوان باسی شادی و خۆشی سەبارەت بە ڕێبێکا لەگەڵ ئەوان دوا و، ئەوان لە ماوەی نیوەڕۆژێکدا، ڕووکاری دەرەوەی ماڵەکەی ڕێبێکایان چاک کردەوە و ڕەنگی شاد و ڕووناکایان لێدا و دەرگا و پەنجەرەکانیان گۆڕی و بن دیوارەکانیان چیمەنتۆ تێ کردەوە، بەڵام نەیانتوانی ئیجازە وەربگرن کاری چاککردن و ڕێکوپێکی نێوماڵەکە درێژە بدەن. ڕێبێکا تەنانەت نەهاتە لای دەرگاکەوە، وازی لێ هێنان هەتا ئەو هەرەوەزە شیتانە کۆتایی پێ بێنن، ئەو کات حیسابی کرد کە چەندەی خەرج هەڵگرتووە و ئارخیندا[٥]ی کارەکەری پیری، کە هێشتا لە لای مابوو، بە مستێک سکە، کە دوای ئاخرین شەڕ لە برەوکەوتبوون و ئەو وایدەزانی نرخیان ماوە، نارد بۆ لایان. ئەو کات تێگەیشتن کە چەندە لە ڕاستییەکانی جیهان دوور کەوتۆتەوە و هەتا گیانی لەبەر دایە، ڕزگارکردنی لەو قاپێلەکە چەنەبازەی ئیمکانی نییە.

لە چاوپێکەوتنی دووهەم جار، کە کوڕانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە ماکۆندۆ کردیان، یەکی دیکە لەوان، ئۆرلیانۆ سینتێنۆ[٦] لەوێ مایەوە، تا لەگەڵ ئۆرلیانۆ تریستە کار بکا. ئەو یەکێک لە هەوەڵین منداڵەکان بوو کە بۆ ڕێورەسمی (غسل تعمی) هێنابوویانەوە ماڵەوە. ئۆرسۆلا و ئامارانتا

[٥]- Argendya

[٦]- AurelianoCenteno

بەچاکی وەبیریان دەهاتەوە. چونکە لە ماوەی چەند سەعاتدا، ئەوەی شتی شکانێ بوو، دەیشکاند. پیاوێکی مامناوەندی و ئاو لەروو بوو، کە زەمان پێشی بلووغی سەرەتایی جەستەیەکی کەتەی هەبوو. بەوجۆرەش توانای شکاندن لەودا وەک خۆی مابۆوە. بەبێ ئەوەی تەنانەت دەست لە ژێر پیلان بدا،ئەوەندەی ژێرپیاڵە شکاند کە فێرناندا بڕیاری دا پێش ئەوە ئاخرین پارچە قاپوقاچاخی بە قیمەتی چینیی ئەو ورد بکرێ، هەندێ قاپ و قاچاخ و دەوریی مسی بکرێ، بەڵام ئەو دەورییە ئاسنانەش زۆری نەخایاند تێک قوپان و لەت بوون. بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو هێزە ناچارییە،

کە بۆخۆشی پێیەوە نارەحەت بوو، ئەوەندە بە ئەدەب و دڵسۆز بوو کە دەسبەجێ دۆستایەتی و خۆشەویستیی هەموویانی بۆ لای خۆی رادەکێشا. توانای کاری لەوپەڕی دابوو. لە ماوەیەکی کورتدا بەرهەمی سەهۆڵی کارخانەی ئەوەندە زۆر کرد کە لە بازاڕی نێوخۆیی زیادبوو، ئۆرلیانۆ تریستە کەوتە ئەو بیرەوە کە بازرگانی لەگەڵ شارەکانی دیکەی ناوچەی باتلاق (زەڵێ) پەرە پێ بدا. ئەو کاتی بوو کە بیری لە نەخشەیەکی بنەڕەتی کردەوە. نەتەنیا لە بەر نوێکردنەوەی کارخانەی سەهۆڵسازیی خۆی، بەڵکو بۆ بەرقەرارکردنی پێوەندی لە نێوان ماکۆندۆ و شوێنەکانی دیکەی جیهان.

**وتی: "دەبێ بۆ ئێرە ڕێگای ئاسن بکێشین."**

**خەڵکی ماکۆندۆ یەکەم جار بوو ئەو وشەیان دەبیست. ئۆرسوڵا کاتێ ئەو گەڵاڵەیەی بینی، کە** ئۆرلیانۆ تریستە لە سەر مێزەکە کێشای _ گەڵاڵەیەک کە راستەوخۆ لە نەخشەکانی خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا دەچوو کە پرۆژەکانی خۆی سەبارەت بە شەڕەکانی هەتاوی بەوشێوە خەیاڵییە وێنادەکرد. گومانی لێبوو بە راست کە مێژوو دووپات دەبێتەوە. بەڵام ئۆرلیانۆ تریستە. بە

پێچەوانەی باپیری خۆی، نە خەو و خواردنی لە خۆی حەرام کرد و نە بە هاوار و رووگرژی کەسی ئازار دا. گرانترین پرۆژەی بەجۆرێک لە بەرچاو دەگرت کە بەزوویی دێتە دی. حیسابەکانی سەبارەت بە خەرج و تاریخی جێبەجێ کردن ورد و بنەڕەتی بوون و، پرۆژەکانی خۆی بێ ئەوە سەر لە کەسێک بشێوێنی، تەواو دەکرد. ئۆرلیانۆی دووهەم، شتێکی، کە لە باپیری

بەمیرات بردوو _ شتێکی کە لە سەرھەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کەمیی ھەبوو_ سەبارەت بە سەرنەکەوتن و تێشکان ئەوەندە وردنەبوو. ھەر بەو حاڵەتە ئاساییەی کە بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژەی پووچی کەشتیرانی پارەی دابوو بە براکەی، پووڵی دا ھەتا ڕێگای ئاسن بۆ ئەوێ بێنن. ئۆرلیانۆ تریستە، دوای ئەوە چاوی بە ڕۆژژمێردا گێڕا، چوارشەممەی دواتر لەوێ ڕۆیشت بۆ ئەوەی دوای وەرزی باران بگەڕێتەوە. ھەتا ماوەیەکی زۆر ھەواڵێکی نەبوو. ئۆرلیانۆ سینتینیۆ، کە لە بەرھەمی زۆری کارخانەی سەھۆڵ نیگەران ببوو، بەرھەمی سەھۆڵی لە جیاتی ئاو، بە ئاوی میوە تاقیکردبۆوە و بێ ئەوەی ویستبی، یان پێشتر بیری لێ کردبێتەوە، مادەی ئەسڵیی بەستەنیی دۆزیبۆوە. لە بەر ئەوەی ھیچ نیشانەیەک لە گەڕانەوەی براکەی نەبوو، لێبڕا لە بەرھەمی کارخانەیەک، کە ئێستا بە ھی خۆی دەزانی، گۆڕانێک پێک بێنێ. وەرزی باران کۆتایی ھاتبوو ھەر سێ مانگی ھاوینێ بێ ئەوەی خەبەرێک لەو دەست کەوێ تێپەڕیبوو. سەرەتای زستانێ، ژنێک کە لە گەرمترین سەعاتی ڕۆژێدا لە سەر چۆمی خەریکی جلشۆرین بوو، بە پەرێشانی و ھاوار ھاوار رایکردە ناو شەقامی شار.

**سەرەنجام، دوای ئەوەی نەفەسی ھاتەوەبەر، وتی: "ئەوە دێ، شتێکی بەسامە، وەک ئاشپەزخانەیەکە کە گوندێکی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشێ."**

**دروست لەو کاتەدا، گوند لە دەنگی فیتووێک، کە دەنگدانەوەیەکی بە ترس و نەفەسێکی درێژی ھەبوو، لەرزیبوەوە. لە چەند حەوتووی پێشتر، ھێندێکیان کرێکار بینیبوو، کە خەریکی ڕێل" ھێڵی ئاسی شەمەندەفەر" دانانن، بەڵام کەس گرنگیی پێ نەدابوون، چونکە لایان وابوو شتێکە کە رەنگە پێوەندیی بە کاولییانەوە ھەبێ، کە بە دەنگی تەپڵ و دەھۆڵ و ھەڵپەڕکێی سەد ساڵ لەوە و پێشەوەی خۆیان گەراونەوە، ھەتا خوا بزانێ کام داھێنانی سەیر و سەمەرەی بلیمەتەکانی ئۆرشەلیم پێشان بدەن. بەڵام خەڵکی کاتێک لە دەنگی سووت و نەفەسی قەتار ھاتنەوە سەرەخۆ، ھەموویان لە ماڵەوە رژانە دەرەوە** و ئۆرلیانۆ تریستەیان بینی، کە لە سەر لۆکۆمۆتیو دەستیان بۆ رادەوەشێنێ. دوای ھەشت مانگ وەدرەنگی کەوتن، خولیای تەماشای ھاتنی ھەوەڵین قەتار بوون، کە بەتەواوی بە ئاڵقە گوڵان

داپۆشـرابوون. قەتـارێکی زەردی بێتـاوان کە بە دوای خۆیـدا ئەو هەمـوو گومـان و دڵنیـاییە، ئەو هەمـوو چـاکە و خـراپە ئەو هەمـوو گـۆڕانە و، ئەو هەموو کارەسات و دڵتەنگییەی هێنایە ماکۆندۆ.
خەڵکـی ماکۆنـدۆ، کە لەو هەمـوو داهێنـراوە بەرزانە سەرسـام مـابوون، نەیاندەزانی سەرسوڕمانی خۆیان لە کوێوە دەست پێ بکەن. هەتا نزیک بەرەبەیانی نەدەنووستن و تەماشای ئەو گوڵۆپە ڕەنگ پەڕیوانەی بەرقیان دەکرد کە ئۆرلیـانۆ تریسـتە لە سـەفەری دووهەمـی بە قەتـار لەگەڵ خـۆی هێنـابوو. مـاوەیەکی زۆری خایانـد هەتـا توانیـان بەزەحـمەت خۆیـان لەگەڵ دەنگی هـاڕە و گرمەی ئەو دەزگایە رابێنن. خەڵکی لەو وێنە بزاوتـانە کە تـاجری دەوڵەمەنـد برۆنـۆ کرێسـپی هێنـابوونی و، لەو تیـاترۆیەی کە سـەردەرگای چـوونەژوورەوەی وەکـو کەللەی شـێر دروسـت کرابـوون و نیشانی دەدا، زۆر نارەحەت و پەرێشان بوون، چونکە هونەرمەندێک کە لە فیلمێکدا دەمـرد و بە خاکیـان دەسـپارد و ئەو هەمـووە بـۆ بەدبەختـی ئەو فرمێسکیان دەڕشت، جارێکی دیکە زینـدوو دەبۆوە و، لە فیلمێکی دیکەدا لە نەخشـی کـابرایەکی عەرەب پەیـدا دەبـۆوە. خەڵکـی، کە هەر یەکە دوو سینتاویان پووڵ دابوو، هەتا لە گیروگرفتی هونەرپیشەدا شـەریک بن، ئەو کـڵاو وەسـەرنانەیان پـێ قبـووڵ نەکـرا، کورسـییەکانی سینەمایان شـکاند. شـارەوان لە سـەر داوای برۆنـۆ کرێسـپی لە ئاگاداریـیەکـدا رایگەیانـد کە سـینەما بریتییە لە کۆمەڵێک وێنە و نرخـی ئەوەی نییە خەڵکی هێنـدە بـۆی بەپەرۆش بـن. بەو روونکـردنەوە هیـوابەرە، کـۆمەڵێکی زۆر پێیـانوابوو بـوونەتە قوربـانیی داهێنـانێکی تـازەی کاولییەکـان و بە لەبەر چـاوگرتنی ئەوەی خۆیـان بە رادەی پێویسـت دەردی سـەری و گرفتارییـان هەیە، فرمێسکی بـۆ هەڵڕێژن و پێویست ناکا لەو خەم و بەدەبەختییەی بەدرۆی بەشـەری ساختەشـدا بگـرین، بڕیاریـان دا پـێ نەنێـنەوە نێـو سـینەما. رووداوێکـی ئەوتـۆش سـەبارەت بەو گرامـافۆنە قورمیشـییانە هـاتەپێش، کە فاحیشـەکانی فەرانسـەیی لەگەڵ خۆیـان هێنابوویـانن و جـێگەی ئۆرگەکـانی دەسـتی قەدیمییـان گرتبـۆوە. ئەنـدامانی ئۆرکێسـترا هەتـا مـاوەیەکی زۆر سەریان لە گرامافۆن سوڕ مـابوو، لە پێشدا مشـتەرییەکانی شـەقامی پیاوان

دەیانویست بچنە بنج و بناوانی، تەنانەت دەگوترا چەند کەس لە خانمە بەڕێزەکان بۆ ئەوەی نەناسرێنەوە بەرگی کرێکارییان دەبەر کردووە و چوونە ئەوێ، هەتا لە هەوەڵین کەسەکان بن کە گرامافۆن دەبینن. دوای ئەوە ماوەیەک لە نزیکەوە تەماشا و ئەودیو و ئەودیویان پێکرد، زۆر زوو گەیشتنە ئەو ئەنجامە کە بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی گشتی و هەروەها بە وتەی ژنە فەڕانسەییەکانیش، دەزگاکە بەوجۆرەش سەرسووڕهێنەرنییە و تەنیا فیلێکی میکانیکییە، کە هیچ کات ناتوانێ بگاتە راستییەکی رۆژانە و ئینسانیی وەک ئۆرکێسترا. ناهومێدیی ئەوان  بە ئەندازەیەک بوو کە تەنانەت لە هەر ماڵێک گرامافۆنێکیان دیتبا، ئەویان وەک ئامرازێک بۆ خۆشیی گەورەسالان دانەدەنا، بەڵکو وەک ئەسبابگەمەی منالان چاوی لێ دەکرا. لە بەرامبەردا کاتێک یەکێک لە خەڵکی گوند هەلی بۆ رەخسا هەتا راستیی تەلی تەلیفۆن، کە لە وێستگەی رێگای ئاسن دامەزرابوو و، بەبۆنەی دەسکە ناشیرنەکەی وەک گرامافۆن حیساب دەکرا تاقیکاتەوە، تەنانەت بێ باوەڕترین کەس لە بەرامبەر ئەودا ناچار بە تەسلیم بوون دەبوو. بە تەواوی وەک ئەوەی خوای گەورە دەیەوێ پێوانەی سەرسوڕمانی خەڵکی ماکۆندۆ تاقیبکاتەوە و، ئەوان لە حاڵەتێکی خۆف و رەجای هەمیشەیی لە بەینی گومان و راستیدا رابگرێ، بە رادەیەک کە هیچ کەس نەیدەزانی راستیی بێ ئەولا و ئەولا لە کوێ شاردراوەتەوە. ئەو رایەڵ و پۆپە بادراو و چندراوە لە راستی و تراویلکە، تەنانەت روحی خۆزێ ئارکادۆ بویندیاشی لە ژێر داربەڕووی حەوشەدا پەرێشان و پەرەوازە کرد، بەجۆرێک کە بە رۆژی رووناک لە تەواوی ماڵێدا سەرگەردان بوو. لەو کاتەوە ئیزگەی رێگای ئاسن بەرەسمی کرابۆوە و، قەتار هەموو رۆژانی چوارشەممە سەعاتی یازدەی بەیانی سەری وەخت دەگەیشتە جێ و، ئیزگەی سادە و دارینی بە مێزێک و تەلیفۆنێک و گیشەیەک بۆ فرۆشتنی بلیت ساز کرابوو، لە شەقامەکانی ماکۆندۆ پیاو و ژنانێک دەبیندران، کە هەر چەند بە رواڵەت وایان دەنواند رەفتاری ئاسایی و رۆژانەیان هەیە، بەڵام زۆرتر وەک کرێکاری سیرکان دەچوون. ئەو شانۆگەرە گەڕۆکانە، فرۆشیاری کالای تازەی بازرگانیی بوون لە شارێک،

کە پێشتر لە کاولییەکان بە ئەندازەی پێویست شتی سەیر و سەمەرەیان دیتبوو_بۆیە دوارۆژێکیان نەبوو. ئەوان بەوپەڕی بێ چاو و روویی لە لایەک پروپاگەندەیان بۆ قابڵەمەی فیکەدار دەکرد، لە لایەکی دیکە بۆ ژیانێک کە لە حەوتەمین رۆژی دوای مردندا گیان دەبیینێ. بەهەرحاڵ ئەوان لەو کەسانەی بە نەخۆشیی درێژخایەن هیلاک و ماندووبوون و یان وەک هەمیشە فریویان دەخوارد، قازانجێکی زۆریان کرد. لە یەکێک لەو چوارشەممەیانەدا لە نێو ئەو خەڵکە شانۆگەرەدا کە پانتۆڵی سواری و چەکمە لەپێ و کڵاوی پێشاهەنگی لە سەر عەینەکی دەورەئاسن و چاوی رەنگ زبەرجەدی و پێستی رەنگ قرژاڵیان هەبوو، میستەر هێربێرت[1] ی گاڵتەچی و رووبەپێکەنین گەیشتە ماکۆندۆ و، بۆ نان خواردن هاتە ماڵێ.

لە سەر مێزی نان خواردن هەتا یەکەم دەسکەمۆز تەواو نەبوو، کەس موبالاتی پێ نەکردبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم، کاتێک ئەو بە زمانی ئیسپانیۆلیی دەست و پێشکاو، رەخنەی هەبوو، کە بۆچی لە هۆتێلی یاقووبدا تەنیا ژوورێکی خاڵییش دەست ناکەوێ، لەگەڵی بەرەورِوو ببوو و، هەر وەک چۆن لەگەڵ بیانییان رەفتاری دەکرد، ئەویشی هێنابۆوە ماڵێ. میستەر هێربێرت بازرگانی ئەو باڵۆنانە بوو، کە دەچوونە هەوا و، بە قازانجی ئەوانە نیوەی دونیا گەڕابوو_بەڵام لە ماکۆندۆ کەس پزدانێکی لێ نەکڕیبوو، چونکە خەڵکەکە دوای دیتنی قالیچەی پەرەندەی کاولییەکان، ئەو داهێنانەیان بە دواکەوتوو دەزانی. هەر بۆیەش بڕیاری دابوو بە قەتاری دواتر ماکۆندۆ بەجێ بێڵێ، کاتێک بە عادەتی هەمیشەیی مۆزی خاڵ خاڵی وەکو کلکی بەوریان هێنایە سەر مێزی نان خواردن، ئەو بە بێ مەیلی مۆزێکی هەڵگرت و هەروا بە قسەکردنەوە و بە حەواس پەرتییەکی حەکیمانە نەک بە خۆشییەکی چاوچنۆکانە، مەزمەزەی کرد و جووی.کاتێک هەوەڵین دەسکەمۆزی خوارد، داوای کرد دەسکەمۆزێکی دیکەی بۆ بێنن. ئەوجار مجرییەکی چکۆڵەی کەرەسەی چاویلکەی نێو باوڵێکی گەورە کە هەمیشە پێی بوو، هێنادەر. بە وردی و گومانی تاجێکی ئەڵماس مۆزێکی سەرەونێو کرد و بە قەڵەمتراشێکی تابەتی دەورەکەی تاشی و لە

[1]- Mr. Herbert

تەرازوویەکـی بچکـۆڵەی دەرمانخــانەدا لە سـەنگی دا و، بە پەرگــارێکی تـایبەتیی چەکسـازی نێوقەدی پێوا. بە دواییدا لە نێو مجری کەسـەرەیەکی دیـکەی هێنـادەر و پـلەی گەرمـا و رادەی نمـی هەوا و تینـی تیشـکی پێـوا. کردەوەکــانی ئەوەنــدە فیڵبــازانە بــوو، کە کەس نەیتــوانی بە خەیــاڵێکی ئاســوودەوە نــانێ بخــوا، هەمووبــان بەتەمــا بــوون میســتەر هێربێـرت ســەرەنجام دوابــاوەڕی خــۆی دەرببــڕێ، بەڵام ئەو شــتێک کە مەبەســت بگەیەنێ بە زمانیدا نەهات.
لە رۆژانـی دواییـدا، ئەویـان بە تـۆڕ و سـەبەتەیەکی چکـۆڵەوە بینـی، کە لە دەرەوەی شــاری خەریکـی راوە پەپـوولەیە. رۆژی چوارشــەممە، دەســتە ئەندازیارێک، ئەندازیاری کشت و کاڵ، پسپۆری ئاو دێری و نەخشـەکێش و نەخشەهەڵگر هاتنە شار و چەند حەوتووان خەریکی لێکۆڵینەوە لە سـەر ئەو زەوییانە بوون کە میستەر هێربێرت راوە پەپوولەی لێدەکرد. دوایی ئاغای جـاک بـراون[٢]، بە سـواری واگۆنێـک، کە بە قەتـاری رەنـگ زەردەوە زیـاد کرابوو، هاتە شار. واگۆنەکە سـەر لە بەر زێرگفت کرابوو و کورسـییەکانی بە مەجمەری کلێسا و تاقی میچی شووشـەی شین بوو. هەر لەو واگۆنەشدا پـارێزەرانی رەشـپۆش، کە هەمــوو کاتێـک بە دوای ســەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بویندیاوە گەڕابوون و ئێستا دەورەی ئاغای براونیان دابوو، هـاتنە شـار. ئەو هــات و چــوونە بــوو بە هــۆی ئەوەی خەڵکـی وا بیـر بـکەنەوە کە ئەندازیارانی کشـتوکاڵی و پسـپۆرانی ئـاودێتنەوە و نەخشەکێشـان و ئاغـای هێربێرت، بە پزدان و پەپوولە رەنگاورەنگەکانییەوە، لەگەڵ ئاغای بـراون بە گـۆڕی بـزاوتە و سـەگە درنـدە ئاڵمانییەکـانییەوە پێوەنـدییەکیان بە شـەڕەوە هەیە. بە هەر حـاڵ خەڵکـی هەلێکـی ئەوتۆیـان بـۆ بیرکـردنەوە لەو بـارەوە دەسـت نەکەوت، چـونکە هێشـتا لە سـەر سـوورمانی خۆیـان نەهـاتبوونە دەرێ، کە شار بوو بە ئۆردووگای ئەو بیانییانەی کە لە خانووی قرمیتداردا دەژیان.
بیانییەکـان لە نیـوەی دونیـاڕا بە سـواری قەتـار دەهـاتن، نەتەنیـا هەمـوو کورسـییەکانی قەتاریـان پـڕ دەکـردەوە، بەڵکـو سـواری میچـی قەتـاریش

[٢]– Jack Brown

دەبوون. بیانییەکان دواتر هاوسەرەکانی خۆشیان هێنا بۆ ئەویێ_ژنانێک کە لیباسی پارچەی جوانیان لەبەر دەکرد و کڵاوی گەورەی رووبەندداریان لە سەر دەنا و لەولای ئیزگەی ڕێگای ئاسن شارێکی تایبەت بە خۆیان ساز کرد، کە لە شەقامەکانی ریزە دارخورما دەبیندرا و پەنجەرەی ماڵەکانیان تۆڕی ئاسنی لێدرابوو و لە بەر هەیوان مێزی گچکەی سپی و بە میچی خانووەکانەوە باوەشێنی لێدرابوو و لە بەر چیمەنی پان و بەربڵاوی ماڵەکاندا تاوس و هەوێردە دەبیندران. ناوچە بە تێلدڕوو حەشار درابوو و تێلەکانی سەرەوە کارەبای هەبوو، کە لە بەیانەکانی فێنکی هاویندا بە پەرەسلێرکەی برژاو رەش دادەگەڕا. هێشتا کەس نەیزانیبوو ئەوانە لە چی دەگەڕێن و بۆچی هاتوونەتە ئەویێ، ئەگەرچی ئەوانە بە مرۆڤدۆستی دادەنران، بەڵام زیاتر لە کاولییەکانی کۆن زەحمەت و دەردیسەرییان پێکدەهێنا. ئەوانە بەکردەوە گەلێک، کە لە رابردوودا بۆ خوای گەورە لە بەرچاو گیرابوو، وەزعی بارانەکانیان گۆڕی و بەرداشتی بەرهەمیان خێراتر کرد و، ئاوی رووباریان بە بەردی سپی لە رەوتی هەمیشەیی لادا و خستیانە ئەودیوی شار و پشتی قەبرستانەکە.لەو کاتەدا بوو کە گۆڕی پواوی خۆزێ ئارکادیۆیان بە سیمان داپۆشی، هەتا بۆنی لاشە لەگەڵ ئاوی رووبار نەکەوێ. بۆ ئەو بیانییانەی کە بە بێ ئەوین دەهاتنە ئەویێ، خیابانی میوانگری ژنە فرانسەییەکانیان کردە گەڕەکێکی بەرین و لە چوارشەممەڕۆژێکی پیرۆزدا قەتارێک فاحیشەیان هێنا ئەویێ_ژنانێک کە بە هەموو شێوە ئەوینداریيەک فێر کرابوون و، هەموو جۆرە رۆنێکی هاندەری پیاوانی لە پیاوەتیکەوتوویان پێ بوو، هەروەها دەیانزانی چۆن پیاوانی شەرمێون هان بدەن و پیاوانی چاوچنۆک تێر کەن و بە سەر پیاوانی لە سەرەخۆدا هەڵبدەن و دەرسی ئەوانە بدەن کە چەند جار لە سەریەک ئەوینداری دەکەن و سزای ئەوانەش بدەن کە لەگەڵ خۆیان ئەوینداری دەکەن. شەقامی تورکەکان کە بە دووکانی رووناک و کاڵای بیانی جێگای بازارە رەنگاوڕەنگە کۆنەکانی گرتبۆوە، رەواجێکی زۆرتری پەیدا کردبوو، شەوانی یەکشەممە پڕ دەبوو لەو گێرەشێوێنانە کە لە نێوان مێزی قومار و چادری تیرئەندازیدا، لە کۆڵانێک داهاتوویان پێشگۆیی و خەونەکانیان

لێکدەدایەوە و لە نێوان مێزەکانی خواردنی سوورکراوە و ئارەق و شەرابدا وێک دەکەوتن و بەیانی یەکشەممە کە دادەهات لە سەر زەوی کەوتبوون، ئەوانە مەستانێکی شەنگۆڵ و زۆر کات کە سانێک بوون کە لە شەڕ و پێکدادانەکاندا بە گوللە، یان مست و چەقۆ و بوتری لە زەوی کەوتبوون.
ئەو هێرشە ئەوەندە پڕ غەوغا و چاوەڕواننەکراو بوو،کە لە ڕۆژەکانی هەوەڵێدا لە بەر رابردن و گوێزتنەوەی بێ پسانەوەی کەرەسەی ماڵ و سندووق و دەنگی دارتاشی ئەو کەسانەی کە بە بێ ئیجازە و ماوەدان لە هەر پارچە زەوییەکی خاڵی کە دۆزیبایانەوە خانوویان بۆخۆیان دروست دەکرد و، هەروەها رەفتاری بێ شەرمانەی ئەو جووتانەی کە جۆلانەیان لە دارەبادامەکان دەبەست و بەڕۆژی ڕووناک لە بن چادران لە پێش چاوی هەمووان ئەویندارییان دەکرد ئیمکانی ڕێگارۆیشتن بە شەقامدا نەمابوو. تەنیا گۆشەی ئارام ڕەشپێستەکانی ئاشتیخوازی ئانتیل[٢] پێکیان هێنابوو، کە لای تاوپەڕان لە هەیوانی ماڵە دارینییەکانیان دادەنیشتن و بە زمانی تێکەڵ و پێکەڵ گۆرانیی خەمهێنەریان دەگوت. لە ماوەیەکی کورتدا شار بە جۆرێک گۆڕا کە هەشت مانگ دوای هاتنی میستەر هێربێرت خەڵکی کۆنینەی ماکۆندۆ لە بەیانی زووەوە لە خەو هەڵدەستان هەتا بتوانن فێری شەقامەکانی شارەکەی خۆیان بن.
جارێک لە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایان بیست کە " بروانن خۆمان تووشی چ گێرەوکێشەیەک کرد! تەنیا لەبەر ئەوەی بیانییەکمان بانگهێشتی کرد تەشریف بێنێ هێندێک مۆز بخوا." ئۆرلیانۆی دووهەم، پێچەوانە لە ڕژانەخواری هەرەس ئاسای بیانییان بۆ شارەکە، لە پێستی خۆیدا نەدەگونجا. ماڵەکە لە پڕ بە میوانانی نەناسیاو و ڕێبواری خۆشگوزەرانی لەشکاننەهاتووی سەرانسەری جیهان پڕ بوو، بەجۆرێک کە ناچار بوون بەو دیوی حەوشەکەوە چەند ژووری خەوی دیکە دروست بکەن. ژووری نەهارخۆرییان گەورە کردەوە و لە جێگای مێزی نەهارخۆریی پێشوو،مێزێکی شازدە کەسی بە کارد و چەنگاڵ و دەوریی تازەوە لە ژوورەکە داندرا. بەوحاڵەش ناچار بوون بۆ نان خواردن نۆبە بگرنەوە.

---

[٢]– Antills و مجمع‌الجزایر، بریتییە لە کووبا، جامائیکا، هائیتی، سانتادومینیکۆ.

فێرناندا ناچار بوو ددان بە جەرگی دا بگرێ و وەسواسیی خۆی قووت داتەوە و لەگەڵ پیسترین میوانان وەک شا رەفتار بکا. میوانانێک، کە بە چەکمەی قوڕاوییەوە دەهاتنە هەیوانێ لە باخچەی میزیان دەکرد و، لە هەر جێگایەک پێیان خۆش با دۆشەگیان بۆ خەوی دوای نیوەڕۆیان پان دەکردەوە، بە بێ لەبەرچاوگرتنی بچووکترین رێز بۆ خانم و رەفتاری شیاوی پیاوەکان، هەرچی پێیان خۆش با دەیانگوت. ئامارانتا،لەو هێرشە گشتییە بە جۆرێک تەنگەتاو ببوو، کە وەک پێشوو بۆ نان خواردن رووی لە ئاشپەزخانە کردەوە. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا چونکە دڵنیا بوو زۆربەی ئەو کەسانەی کە بۆ سەلام و ئەحواڵپرسی دێنە کارگاکەی، بە خاتری رێز و خۆشەویستی نییە، بەڵکو تەنیا بەو مەبەستە دێن حەز دەکەن یادگارێکی مێژوویی ـفوسیلێک کە شیاوی مووزەیە ببینن، بۆیە میلەی ئاسنی لە دەرگا و پەنجەرەی ژوورەکەی دا ، خۆی لەوێدا زیندانی کرد. لەوە بەدوا بێچگە لە هێندێک هەڵی کەموێنە، کە لە بەر دەرگای حەوشە دادەنیشت، کەس چاوی پێ نەکەوت. ئۆرسولا، بە پێچەوانە، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە لاقی بە زەویدا دەخشاند و دەستی بە دیواری دەگرت و دەڕۆیشت، هەر کات هاتنی قەتار نزیک دەبۆوە هەستی بە خۆشییەکی منالانە دەکرد. فەرمانی دەدا بەو چوار ئاشپەزانە کە لە ژێر رێنوێنی لە سەرەخۆیانەی سانتا سۆفیا دێلا پێداددا پەلەیان دەکرد هەموو شتێک لە کاتی خۆیدا ئامادە بێ: "دەبێ گۆشت و ماسی ساز بکەین."
پێی دادەگرت کە: "دەبێ هەموو شت ئامادە کەین، چونکە هیچ کات نازانی ئەو بیانییانە چ خواردنێکیان پێ خۆشە." قەتار لە گەرمترین کاتی رۆژانەدا دەهات. کاتی نەهار، ماڵ، کە وەک بازار شلۆق بوو و دەلەرزییەوە و، میوانەکان کە تەنانەت نەیاندەزانی خانەخوێ کێیە، شەلاڵی ئارەقە ملبەملەیان دەکرد، بۆ ئەوەی باشترین شوێن لە سەر مێزی نان خواردن بە دەست بێنن و، ئاشپەزەکان بە قابڵەمەی گەورەی سووپ و گۆشت، دۆڵمەی کوولەکەی پڕ لە سەوزی و مەنجەڵە برینجان وێک دەکەوتن. خزمەتکاران جار جار خۆشاوی لیمۆیان بۆ میوانان تێدەکرد. شلۆقی وەزعەکە بەرادەیەک بوو کە فێرناندا بەو خەیاڵەی رەنگە هێندێک دووجار

خوارد دەخۆن زۆر نارەحەت بوو و، چەندین جار کاتێک کەسێک لە سەر مێزی نان خواردن، داوای ریزی حیسابی لێکرد، خەریکبوو وەک سەروەشێنی چارەوێ بکا بە جنێوان دایگرێ. ساڵێک زیاتر بەسەر هاتنی میستەر هێربێرت تێدەپەڕی و تەنیا شتێکی لێیان حاڵی بوو، ئەوە بوو کە ئەو بیانییانە دەیانەوێ لەو مەڵبەندە جادوو لێکراوەی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا و هاورێکانی بۆ داهێنانی گەورە پێیدا رابردبوون، داری مۆز بنێژن. دوو کوڕی دیکەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، خاچی بۆر بە نێو چاوانەوە، بە دوای ئەو تەقینەوەدا کە وەک قرپ لێدانێکی بورکانێ دەچوو، هاتنی خۆیان وەک هەمووان بەو رستەیە تەواو کرد.

وتیان: "هاتین، وەک هەمووان کە دێن."

رێمیدیۆسی جوانکیلە تەنیا کەسێک بوو کە لە نەخۆشیی مۆز بە دوور بوو. کچێکی لەبار و لەڕادەبەدەر جوانی لێهاتبوو. زۆرتر لە پێشوو لە بەرامبەر کۆسپ و بەرهەڵستدا رادەوەستا و گوێی نەدەدا بە سووکایەتییان و لە دونیای بێ خەوشی خۆیدا خۆشبەخت بوو. نەیدەزانی ژنان بۆچی ژیانیان بە لەبەرکردنی ژێرکراس و مەمکەوانە"ستیان" لە خۆ حەرام کردووە. کراسێکی درێژی کەتانی بۆخۆی دروو و، زۆر بە ساکاری لە سەرەوە دەبەری دەکرد و بێ ئەوەی هەست بە رووتی بکا و بێ هیچ تەشریفاتێک کێشەی لیابس پۆشینی بۆخۆی چارەسەر کردبوو.لە روانگەی ئەوەوە رووتی تەنیا رێگای شیاو و ئابروومەندانە بۆ هاتووچۆی نێو ماڵەوە بوو. بسکی دەگەیشتنە پانییەی پێی، هێندەی ئازاردا و، هێندە بە شانەموویەکانیان بادا و بە پەڕۆی رەنگاورەنگ پرشیان بۆ چنی جارز بوو و سەری خۆی تاشی و بە بسکەکانی بۆ پەیکەری پیرۆزان کڵاومووی دروست کرد.

ئەوەی کە لە تایبەتمەندیی ئاسان کردنەوەی ئەودا سەرسوورهێنەر بوو، ئەوە بوو کە هەر ئەندازە بە خاتری راحەتیی خۆی، خۆی لە جوان کردن و بەدووداچوونی مۆد دەبوارد و، هەر چەندە بۆ فەرمان بردن لە تایبەتمەندیی سروشتیی خۆی دەستی لە بەند و قەڵادە بەردەدا، جوانی باوەڕ پێنەکراوی زۆرتر دەردەکەوت و رەفتاری لە بەرامبەر پیاواندا

هاندەرانەتر دەبوو. کاتێک کوڕەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بۆ یەکەم جار هاتنە ماکۆندۆ، ئۆرسۆلا بیری کەوتەوە کە لە ڕەگی ئەوانەشدا خوێنی نەتیژەکەی هەیە، بە وەبیرهاتنەوەی ترسێکی فەرامۆش کراو لەرزی لێهات و بە کچەی وت: "چاوەکانت جوان بکەوە، لەگەڵ هەر کامەیان بێ منداڵەکەتان بە کلکەوە لە دایک دەبێ." کچە بەجۆرێک بەوئاگادارکردنەوەیە بێ موبالاتی کرد، کە جلکی پیاوانی پۆشی و خۆی لە خۆڵی وەردا و بە دارێکەوە هەڵزنا و، کەمی مابوو کارەساتێک لە نێوان حەڤدە کوڕە مامی خۆی بخوڵقێنێ، چونکە هەموویان بە بینینی ئەو نمایشە لە تاقەت نەهاتووە خەریک بوو شێت بن. لە بەر ئەوەش بوو کە هەر کات دەهاتنە شاری هیچ کامیان لەماڵەوە نەدەنووستن و، چوار کەسیان کە لە شار مابوونەوە، بە فەرمانی ئۆرسۆلا لە خانووی بەکرێدا دەژیان. ئەگەر ڕێمیدیۆسی جوانکیلە بەوخۆپارێزییەی زانیبا بێگومان لە پێکەنینان دەدڕا. هەتا دوایین کاتی کە لە سەر زەوی بوو، تێنەگەیشت چارەنووسی بێلادانی ئەو ئەوەیە ژنێکی بەهەڵەدابەر بێ و، ئەوە کارەساتێکی ڕۆژانە بوو. هەر کات کە لە فەرمانی ئۆرسۆلا دەردەچوو و، دەهاتە ژووری نەهارخواردن، ترس و دڵەراوکەی لە نێو بیانییان دروستدەکرد. بەچاکی دیار بوو کە لە ژێر پارچەی ئەستووری کراسەکەی شتێکی دیکەی لە بەردانییە. هیچ کە ئامادە نەبوو بیسەلمێنێ تاشینی ئەو سەرە جوانە شێوەیەک ناز و خۆڕانان نییە و، دەرخستنی ڕانە جوانەکانی بۆ فێنکبوونەوە جۆرە هاندانێکی تاوانکارانەنییە، هەروەک قامک مشتنی دوای نان خواردن تەنیا بۆ خۆشیی خۆی بوو و هیچی دیکە. ئەوەی کە هیچ کام لە ئەندامانی بنەماڵە هەرگیز نەیانزانی و بە پێچەوانە بیانییەکان تێیگەیشتن ئەوە بوو ، ڕێمیدیۆسی جوانکیلە بۆن و بەرامەیەکی ئەوتۆی لێدەهات، کە دوای ڕابردنی بە شوێنێکدا هەتا چەند سەعات نەدەبڕایەوە. ئەو پیاوانەی کە لە کاروباری ئەویندارییدا شارەزاییان هەبوو و لە سەرانسەری جیهاندا تاقیکردنەوەی ئەوینداریيان هەبوو، دەیانگوت، هیچ کات ئەوەندە لە نیگەرانیدا ئازاریان نەکێشاوە. نیگەرانییەک کە بۆنی ئاسایی ڕێمیدیۆسی جوانکیلە پێکی دێنێ. لە هەیوانی گوڵی بگۆنیا، لە ساڵۆن و، لە هەر شوێنێکی دیکەی ماڵ بەوردی توانیان

دیـاری بـکەن کە ئەو لە کوێـوە رابـردووەو، لە رۆیشـتنی چ مـاوەیەک تێپەڕیـوە. شـوێنەوارێکی ئاشـکرا و هەڵهەڵنەگـر بـوو. کە هـیچ کـام لە ئەندامانی بنەماڵە توانای یەکالاکردنیان نەبوو، چونکە بۆنی ئەو زۆر دەمێک بـوو لەگەڵ بۆنەکـانی دیـکەی رۆژانە تـێکەڵ ببـوو. بەڵام بیانییەکـان، دەستبەجێ هەستیان بەوبۆنە کرد. سـەرەنجام تەنیا ئەوان تێگەیشتن کە فەرمانـدەی لاوی گـارد بـۆچی لە تـاو ئەویـن دیقـی کردبـوو و، ئەو میـرزادەیەش، کە لە رێگـای دوورەوە هـاتبوو، بـۆچی تووشـێ ئەو رۆژە رەشـە ببـوو. رێمیدیۆسـی جـوانکیلە لەو دەورە ئاڵۆزکـاوەی کە پێیـدا دەڕۆیشت بێ خەبەر بوو، لەو ئافەتە لەتوانانەهـاتووەی کە رابوردنی پێکی دەهێنا ئاگـادار نەبوو و، بە بێ هـیچ مەبەسـتێک لەگەڵ پیاوان بە شـێوەی ئاسـایی رەفتـاری دەکـرد و سـەرەنجام بە میهرەبـانی پـاکی لەگەڵ ئەوان تووشی نـارەحەتی و گۆڕانی دەکردن. کاتێک ئۆرسـۆلا تـوانی ناچاری بکا لەوە بەدواوە لەگەڵ ئامارانتا، دوور لە چاوی بێگانان، لە ئاشـپەزخانە نـانی بخـوا، هەسـتی بە راحەتییەکـی زۆرتـر کـرد، چـونکە ئەو هەر چۆنێـک بـێ نەیدەزانی نەزم چییە، بۆ ئەو فەرقی نەبوو لە کوێ نـانی دەخـوا، ئەویش لە هەر کاتێک و لە هەر زەمانێک ئیشـتیای پێ بـا. جـاری وا هەبـوو سـەعاتی سێی دوا نیوەشەو هەڵدەستا بۆ نان خـواردن و، بە دوایدا تەواوی رۆژەکە دەنووست و، چەند مانگانی بە سەعاتی تێکەڵ و پێکەڵ تێپەڕ دەکرد، هەتـا رووداوێـک، پـێش هاتێـک دیسـان دەیهێنـایەوە سـەر نەزمـی ئاسـایی. لەو کاتانەشدا رەوتی ژیانی ئاسـایی بـوو. سـەعاتی یـازدەی بەیـانی هەڵدەسـتا و رووتو قووت دوو سـەعاتان دەرگـای حەمـامی لە سـەر خـۆی دادەخسـت و بەو جـۆرە کە دووپشـکەکانی دەکوشـت لە خەوی گـران و درێژخـایەنی هەڵدەستا. دوایە بە سـەتڵێک، لە حەوزەکەی حەمـام ئـاوی بە خۆیدا دەکـرد، حەمـام کردنـی هێنـدە درێـژ و ورد و تەشـریفاتی بـوو، کە ئەگەر کەسـێک شـارەزای رەوشـتی نەبـا، وایدەزانی ئەو لەشـی خـۆی دەپەرسـتێ، بەڵام بۆ ئەو، ئەو رێوڕەسـمە کەسـییە هیچ جۆرە هەوەسێکی لەگەڵ نەبوو و، تەنیا هۆیەکی ئاسایی بوو بۆ وەخت تێپەڕ کردن هەتا برسـیی بێتەوە. رۆژێکیـان، کاتێـک دەسـتی بە خۆشووشـتن کردبـوو، بیگـانەیەک کاشـییەکی میچـی

حەمـامی دەرهێنـا و لە بینینـی ئەو دیمەنە رووتە کەموێنەیە هەناسـەی لە سـینگیدا راوەسـتا. ریمیدیۆسـی جـوانکیلە،. لە نێـوان درزی کاشـەییە شـکاوەکانی میچـی حەمـامەوە، چـاوێکی ناهومێـدانەی لێکـرد، بەڵام بە بـێ ئەوەی خەجـاڵەتیی لـێ دەرکەوێ، شـڵەژاو وتـی: "وریـا بە لەوانەیە بکەویە خوارەوە."

بێگانە بە نارەحەتی وتی: "تەنیا دەمەویست بتبینم."

دەموچاوی کابرای بیانی، لەبەر حەپەسان دەتگوت ئازاری هەیە، وەکئەوەی لەگەڵ هەستی خۆیدا لە شەڕێکی بێدەنگدابێ ، هەتا ئەو تراویلکەی لـێ گوم نەکـا. ریمیدیۆسـی جـوانکیلە بەو خەیـاڵە کە کـابرا لە ترسـی شـکانی کاشـییەکان بەو جـۆرە ئـازار دەچێـژێ، بەپەلە خـۆی شوشـت هەتـا کـابرا لە مەترسیی کەوتنە خـوارەوە رزگـار بکـا. لەگەڵ ئەوە ئـاوی بە خۆیـدا دەکـرد، بە پیاوەی گوت؛میچی سەرشۆرەکە زۆر خراپە چونکە هەڵاشـەکەی بەئـاوی باران رزیـوە و، ئەو دڵنیـاییە لە بەر ئە وگەڵارزیـوانەی بەر بـارانێیە حەمـام پـڕ دەبـوو لە دووپشـک. کـابرای بێگـانە ئەو قسـانەی بە حیسـابی خۆشئەخلاقی و بە ئەدەبی ئەو دانا و، لە بەر ئەوە کاتێک ئەو سـابوونی لە خۆی دەدا، وەسوەسە بە سەریدا زاڵ بوو و، هەنگاوێک رۆیشتە پێشەوە.

بە نارە نار وتی: "رێگە بدە من سابوونت لێدەم."

ریمیدیۆسی جوانکیلە وتی: "زۆرت سوپاس دەکەم، دەستەکانی خۆم بەسە."

کابرای بێگانە بە پاڕانەوە وتی: "کەوابوو رێگە بدە سابوون لە پشتت بدەم."

ئەو وتـی: "چ کـارێکی گەوجـانەیە! مـن هەرگیـز نەمـدیوە کەس سـابوون لە پشتی خۆی بدا."

دوایە، کاتێک دەیەویست خۆی وشک بکاتەوە، پیاوە بە چاوی فرمێسکاوی پـاڕایەوە زەماوەنـدی لەگەڵ بکـا و، ئەو بە بـێ درۆ وەڵامـی دایەوە کە هـیچ کات ئامادەنییە ببێتە ژنـی کەسێک، کە لە بەر ئەوپەڕی گەوجی سـەعاتێک کاتی خۆی بەفیرۆ بدا و، تەنانەت چاوی لە نان خواردنیش پۆشێبێ تەنیا بۆ ئەوەی تەماشـای حەمـام کردنـی ژنێـک بکـا. سـەرەنجام کاتێـک کراسـە هەراوەکەی خـۆی دەبەر دەکـردەوە، پیـاوە سـەلماندی کە راسـت وەک هەمووان دەڵێن وابوو، ئەو لە ژێر ئەو کراسەوە هیچ ناپۆشێ.ئەو نهێنییەش

دەتگوت ئاسنێکی سوورەوەکراوە و ئەو داخ دەکا. ئەو جار دووکاشیی دیکەشی لە میچی دەرهێنا هەتا بتوانێ خۆی بخاتە خوارێ بۆ نێو حەمامەکە.
ڕێمیدیۆسی جوانکیلە بە ترساوی کابرای دەنگ دا: " بڵێندایی یەکجار زۆرە خۆت بە کوشت دەدەی."
کاشییە رزیوەکان بە دەنگێکی ناخۆش تێک قرمان و پیاوە تەنیا توانی لە ترسان هاوار بکا. تەپڵی سەری بە چیمەنتۆی بەری حەمام تێک هاڕ درا و دەسبەجێ مرد.
ئەو بیانییانەی کە لە ژووری نەهارخواردن گوێیان لە دەنگی بوو و، بەپەلە خۆیان گەیاندە ئەوێ، هەتا لاشەکەی بێننەدەرێ، لە سەر پێستی لاشەیەوە، بۆنی گێژکەری ڕێمیدیۆسی جوانکیلەیان بە بەرلووتی هەڵاهات. ئەو عەترە وەها بە قووڵی دەلاشە چزابوو، کە خوێن لە قەڵشی کەللەسەری نەدەهات، بەڵکو ئاوێکی چەوری ڕەنگ عەنبەری و تێکەڵاو بەو عەترە ئاڵۆسکاوەی لێ دەهاتەخوار. ئەو کات تێگەیشتن کە بۆنی ڕێمیدیۆسی جوانکیلە، تەنانەت پیاوان لەولای مردنیشەوە هەتا ئێسقانەکانیشیان گۆڕ دەکرێ ئەشکەنجە دەدا. بەوحاڵەشە ئەو نهێنییە سامناکەیان نەخستە پاڵ ئەو دوو کەسەی دیکە کە بە خاتری ڕێمیدیۆسی جوانکیلە گیانی خۆیان لە دەست دابوو. هێشتا قوربانییەکی دیکە پێویست بوو، هەتا بیانییەکان و کۆمەڵێکی زۆری دیکەش لە خەڵکی قەدیمی ماکۆندۆ ئەو داستانەی بسەلمێنێن، کە ڕێمیدیۆسی جوانکیلە لە جیاتی نەفەسی ئەویندا ئاوێکی چەوری مەرگهێنەری لێ دەتکێ.
چەند مانگ دواتر، پاشنیوەڕۆیەک، کاتێک ڕێمیدیۆسی جوانکیلە و چەند کەس لە هاورێکانی چووبوونە تەماشای مەزرایان، هەلی سەلماندنی ئەو مەسەلەیە هاتەپێش. بۆ خەڵکی ماکۆندۆ گەڕان لەو شەقامە نمدار و بێ کۆتاییانە کە لە هەر دوولای داری مۆزیان ناشتبوو، سەیرانێکی تازە بوو و، دەتگوت بێدەنگی لە شوێنێکی دوورەوە هاتبووە ئەوێ و ئەوەندە نوێ بوو کە دەنگی مرۆڤ هێشتا نەیدەتوانی کاری تێبکا. هێندێک کات ئەوەی لە دوو میتر نەدەبینرا، لە کۆتایی ئەوبەری شیناوەردەوە بەچاکی دەبیسرا. بۆ

کچانی ماکۆندۆ ئەو گەمە نوێیە پڕ لە ترس و پێکەنین و سەمەرە بوو. شەوان بەجۆرێک لە گەڕان و پیاسەی خۆیان دەدوان، هەروا بزانە لە خەودا بینیویانە. ناوبانگی ئەو بێدەنگییە بەجۆرێک بوو کە ئۆرسوڵا دڵی نەهات ڕێمیدیۆسی جوانکیلە لەو سەیرانە بێبەش بکا و ڕێگای دا ڕۆژێک دوای نیوەڕۆ لەگەڵ هاوڕێکانی بۆ ئەوێ بچێ، دیارە بەو مەرجەی جلکی ڕێکوپێک دەبەر بکا و کڵاوێکی لەسەر بنێ. هەر کە دەستەی کچان گەیشتنە داچێندراو، هەروا بە عەترێکی کوژەربۆن گرتوو بوو. کرێکارانێک کە خەریکی کارکردن بوون هەستیان کرد جادوویەکی سەیر سیحری پێکردوون و مەترسییەکی نادیار هەڕەشەیان لێدەکا. هێندێکیان پێشیان تەقییەوە و گریان. ڕێمیدیۆسی جوانکیلە و هاوڕێ ترساوەکانی لە دەست هێندێک پیاوی وەحشی کە هێرشیان کردبوونە سەرێ هەڵاتن و پەنایان بردە بەر ماڵێک لەو نزیکانە، کەمێ دواتر چوار کەس لە ئۆرلیانۆکان کە خاچی خۆڵەمێشیان وەک نیشانێکی مەزهەبی و مۆرێکی لە شکاننەهاتوو ڕێزی پیرۆزانەیان دەبزاواند، ئەوانیان ڕزگار کرد. ڕێمیدیۆسی جوانکیلە بە کەسی نەگوت کە یەکێک لە پیاوەکان لە ئالۆزیی وەزعەکە کەڵکی وەرگرتووە و توانیویەتی دەست لە سەر زگی دابنێ. دەستێک کە زۆرتر وەک چرنووکی هەڵۆیەک دەچوو کە خۆی بە لێواری هەڵدێرێکەوە هەڵاواسیبێ. لە ئانێکدا نیگای ئەو لەگەڵ نیگای پیاوە گەیشتنە یەک و نیگای ناهومێدی پیاوە وەک ڕەحم و دڵسۆزییەکی سووڕەوەکراو لە سەر دڵی هەڵکەندرا. هەر ئەو شەوە پیاوە لە شەقامی تورکان قسەی لە بەختەوەری و سەرەڕۆیی خۆی کرد و شانازیی بەخۆیەوە کرد، بەڵام چەند دەقیقە دواتر سمی ئەسپێک سینگی دڕی و کۆمەڵێک لە بیانییەکان بینیان خوێن دەرشایەوە و گیانی تێیدا نوقم بوو.

ئەوە کە دەیانگوت ڕێمیدیۆسی جوانکیلە ودمی مردنی بەدەستە، بە چوار کارەساتی حاشاهەڵنەگر سەلمابوو. هەر چەند هێندێک لە پیاوەکان، کە تەنیا ئەهلی قسە بوون، دەیانگوت شەوێک عیشقبازی لەگەڵ ژنێکی ئەوها گیان فیداکردنێک دێنێ، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ وەڕاست گەڕانی ئەو ئاواتە کەس نەیوێرا هەنگاوێک بەرەوپێش بەرێ. ڕەنگە، نەک بۆ بەدەستهێنانی

ـەی. بەڵکو بۆ پووچەڵ کردنەوەی مەترسییەکەی، تەنیا هەستێکی سەرەتایی
ـ ساکاری وەک ئەوین بەس بووبێ، بەڵام ئەوین تەنیا شتێک بوو هەرگیز
ـە بیری کەسدا نەهات.
ـۆرسوڵا دەستی لە چاوەدێریی ئەو هەڵگرت. لە رابردوودا کاتێک هێشتا لە
ـامادەکردنی ئەو بۆ ژیانێکی دونیای ئاسایی لای نەدابوو، تێکۆشابوو
ـەرنجی ئەو بۆ کارەکانی نێومال رابکێشی. پێی دەوت: "پیاوەکان زۆر
ـەوە زۆرتر لە ژنێک چاوەڕێ دەکەن کە بیری لێدەکەیەوە ، دونیایەک
ـاشپەزی، دونیایەک گەسکلێدان و دونیایەک ئازارکێشان بۆ شتی وردیلە
ـ پڕ و پووچ کە تۆ هەر بە خەیاڵیشت دا نایە." لە ناخەوە خۆی فریو دەدا.
ئەو تەنیا تێدەکۆشا رمیدیۆسی جوانکیلە بۆ خۆشبەختی ماڵەوە پەروەردە
بکا، چونکە لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە لە سەر تۆپی زەوی کەس نییە
دوای نووستن لەگەڵ کچە، تەنانەت بۆ رۆژێکیش بێ، بتوانێ ئەو هەموو بێ
موبالاتییە قبووڵ بکا. لە دایکبوونی ئاخرین خۆزێ ئارکادۆ و ئیرادەی
پتەوی ئەو بۆ ئەوەی بۆ بوونە قەشە پەروەردەی بکا، سەرەنجام بوو بە
هۆی ئەوە کە دەست لە چاوەدێریی نەتیژەی خۆی هەڵگرێ و نیگەرانی ئەو
نەبێ. ئەوی دایە دەستی چارەنووسی خۆی. هیوادار بوو موجیزەیەک
بقەومێ و لەو جیهانەدا پیاوێک پەیدا بێ کە ئەوەندە بێ موبالات بتوانێ
لەگەڵی رابوێرێ. ئامارانتا، لەمێژبوو دەستی لە هەر جۆرە هەوڵ و
کۆششێک بۆ پەروەردەکردنی ئەو شووشتبوو. لە زەمانی پاشنیوەڕۆیەکانی
لەبیرکراوی ژووری دروون، کاتێک کە نەوەی براکەی دەستەی چەرخی
درروونی بۆ هەڵدەسووڕاند، بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە مێشکی ئەو هەڵی
نەداوە و کچێکی گەمژەیە. لە بێ موبالاتیی ئەو سەبارەت بە وتوویژ لەگەڵ
پیاوان سەری سوور مابوو و، دەیگوت: "وا بزانم ناچار دەبین تۆ هەراج
بکەین!!" دوایە کاتێک ئۆرسوڵا رێمیدیۆسی جوانکیلەی ناچار دەکرد رووی
خۆی بە دەسماڵ داپۆشێ و بچێتە دابی نوێژ، ئامارانتا بە بیریدا هات کە
ئەو ئارایشە سیحراوییە ئەوەندە هاندەرە، بێگومان بەم زووانە پیاوێک
هەڵدەکەوێ، ئەگەر لە رووی وردبینیش بێ، بە سەبر و لەسەرەخۆبێ و بۆ
دۆزینەوەی خاڵی لاواز لە دڵی ئەودا هەنگاو بەرەپێش بنێ. بەڵام کاتێک

بینی ریمیدیۆسی جوانکیلە چەند نەفامانە داخوازیی پیاوێکی، کە لە زۆر لایەنەوە لە شازادە شیاوتر بوو، دایە دواوە، هیوای بوو بە ناهومێدی. فێرناندا تەنانەت تێنەکۆشا تێبگا. کاتێک لە کەرنەڤاڵە خوێناوییەکەدا. ریمیدیۆسی جوانکیلەی بە لیباسی شاژنەوە بینی، لای وابوو شتێکی بێ هاوتایە، بەڵام دوایی کە زانی بەدەست نان دەخوا و ناتوانێ وەڵامێکی ئەوتۆ بداتەوە کە لە سارکاریدا وێنەی هەبێ، تەنیا سکاڵای ئەوە بوو کە گەمژەکان لە نێو بنەماڵەدا لە رادەبەدەر دەژین. ئەگەرچی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە سەر ئەو باوەڕە بوو و، دووپاتی دەکردەوە کە ریمیدیۆسی جوانکیلە بهۆشترین کەسێکە لە ژیانیدا دیتوویە و ئەو راستییەی بە هەموو توانای سەیری خۆی بۆ دەستخەڕۆیی هەموویان و هەر کات پێشان دەدا، وازیان لە کچە هێنا.

ریمیدیۆسی جوانکیلە بە بێ ئەوەی خاچێکی لە سەر شانی دانێن لە بیابانی تەنیاییدا بەڕەڵلا کرا. لە خەوە بێکابووسەکانیدا، لە حەمامە بێپسانەوەکانیدا، لە نان خواردنە بێ وەختەکانیدا و، لە بێدەنگییە قووڵ و درێژەکانی بێ بیرەوەریدا درێژەی بە ژیانی دا. هەتا پاشنیوەڕۆی رۆژێک لە رۆژەکانی مانگی مارس (ئایار) کە فێرناندا دەیەویست مەلافە هوڵەندییەکانی لە باخ قەد بکا و داوای لە ژنانی ماڵەوە کرد یارمەتیی بدەن. تازە خەریکی قەدکردنی مەلافەکان بوون کە ئامارانتا تەماشای کرد ریمیدیۆسی جوانکیلە

سەر لەبەر رەنگی زۆر بە سەیری پەڕیوە.

لێی پرسی: "حاڵت باشنییە؟"

ریمیدیۆسی جوانکیلە کە لەولاوە سەری مەلافەی گرتبوو، زەردەخەنەیەکی بەزییهێنەری کرد و وتی: "بەپێچەوانە هیچ کات ئەوەندە حاڵم باش نەبووە."

هێشتا رستەکەی کۆتایی نەهاتبوو کە فێرناندا هەستی کرد شنەبایەکی نەرم و نوورێک مەلافەکانی لە دەست رادەکێشێ و بەپانی و درێژی لێکیان ئاواڵا دەکا. ئامارانتا لە تۆڕەکانی ژێرکراسەکەی خۆیدا هەستی بە

لەرزینێکـــی ئەفســـووناوی کـــرد و، دروســـت لەو ئـــانەدا کە ڕێمیدیۆســـی جوانکیلە
لە سەر زەوی بڵێند دەبوو، دەستی بە مەلافەکانەوە گرت نەکەوێتە زەوی. ئۆرسـۆلا، کە لەو کاتیدا خەریکبوو کوێر دەبوو، تەنیا کەسێک بوو کە بە خەیاڵی راحەت مانای ئەو بایە تێگەیشت، مەلافەکانی بە نوور سپارد و لە لەریـنەوەی نـووری چـاو لە بەر هەڵنەهـاتووی مەلافەکانـدا ڕێمیدیۆســی جوانکیلەی بینی دەستی بۆ ماڵئاوایی رادەوەشێنێ و گوڵ و سەدیران بەجێ دێڵێ. هەروا کە سەعاتی چواری دوای نیوەڕۆیان دەگەیشتە کۆتایی، لەگەڵ مەلافەکان لە ئاسمانی ژووروو، جێگایەک کە تەنانەت بەرزەفڕترین باڵندەی خەیاڵیش نایگاتێ، بۆ هەمیشە لە چاوان ون بوو.
دیـارە بێگانەکـان وایـانزانی کە ڕێمیدیۆسـی جـوانکیلە سـەرەنجام بـۆتە قوربـانیی چارەنووسـی بـێ ئەولا و ئەولای شـاژنی مـێش هەنگـوین و، ماڵەوەیـان بـۆ پاراسـتنی ئـابرووی بنەمـاڵەیی، داسـتانی بەرزبـوونەوە بـۆ ئاســـمانیان داهێنـــاوە. فێرنانـــدا کە لە بەر ئێرەیـــی ڕکـــابریی جـــوان لە نێوانیاندا،دەسـووتا، ناچـار بـوو ئەو مـوجیزەیە بسـەلمێنێ. هەتـا مـاوەیەکی زۆر لە بەر خـوا دەپـاڕایەوە مەلافەکـانی بـۆ بنێـرێتەوە. زۆرکەس باوەڕیـان بەوموجیزەیە هێنا، تەنانەت شەمیان هەڵکرد و نۆ شەو و ڕۆژان تەسبیحیان گێڕا و دوعایان کردن. ڕەنگە ئەگەر قەلاچۆی دڕندانەی ئۆرلیانۆکان نەهاتبا پێش و، ترس جێگای سەرسووڕمانی نەگرتباوە، هەتا ماوەیەکی زۆر باسـی ئەو موجیزەیە دەکرا. هەر چەند سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بویندیا هەسـتی خـۆی بە حیســـابی پێشـــگۆیی دانەنـــابوو، بەڵام بە جۆرێـــک دوارۆژی ســـامناکی کورەکانی پێشبینی کردبوو. کاتێک ئۆرلیـانۆ سـیرادۆر[٤]، و ئۆرلیـانۆ ئارکایـا[٥] لەو هەرەج و مەرەجەدا هـاتنە ئەوێ و خوازیـاری ئەوە بـوون لە ماکۆنـدۆ بمێنـنەوە. باوکیـان زۆری هەوڵ دا لەو بیرەیـان لابـدا، لە شـارێکدا، کە لە ڕۆژێکـدا بـۆتە مەڵبەنـدێکی سـامناک، دوارۆژێکـی باشـی بـۆ ئەوان بەدی نەدەکرد. بەڵام ئۆرلیانۆ سینتۆ و ئۆرلیانۆ تریسـتە، بە پشـتیوانی ئۆرلیـانۆی

[٤]– AurelianoSerrador

[٥]– AurelianoArcaya

دووهەم، لە کارخانەی خۆیاندا کاریێکیان پێدان. دەلیلەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لێڵ و پێچەوانەی بڕیاری ئەوان بوو. کاتێک ئاغای براونی بینی بە سواری هەوەڵین ماشین (ئۆتۆمبیلێکی کروکی نارنجی ڕەنگ، کە واقەواقی سینگاڵەکەی سەگانی دەترسان) هاتە ماکۆندۆ، جەنگاوەری پیری لە هەڵچوونی نەفامانەی خەڵکەکە بەتوندی تووڕە بوو ، بۆی دەرکەوت کە پیاوەکان لەگەڵ ئەو زەمانەی کە ژن و منداڵەکانیان بەجێ دەهێشت و تفەنگ بەشان دەچوونە شەڕی، چەندە گۆڕاون. دوای پەیمانی نێرلاندیا. کاربەدەستانی خۆجێی کۆمەڵێک شارەوانی بێ بڕشت بوون —و کۆمەڵێک پاریزەری مەجلیسی رازێنەر کە لە نێوان دوورەپەرێزانی ئاشتیخوازی ماندووی ماکۆندۆ هەڵبژێرابوون. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، کاتێک پاسەوانە پێ پەتییەکانی چەکدار بە باتۆمی داری دەبینی، دەیگوت: "چەند ڕێژیمێکی دواکەوتووە! ئەو هەموو شەڕەمان کرد بۆ ئەوەی تەنیا نەهێڵین خانووەکانمان ڕەنگی شین لێبدەن."

هەر جۆرێک بێ، بە هاتنی شەریکەی مۆز، کاربەدەستانی خۆجێی جێگای خۆیان دا بەو بێگانە ستەمکارانەی کە ئاغای براون لەگەڵ خۆی بردبوونیە ئەو ناوچە تێلدڕووکراوە، بەو جۆرە کە خۆی دەیگوت شیاوی ئەوەن دوور لە مێشووله و گەرما و نارەحەتی زۆر و کەموکورِی شار، لەوێ بژین. پیاوکوژانی بەکرێگیراوی ساتۆر بەدەست جێگای پاسەوانە پیرەکانیان گرتەوە، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە کارگەی دەرگاداخراوی خۆیدا بیری لەو گۆڕانانە دەکردەوە و بۆ یەکەمین جار لە ماوەی ساڵانی تەنیایی خۆیدا، بە دڵنیایی تەواوەوە لەوەی شەڕیان درێژە پێ نەداوە، هەتا گەیشتن بە ئامانجی دڵخواز، هەڵەیەکی گەورە بووە، نارەحەت بوو. لەو ڕۆژانەدا یەکێ لە براکانی سەرهەنگ ماگنیفیکۆ ویسبالی لە بیرکراو، نەوەیەکی حەوت ساڵەی خۆی بردبووە مەیدانێ هەتا لە سەر ئەو عارەبانە دەستییانەی نۆشابەی بێ ئالکهۆڵ دەفرۆشن نۆشابەیەکی بکڕێ. تەنیا لەبەر ئەوەی منداڵەکە بە هەڵکەوت بە سەر پاسەوانێکدا کەوت و نۆشابە بە جلکەیدا ڕژا، کابرای دڕندە منداڵەکەی بە ساتۆر پارچە پارچە کرد و، سەری باپیریشی، کە خۆی هاویشتبووە مەیدانێ بە زەبرێکی ساتۆر لە لەشی جیا

کردەوە. تەواوی خەڵکی شاری کۆمەڵێکیان بینی کە کابرای سەربڕاو دەبەنەوە ماڵێ، ژنێک سەری بڕاوی کە خوێنی لێ دەتکا بە دەستێک و کیسەیەکیش کە پارچە پارچە لەشی خوێناوی منداڵەکەی تێدا بوو بە دەستەکەی دیکەیەوە گرتبوو.
ئەو ڕووداوە بۆ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئەوپەڕی پلەی کەفارەدانەوە بوو. لە پڕ هەستی کرد هەر ئەو ئازارە دەچێژێ کە لە زەمانی لاویدا لە بینینی مەرگی ژنێک چێشتوویە، کە تەنیا لە بەر ئەوە سەگی هار گرتوویە، ئەوەندەیان لێدا هەتا مرد. چاوێکی لەو کۆمەڵە خەڵکە کرد، کە لە بەرامبەر دەرگا وەستابوون و بە دەنگی گەورەی پێشوو، کە لە بەر ڕق لە خۆی بەگوڕتر ببوو، باری ڕق و تووڕەیی کە لەوە پتر نەیدەتوانی ڕایبگرێ بە سەر ئەوانیدا ڕژاند.
نەڕاندی: "لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا کوڕەکانم چەکدار دەکەم، هەتا گیانمان لە شەڕی ئەو بیانییە پیسانە ڕزگار کەین."
هەر لە ماوەی ئەو هەفتەیەدا، لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی کەنار، جینایەتکارانی نادیار، حەڤدە کوڕەکەیان وەک کەروێشک گرت و گوللەیان لە نێوەڕاستی ئەو خاچە خۆڵەمێشییەدا کە بە نێوچاوانیانەوە بوو. ئۆرلیانۆ تریستە سەعاتی حەوتی شەو لەگەڵ دایکی دەڕۆیشتە دەرەوە، کە گوللەیەکی تفەنگ بە تاریکی نێوەڕاستی نێوچاوانی کون کرد.
ئاۆرلیانۆ سینتۆیان لە جۆلانەیەکدا دۆزییەوە کە ئاسایی لە کارخانە هەڵیداوەسی، سەهۆڵ بڕێک هەتا بن دەسکان لە نێوان هەر دوو بڕۆی چووبووە خوارێ. ئۆرلیانۆ سیروادۆر دوای ئەوەی دۆستە کچەکەی بردە سینەما و دوایی گەیاندییەوە ماڵی دایک و بابی و خۆی بە شەقامی ڕووناکی تورکەکاندا ڕادەبرد، کەسێک، کە هەرگیز نەناسرا، لە نێو کۆمەڵەی خەڵکەوە بە دەمانچە تەقەی لێکرد. لەشەکەی کەوتە نێو مەنجەڵێک ڕۆنی قاڵ. چەند دەقیقە دواتر کەسێک لە دەرگای ژوورێکی دا، کە ئۆرلیانۆ ئارکادیا لەگەڵ ژنێک خەریک بوون، بانگی کرد: "پەلە بکە، خەریکن براکانت دەکوژن." ژنەکەی کە لەگەڵ ئۆرلیانۆ ئارکادیا بوو، دوایە گێڕابوویەوە، ئەو لە تەختی خۆی فڕێدا بۆ خوارەوە و دەرگای کردبۆوە لە

پێش دەرگا مێشکی بە چەند گولله پرژابوو. لەو شەوە مەرگهێنەرەدا، لەو کاتەدا کە ماڵ بۆ سەرەخۆشیی ئەو چوار کوژراوە ئامادە دەبوو، فێرناندا لە شاریدا وەک شێتان بە دوای ئۆرلیانۆی دووهەمدا دەگەڕا، بەڵام پیترا کۆتیس بەو خەیاڵە کە ئەو قەڵاچۆکردنە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە ناوی سەرهەنگیان لەسەرە، ئۆرلیانۆی دووهەمی لە خەڵوەتێدا شاردبۆوە. هەتا رۆژی چوارەم ئامادە نەبوو لە خەڵوەتێ دەریخا. رۆژێک کە تێلگرافەکانی گەیشتوو لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی کەنار روونیان کردەوە. رقی دوژمنی نادیار تەنیا بۆ ئەو برایانە بووە کە بە خاچی خۆڵەمێشی نیشانەکراون، ئامارانتا دەفتەرێکی گچکەی، کە ناونیشانی برازاکانی تێدا نووسرابوو، هێنا دەرێ و هەر بەو جۆرەی تێلگرافەکان دەگەیشتن، خەتێکی بە سەر ناوەکاندا دەهێنا، هەتا ئەوەی تەنیا ناوی برا گەورەکە مایەوە. ئەویان بە چاکی لەبیر مابوو، چونکە پێستی تیرەی"ڕەشی" لەگەڵ چاوە سەوزەکانی ناتەباییەکی سەیریان هەبوو، ناوی ئۆرلیانۆ ئامادۆر[٦] و کاریشی دارتاشی بوو. لە گوندێکی شاراوە لە داوێنی گردێک دەژیا.

دوای دوو حەفتە چاوەڕوانی بۆ تێلگرافێک، کە هەواڵی مەرگی ئەو بگەیەنێ، ئۆرلیانۆی دووهەم بەو خەیاڵەی ئەو لە مەترسییەکی هەڕەشە لە ژیانی دەکا، بێ ئاگایە، کەسێکی نارد ئاگاداری بکاتەوە. نێردراو گەڕایەوە و رایگەیاند کە گیانی ئۆرلیانۆ ئامادۆر لە ئەوان دایە. شەوی قەڵاچۆکە دووپیاو چووبوونە ماڵیان و بە دەمانچە تەقەیان لێکردبوو، بەڵام گوللەکان خاچی خۆڵەمێشییان نەپێکابوو. ئۆرلیانۆ ئامادۆر خۆی بە سەر دیواری حەوشەدا فڕێدا بۆ دەرێ و، لەو جادە پڕ پێچاو پێچی و بەرز و نزمیی چیا، کە بە هۆی ئاشنایی و دۆستایەتیی لەگەڵ سووورپێستان، وەک بەری دەستی خۆی شارەزایان بوو، ون بوو و ئیتر هەواڵێکی لێ نەزانرا.

ئەو رۆژانە بۆ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا رۆژانێکی رەش بوون. سەرکۆمار تێلگرامێکی سەرەخۆشیی بۆ نارد، کە بەڵێنی دەدا لەو بارەوە پرسینەوەی ورد بکا و هەروەها رێزی بۆ مردووەکان دانابوو. بە فەرمانی سەرکۆمار شارەوانیی شار لە رێوڕەسمی ناشتنی تەرمەکاندا ئامادە بوو و، چوار

---

٦– Aureliano Amador

دەسکەگوڵی لەگەڵ خۆی هێنابوو، دەیەویست لە سەر تابووتەکانی دابنێ. بەڵام سەرهەنگ فرێیدانە نێو شەقام. دوای ڕێورەسمی بەخاک سپاردن بۆخۆی تێلگرامێکی بۆ سەرکۆمار ئامادە کرد، کە ئەوەندە سووکایەتیی تێدا بوو تێلگرامچی لە بەڕێکردنی سەرپێچیی کرد. سەرهەنگ جنێوی زۆرتری لە دەقی تێلگرامەکە زیاد کرد و لە نێو پاکەتێکی نا و پۆستی کرد. ئەو جۆرەی کە لە مردنی ژنەکەی بۆی هاتبووە پێش و هەر بەو جۆرەی، کە بە درێژایی شەڕ، چەندین جار بۆ مردنی باشترین هاوڕێکانی بۆی ڕوودابوو، هەستی بە خەم و پەژارە نەکرد، بەڵکو سەرتاپای لەشی ڕقێکی کوێری بێ ئامانجی روون و جۆرێک هەستی بێ توانایی دایگرت. تەنانەت قەشەئەنتۆنیۆ ئیزابێلیشی بە هاودەستی لەگەڵ جینایەتکاران تاوانبار کرد، کە بۆچی کوڕەکانی بە خۆڵەمێشێک نیشانە کردوون، کە پاک ناکرێتەوە، هەتا دوژمنەکانی لە هەموو شوێنێک بتوانن بیانناسنەوە!. کەشیشی پەککەوتوو، کە ئیدی نەیدەتوانی رایەڵی بیرەکانی دەسەرێک کاتەوە و، باوەڕهێنەرانی بە مەوعیزەی بێ مانا دەترساند، رۆژێک دوای نیوەڕۆ، بە قاپێکەوە کە ئەو رۆژە چوارشەممە خۆڵەمێشی تێدا گرتبۆوە هاتە ماڵی ئەوان و دەیویست بۆ ئەوە بیسەلمێنێ کە ئەو خۆڵەمێشە پاک دەبێتەوە، نێوچاوانی هەموو ئەندامانی بنەماڵە بەو خوڵە چەور بکا، بەڵام سامی ئەو خەسارە ئەوەندە لە دڵ و دەروونی هەموویاندا جێگرتوو بووە، تەنانەت فێرنانداش نەیهێشت کەشیش خۆڵەمێشی لە رووی تاقیکاتەوە و لەوە بەدوا هیچ کەس لە ئەندامانی بویندیا لە "چوارشەممەی خۆڵەمێش" چۆکیان لە بەر میحرابێ دانەدا.

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، هەتا ماوەیەکی زۆر نەیتوانی بگەڕێتەوە سەر گەڕی ئاسوودەیی خۆی، دەستی لە دروستکردنی ماسییە چکۆڵە زێڕەکان هەڵگرت و خواردنی کەم دەخوارد و، لە حاڵێکدا پەتووەکەی خۆی بە دوای خۆیدا رادەکێشا، وەک خەوگەڕان بە رێگادا دەڕۆیشت. رقی بێدەنگی خۆی دەخواردەوە و لە ماڵێ دەگەڕا. لە ماوەی سێ مانگاندا مووی سەری هەموو ماش و برینجی بوو و سمێڵی چەخماخی قەدیمی بە سەر لێوە بێڕەنگەکانیدا داچۆڕا. لە بەرامبەردا چاوەکانی دیسان بوون بە دوو کڵۆ

پۆڵوو، چاوانێک، کاتێک لە دایک ببوو، دەوروبەری ترساندبوو و، زەمانێک بە نیگـایەکی سـاکار کورسـیی وەجـووڵە هێنـابوون. لە گەرمەی رق و خرۆشـی بـێ سـوودیدا، تێدەکۆشـا هەسـتی پێشـگویی لە خۆیـدا هـان بـدا. هەستێک کە ئەوەندە لاویەتیی ئەوی بە ڕێڕەوی سامناکدا بۆ سـەر زەویی بەیار و بیکەڵکی شانازی بردبوو، لە نێو چووبوو. ئەو لە مـاڵێکی غەریبەدا، کە هیچ شتێک و هیچ کەسێک چووکترین خۆشەویستییەکی لە دڵـی ئەودا پێک نەدەهێنا، گوم ببوو. جارێکیـان بە دوای شـوێنەوارێک لە رابـردووی پێش شەڕ، دەرگای ژووری مێلکیادێسی کردەوە. بەڵام لەوێ تەنیا چاوی بە خـۆڵ و کۆمـایەکی زۆری زبـڵ کەوت، کە بە درێژایـی سـالآن بە سـەر یەکدا کۆببـۆوە، لە سـەر ئەو بەرگە کتێبـانەی کە کەس نەیخوێنـدبوونەوە و، لە سـەر نووسـراوەی کـۆنی پێسـتی، کە نـم کـاری تێکردبـوون و لە نێـو چووبـوون، گـوڵێکی سـەوز روابـوو و، لە هەوای ژوورێـک، کە رۆژێـک لە رۆژان خـاوێنترین و روونـاکترین بەشـی مـاڵێ بـوو، بـۆنی بیـرەوەرییە گەنیوەکـانی لێـدەهات. رۆژێکیـان بەیـانی، ئۆرسـۆلای بینـی کە لە ژێـر داربەڕووەکە لە سەر رانی مێردە مردووەکەی فرمێسکان دەرێژێ. لە نێو خەڵکی ماڵێ، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا تەنیا کەسێک بوو کە هێشتا ئەو پیاوە بەهێزەی نەدەدی، پەنجا ساڵ ژیان لە دەرەوە و بێ سەرمیچ ئەوی بە سەر خۆیدا کووڕ کردبۆوە، ئۆرسۆلا پێیگوت: "سڵاو لە باوکت بکە."

ئەو بۆ مـاوەیەکی کـورت لە بەرامبەر داربەڕوەکە راوسـتا و، دیسـان بـۆی دەرکەوت تەنانەت ئەو فەزا چۆڵەش مەیلێک لە دڵیدا نابزوێنێ.

لە ئۆرسۆلای پرسی: "دەڵێ چی؟"

ئۆرسۆلا وەڵامی دایەوە: "خەمناکە، چونکە پێیوایە تۆ بەوزووانە دەمری"

سەرهەنگ بە زەردەخەنەوە وتی: "پێی بڵێ مرۆڤ کاتێک دەمرێ کە بتوانێ بمرێ، نە ئەو کاتەی کە دەبێ بمرێ."

پێشبینی باوکی مردووی، خۆڵەمێشێکی کە لە سەر ئـاخرین غـرووری دڵـی مـابۆوە لای دا. هەر چەنـد ئەو ئەوەی بە حیسـابی هێزێکـی لەنەکـاو دانـا. هێرشـی بـردە سـەر ئۆرسـۆلا هەتـا بـۆی ئاشـکرا کـا سـکە زێڕەکـانی کە لە هەیکەلی حەزرەتی یوسفدا دیبوویەوە لە کوێی حەوشـەدا شـاردوونییەوە.

ئورسوڵا بە ئیرادەیەکی پتەو، کە ئەزموونێکی کۆن ئیلهامی پێدابوو وتی: "هەرگیز نایزانی." و درێژەی دا: "رۆژێک خاوەنی ئەو گەنجە پەیدا دەبێ و تەنیا هەر ئەو دەتوانێ لە ژێر خاک دەری بێنێتەوە".
هیچ کەس نەیدەزانی پیاوێک کە هەمیشە سەخی بووە، بۆچی لەپڕ وا بە نیگەرانی ئارەزووی پووڵێ دەکا، ئەویش نە پووڵێکی کەم بۆ خەرجی پێداویستییەکی گرنگ، بەڵکو سامانێکی ئاوها سەرسوورهێنەر، کە تەنیا ناوهێنانی ژمارەی پارەکە، ئۆرلیانۆی دووهەمی حەپەساندبوو و زاری پێ داچەقاندبوو. کاتێک سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بۆ داوای یارمەتی رۆیشتە لای هاورێ کۆنەکانی حیزبی، هەموویان خۆیان شاردەوە، هەتا چاویان پێی نەکەوێ. لەو دەورەیەدا بوو کە بیستیان دەڵێ: "ئێستا لە نێوان ئازادیخوازان و پارێزگاران تەنیا تەفاوەت لەوە دایە کە ئازادیخوازان دەچنە نوێژی سەعاتی پێنج و پارێزگاران دەچنە نوێژی سەعاتی هەشت." هەر چۆنێکی بێ ئەوەندە لە سەر لەوجرِی و جەنەگرتنی خۆی پێی داگرت و ئەوەندە پاڕاوە و لە سەری رۆیشت و ئەوەندە غرووری خۆی تێکشکاند و، ئەوەندە لەو دەرگا و ئەو دەرگای دا و بە زیرەکییەکی زوو تێپەڕ و، بەرهەڵستییەکی بێبەزەییانە، خۆی گەیاندە هەموو لایەک، هەتا سەرەنجام دوای هەشت مانگان توانی لەو پووڵە زۆرتر کۆبکاتەوە کە ئۆرسوڵا لە ژێر خاک شاردبوویەوە. ئەو جار چوو بۆ چاوپێکەوتنی سەرهەنگ خرینیلیدۆ ماکیزی ئیفلیج، هەتا داوای لێ بکا بۆ دەست پێکردنی شەڕێکی گشتی یارمەتیی بدا. لە راستیدا لەو کاتە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز تەنیا کەسێک بوو کە دەیتوانی تەنانەت لە سەر کورسییە چەرخدارەکەشییەوە زنجیرەی رزیوی شۆڕش ببزوێنێ. دوای پەیمانی نێرلاندیا، هەروەک سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا پەنای بۆ ماسییە زێڕە چکۆڵەکانی برد، ئەویش لەگەل ئەفسەرانی شۆڕش، کە لە زەمانی تێشکانەوە وەفادار مابوونەوە لە پێوەندیدا بوو. لەگەڵ ئەوان چووبووە شەڕی خەمهێنەری زەلالەتکێشانی رۆژانە، پاڕانەوە و گازاندان.لە شەڕی "سبەی وەرەوە"کان، "ئیدی هێندە نەماوە"کان و پەروەندەی تۆ بەوردی تەماشا دەکەین"ەکان، شەڕێک کە ناهومێدانە لەبەرامبەر "لەگەڵ پێشکەشکردنی رێزی سەرکەوتووانە"ی

زۆرێک کە دەبوایە لە ژێر پەڕەکاغەزی یارمەتیی خانەنشینی هەتا کۆتایی تەمەن مۆری بکردایە و هەرگیز نەیکرد، دوورابوو. شەڕەکەی دیکە، ئەو شەڕە خوێناوییەی بیست ساڵە، بە ئەندازەی ئەو شەڕە دڵسووتێنەی فریوی ئەبەدی، داری بە روحی ئەواندا نەدابوو. تەنانەت سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز، کە لە سێ هەوڵی کوشتن رزگاری بوو و پێنج جار بریندار و لە زۆر شەڕاندا زیندوو مایەوە، تەسلیمی هێرشی توندی ئەو چاوەڕوانییە بوو و، لە تێشکانی ناچاری تەمەنی پیریدا نوقم بوو و، لە نێو پەڵەنووری وەک ئەڵماسی خانوویەکی بەکرێ، هەر بیری لە ئامارانتا دەکردەوە. هەواڵێکی کە لە شەڕکەرە پیرەکان دەستی کەوت، وێنەی ئەوان بوو کە لە رۆژنامەدا چاپ کرابوو. سەری خۆیان بە بێ شەرمی لە کەنار سەرکۆماری نەناسیاو بەرز کردبۆوە.سەرکۆمارێک کە ئارمێکی وێنەی خۆی دەدانێ هەتا لە یەخەی کۆتی خۆیانی بدەن و، لەگەڵ ئالایەکی پیس، لە خوێن وخاک، هەتا بەسەر تابووتی خۆیانیدا بدەن. ئەوانی دیکە کە هێشتا غیرەتیان مابوو لە سایەی دڵسۆزیی گشتی، لەگەڵ ئەوەشدا لە برسان بەرەو مردن دەڕۆیشتن، رق و بێزاریی خۆیان دەخواردەوە و لە تەمەنی پیری لە زەڵکاوی فریودەری شانازیدا دەگەنان و هەروا چاوەڕوانی نامەیەک بوون. بۆیە کاتێک سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا ئەوی بۆ شەڕێ بانگهێشت کرد، کە دەبوایە شوێنەواری رێژیمێکی لادەر و ریسوا لە سەر زەوی پاککەنەوە، کە بە پشتیوانی بێگانەیەک هاتۆتە سەرکار، سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز تەزوویەکی خەماوی بە لەشیدا هات.
هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: "ئاخ، ئۆرلیانۆ، دەمزانی پیربووی، بەڵام ئێستا بۆم دەردەکەوێ زۆر لەوە پیرتری کە بەڕواڵەت دەنوێنی."

ئۆرسوڵا، لە گێژاوی ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا دەرفەتی نەبوو هەتا خەریکی پەروەردەکردنی مەزهەبیی خۆزێ ئارکادۆ بێ، کاتێک گەیشت، کە دەبوایە ئەوی بەپەلە ئامادە بکەن و بینێرنە مەدرەسەی فەقێیان. مەمە، خوشکی خۆزێ ئارکادیۆ، کاتی خۆی لە نێوان زیپک و زاکوونی فێرنانددا و بەدبەختیی ئامارانتادا دابەش کردبوو، هەر نێزیکی ئەو کاتەبوو، گەیشتە

تەمەنێک کە دەبوایە بچێتە مەدرەسەی شەوانەڕۆژی "تەرکە دونیا"کان و فێری کلاوسن لێدان ببێ. ئۆرسوڵای وەلانراو و گومانـاوی، لە شکڵ و قاڵبێکی دابووی بە رووحییەتی داتەپاوی ئەو شاگردەی ئوسقۆفی گەورە، زۆر پەرێشان ببوو، بەڵام تاوانەکەی نەدەخستە ئەستۆی پیریی خۆی و نەیشیدەخستە ئەستۆی ئەو سێبەرە رەشانەی لە نێوان ئەوانەوە بە سەرسەختی دەیتوانی شتان لە یەک کاتەوە، بەڵکو ئەوانەی بە شتێکی دیکە دەزانی کە خۆشی نەیدەتوانی بەتەواوی دیاریی بکا و، بە شێوەیەکی ناڕوون، وای دادەنا زەمانە وردە وردە لەنێو دەچێ. بەئاشکرا دەیدیت کە راستی، رۆژانە بەسەر دەستییەوە هەڵدەخلیسکێ و دەڕوا. دەیگوت: "ئەو رۆژ و ساڵانە وەک ساڵەکانی پێشوو ناڕۆن." بیری دەکردەوە لە رابردوودا چەندی دەکێشا هەتا منداڵەکان گەورە دەبوون. لەوکاتەوە کە کوڕە گەورەکەی، خۆزێ ئارکادۆ، لەگەڵ کاولییەکان رۆیشتبوو، هەتا ئەو کاتەی وەک مارێکی ژەهراویی رەنگاوڕەنگ گەڕابۆوە و، وەک ئەستێرەناسێک قسەی دەکرد، چەند رابردبوو. ئەو رووداوانەی کە زۆر پێش ئەوەی ئامارانتا و ئارکاسیۆ زمانی سوورپێستانی دێهاتی فەرامۆش بکەن و، زمانی ئیسپانیۆلی فێر بن، لە ماڵەوە روویان دابوو. تەواوی ئەو هەوا خۆش و ناخۆشانەی خۆزێ ئارکادۆ بویندیای بێچارە لە بن داربەڕوو خۆی لە بەر راگرتبوو، ئەو هەموو فرمێسکەی بۆ مەرگی ئەویان رشتبوو هەتا ئەو جارەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایان بە کوڵەمەرگی هێنایەوە ماڵەوە و، تازە دوای ئەم هەموو شەڕ و ئازارەی شەڕ نەگەیشتبووە تەمەنی پەنجا ساڵان. لە رابردوودا، دوای ئەوەی رۆژێکی تەواو خەریکی دروستکردنی ئاوی نەباتی جانەوەر شکل دەبوو، هێندەی ماوە هەبوو لە سپێنەی چاوی منداڵەکانەوە بزانێ رۆن گەرچەکیان گەرەکە یان نا، بەڵام ئێستا، کە هیچ کارێکی نەبوو و، رۆژ هەتا ئێواری خۆزێ ئارکادیۆی لە کۆڵ دەکرد، وەزعی زەمان ناچاری دەکرد هەتا هەموو کارێکی نیوەتەواو بەجێ بێڵێ. راستییەکەی ئەوە بوو هەر چەند ئۆرسوڵا حیسابی ساڵەکانی تەمەنی لەبیر نەمابوو، بە هەموو تواناوە جەنەی دەگرت پیر نەبێ و، پیلەی بە هەمووان دەگرت و خۆی لە هەموو بابەتێک وەردەدا و ، بێگانەکانی بەوپرسیارە

هەمیشـەییەی ئـازار دەدان، کە ئایـا لە زەمـانی شـەڕدا یۆسـفێکی پیـرۆزی گەچییـان لە مـاڵی ئەوان دانەنـابوو، هەتـا دوای کۆتـایی وەرزی بـاران وەریبگرنەوە. هیچ کەس بەچاکی نەیزانی لە چ کاتێکەوە وردەوردە سۆمای چـاوانی لەدەسـت چـوو، تەنـانەت لە سـاڵەکانی کۆتـایی تەمەنـدا، کە ئیتـر نەیدەتوانی لە سەر جێگای خۆی بێتە خوارێ، وا دەهاتە بەرچاو کە تەنیا زەبری پیری و داکەوتـن ئەوی لە پـێ خسـتووە ـ هـیچ کەس تەنـانەت بە خەیاڵێشـیدا نەدەهـات کە ئەو کـوێر بـووە. بۆخـۆی پـێش لە دایـک بـوونی خـۆزێ ئارکـادۆ زانیبووی. لە پێشـدا وایدەزانی لاوازییەکە زوو دەڕوا و بە دزییەوە شـەربەتی کەدووی دەخـواردەوە و هەنگـوینی دەچـاوان دەکێشـا. بەڵام بەزوویـی بـۆی دەرکەوت چـارەنییە و لە تاریکیـدا نـوقم دەبـێ، بە جۆرێک کە هەرگیز داهێنـانی کارەبا بەدروسـتی تێنەگەیشـت، چونکە کاتێک هەوەڵـێن چـرای کارەبایـان بە مـاڵەوە پێوەنـد دا، تەنیـا رووناکـاییەکی کەمرەنگـی بینـی. لەو بـارەوە لەگەڵ کەس قسـەی نەکـرد، چـونکە ئەگەر زانیبایـان هەمـوو فاتیحایـان بۆ دەخوێند. لە بێدەنگیدا، هەمـوو بیـری خـۆی کۆکردەوە هەتا بتوانێ مەودای شتومەک و دەنگی خەڵک فێر بێ و ، بتـوانێ ئەوەی کە ئاوی مرواری رێگەی پـێ نەدەدا، بە هۆشـی خۆی ببینـێ و دوایـی یـارمەتیی چـاوەڕواننەکراوی بـۆنی دۆزیـیەوە، کە لە تاریکاییـدا خـۆن بەهێزێکی روونتر لە بارسـتایی و رەنگ نیشـان دەدا و سـەرەنجام ئەوی لە داننان بە تەسلیم رزگار کرد. لە تاریکـانی ژووردا دەیتوانی دەرزی پێوەکا و جێگە دوگمە بدروێتەوە، دەیزانـی شیر چ کاتێـک دەکـوڵێ، شـوێنی هەر شـتێکی وەهـا بەدڵنیـاییەوە فێـر بـوو، کە کـاتی وا هەبـوو خۆشـی لە یـادی دەچوو کوێر بووە. جارێکیان فێرناندا ئاڵقەی مارەیی خۆی گوم کرد و، بۆ دۆزینەوەی هەموو مـاڵەوەی سـەروژێر کـرد، ئۆرسـۆلا ئـاڵقەکەی لە ژووری منداڵەکان لە سەر تـاقە دۆزییەوە. زۆر سـاکار بـوو، هەروا کە خەڵکی دیکە لە ماڵەوە هاتووچۆیان بوو، ئۆرسۆلا بە چوار هەستی خۆی گوێقوڵاغ بوو نەوەک لە نەکاو خـافڵگیری بکەن و ، دوای مـاوەیەک زانـی کەسـانی مـاڵەوە هەر کامەیان، بێ ئەوەی خۆیان بزانن هەموو رۆژێ بە رێڕەوێکدا دەڕۆن و هەر ئەو کـارە هەمـوو رۆژێ دووپـات دەکەنەوە و، تەنـانەت لە سـەر و

عادەتی دیاریکراویش وشەکانی هەمیشەیی دەڵێنەوە، لە ئەنجامدا، کاتێک هەمان عادەتیان دووبارە نەدەکردەوە و دەیانگۆڕی ، وەک ئەوە وابوو شتێکیان ون کردبێ. لە بەر ئەوە کاتێک هات و هاواری فێرانانددای بیست کە ئاڵقەی خۆی گوم کردووە، بە بیریدا هات کە تەنیا کردەوەی نائاسایی ئەو رۆژە، وەک شەوی پێشوو، لە بەر ئەوەی ساسێکی لە پێخەفەکانی خۆیدا ڕشتبوو، لە بەر با هەڵخستنی دۆشەکی منداڵەکان بووە. لە بەر ئەوە کە لە کاتی هەڵخستنی دۆشەکەکاندا منداڵەکان ئامادە بوون، ئۆرسۆلا بە بیریدا هات کە فێرناندا ئاڵقەکەی خۆی لە تەنیا جێگایەک داناوە کە دەستی منالانی وێ پێرانەگا: لە سەر تاقە. فێرناندا بەپێچەوانە، بە خۆڕایی بۆ دۆزینەوەی ئاڵقەکەی، لە ڕێڕەوی کاری رۆژانەیدا گەڕابوو، بە بێ ئەوەی بزانێ بۆ شتی ون بوو نابێ لە شوێنی کاری عادەتی رۆژانە بگەڕێ و هەر بۆیەشە دۆزینەوەی ئەو شتانە هێندە گرانە.

گەورەکردنی خۆزێ ئارکادیۆ، یارمەتیی ئۆرسۆلای دا هەتا ئاگای لە وردترین گۆڕانەکانی ماڵەوە، کە کەساسیهێنەر بوو، ببێ. هەر کە دەیزانی ئامارانتا لە ژووری خەوە و خەریکە لیباس دەبەر پەیکەری پیرۆزان دەکا، وایدەنواند کە جیاوازیی رەنگەکان فێری منالەکان دەکا و پێی دەوت: "باشە راوەستە بزانم، بلێ بزانم لیباسی سان رافائێل چ رەنگێکە؟" و هەروەها منالەکە هەواڵێکی پێ دەدا کە چاوەکانی لێیان حەشار دەدا و زۆر پێش ئەوەی بینێرێتە قوتابخانەی فەقێیان ئۆرسۆلا توانیبووی بە دەست لێدان لە پارچەی جلی پیرۆزەکان رەنگی جۆراجۆری ئەوان بزانێ. جاری واش هەبوو رووداوی چاوەڕوان نەکراو دەهاتە پێش. رۆژێک دوای نیوەڕۆ، ئامارانتا لە هەیوانی گوڵەبگۆنیاکان دا دانیشتبوو و گوڵدۆزیی دەکرد، ئۆرسۆلا تێی هەڵەنگوت.

ئامارانتا نارەزایی دەربڕی کە: "تۆخوا ئاگات لە خۆ بێ، بۆچی چاو لە بەر پێت ناکەی؟"

ئۆرسۆلا وتی: "تاوانی تۆیە، لە جێگایەک دانیشتووی کە نابێ دابنیشی."

ئەو کارە بۆخۆی راستییەک بوو. لەو رۆژەوە شتێکی بۆ دەرکەوت کە هەرگیز کەسێکی دیکە نەیزانیبوو. ئەویش ئەوە بوو، کە بە تێپەڕبوونی

ساڵ، رۆژ بە شێوەی هەست پێنەکراو جێگا دەگۆڕێ و کەسانێکی کە لە سەر هەیوان دادەنیشتن، ناچارن، بە بێ ئەوەی ئاگایان لێ بێ، وردەوردە شوێنی خۆیان بگۆڕن. لەوە بەدوا هەر ئەوەندە بەس بوو ئۆرسۆلا تاریخی رۆژەکەی لە یاد بایە، هەتا بزانێ ئامارانتا بەڕاستی لە کوێ دانیشتووە. لەرزی دەستەکانی رۆژبەڕۆژۆژ ئاشکراتر دەبوو و، قورسایی پێیەکانی لە توانا بەدەر بوون، بەوحاڵەش هەیکەلی گچکەی لەیەک ئاندا لە هەموو شوێنێک دەبینرا. بە مەزندە گەیشتبووە چالاکی و زیرەکیی ئەو کاتەی کە بەتەنیایی تەواوی گرانایی باری ماڵەوەی لە سە شان بوو و، ئەو کات لە تەنیایی کارتێنەکراوی دارزان دا هەروا کە رووداوەکانی بێ بایەخی بنەماڵەی بەسەر دەکردەوە. بۆ هەوەڵین جار، بەئاشکرا، راستیگەلێکی بۆ دەرکەوت کە ژیانی پڕ لە ئەرکی رابردوو نەیانهێشتبوو ئەوانە بزانێ. لە کاتێکدا کە خۆزێ ئارکادیۆیان بۆ ناردنی مەدرەسەی فەقێیان ئامادە دەکرد. ژیانی خۆی لەو ماڵەدا لە سەرەتای دروستبوونی ماکۆندۆ وەها بەوردی و بەدرێژی وەرد دایەوە، کە باوەڕی سەبارەت بە نەوەکانی دوایی بەتەواوی گۆڕا.

بۆی دەرکەوت کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا، بە پێچەوانەی بۆچوونی پێشووی، خۆشەویستیی خۆی بەرامبەر بە بنەماڵە لە بەر ئەوە لەدەست نەداوە کە شەڕ ئەوی کردۆتە کابرایەکی بێهەست و تووڕە، بەڵکو ئەو هەر لە سەرەتاوە کەسی خۆش نەویستووە، بە هاوسەرەکەی ڕێمیدیۆسیشەوە، نە ئەو ژنە زۆرە یەک شەوانەی کە بە سەر ژیانیدا تێپەر بیوون و، نە تەنانەت کوڕەکانی. هەستی کرد کە ئەو بە پێچەوانەی باوەڕی گشتی، بۆ وەدەستهێنانی ئیدەی خۆی ئەو شەڕانەی نەکردووە و، دیسان بە پێچەوانەی باوەڕی گشتی، بۆ سەرکەوتینش لە بەر ماندووبوون چاوپۆشیی نەکردووە، بەڵکو تەنیا بە هۆیەک، کە ئەو ئامادە بوو گیانی خۆی لە پێناو دا بەخت بکا، پیاوێکە کە هەر ناتوانێ کەسی خۆش بوێ. شەوێک ئەوکاتە ئەوی لە زگدا بوو، گوێی لە دەنگی گریانی ئەو بوو. دەنگی گریان ئەوەندە بەهێز و ئاشکرا بوو کە خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا لە تەنیشتی بەخەبەر هات و بەو بیرە کە منداڵەکەیان لەو کەسانەیە کە دەنگیان

لە نێو زگی دایکیشەوە دەبیسرێ، بەڵام بۆخۆی، بە پێچەوانەی هەمووان بە دڵنیایی ئەوە کە ئەو ناڵە درێژە هەوەڵین نیشانەیە بۆ کلکی بەسامی بەراز، لە ترسان لەرزی و لە بەر خوا پاڕایەوە مناڵەکەی لە نێو زگیدا بکوژێ و، ئێستا لە کاتی پیریدا تێدەگەیشت و دووپاتی دەکردەوە کە گریانی مناڵ لە زگی دایکیدا، راگەیاندنی دەنگی ئەوپەڕی ژیان یان بوون بە پێغەمبەرنییە، بەڵکو تەنیا نیشانەی هەڵە هەڵنەگری نەبوونی پێوانەی ئەوینە. کاتێک بایەخی کوڕەکەی هاتە خوارێ، لە پڕ هەستی بە دڵسۆزییەک کرد کە پێی قەرزدار بوو. ئامارانتا، بە پێچەوانە بە دڵی وەک بەردی، کە ئەوی دەخستە ترسەوە و تاڵی پەستواوی ژیانی لەویش تاڵ کردبوو، لەو ئەزموونە کۆتاییەدا بە شێوەی دڵسۆزترین ژن هاتەدەرێ. ئۆرسۆلا، لەژێر تیشکی پڕ لە بەزەیی تێگەیشت، ئەو ئازارە ستەمکارانەی کە ئامارانتا دابوویە پیترۆکرێسپی، بەپێچەوانەی باوەڕی گشتی لە بەر ئیرادەیەکی تۆڵەئەستێنانە نەبوو، هەروەک ئازاردانی وردەوردەی سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزیش دیسان بە پێچەوانەی باوەڕی گشتی، لە گرژیی ئەوەوە سەرچاوەی نەدەگرت، بەڵکو هەر دوو رووداوە، خەباتێکی کوشندە لە نێوان ئەوینی بێ کۆتایی و سامێکی لە شکان نەهاتوو بوو و، لەو خەباتەدا ترسێکی غەیرە مەنتقی، کە ئامارانتا هەمیشە لە دڵی خۆیدا هەستی پێکردبوو، سەرکەوتبوو. لەو دەورەدا بوو کە ئۆرسۆلا جارێکی دی ناوی رێبێکای بە سەر زماندا هات. بە وەبیرهێنانەوەی یادی ئەو، خۆشەویستییەکی قەدیمی لە ژێر پەژارەیەکی کۆنە ساڵ بە پێهەڵدانێکی لەنەکاو هاتەدەرێ. تێگەیشت کە تەنیا رێبێکا، کە شیری ئەوی خواردبوو و خۆڵی زەوی و گێچی دیواری خواردبوو. کەسێک کە لە رەگەکانیدا لە جیاتی خوێنی ئەو، خوێنی نەناسراوی دوو نەناسراوی پێدا دەڕۆیشت،کە ئێسقانەکانیان ئێستاش لە نێو گۆڕدا تەقە تەقیان دەهات.

رێبێکا بە دڵێکی بێ قەرار و، رێبێکایەک کە هەرگیز تێری نەدەخوارد، تەنیا کەسێک بوو کە ئەو ورەیەی هەبوو ئۆرسۆلا بۆ نەسلی خۆی خوازیاری بوو. بە قەراخ دیوارادا دەڕۆیشت و دەیگوت: "رێبێکا چەندە زاڵمانە لەگەڵت جووڵاینەوە!"

لە ماڵەوە پێیانوابوو قسان دەبزرکێنێ ـ بەتایبەتی لەو کاتەوە کە دەستی ڕاستی خۆی وەک جوبرائیل هەڵدێنا و بە ڕێگادا دەڕۆیشت. بەوحاڵەش فێرناندا بۆی دەرکەوت لە سێبەری ئەو بزرکاندنەی ئەوا هەتاوێکی ڕووناکبینی شاراوەتەوە، چونکە ئۆرسوڵا بە بێ بچووکترین گومان دەیتوانی بڵێ لە ماوەی ساڵێکدا چەند بۆ ماڵەوە خەرج کراوە.
ئامارانتاش هەر ئەو باوەڕەی سەبارەت بەو بۆ پەیدا ببوو، چونکە ڕۆژێک دایکی لە ئاشپەزخانە لە مەنجەڵی ئاشی وەردەدا، کە لە نەکاو بە بێ ئەوەی بزانێ ئەوان گوێی لێ رادەگرن وتی؛ ئاشی"چێشت" گەنمەشامی کە لە هەوەڵین کاولییەکانیان کڕیبوو و، پێش ئەوە زەمانەی خۆزێ ئارکادۆ شێت و پێنج جار دەوری دنیا بدا، ون ببوو. لە ماڵی پێلار تێرنێرا، کە نیزیکەی سەد ساڵ لە تەمەنی رادەبرێ، ساخ و سەلیم ماوەتەوە، هەر چەند قەڵەویی لەڕادەبەدەری منداڵان دەترسێنێ، هەروەک زەمانێک قاقای پێکەنینی کۆتری دەترساندن. ئامارانتا لەو بۆچوونە ڕاستەی ئۆرسوڵا سەری سوڕ نەما. ئێستا بە تاقیکردنەوە بۆی دەرکەوتبوو کە هۆشی تەمەنی پیری، زۆر چاکتر لە فاڵی وەرەق، هەموو شتێک پێشبینی دەکا.
لەگەڵ هەمووی ئەوانەدا، کاتێک ئۆرسوڵا بۆی دەرکەوت ماوەی نەبووە خۆزێ ئارکادیۆ بە مەیلی خۆی پەروەردە بکا، خۆی دایە دەستی چارەنووس، هەر کات تێدەکۆشا، ئەو شتەی دەروون بینی ڕوونتر لە ڕاستی پێشانی دەدا بە چاو ببینێ، تووشی هەڵە دەبوو. ڕۆژێکیان بەیانی. دەواتی مەرەکەبی بەو خەیاڵەی گوڵاوە، بە سەر منداڵیدا کرد. لە پێداگرتنی بۆ بەشداری لە هەر بابەتێکدا، ئەوەندە پای لەو بەر و ئەوبەری کەوت کە لە خۆی جاڕز بوو، کۆشا خۆی لە دەست ئەو سێبەرە دڵڕەقانە، کە ئەویان لە داوی خۆیان دەپێچا، ڕزگار بکا و ئەو کات بوو کە بە مێشکیدا هات بەملاو ئەولادا کەوتنی هەوەڵین سەرکەوتنی داڕزان و تاریکایی نییە و تەنیا هەڵەی زەمانە. بیری کردەوە کە لە ڕابردوودا خوداوەند وەک تورکان فێڵی لە پێوانی ساڵ و مانگیدا نەدەکرد و، وەزع جۆرێکی دیکە بوو. ئێستا نەتەینا مناڵەکان خێراتر گەورە دەبوون، بەڵکو هەستیش لە ڕادەیەکی توندتر لە جاران گەشەی دەکرد. هێشتا زۆر لە بەرزبوونەوەی لەش و ڕووحی

ریمیدیۆسی جوانکیلە بۆ ئاسمان تێنەپەڕیبوو، کە فێرناندای بێ هەمیشە بە بۆڵەبۆڵ، لێرە و لەوێ دەیگوت بۆچی مەلافەکانمی بۆ ئاسمان بردووە، هێشتا لاشەی ئۆرلیانۆکان لە گۆڕدا سارد نەببۆوە، کە ئۆرلیانۆی دووهەم ماڵی چراخان کرد و کۆمەڵێک مۆسیقاری ئۆکۆردیۆنی مەستی هێنانە ئەوێ، کە هەموویان هەتا گەروویان شامپانیایان خواردەوە. راست وەک ئەوە لە جیاتی مرۆڤ کۆمەڵێک سەگ تۆپی بن. دەتوت چارەنووس دەبوایە ئەو شێتخانەی کە ئەو بەو خوێنی دڵ خواردنەوە و، ئاونەباتی شیرینیی لەشێوەی ئاژەڵی بچکۆڵە پێکەوەی نابوو. ببێتە کۆمایەک زبڵی خراپە. ئۆرسۆلا، لەو حاڵەدا کە خۆزێ ئارکادیۆی ئامادە دەکرد، بیری لەو شتانە دەکردەوە و لە خۆی دەپرسی: "باشتر نەبوو رۆییبا و لە گۆڕی خۆیدا راکشابا و رێگای دابا گڵی وەسەرکەون، بە بێ ترس لە خوای دەپرسی ئایا بەراستی وا بیر دەکاتەوە کە دروستکراوەکانی لە ئاسن دروست کراون، تا بەرگەی ئەو هەموو دەرد و بەدبەختییە بگرن. ئەو پرسیارە دووقات گێژی کرد و هەستی دەکرد زۆر بەتوندی دەیەوێ وەک بێگانەیەک دەست بە جنێودان بکا و سەرەنجام تەنیا بۆ ئانێکیش بێ شۆڕش بکا. ئانێکی کە زۆر جار ئاواتی بۆ خواستبوو و، هەموو جارێ بە دوای خستبۆوە، سەرەنجام دەستی لە تەسلیمبوون هەڵگرت و جارێک بە دڵێکی خۆش پیسایی بە هەموو شتێکدا کرد، کێوە بێ پسانەوەکانی جنێوی، کە بە درێژایی سەدەیەک رایگرتبوون، لە دڵی خۆی وەدەرنان.

هاواری کرد: "ئادەی پیسایی!"

ئامارانتا کە جلەکانی لە نێو سندووق دەنان، وایزانی دووپشک پێوەی داوە بە ترسەوە پرسی: "لە کوێیە؟"

چی؟

ئامارانتا وتی: "جانەوەر."

ئۆرسۆلا بە ئەنگوست ئاماژەی بۆ دڵی خۆی کرد.

وتی: "ئەوەتا."

رۆژی پێنج شەممە سەعاتی دووی دوانیوەڕۆیە، خۆزێ ئارکادۆ بە مەبەستی چوونە مەدرەسەی فەقێیان ئەوێی بەجێ هێشت. ئۆرسۆلا

هەمیشە ئەوی بە جۆرێک دەهاتەوە یاد کە لە دەمی ماڵئاواییدا بەبیریدا هاتبوو: هەر لەو کاتەشدا لێبڕاو، بە بێ ئەوەی فرمێسکێک برێژێ، دروست هەر بەو شێوەی کە فێری کردبوو، شەلاڵی ئارەقەی گەرمای کۆت و شەڵواری مەخمەری سەوزی دوگمەیی و فۆکلێکی ئاهار لێدراو و بە یەخەوە، ژووری نەهارخۆری بۆن گرتوو بە عەتری گوڵاو کە ئۆرسوڵا بە سەریدا کردبوو هەتا بتوانێ شوێن‌پێی لە ماڵەوەدا بدۆزێتەوە بەجێ هێشت. لە سەر مێزی نانی نیوەڕۆی ماڵاوایی هەموویان بە قسەی خۆش بەریان لە نارەحەتیی خۆیان گرت و، بە شەوقێکی رواڵەتی گوێیان دایە وتەکانی قەشەئەنتۆنیۆ ئیزابێل. بەڵام کاتێک دەستیان دایە سندووقی ئاستەرمەخمەر. کە قفڵی زێوی لێدرابوون و، هەڵیان هێنا، هەموو لایان وابوو تابووتێک لە ماڵەوە دەبەنە دەرەوە.
تەنیا کەسێکی ئامادە نەبوو لە رێورەسمی ماڵئاواییدا بەشداری بکا. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بوو.
به بۆڵەبۆڵ لە بن لێوانەوە وتی: "هەر ئەوەمان کەم بوو. پاپایەک!"
سێ مانگ دواتر فێرناندا و ئامارانتا مەمەیان بردە مەدرەسە و بە کلاوسێنگەوە گەڕانەوە، کە جێگای پیانۆی گرتەوە. لەو کاتەدا بوو ئامارانتا دەستی کرد بە کفن‌دوزی خۆی. تای مۆز نیشتبۆوە، خەڵکی قەدیمی ماکۆندۆ کە دەیانبینی تازەهاتووەکانی بیانی ئەوانیان وەپاش داوە. جار لە جار زۆرتر خۆیان دەکوتا دەستیان لە شوێنێک گیر کەن. بەڵام هەر چۆنێ بێ لە فکری ئەوەدا، کە لە خنکان رزگاریان بووە، خەیاڵیان راحەت دەبوو. لە ماڵەوە بانگهێشتنی شام و نەهاران هەروا بەردەوام بوو، عادەتە کۆنەکان تەنیا چەند ساڵ دوای رۆیشتنی شەریکەی مۆز لەوێ کەوتنەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆیان. هەر چۆنێ بێ، لە بەر ئەوەی فێرناندا کاروباری ماڵەوەی بەدەستەوە گرتبوو، لە رێورەسمی میوانداریدا گۆڕانێکی بنەڕەتی پێک هات. ئۆرسوڵا لە تاریکاییدا نوقم دەبوو و ئامارانتاش خەریکی دروونی کفنی خۆی بوو، لەو بارەوە شاژنی تازەهاتووی پێشوو، دەسەڵاتی ئەوەی هەبوو، خۆی میوانەکان هەڵبژێرێ و بڕیاری سەختگیرانە، کە لە دایک و باوکی فێر ببوو، بە سەریاندا بسەپێنێ. لە شارێکی بە هۆی بوونی چەند

بێگانەیەکەوە تێشکابوو، کە سامانی باهێناویان بە بادا دەدا، رەفتاری توندی فێرناندا ئیعتباری ماڵەوەی تەواو هێنابووە خوارێ. لە روانگەی ئەوەوە خەڵکی نەجیب و چاک کەسانێک بوون، کە لەگەڵ شەریکەی مۆز پێوەندییان نەبوو. تەنانەت خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم ، برای مێردەکەی قوربانیی ئەو بێ فەرق و جیاوازییە بوو، چونکە لە سەرەتای هەڵچوونی رۆژەکانی هەوەڵەوە، دیسان کەڵەشێرە شەڕکەرە جوانەکانی خۆی فرۆشت و لە شیرکەتی مۆزدا وەک دەمڕاست دەستی بەکار کرد.

فێرناندا وتی: "هەتا کاتێک ئەو نەخۆشیی گرویێی بیانییەکانی هەیە، حەقی نییە پێ بنێتە ئەو ماڵە."

دەستووراتی بێ ئەولاو ئەولای ماڵەوە ئەوەندە پەژارەهێنەر بوو، کە ئۆرلیانۆی دووهەم ماڵی پێترا کۆتیسی پێ لە ماڵی خۆیان باشتر بوو، لە پێشەوە بەوبیانووە کە میوانەکانی دەبنە هۆی زەحمەتی فێرناندا، میوانداریییەکانی خۆی لەوێ دامەزراند و ئەو جار بە بەهانەی ئەوە کە حەیوانەکان بەرەکەتیان لێ بڕاوە، تەویلە و کاودانی بۆ ئەوێ گواستەوە. سەرەنجام بەوبیانووە کە ماڵی گراوییەکەی فێنکترە دەفتەری کاریشی بردە ئەوێ، کاتێک فێرناندا تێگەیشت کە بە بێ ئەوەی مێردەکەی مردبێ بۆتە بێوەژن، ئیدی درەنگ ببوو بۆ ئەوەی وەزعەکەی بگێڕێتەوە سەر دۆخی هەوەڵێ. ئاۆرلیانۆی دووهەم زۆر بە کەمی لە ماڵەوە نانی دەخوارد، هاتنی بۆ ماڵەوەش تەنیا بۆ نووستنی لەگەڵ ژنەکەی، کەسی فریو نەدەدا.

شەوێکیان هەتا رۆژ لە باوەشی پێترا کۆتیسدا مایەوە و بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی، فێرناندا لە بەر ئەو بێ موبالاتییە نە سەرکۆنەی کرد و نە تۆرانێکی لە خۆی نیشان دا. تەنیا هەر ئەو رۆژە، دوو سندووق شتومەکی ئەوی نارده ماڵی گراوییەکەی. سندووقەکانی بەرۆژی رووناک ناردن و، دەستووری دا بە نێوەڕاستی شەقاماندا بیانبەن، هەتا هەموو کەس بیانبینێ، دڵنیا بوو کە مێردی لارێی توانای ئەو ریسواییەی نابێ و سەرشۆڕانە دەگەڕێتەوە ئاغەڵێ. بەڵام ئەو کردەوە قارەمانانەیە، جارێکی دیکە سەلماندی کە فێرناندا نەتەنیا شارەزای ئەخلاقی مێردەکەی نەبووە، بەڵکو شارەزای رووحیەتی خەڵکێکیش، کە بچووکترین وێچوونیان وەک خەڵکی

ئەو ناچێ، نییە، چونکە هەر کەسێک بردنی سندووقەکانی دەدی دەیوت: "ئەوە ئەوپەڕی داستانێکە کە ورد و درشتی لە بەر چاوی کەس شاراوە نەبوو، ئۆرلیانۆی دووهەم ئەو ئازادییەی بە میوانداریەکی سێ ڕۆژە جێژن گرت. لەو حاڵەدا کە فێرناندا لە جلوبەرگی درێژ و ڕەنگ ماتیدا و بە گەردنبەندە کۆنەکان و غرووری بێ جێی، لە لاویەتی دوور دەکەوتەوە، وا دەهاتە بەرچاو کە ماشووقەکەی بە لاوییەتییەکی تازەدا دەپشکوێ. کراسی ئاوریشمی سروشتیی ڕەنگاوڕەنگی دەبەرد دەکردن و چاوەکانی بە ئاوری تۆڵە وەک چاوی بەور دەدرەوشان. ئۆرلیانۆی دووهەم وەک ساڵەکانی هەوەڵی لاوی بۆوە بە هی ئەو_تەواو وەک پێشوو، زەمانێک کە پیترا کۆتیس ئاشقی ئەو نەبوو. بەڵام، چونکە لەگەڵ هەردووکیان دەنووست، ئەوی لەگەڵ برا دووانەکەی لێ تێکچووبوو، و شوکری خوای دەکرد کە خوا پیاوێکی داوەتێ دەتوانێ بە قەد دوو پیاوان ئەوینداری بکا. ئەو هەوەسە تێرکراوە ئەوەندە زۆر بوو، کە زۆر جاران کاتێک لە سەر مێزی نان خواردن بوون، چاویان لە چاوی یەکتر دەبڕی و بە بێ ئەوەی وشەیەکیان لە زاری بێتەدەر، سەری دەورییەکانیان دادەپۆشی و دەچوونە ژووری نووستن. هەتا لەوێ لە برسان و لە ئەوینداری بمرن. ئۆرلیانۆی دووهەم، لەو شتانەی کە چەند جار لە چاوپێکەوتنی بە دزیی خۆیدا لە ژووری ژنە فەرانسییەکان بینیبووی، ئیلهامی وەرگرت، تەختی نووستنێکی بۆ پیترا کۆتیس کڕی، کە دەوران دەوری وەک تەختی کەشیشان پەردەی هەبوو، پەردەی مەخمەری لە پەنجەرەکان دا و تاقی ژوورەکە و سەرانسەری دیوارەکانی بە ئاوێنەی گەورەی کریستاڵ داپۆشین. لە هەمیشە دەست بڵاوتر بوو و، حەزیشی بە میوانداری لە زیادی دابوو، بەو قەتارەی کە هەموو ڕۆژێ سەعاتی یازدە دەهات، سندووق سندووق کۆنیاک و شامپانی بۆ دەهات و، هەروا کە لە ئێزگەی قەتار بەرەو ماڵ دەبۆوە، هەر کەسی لە سەر ڕێگاوە دیبا، لە خۆیی و بێگانە و ئاشنا و کەسانێک کە دوایە لەگەڵیان دەبوو بە ئاشنا، هەموویانی بە بێ لەبەر چاوگرتنی هیچ جیاوازییەکی چینایەتی بۆ بەشداری لە میوانداریەکی چاوەڕواننەکراو بەدووی خۆیدا دەهێناوە. تەنانەت ئاغای براونیش، کە تەنیا

بە یەک زمانی بێگانە قسەی دەکرد، فریوی ئۆرلیانۆی دووهەمی خوارد و، چەندین جار لە ماڵی پێترا کۆتیس مەستیی کرد و سەگە درندە ئالمانییەکانی کە بۆ هەر شوێنێک دەڕۆیشت لەگەڵ خۆی دەیبردن، بە ئاهەنگی تێکساسی، کە لەگەڵ ئۆکۆردیۆن دەیگوت، لەگەڵ خۆی وەسەمای هێنابوون.

ئۆرلیانۆی دووهەم لە جەنگەی میوانداریدا هاواری دەکرد: "گاجووتەکان، لێک جویێ بنەوە، ژیان کورتە."

لە هەمیشە زۆرتر هەستی بە خۆشبەختی دەکرد، خۆشەویستی لە هەموو کاتێک پتر ببوو و، گاوگۆڵەکەی لە هەموو کاتێک زۆرتر زاوزوویان دەکرد. بۆ میوانداریيە بێ ئەژمارەکانی ئەوەندە گا و بەراز و مریشکیان سەربڕی، حەوشە بە خوێن قوڕاوی بوو و ڕەش هەڵگەڕا. ئەوەندەیان ئێسک و ورگ و ریخۆڵە فڕێ دا، حەوشە بوو بە قووڵکەی زبڵدان و، بەدایمە دینامیتیان تێدا دەتەقاند بۆ ئەوەی خەرتەلان چاوی میوانان نەکوڵن. ئۆرلیانۆی دووهەم بوو بە پیاوێکی قەڵەو و دەموچاو سوور و کیسەڵێکی بەهەیبەت، کە ئیشتیای تەنیا لەگەڵ ئیشتیای خۆزێ ئارکادۆ بەراورد دەکرا. ئەو کاتەی کە لە دەڤەری دەوری دونیا گەڕابۆوە، ناوبانگی نەوسنیی بێسنوور و ئەبلەخەرجییە گەورەکان و میوانداریيە بێ وێنەکانی، سنووری زەلێی تێپەڕاند و سەرنجی زگپەرستەکانی هەموو کەناری بۆ لای خۆی ڕاکێشا. زۆرخۆرە بەناوبانگەکانی هەموو لایەک ڕژانە ئەوێ، هەتا لە مل بەملەی توانایی و خۆڕاگری لە زۆر خۆریدا، کە لە ماڵی پێترا کۆتیس دەرازایەوە، بەشداری بکەن. ئۆرلیانۆی دووهەم پلەی زۆرخۆریی لە شکاننەهاتووی، هەتا شەممەی بێفەڕ، کە کامیلا ساگاستومە[1] گەیشتە ئەوێ، پاراستبوو. کامیلا ژنێکی قەڵەو بوو کە لە سەرانسەری وڵاتدا بە "فیلی مێ" بەناوبانگ بوو. ململانەی ئەوان هەتا بەرەبەیانی ڕۆژی سێ شەممە درێژەی کێشا. لە بیست و چوار سەعاتی هەوەڵدا، ئۆرلیانۆی دووهەم بە خواردنی گوێلکێک لەگەڵ پەتاتە و مۆزی سوورەوەکراو و خواردنەوەی سندووق و نیوێک شامپانی، باوەڕی تەواوی بە سەرکەوتنی خۆی هەبوو، خۆی بە دڵ

---

[1] - CamilaSagastame

زینــدووتر و بەشــەوقتر لە حەریــفەکەی دەزانــی، حەریفێــک کە هــیچ نیگەرانییەکـی نەبـوو و، بەڕواڵەت تەنیـا کـاری بەس ئەو کـارە بـوو و وا دەهـاتە بەرچـاو زۆر بەو خەڵـکە دڵخۆشـنییە، کە هێرشـیان بـۆ ئەو مـاڵە هێناوە. هەروا کە ئۆرلیـانۆی دووهەم نیگەرانـی سـەرکەوتن بوو و پارووی گەورەی دەخــوارد، "فیلــی مــێ" گۆشــتی بە هونەرمەنــدی و لەبــاری نەشـتەرگەرێک دەبـڕی و، بە بـێ هـیچ پەلەیەک و بەجـوانی لە زاری دەنـا. هەر چەند ژنێکی زل کەتە بوو، بەڵام جوانیی ژنـانە بە سـەر ئەو پەیکەرە گەورەیـدا زاڵ بـوو. دەموچـاوێکی لەبـار و دەسـت و پەنجەیەکـی جـوان و زەریفـی هەبـوو، ئەوەنـدە دڵـڕفین بـوو کە ئۆرلیـانۆی دووهەم کاتێـک ژنە هاتەژووریَ لە بن لێوانەوە وتی، خۆزگە لە جیاتی سەرمێز، لە سـەر تەختی خەوتـن ململانێ کرابـا، کاتێک حەریفەکە نیوگوێلکێکی بە لەبەرچـاو گرتنی باشـترین دابـی نـان خـواردن خـوارد، ئەو بە دڵەوە وتـی کە ئەو فـیلە مێیە زەریـف و دڵـڕفێن و تێرنەخـۆرە ژنێکـی لەبەر دڵانە. بە هەڵەدا نەچووبـوو، ئەوە راسـت نەبـوو کە "فیلـی مـێ" ئێسـک شـکێنە، ئەو گـاخۆر، یـان ژنە ریشدارێکی سیرکی یۆنانییەکان نەبوو، بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی گۆرانی بـوو. کاتێـک ببـوو بە دایکێکـی بەڕێـزی بنەمـاڵە، لەو رێگـایەوە کە باشـترین شـێوەی نـان خـواردن فێـری منداڵەکـانی بکـا، فێـری ئەو هـونەرە ببـوو. نـانخواردن نەک بە خــاتری هانــدانی نائاســـایی ئیشــتیا، بەڵکــو لە بەر ئاســـوودەیی تەواوی رووحـــی، تیـــۆری ئەو بـــوو کە بەکـــردەوەش ســەلماندبووی. لە بەر ئەو بنەمــایە بـوو کە کەسـێک ویژدانــی لە هەمــوو بـارێکەوە راحەت بـێ، دەتـوانێ بێراوەسـتان هەتـا مانـدوو دەبـێ، خـواردن بخا. ئەگەر هونەرستانی مۆسیقا و ماڵی خۆی بەجێ هێشـتبوو هەتـا لەگەڵ کەسێک کێبەرکێ بکا، کە نێوبانگی زۆرخۆریی لە سەرانسەری وڵاتدا دەنگی دابۆوە، تەنیـا لە بەر هۆیەکـانی ئەخلاقـی بـوو، نەک لە بەر هەوا و هەوەس. لە دەقـیقەی هەوەڵەوە، کە چـاوی بە ئۆرلیـانۆی دووهەم کەوت، زانیـی ئەو تێدەشــکێ، نەک لە بەر ورگ، بەڵکــو لەبەر ئەخــلاق. لە کۆتــایی شــەوی هەوەڵدا، هەر بەو جۆرە کە "فیلـی مـێ" بەورەوە درێژەی بە خـواردن دەدا، ئۆرلیـانۆی دووهەم خـۆی بە قسـە و پێکەنینـی لەڕادەبەدەر مانـدوو دەکـرد.

چوار سەعات نووستن، کاتێک لە خەو هەستان هەرکامەیان ئاوی چل دانە پرتەقاڵ و هەشت لیتر قاوە و سی دانە هێلکەیان بە کاڵی خوارد. لە سەرەتای رۆژی دووهەم، دوای ئەوەی چەندین سەعات بێ خەوییان چێشت و دوای ئەوەی دوو بەر بەراز و دەستەمۆزێک و چوار سندووق شامپانیایان هەڵلووشی، "فیلی مێ" کەوتە ئەو بیرە کە رەنگە ئۆرلیانۆی دووهەم بە بێ ئەوەی خۆی بزانێ، رێگایەکی کە ئەو دایهێنابوو دۆزیوەیەتییەوە، کەوابوو حەریفەکەی لەوەی ئەو بیری لێدەکردەوە زۆر سامناکتر بوو. بەوحاڵەشەوە کاتێک پیترا کۆتیس دوو قەلەموونی سوورەوەکراوی هێنا سەر مێزەکە، ئۆرلیانۆی دووهەم هەستی بە تێری دەکرد. "فیلی مێ" وتی: "ئەگەر ناتوانی چیدی مەخۆ، بە یەکەوە بەرامبەر دەبین."

ئەوەی لە ناخی دڵەوە دەوت، چونکە دەیزانی ئەگەر حەریفی بە کوشتن بدا، ئەو کات ویژدانی قەت رێگەی نەدەدا پارووییەکی بەخۆشی لە زاری بنێ، بەڵام ئۆرلیانۆی دووهەم ئەو داوایەی بە ململانەیەکی دیکە دانا و زگی خۆی زۆر لەوە زۆرتر کە هەڵدەگرێ بە گۆشتی قەلەموون ئاخنی. لە هۆش چوو، زاری وەک زاری سەگی کەفی هەڵدەدا، سەری بە سەر دەوری پڕ لە ئێسقاندا کەوت و بە ئازارەوە ناڵاندی.لە تاریکایی بێهۆشیدا هەستی کرد لە بڵیندایی بورجێکەوە کەوتۆتە خوارێ و لە بەتاڵاییەکی بێ کۆتاییدا رۆدەچێ. لە ئاخرین دەقیقەدا پێش ئەوە لە هۆش بچی، زانی لە کۆتایی ئەو هەڵدێرە بێ بنە مردن چاوەڕوانییەتی.

تەنیا توانی بڵێ: "بمبەنە لای فێرناندا."

ئەو هاورێیانەی کە ئەویان بردە لای فێرناندا بۆ ماڵەوە، وایانزانی دەیەوێ بەو قەولەی کە بە ژنەکەی داوە بەوەفا بێ و لە نوێنی گراوییەکەیدا نەمرێ. پیترا کۆتیس ئەو چەکمە بریقەدارانەی، کە دەیویست لە تابووتدا دەپێیان بکا، رەش کردبۆوە و بە دوای کەسێکدا دەگەڕا بۆی بەرن، کە کەسێک هات و هەواڵی هێنا کە ئۆرلیانۆی دووهەم لە مەترسی رزگاری بووە. لە راستیدا هێشتا هەفتەیەکی پێنەچووبوو، هاتەوە سەر حاڵ و، دوو حەوتوو دواتر زیندوومانەوەی خۆی بە میوانداریی زۆر کردە جێژن، هەروا درێژەی

بە ژیان لە ماڵی پێترا کۆتیس دا بەڵام هەموو رۆژێ سەری ماڵی فێرناندای دەدا و جاری واش هەبوو لەوێ دەمایەوە هەتا لەگەڵ ماڵەوەیان نان بخوا. دروست وەک ئەوە وابوو چارەنووس رەوتەکەی گۆڕیبێ: ئەو ببووە مێردی گراوییەکەی و دووڕووی ژنەکەی.
فێرناندا بەرەبەرە هەناسەیەکی راحەتی هەڵدەکێشا. لە هەڵلای ئەو لێک جیابوونەوەدا، تەنیا شتێک کە هۆشی پێیەوە بوو، مەشقکردن بە کلاوسێن لە سەعاتی خەوی دوای نیوەڕۆیان و نامەی منداڵەکانی بوو. لەو نامانەدا کە هەر بە پازدە رۆژان جارێک بۆی دەناردن، وشەیەکی راستیان تێدا نەبوو. بەدبەختیی خۆی لەوان دەشاردەوە، ئەو خەمانەی کە لەگەڵ ئەوەشدا تیشکی بە سەر گوڵە بگۆنیاکاندا دەپرژاند و لەگەڵ هەوای لیچقی سەعاتی دووی پاشنیوەڕۆیان و لەگەڵ شەپۆلی جێژنەکانی کە لە شەقامەوە دەهاتن. رۆژبەڕۆژ وەک کۆشکی ئاغایەتی دایک و باوکی دەچوو و لەوانی دەشاردەوە. فێرناندا لە نێوان سێ تارمایی زیندوو و تارماییەکی مردووی خۆزێ ئارکادۆ بویندیا، کە کاتێک کلاوسێنی لێ دەدا جارجار دەهات و لە سێبەری روونـاکی ساڵۆندا دادەنیشت و بەوردی گوێی لە مۆسیقای ئەو دەگرت، تەنیا و سەرگەردان مابووەوە. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا تەنیا سێبەرێک بوو. لە ئاخرین جار کە لە ماڵەوە دەرچووبوو هەتا پێشنیاری شەڕێکی بێ دواڕۆژ بە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بدا. تەنیا کاتێک لە کارگاکەی خۆی دەهاتە دەرێ تا بچێ لە بن داربەڕووەکە مێزی بکا. بێجگە لە سەرتاش رێگای کەسی دیکەی بۆ لای خۆی نەدەدا، ئەویش هەر بە سێ حەوتووان جارێک. ئەوەی رۆژێ جارێک ئۆرسۆلا بۆی دەهێنا دەیخوارد و هەرچەند بە شەوق و گەرمیی جاران ماسییە چکۆڵە زێڕەکانی دروست دەکرد، بەڵام کاتێک زانی خەڵک وەک یادگارێکی مێژوویی دەیکڕن نەوەک جەواهێر، دەستی لە فرۆشتنیان هەڵگرت. بووکەڵەکانی رێمیدیۆس، کە لە زەمانی زەماوەندیانەوە رازێنەرەوەی ژووی خەویان بوو، لە حەوشە ئاگر تێبەردا. ئۆرسۆلای گوێ بەزەنگ زانیی کوڕەکەی چ دەکا، بەڵام نەیتوانی پێشی بگرێ.
پێیگوت: "دڵڕەقی."

ئه گوتی: "مەسەلەی دڵ لە گۆڕێدانییە، ژوورەکە مۆرکەی هەڵێناوە."
ئامارانتا هەروا خەریکی دروونی کفنەکەی خۆی بوو. فێرناندا نەیدەزانی بۆچی جارجار ئەو بۆ مەمە نامە دەنووسێ، تەنانەت دیاریشی بۆ دەنێرێ، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئامادەنییە تەنانەت ناوی خۆزێ ئارکادیۆش ببیسێ. کاتێک هۆیەکەیان لە ڕێگەی ئۆرسوڵاوە لەو پرسی، ئامارانتا وەڵامی دایەوە : "دەمرن و هۆیەکەشی نازانن." ئەو وەڵامە مەتەڵێکی لە دڵی ئەودا خولقاند، کە هەرگیز نەیتوانی هەڵی بدا. ئامارانتای لە خۆبایی و قەدبڵێند، کە هەمیشە چەند ژێرکراسی تۆڕی دەبەر دەکرد و، حاڵەتی بەویقاری لە بەرامبەر ڕەوتی ساڵان و بیرەوەرییە تاڵەکاندا خۆی ڕاگرتبوو، دەتگوت خاچی خۆڵەمێشی کچێنیی لە نێوچاوانی نووسراوە. بەڵام لەڕاستیدا ئەو خاچەکەی لە پەڕۆیەکی ڕەشدا لە دەستی بەستبوو، پەڕۆیەکی ڕەش، کە تەنانەت لە کاتی خەوتنیشدا لە دەستی نەدەکردەوە و بۆخۆی دەیشۆرد و ئوتووی دەکرد. ژیانی لە چنینی کفنەکەیدا لە کورتی دەدا. وا دەهاتە بەرچاو کە ڕۆژانە دەیچنێ و شەوانە هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام ئەوە بە خاتری هیوا بە سەرکەوتن بە سەر تەنیاییدا نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانە، بە هۆی دەرێژەدانی تەنیایی بوو.
نیگەرانیی هەرە زۆری فێرناندا لە ماوەی ساڵەکانی لێکجیابوونەوەدا ئەوە بوو، کە مەمە بۆ هەوەڵین پشوودان بگەڕێتەوە ماڵەوە و ئۆرلیانۆی دووهەم لەوێ نەبێ. بەڵام ڕێککەوتنێک کۆتایی بەونیگەرانییە هێنا، کاتێک مەمە گەڕایەوە ماڵەوە، باوک و دایک بەجۆرێک بەیەکەوە سازابوون، نە تەنیا کچە وابزانێ ئۆرلیانۆی دووهەم هێشتا مێردێکی وەفادار و ئەهلی ماڵ و ژیانە، بەڵکو تەنانەت نەهێڵن لە وەزعی خەمناکی ماڵەوەش تێبگا. هەموو ساڵێ بۆ ماوەی دوو مانگان ئۆرلیانۆی دووهەم ڕۆڵی مێردێکی نموونەیی بەڕێوە دەبرد و میوانداریی بەستەنی و شیرینیی پێکدەهێنا، کە کچۆڵە قوتابییەکە بە شادی و خۆشی لەگەڵ لێدانی کلاوسێن دەورووبەرێکی شادیهێنەری دەڕەخساند. لەو کاتەوە ئاشکرا بوو، زۆر کەمی لە ئەخلاقی دایکی بە میرات بردووە. زۆرتر بە ئامارانتا دەچوو، بە زەمانێک کە ئامارانتا هێشتا تامی بەدبەختیی نەچێشتبوو، لە تەمەنی چاردە ساڵیدا، پێش

ئەوەی ئەوینی نهێنیی ئەو سەبارەت بە پیترۆکرێسپی خەتی چارەنووسی دڵی بابدا، بە هەڵپەڕین و هەڵبەزین ماڵی بە سەر سەری خۆیدا دەهێناخوارێ. بەڵام مەمە بەپێچەوانەی ئامارانتا و جیا لە هەموو ئەندامانی بنەماڵە، حاڵەتی تەنیایی بنەماڵەیی نەبوو. وا دەهاتە بەرچاو کە لەگەڵ زەمانە یەکیەتیی تەواویان هەیە، تەنانەت سەعاتی دووی پاش نیوەڕۆ، کە دەرگای سالۆنی لە سەرخۆی دادەخست، هەتا بە نەزمێکی بێخەوش مەشقی کلاوسێن بکا، دیار بوو کە ماڵەوەی پێ خۆشە و تەواوی ساڵێ بە هیوای ئەو شەوق و زەوقە تێدەپەڕاند، کە بە هاتنەوەی لە لاوانیدا پێکدەهێنا و، ئەو هەستە لە میوانگری و مەیلی یەکجار زۆری باوکی بۆ میوانداری دوور نەبوو. هەوەڵین نیشانەی ئەو میراتە مالوێرانکەرەی لە سێهەمین جاردا، کە بۆ پشوودان دەهاتەوە ئەوێ، ئاشکرا بوو. مەمە بە بێ ئاگاداریی پێشوو لەگەڵ چوار "تەرکەدنیا" و شیست و هەشت هاوقوتابی، کە بۆخۆی بانگهێشتی کردبوون، هەتا حەوتوویەک لە ماڵی ئەوان رابوێرن، هاتەوە.

فێرنانـدا بە بۆڵەبۆڵ وتی: "چ بەدبەختییەکی گەورەیە! تەواو وەک بابی بوونەوەرێکی درندەیە." ناچار بوون لە هاوسێکان تەخت و جۆلانە قەرز بکەن و بەنۆرە بێنە سەر مێزی نانخواردن و بۆ حەمام کردن سەعات دیاری بکەن. چل چوارپایەیان بە قەرز هێنا هەتا کچە قوتابییەکان بە ئۆنیفۆرمی شین و چەکمەی پیاوانەیان هەموو رۆژێ لەملا و ئەولا بڵاو نەبن. بانهێشتن بوو بە بەڵا. کچانی خوێندکاری لاو بە هەراو هوریا هێشتا نانی بەیانی تەواو نەدەبوو، نۆرەیان بۆ نەهارێ دەگرتەوە و، دوایەش دەسبەجێ بۆ شام و لە ماوەی هەفتەیەکدا تەنیا جارێک توانیان بۆ گەڕان بچنە نێو شیناوەردان. هەر کە شەو دادەهات، راهیبەماندوو و مردووەکان، هەر نەیاندەتوانی لە جێگای خۆیان ببزوون و فەرمانێ بدەن و مێگەلی کچانی ماندوونەناس، هێشتا لە حەوشە سرووودی قوتابخانەیان بە بێ نۆت دەخوێندەوە. رۆژێکیان کە ئۆرسۆلا پێی دادەگرت کارێکی باش و چاک بکا و سەر رێگای بە کچەکان گرتبوو، هێندەێ نەمابوو پێشێلی بکەن. رۆژێکی دیکەش هەموو راهیبەکان زۆرزۆر ئالۆزابوون، چونکە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ

بویندیا بە بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی کچەکان لەوێن ، لە بن داربەڕوەکە مێزی کردبوو، کەمی مابوو ئامارانتا لە ترسان هەموویان بکوژێ، کاتێک دەیویست خوێ لە سووپی بکا، یەکێک لە راهیبەکان هاتە ئاشپەزخانە و تەنیا شتێک کە بە بیریدا هات بپرسێ، ئەوە بوو گوتی، ئەو تۆزە سپییە چییە.

ئامارانتا لەو وەڵامدا وتی: "ئارسنیک!"

شەوی هاتنی قوتابییەکان، پێش خەوتن، بۆ چوونە ئاودەست ئەوەندە پشێوییان دروستکرد، کە ئاخیر کەسیان سەعاتی یەکی دوای نیوەشەو چووە ئاودەستێ. ئەو جار فێرناندا حەفتاو دوو لەگەنی کڕی و تەنیا توانی گیروگرفتی شەوانە بکاتە کێشەی رۆژانە، چونکە لە بەرەبەیانییەوە کچەکان لەگەن بەدەستەوە لە دوای یەک لە پشت دەرگای ئاودەست ریز دەبوون، هەتا لەگەنی خۆیان بشۆنەوە. هێندێکیان تایان هاتێ و چەند کەسیشیان لە بەر پێوەدانی مێشوولە نەخۆش کەوتن، بەڵام لە سەریەک هەموویان لە بەرەورووبوونەوە لەگەڵ هەر گیروگرفتێکدا بەربەرەکانییەکی سەیریان لە خۆیان پێشان دەدا و، تەنانەت لە گەرمترین کاتی رۆژیشدا لە حەوشە بە دوای یەکتردا رایاندەکرد. سەرەنجام کاتێک لەوێ رۆیشتن، گوڵەکان پامالکرابوون و مۆبڵ و کەرەسەی نێو ماڵ شکا و دیوارەکان بە نووسراو و دروشم و شکڵ و وێنەی سەیر و سەرمەرە داپۆشرابوون. بەڵام فێرناندا تەواوی سەدەمە و زیانەکانی بەخشین، چونکە سەرەنجام بە رۆیشتنی ئەوانە دەیتوانی هەناسەیەکی رەحەت هەڵکێشێ. تەخت و چوارپایەکانی دانەوە جیرانەکان و حەفتا و دوو لەگەنەکانیشی لە ژووری مێلکیادێس دانان، لەوە بەدوا ئەو ژوورە قفڵ کراوە، کە لە زەمانەکانی پێشوودا ژیانی رووحانی بنەماڵە لەوێدا بەڕێوە دەچوو بە ناوی ژووری لەگەنان ناونرا. ئەو ناوە لە روانگەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیاوە شیاوترین ناو بوو بۆ ئەو ژوورە ، چونکە هەر بەو جۆرەی کە باقی ئەندامانی بنەماڵە هێشتا سەریان لەوە سوڕمابوو، کە چۆنە ژووری مێلکیادێس لە وێرانی و تۆز و خۆڵ پارێزراوە، ئەو پێی وابوو ئەو ژوورە زبڵدانە. بەڵام بۆ وی گرینگ نەبوو لەو بارەوە حەق بە کێیە، ئەگەری لە چارەنووسی ئەو ژوورەش

ئاگـادار بـوو، تەنیـا لە بەر ئەوە بـوو کە فێرنانـدا دوانیـوەڕۆیەکی تەواو نـارەحەتی کـرد هێنـدەی بە بەر دەرگـای ژوورەکەی ئەودا بێت و بچێ بـۆ بردنی لەگەنەکان.
لەو رۆژانەدا بـوو کە خـۆزێ ئارکـادیۆی دووهەم دیسـان لە مـاڵەوە پەیـدا بۆوە، بە بێ ئەوەی سـەلام لە کەس بکا بە هەیـوانێ دا رابـرد و یەکڕاسـت رۆیشـتە کارگـای سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بوینـدیا و، دەرگـاکەی داخسـت بـۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکا. ئۆرسۆلا هەر چەند نەیدەتوانی ببینێ، بەڵام دەنگی چەکمە کرێکارییەکـانی ئەوی ناسـییەوە و سـەری سـووڕما کە ئەو هەتـا چ رادەیەک لە بنەمـاڵەی خـۆی دوور کەوتـۆتەوە. دۆڵێکـی گەورە ئەوی لە هەموویـان، تەنـانەت لە بـرا دووانەکەشـی، جیـا کردبـۆوە، کە بە منـاڵی ئەو هەمووە گاڵتە سـەرگێژکەرەیان بەرامبەر خـانەوادە و دراوسـێکان بەیەکەوە کردبوو و بە گەورەییش هیچ وەک یەک نەدەچوون. بـاڵابەرز و بـاریکەڵە و لە فکرداچـوو، بە دەموچـاوی خەمنـاکی وەک عەرەبـی شـەڕەکانی سـەلیبی دەچـوو و، بـریقەی تازیەبـارانەی دەموچـاوی لە رەنگـی پـاییز، زۆرتـر لە ئەوەکەی دیکە، بە دایکـی، سـانتا سـۆفیا دێـلا پێداد دەچـوو. ئۆرسـۆلا، لەو عـادەتە کە هەر کـات باسـی بنەمـاڵە دەکـرا ئەوی لە بیـر دەچـۆوە، خـۆی سەرزەنشـت کـرد، بەڵام کاتێـک جـارێکی دیـکە هەسـتی بە بـوونی ئەو لە مـاڵەودا کرد و زانـی سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بویندیا لە سـەعاتی کـاری خۆیدا، رێـگەی داوە بچێـتە کـارگەکەی، بیـرەوەرییە کۆنەکـانی هەڵسـەنگاندنەوە و، جارێکی دیکەش بـاوەڕی هەمیشـەیی خـۆی سـەلماندەوە کە لە ئـانێکی کـاتی منداڵیدا ئەو خـۆی لەگەڵ بـرادووانەکەی گۆڕیـوەتەوە، چـونکە ئەوە ئەو بـوو دەبـوایە نـاوی ئۆرلیـانۆ بـێ نەک ئەوەی دیـکە. هـیچ کەس لە وردەکـاریی ژیانی ئەو ئاگادار نەبوو، جارێکی زانیـان کە شـوێنێکی دیـاریکراوری نییە و لە ماڵی پیلار تێرنێرا کەڵەشێری شـەڕکەر پەروەردە دەکا و، جـاری واشـە هەر لەوێ دەنـــوێ. بەڵام بە نزیکـــی هەمـــوو شـــەوان لە باوەشـــی ژنە فەرانسەییەکاندا دەگاتە رۆژ. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم، بە بێ هـیچ جـۆرە پیوەنـدییەکی ئەویـنداری و بـێ ئـارەزووی پـلە و پـایە، وەک ئەسـتێرەیەکی وێڵی گەلەئەستێرەی ئۆرسۆلا بەملاو و ئەولادا دەخولایەوە.

لە راستیدا لەو بەرەبەیانییە دوورە دەستەوە، کە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بردبوویە سەربازخانە، نەک بۆ ئەوەی رێورەسمی بەرێوەبردنی ئیعدام ببینێ. بەڵکو بۆ ئەوەی هەتا کۆتایی تەمەنی زەردەخەنەی خەم و گاڵتاویی ئەو پیاوەی تیرەباران دەکرا لە بیر نەباتەوە. ئەو ئیدی نە هی بنەماڵەی خۆی بوو و نە هیچ بنەماڵەیەکی دیکە. ئەوە کۆنترین بیرەوەری نەبوو، بەڵکو تەنیا بیرەوەرییەک بوو کە لە منالییەوە هێشتا لە یادی مابوو. ئەو بیرەوەرییەی دیکەی نەیدەزانی لە کام قۆناخی ژیاندا جێ بکاتەوە: بیرەوەریی پیرەپیاوێک لە جلی کۆنینەدا، بە کڵاوێک کە وەک قاژوو رەش بوو و دوو باڵی هەبوو، لە نێوان شووشەی رووناکی پەنجەرەوە داستانی یەکجار زۆر خۆشی بۆ دەگێرایەوە. بیرەوەرییەکی لێڵ بە بێ هیچ حەسرەتێک و پڕعیبرەت و دروست بە پێچەوانەی بیرەوەریی کابرای تیربارانکراو، کە رەوتی ژیانی ئەوی دیاری کردبوو و هەتا تەمەنی دەچووە سەرێ بۆی روونتر دەبۆوە، دروست وەکو ئەو، رەوتی زەمان ئەوی لەو بیرەوەرییە دوورەدەستە نزیکتر دەکردەوە. ئۆرسوڵا تێکۆشا بە هۆی ئەوەوە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا واز لەو خۆزیندانیکرنە بە ئانقەستە بێنێ. بە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی وت: "بینێرە سینەمایە. راستە کە سینەمای پێ خۆشنییە، بەڵام لانیکەم هەوایەکی پاک دەڵدەمژێ."

زۆری پێنەچوو کە بۆی دەرکەوت خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمیش وەک سەرهەنگ گوێی لە پاڕانەوەکانی ئەونییە و هەر دووکیان، وەک لە یەک مەعدەن دروستکراون و بەزە و خۆشەویستی دزەیان بۆ ناکا. هەر چەن هیچ کەس، تەنانەت ئۆرسوڵاش، نەیزانی ئەو دووانە بەیەکەوە لە کارگا لە بارەی چییەوە قسەیان دەکرد، ئۆرسوڵا زانی کە ئەو دووانە تەنیا ئەندامی بنەماڵەن کە بە شێوەیەک پێوەندییان بە یەکەوە هەیە.

راستی ئەوە بوو کە تەنانەت خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمیش نەیدەتوانی سەرهەنگ لەو زیندانە دەرکێشێ. هێرشی کچە خوێندکارەکان سەبر و تاقەتی ئەویان بەتەواوی تێکدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە بووکەڵەکانی رێمیدیۆسی لە نێو بردبوو. بەڵام بە بیانووی ئەوە کە ژووری خەوەکەی مۆرکەی هەڵیناوە، جۆلانەیەکی لە کارگەکەی خۆی هەڵاوەسی و لەوەبەدواوە، کاتێک

بۆ ئاوبەدەست گەیاندن دەچووە حەوشە، ئۆرسوڵا نەیدەتوانی تەنانەت قسەی ئاساییشی لەگەڵ بکا، دەیزانی کە ئەو دەستیش لەو قاب و دەورییە خواردنانە نادا کە ئەو بۆی دەبردن. ئەوانی لەوبەری مێزی کارەکەی دادەنان هەتا دروستکردنی ماسییەکی چکۆڵەی زێڕ تەواو بکا و گوێی نەدەدایە ئەوە کە رۆنی سەرسوپەکە بمەیێ و گۆشتەکە سارد بێتەوە. لەو کاتەوە سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز پێشنیارەکەی بۆ شەڕێکی پیرانە رەت کردبۆوە، بێ خولقتر ببوو، وەک لە خواترسان چووبۆوە پاڵ خۆی و بنەماڵەکە بەجۆرێکیان چاو لێدەکرد هەر وەک مردبێ. هیچ جۆرە دژکردەوەیەکی ئینسانیی لێ نەدەبینرا، هەتا ئەوەی رۆژێ، رۆژی یازدەهەمی مانگی ئوکتۆبر لە ماڵەوە چووە دەرێ، هەتا تەماشای رابردنی سیرکێک بکا. ئەو رۆژەش بۆ سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وەک رۆژانێک بوو کە لەو ساڵانەی دواییدا رایبواردبوو. سەعاتی پێنجی بەیانی بە دەنگی واقەواقی بۆقان و جیرەجیری سریلان لەودیوی دیوارەوە لە خەو هەستابوو. لە رۆژی شەممەوە بارانێکی ورد بە بێ پسانەوە دەباری و پێویست نەبوو ئەو دەنگی ئارامی بارانێ لە سەر گەڵای حەوشە ببیسێ هەتا هەست بە سەرما بکا. بەهەر حاڵ لە نێو ئێسقانەکانی دا هەستی بە سەرما دەکرد. وەک هەمیشە خۆی لە پەتوویەکی خوری پێچابوو و ژێرشەڵوارییەکی درێژی کەتانی ئەستووری دەپێدا بوو، کە لە بەر ئەوە رەحەت بوو،لە بەری دەکرد و لە بەر شکڵی کۆنی ناوی نابوو "تنوکەی پارێزگاران". شەڵوارێکی تەنگی دەبەر کرد، بەڵام دوگمەکانی دانەخست، دوگمە زێڕە هەمیشەییەکەی لە یەخەی کراسی نەدا. بڕیاری دابوو حەمامێ بکا، پەتووی بە سەر سەری خۆیدا دا. سمێڵە داچۆڕاوەکانی بە ئەنگوستان شانە کرد و بۆ میزکردنی رۆیشتە حەوشە. هێشتا ئەوەندە بۆ تاوکەوتن مابوو، کە خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا لە ژێر چەتری گەڵا خورماکانی باران رزاندبوویەوە وەنەوزان لێ بدا. سەرهەنگ ئەوی نەدی، هەر بەو جۆرەی کە هیچ کات نەیدەدی.

کاتێک میزی بە کەوشەکانی باوکی داکرد، تارمایی باوکی لە خەو راپەڕی و، رستەیەکی ناڕوونی پێیگوت ، بەڵام ئەو نەیبیست و، خۆشوشتنەکەی

بۆ دوایە دانا، نەک لە بەر باران و سەرما، بەڵکو لە بەر مژی خەمهێنەری مانگی ئوکتۆبەر، لە گەڕانەوە بۆ کارگادا، بۆنی فتیلەیەک، کە سانتا سۆفیا دیلا پێداد ئاورگی پێ دەداگیرساند بە بەر لووتی هەڵاهات. لە ئاشپەزخانە چاوەڕوانی کرد، هەتا قاوەکە بکوڵێ و ئەو بتوانێ کووپە قاوە تاڵە بێ شەکرەکەی خۆی هەڵگرێ و بیباتەوە کارگایە. سانتا سۆفیا دیلا پێداد، وەک هەموو رۆژانی بەیانی لێێ پرسی چ رۆژێکی حەفتەیە و ئەو وەڵامی دایەوە سێ شەممە یازدەهەمی ئۆکتۆبەرە. هەروەوا کە رووناکیی ئاگر ئەو ژنەی، کە دەتگوت نە ئێستا و نە هیچ کاتێکی دیکە نەبووە، بە بریسکەی زێرینی هەڵگیرساند، سەرهەنگ لەپڕ بیری کەوتەوە کە رۆژێکیان یازدەهەمی ئوکتۆبەر لە گەرماوگەرمی شەڕیدا، بەوخەیاڵە کە ئەو ژنەی لەگەڵ نووستووە، مردووە، لە ترسان لە خەودا راپەڕیبوو، ژنە بەڕاستی مردبوو. ئەو نەیدەتوانی ئەو رێکەوتە فەرامۆش بکا. چونکە ژنە سەعاتێک پێش مردنی، رێکەوتی لێ پرسیبوو. هەروا کە قاوەکە دەکوڵی، ئەو بە بێ دڵتەنگی و تەنیا لە رووی وردبینی درێژەی بە بیرەوەریی ئەو ژنەدا ، کە بەتاریکی خزابووە نێو جۆلانەکەی، هەرگیز نە ناوی بیستبوو و نە دەموچاوی بینیبوو. لە نێو تەواوی ئەو ژنانەدا کە بەو شێوەیە بە ژیانیدا تێپەڕ ببوون، بیری نەکەوتەوە کە ئەو ژنە لە هەوەڵین چاوپێکەوتنیدا کەمی مابوو لەو فرمێسکانەدا بخنکێ و سەعاتێک پێش مردن سوێندی دابوو هەتا کۆتایی تەمەن خۆشی بوێ.

کاتێک بە پیاڵە قاوەوە، کە هەڵمی لە سەر هەڵدەستا، دەگەڕایەوە بۆ کارگا. ئیدی نە بیری لەو کردەوە و نە لە ژنانی زۆری دیکە. چرای هەڵکرد هەتا ماسییە چکۆڵە زێڕەکان، کە لە قوتوویەکی حەلەبی هاویشتبوون، بژمێرێ. هەقدە دانە ماسیی زێڕ بوون.لەو کاتەوە بڕیاری دابوو نەیانفرۆشێ رۆژی دوو ماسیی دروست دەکرد. کاتێک دەبوونە بیست و پێنج دانە ماسی، لە کوورەیدا دەیتواندنەوە هەتا جارێکی دیکە لە سەررڕا دروستیان کاتەوە. هەموو بەیانییەکە کاری کرد. بیری لە هیچ نەکردەوە. نەیزانی کە سەعات دەی بەیانی باران ئەوەندە توند بووە کە کەسێک بە پێش کارگایدا رابردووە و هاواری کردبوو دەرگایان داخەن، دەنا لافاو ماڵەکەیان دەبا.

تەنانەت بیری لە خۆشی نەکردبۆوە، هەتا ئەو کاتە ئۆرسوٚلا نانی نیوەڕۆی بۆ هێنا و چراکەی کوژاندەوە.
ئۆرسۆلا وتی: "چ بارانێک!"
ئەو وتی: "ئوکتۆبەر."
کاتێک ئەوەی وت سەری خۆی لە سەر هەوەڵین ماسی رۆژ کە دروستی دەکرد هەڵنەهێنا، چونکە خەریک بوو یاقووتی لە چاوان دەخست. کاتێک دروستکردنی ماسییەکە تەواو بوو و ئەوی دەخستە نێو ماسییەکانی دیکە. لە نێو قوتووە حەڵەبییەکەدا، ئەو کات خەریکی سووپ خواردن و بە دوایدا زۆر بە لەسەرەخۆیی گۆشتی سوورەوەکراو لەگەڵ پیواز و برینجی سپی و لەتە مۆزی سوورکراوەی بەیەکەوە لە دەورییەکدا لێکدان و خواردی. ئیشتیای لە باشترین و خراپترین وەزعدا نەدەگۆڕا. دوای نانی نیوەڕۆ پشوویدا. لە سەر بنەمای شێوەیەک خورافاتی زانیاری، ئەو هیچ کاتێک هەتا دوو سەعات لە هەزمی خواردن تێپەڕ نەبا، نە کاری دەکرد و نە شتێکی دەخوێندەوە و نە حەمامی دەکرد و نە ئەویندارى و، ئەو باوەڕە وەها ریشەی تێدا داکوتابوو کە چەندین جار کردەوەکانی شەڕی راگرتن هەتا دەستەی شەڕکەر تووشی نەخۆشیی هەزمی خواردن نەبن، لە جۆلانەیدا راکشا و بە قەڵەمتراشێک پارچە مێوێکی کە دەگوێی نابوو هێنایەدەرێ و لە ماوەی چەند دەقیقاندا خەوی لێکەوت. خەونی بە خانوویەکی چۆڵەوە بینی کە دیوارەکانی سپی بوون. چۆتە ژوورێ و لە بەر ئەوە هەوەڵین مرۆڤە کە پێ دەنێتە ئەوێ هەستی بە نارەحەتی دەکرد. لە خەوی خۆیدا بیری کەوتەوە کە هەر ئەو خەونەی شەوی پێشوو و زۆرتری شەوەکانی ساڵەکانی ئەو دواییانەشی بینیوە و، دەیزانی کاتێک لە خەو هەستێ وێنەی ئەو خەونەی لەیاد دەچێتەوە، چونکە ئەو خەیاڵە دووپات بووەوە تەنیا دەکرا لە خەودا بیری بکەوێتەوە. لەراستیدا دەقیقەیەک دواتر، کە سەرتاش لە دەرگای کارگایدا، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا وەها لە خەو هەستا وەک بڵێی بێ ئیرادە و تەنیا بۆ چەن ئانێک خەوی لێ کەوتبوو و، ماوەیەکی بۆ خەون بینین نەبووە.
بە سەرتاشی وت: "ئەورۆ نا، رۆژی هەینی وەرەوە."

لە ریشی سێ رۆژەیدا جێبەجێ مووی سپی بەرچاو دەکەوتن، بەڵام ئەو ریش تاشینی بە پێویست نەدەزانی و چونکە رۆژی هەینی مووەکانی سەری چاک دەکرد. دەیتوانی هەر ئەو رۆژە بە سەرتاش بڵێ ریشیشی بتاشێ. ئارەقەی لینجی خەونی چاوەڕواننەکراوی پاشنیوەڕۆیە، برینی بن هەنگڵانی بیر خستەوە، باران وێستابوو، بەڵام هێشتا رۆژ لە بن هەوران نەهاتبووە دەرێ. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا قرپێکی وەها بەدەنگی هاتەوە کە تامی ترشی سووپەکەی هاتەوە نێو زاری و بە فەرمانبەری لە دەستووری لەش، پەتووی بە سەر شانیدا دا بچێتە ئاودەستێ. زیاد لە پێویست لەوێدا مایەوە. لە سەر لیتەیەکی توندەوەبوو کە لەو قوتووە دارەدا هەڵدەچوو، هەڵترووشکابوو هەتا عادەت بیری خستەوە کە کاتی ئەوە هاتووە کارەکەی دەست پێ بکاتەوە. لەو ماوەیەدا کە لە ئاودەست بوو، دیسان هاتەوە بیری کە ئەو رۆژە سێشەممەیە و خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم، چونکە رۆژی وەرگرتنی حەقدەستە لە کێڵگەکانی شەریکەی مۆزدا، نەهاتۆتە کارگەکەی. ئەو بیرەوەرییەش وەک هەموو بیرەوەرییەکانی ساڵەکانی ئەو دواییە، بە بێ هیچ هۆیەکی تایبەتی ئەوی کێشایەوە بیرەوەرییەکانی ساڵەکانی ئەو دوایییە، بە بێ هیچ هۆیەکی تایبەتی ئەوی کێشایەوە بیرەوەرەی شەڕ! بیری کەوتەوە کە جارێکیان سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بەڵێنی ئەسپێکی نێواچاوان قەشانی پێدابوو، بەڵام دوایی باسێکی لەو بارەوە نەکردبوو. کەوتە بیرهێنانەوەی بیرەوەرییە بڵاوەکان، بەڵام ئەوانی بە شێوەیەکی تەماوی دەهاتەوە یاد. فێر ببوو چۆن بەساردی بیریان لێ بکاتەوە و رێگە نەدا بە بیرەوەرییەکانی لێرەولەوێی هەستێک لە نێو دڵیدا رابێ. کاتێک گەڕایەوە کارگە و بینی باران راوەستاوە، بیری کردەوە هەوا بۆ خۆشوشتن لەبارە، بەڵام ئامارانتا پێش ئەو رۆیشتبووە حەمام. لە بەر ئەوە دەستی بە دروستکردنی دووهەم ماسی زێڕی رۆژانە کرد. خەریک بوو قولاپێکی وەکلکی ماسییەکە دەخست، رۆژ بە بە گەرمییەوە لە بن هەوران هاتەدەر، تیشک وەکو بەلەمێکی کۆنە ناڵاندی. هەوا، کە بە بارانی سێ رۆژە شۆرابۆوە، پڕ بوو لە مێرووولەی باڵدار. ئەو کات هەستی کرد میزی دێ، بەڵام خۆی راگرت هەتا دروستکرنی ماسییە

چکۆڵە زێڕەکە تەواو دەکا. سەعاتی چوار و دە دەقیقە بۆ لای حەوشە دەڕۆیشت ،کە دەنگی کەرەسەی مۆسیقای ئاسنی، دەنگی تەپڵ و هەراو هۆریای منداڵانی هاتە بەر گوێ و بۆ هەوەڵین جار لە پاش جحێڵی خۆی. بە ئیرادەوە پێی لە نێو تەڵەی دڵتەنگی ناو و جارێکی دیکە لە نێو ئەو پاشنیوەڕۆ بە شکۆیەی کاولییەکاندا ژیا کە باوکی ئەوی بۆ دیتنی سەهۆل بردبوو. سانتا سۆفیا دێلا پێداد کاری ئاشپەزخانەی وێل کرد و رایکردە دەرگای حەوشە، هاواری کرد: "سیرک هاتووە."

سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوێندیاش لە جیاتی رۆیشتن بۆ لای داربەڕووەکە. لە دەرگای ماڵەوە چووە دەر و لەگەڵ ئەو خەڵکە تێکەڵ بوو کە بۆ تەماشای سیرک هاتبوون. ژنێکی بینی کە جلێلی زەرکەشی لە بەردایە و سواری فیلێک بووە، وشترێکی خەمگینی بینی، ورچێکی دیت کە جلی کچێکی جوانی هۆڵەندی لەبەر کردووە و وێڕای موسیقای دیکە ئەویش بە کەوچک و قابلمە لێدەدا، یاریکەرەکانی سێرکی بینی کە لە دوای کەژاوەکە تەقلە لێدەدەن. کاتێک سیرک بەوێدا رابرد و رۆیشت و بێجگە لە بەشی رووناکی شەقام و هەوای پڕ لە مێروولەی باڵدار و چەند کەس کە بە سەر بەتاڵایی گوماندا کوورِ ببوونەوە شتێکی دیکە نەمایەوە. دیسانیش دەموچاوی تەنیایی بێ نەوای خۆی بینی. ئەو کات بە بیری سێرکەوە بۆ لای داربەڕوو رۆیشت و هەروا کە میزی دەکرد هەوڵی دا بیر لە سێرک بکاتەوە، بەڵام ئیدی بیرەوەرییەکی نەهاتەوە یاد. سەری وەک جوجکە مریشک بردەوە نێو شانان و لەو حاڵەدا کە نێوچاوانی وەقەدی داربەڕووەکە دابوو، بە بێ جووڵە مایەوە. بنەماڵەکەی هەتا سەعاتی یازدەی بەیانیی رۆژی دواتر ئەویان نەدۆزییەوە و ئەویش ئەو کاتە بوو کە سانتا سۆفیا دێلا پێداد چووبوو زبڵی لە گوشەیەکی حەوشە رۆکا و چاوی بە داڵاشان کەوتبوو بەسەریدا دەسووڕانەوە.

دوایین پشوودانی مەمە کەوتە کاتی پرسە و سەرەخۆشیی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوێندیا، لەو ماڵە دەرگا و پەنجەرە داخراوەدا، جێگای میوانی

نەبوو، هەموو لە سەرەخۆ قسەیان دەکرد و نان خواردن بە بێدەنگییەکی تەواوەوە بەڕێوە دەبرا و ڕۆژی سێ جار سرووت ە دوعایان دەخوێند و تەنانەت ڕاهێنانی کلاوسێنیش لە سەعاتی گەرمای خەوی پاشنیوەڕۆیاندا دەنگدانەوەیەکی پرسەباری هەبوو. سەرەڕای دژایەتیی نهێنی لەگەڵ سەرهەنگ، فیرناندا لە بەر ئەو ڕێزەی دەوڵەت بۆ یادی دوژمنی مردووی خۆی دایینابوو، دەستووری ئەو سەرەخۆشییە ڕەسمییەی دابوو. ئۆرلیانۆی دووهەم، بە پێی قەراری هەمیشەیی، بەدرێژی پشوودانی کچەکەی، گەڕایەوە ماڵ و، فێرناندا بە بێگومان کارێکی کرد، هەتا دیسان جارێکی دیکە ئیمتیازی هاوسەری ڕەسمی بەدەست بێنێتەوە، چونکە مەمە ساڵی دوایی خوشکێکی بچکۆلانەی کە تازە هاتبووە دونیا لەوێ بینی. کە بە پێچەوانەی حەزی دایکی، ناویان نابوو ئامارانتا ئۆرسۆلا.[1]

مەمە خوێندنی خۆی تەواو کردبوو.

دیپلۆمێک کە شایەدی دەدا ئەو دەتوانێ وەک مۆسیقارێکی کلاوسێن لە کۆنسێرتاندا بەشداری بکا. بە لێزانیی ئەو لە لێدانی ئاهەنگەکانی خۆجێی سەدەی حەڤدە و لە جێژنێکدا کە بە شانازیی کۆتایی پێهاتنی خوێندنی ئەو و، کۆتایی دەورەی پرسە دەژمێردرا، دانی پێدانرا. میوانەکان، زۆرتر لە هونەرەکەی ، دووفاقیی کەسایەتیی ئەویان پەسند کرد. وا دەهاتە بەرچاو کە هەڵسوکەوتی پڕ گاڵتەوگەپی و هەتا رادەیەک منالانەی ئەو لەگەڵ هیچ جۆرە هەڵسووڕانێکی جیددی ڕێک نەیەتەوە. بەڵام کاتێک لە پشت کلاوسین دادەنیشت دەبوو بە کچێکی دیکە، زووهەڵدان و گەورەبوونی، حاڵەتی مرۆڤێکی گەورەی پێدابوو. ئەخلاقی هەمیشە هەر ئاوها بوو. لە ڕاستیدا ئارەزوویەکی دیاریکراوی نەبوو و، تەنیا لە بەر نەزمێکی ستەمکارانە، بۆ ئەوەی بیروڕای دایکی هەڵە دەرنەچێ باشترین نمرەی وەرگرتبوو. ئەو، گەر ناچاریان کردبا لە ڕشتەیەکی دیکەشدا بخوێنێ. ئەنجام هەر ئەوە دەبوو. سەختگیریی فێرناندا و عادەتی ئەو بۆ بڕیاردان لە جیاتی خەڵکی دیکە، لە منداڵییەوە ئەوی نارەحەت کردبوو و هەر لە بەر ئەوەش بوو ئامادە بوو دەست بداتە هەر جۆرە فیداکارییەکی گرانتر لە کلاوسێن، تا

---

[1]– Amarantaursula

لەگەڵ سەختگیری فێرناندا رووبەڕوو نەبێ. لە ریۆڕەسمی کۆتایی خوێندندا بە بیریدا هاتبوو کە ئەو وەرەقە کاغەزە پێستییە، بە پیتی رۆشنی قەدیمی لە شەڕی رێککەوتنێک رزگاری دەکا کە نە لەبەر بەرفەرمانی، بەڵکو لە بەر بەرژەوەنـدیی خـۆی قبـووڵی کردبـوو. دڵنیـابوو کە لەوەبەدوا تەنـانەت فێرناندای سەرەڕۆش، نیگەرانی ئەو ئامرازە موسیقایە نابێ، ئامرازێک کە تەنانەت راهیبەکانیش بە میراتێکی موزەیان دەدانا. لە ساڵەکانی هەوەڵدا وایدەزانی گریمانەکانی (فرضیات) هەڵە بوون، چونکە دوای ئەوەی نەتەنیا لە سالۆنی میواندارییی ماڵێ، بەڵکو لە تەواوی ئاهەنگە خێرخوازییەکان و جێژنەکانی خوێندن و رێوڕەسمی بیرەوەریی پێوەند بە نیشتمان، کە لە ماکۆندۆ جێژن دەگیرا نیوەی خەڵکی شاری دەخەو دەکرد. دایکی دیسان درێژەی بە بانگهێشتی هەر تازەهاتوویەک دا، کە پێی وابوو دەتوانێ بە لێوەشاوەیی کچەکەیدا هەڵبڵێ. تەنیا دوای مەرگی ئامارانتا، کاتێک بنەماڵە بۆ ماوەیەکی پرسەیان دەست پێکردەوە، مەمە توانی دەرگای کلاوسێن دابخا و کلیلەکەی لە کێشەوی گەنجەیەکدا فەرامۆش بکا، بە بێ ئەوەی فێرناندا خۆی زەحمەت بدا هەتا بزانێ چ کات و بە تاوانی چ کەسێک ئەو کلیلە گوم بووە. مەمە ئەو کۆنسێرتانەی هەر بەو فەلسەفەیە رادەپەڕاند کە کاتی خوێندن گیانی هێنابووە سەر لێوان، نرخێک بوو کە بۆ ئازادیی خۆی دەدا. فێرنانـدا وەهـا لە ئەخلاقـی خۆشەویسـتانەی ئەو رازی بـوو و، لەو پێهەڵـدانەی کە هـونەرەکەی لە خەڵکدا پێکـی دێنـی، هەسـتی بە لەخۆبـایی بـوون دەکـرد، رێـگەی پێـدا مـاڵ هەمیشـە پـڕ بـێ لە هاوڕێکـانی و. دوانیوەڕۆیان بچێتە مەزرا و لەگەڵ ئۆرلیانۆی دووهەم و خانمەکانی جێگای باوەڕ بچێتە سینەمایە. دیارە بە مەرجێک کە قەشەئەنتۆنیۆ ئیزابێل لە سەر مینبەرەوە رێگەی نواندنی فیلمەکەی دابێ. لەو کاتە ئارامانەدا، ئامادەباشیی دروستی مەمە دەردەکەوت. جێگای خۆشبەختیی ئەو دروست لە کۆتایی ئەولای نەزمەوە بوو: لە میوانییە پڕ هەراو هوریاکاندا، لە پاشملە باسکردن سەبارەت بە ئاشقان، لە چاوپێکەوتنە درێژەکان لەگەڵ دۆستە کچەکان. فێـری سیگارکێشـان ببـوون و، سـەبارەت بە پیـاوان قسـەیان دەکـرد و جارێکیش سێ بوتڵی شەرابی نەیشەکەریان دەست کەوت و مەستیان کرد

و سەرەنجام هەموویان رووت بوونەوە و هێندێک شوێنی لەشی خۆیان پێک گرت و پێوایان. مەمە هەرگیز ئەو شەوەی لە بیر نەدەچۆوە، هەروا کە نوقڵی نەعنای دەجوو هاتەوە ماڵ و بە بێ ئەوەی کەس ئاگاداری ئاشووبی دەروونیی بێ، لە سەر مێز لە شوێنێک کە فێرناندا و ئامارانتا بە بێ قسەکردن شامیان دەخوارد، دانیشت. دوای رابواردنی دوو سەعاتی سەچڵیی لە ژووری خەوی یەکێک لە دۆستە کچەکانی، دوای ئەوەی لە ترس و پێکەنینان فرمێسک لە چاوەکانی هاتبوونەخوارێ، لە کۆتایی ئەو قەیرانەدا وزەیەکی کەموێنەی بەدەست هێنابوو. هەتا بەو ڕستەیە، یان بە رستەیەکی وەک ئەو، بە دایکی بڵێ؛ باشترە کڵاوسێنەکە لە کونگی خۆت رۆکەی. لە سەر مێزەکە دانیشتبوو، سووپی مریشکی بە گەرروویدا دەڕۆیشتەخوار و دەگەیشتە گەدەی و وەک ئاوی حەیاتێ زیندووی دەکردەوە. ئەو کات فێرناندا و ئامارانتای لەتوێی بیرکردنەوەی ڕاستەقینەیاندا دەدیت. بەزەحمەت پێشی خۆی گرت، هەتا زیزبوونی منالانەیان و فیز و لەخۆبایی‌بوونی ئەو دوو ژنانە بە چاویاندا نەداتەوە. دووهەم جار کە بۆ پشوودان هاتبۆوە ماڵێ، زانیبووی کە باوکی تەنیا بۆ پاراستنی رواڵەت لە ماڵەوە دەژی و، بە ناسینی فێرناندا و دوای ناسینی پیترا کۆتیس حەقی بە لای باوکی دا. تەنانەت ئەویش پێی باشتر بوو کچی گراویی باوکی بێ، هەتا کچی دایکی خۆی. مەمە لە نەشەی ئەلکهوولدا، بە حەزێکی تەواوەوە بیری لە سووکایەتییەک دەکردەوە، کە ئەگەر لەو کاتەدا بیرەکەی بە دەنگی بەرز دەربڕیبا، دەقەوما. ڕواڵەتی بەدجینسانەی دەروونی ئەوەندە توند بوو، فێرناندا پەی بە حاڵی ئەو برد.

پرسی: "چ بووە؟"

مەمە وەڵامی دایەوە؛ "هیچ، تازە دەزانم هەردووکتانم چەندە خۆش دەوێ."

ئامارانتا لەو هەموو بێزارییە ئاشکرایەی نێو رستەکە، بەتوندی هەڵبەزییەوە، بەڵام فێرناندا ئەوەندە دڵناسک بوو کە کاتێک نیوەشەو مەمە بە سەرئێشەیەکی توندەوە لە خەوڕابوو و بە توندی رشایەوە، خەریک بوو لە ترسان شێت بێ و بوتڵێکی رۆن گەرچەک دەرخوارد دا و مشەمای بە زگییەوە نا و سەهۆڵی لە سەر سەری دانا و ناچاری کرد پێنج رۆژان لە

جێگا دەرنەکەوێ و، ئەو خواردنانەی پزیشکی فەرانسەیی تازەهاتووی بۆی داناوە بیانخوا. دکتۆر لە دوای تەماشکردنێکی دوو سەعاتە نەگەیشتە ئەنجامێکی ڕوون گوتی نەخۆشییەکەی نەخۆشییەکی ژنانەی دەگمەنە. مەمە کە توانای خۆی لە دەست دابوو، لە ناهومێدی خۆیدا بیجگە لە ملراکێشان چارەیەکی دیکەی نەبوو. ئۆرسولا کە لەو کاتەدا بەتەواوی کوێر ببوو. بەڵام هێشتا هۆش و زووتێگەیشتن و تێکۆشانی لەدەست نەدابوو، تەنیا کەسێک بوو کە هۆی بنەڕەتیی نەخۆشییەکەی هەست پێکردبوو، بیری کردەوە: "هەرچی دەیڵێن بیڵێن، بەڵام ئەو شتانە تەنیا بۆ ئارەق خواردن دێتە پێشەوە." بەڵام دەسبەجێ ئەو بیرەی لە سەر بردەدەر و تەنانەت خۆشی لە بەر ئەو بیرە گەوجانەیە سەرزەنشت کرد. ئۆرلیانۆی دووهەم کە مەمەی بەو حاڵەوە بینی ویژدانی بەتوندی نارەحەت بوو و قەولی بە خۆی دا کە لە داهاتوودا زۆرتری پێرابگا. بەوجۆرە بوو کە هاوڕێیەتییەکی خۆشەویستانە لە نێوان باوک و کچە پێک هات، کە باوکەکەی بۆ ماوەیەکی لە جودایی تاڵی بێ میوانی و کچەکەی لە چاوەدێرییەکانی فێرناندا جیا کردەوە.

دایک بە پێچەوانەی چاوەڕوانی، تووشی قەیرانێکی پێشبینییان نەبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم تەواوی کارەکانی خۆی دوادەخستن هەتا کاتی خۆی لەگەڵ مەمە بەرێتەسەر و، بەشی زۆری کاتەکانی لەگەڵ ئەو تێپەر دەکرد و دەیبردە سینەما و سێرک. لە ئاخرەکاندا لە بەر نارەحەتیی قەڵەویی یەکجار زۆر کە ڕێگەی نەدەدا خۆی بەندی کەوشەکانی توند کا و، هەروەها لە بەر ئیشتیای درۆزنانە، ببوو بە پیاوێکی ڕووگرژ. ناسینی کچەکەی ڕووخۆشیی رابردووی سەر لە نوێ بۆ گێڕایەوە و، خۆشیی هەستان و دانیشتنی لەگەڵ مەمە، بەرە بەرە ئەوی لە خوێنتاڵی هێنادەرێ. مەمە جوان نەبوو، دروست وەک ئامارانتا کە هەرگیز جوان نەبوو. لە بەرامبەردا کچێکی ساکار و لەبەردڵان بوو کە لە دەقیقەی هەوەڵەوە هەموو کەس خۆشیی لێی دەهات. فیزی قەدیمی و حەسوودیی دڵی هەژاری فێرناندا لە بەرامبەر ڕووحیەتی ساکاری کچەکەیدا شەرمەزار دەبوو،ئۆرلیانۆی دووهەم بە پێچەوانەی ئەوی هان دەدا. ئەوە بوو کە

بڕیاری دا مەمەی لەو ژوورە خەوەی کە لە منداڵییەوە لێی دەنووست و چاوی بە سامی پیاوچاکەکانی زەقدەبوونەوە و، دەبوونە هۆی ترسی ساڵانی بلووغی. ژووری خەوێکی گەورەی بۆ مۆبل کرد، لەگەڵ تەختی خەوێکی شاهانە و پەردەی مەخمەر و مێزێکی خۆرازاندنەوە. تەنانەت نەیزانی بێ ئیرادە خەریکە روونووسێک لە ژووری خەوی پێترا کۆتیس دروست دەکا. ئەوەندە بۆ مەمە دەست ئاوەڵا بوو کە نەیدەزانی چەندی پارە دەداتێ و هەر چۆنێک بێ، مەمە خۆشی پووڵی لە گیرفانی ئەو دەردەهێنا. هەموو رۆژێ بەیانیان کچەکەی لەو بەرهەمە جوانانەی کە دەهاتنە فرۆشگای شیرکەتی مۆز ئاگادار دەکردەوە. ژووری مەمە پڕ لەو بەردانە بوو کە نینۆکی پێ ساو دەکەن. فێری موو، قەترەیەک بۆ خومارکردنی چاو و، زۆر لە بەرهەمی جوانی دیکە، کە هەر کاتێک فێرناندا دەهاتە ژوورێ، بەو خەیاڵەی کە مێزی ئارایشی کچەکەی بە بێگومان وەک مێزی خۆرازاندنەوەی ژنە فەڕانسەییەکان دەچێ، سام دەیگرت. بە هەر حاڵ کاتی فێرناندا لەو زەمانەدا، لە نێوان ئامارانتا ئۆرسۆلای بچکۆڵە _ کە منداڵێکی بیانووگر و نەخۆش بوو _ و نامەنووسینی تکاکارانەی لەگەڵ پزیشکانی نادیار، دابەش ببوو، بە جۆرێک  کە کاتێک بە هاودەستی باوک و کچەی زانی تەنیا بەڵێنییەک کە توانی لە ئۆرلیانۆی دووهەمی وەربگرێ، ئەوە بوو، کە هیچ کات مەمەی نەباتە ماڵی پێترا کۆتیس، داوایەکی پووچ بوو، چونکە گراوییەکەی ئەوەندە لە دۆستایەتیی دووڕووی خۆی و کچەکەی نارەحەت بوو کە تەنانەت نەیدەویست ناوی کچەش ببیسێ. پێترا کۆتیس لە ترسێکی نادیار دا ئازاری دەچێشت. هەر وەک بڵێێ غەریزەیەکی نهێنی پێی دەگوت کە هەر ئەوەندە بەسە مەمە ئیرادە بکا و لە شتێکدا کە فێرناندا سەرنەکەوتبوو، سەرکەوێ، بێبەشکردنی لە ئەوینێک، کە لای وابوو هەتا کۆتایی تەمەن خاوەنییەتی. ئۆرلیانۆی دووهەم ناچار بوو بۆ هەوەڵین جار مل بۆ خۆڕانان و شەڕ و هەڵلای گراویی خۆی راکێشێ و تەنانەت دەترسا مەبادا جانتاە سەرگەردانەکانی دیسان بگەڕێنەوە ماڵی هاوسەرەکەی. ئەو رووداوە نەهاتەپێش ، هیچ کەس دووڕوویی پێترا کۆتیسی باشتر لە خۆی نەدەناسی و دەیزانی جانتاکانیان بۆ هەر جێگایەک

ناردووە، لەوێ دەمێنێتەوە. چونکە ئۆرلیانۆی دووهەم شتێکی کە قینی لێ بوو ئێرە و ئەوێ کردن و ناوماڵ کێشانەوە بوو. بەوشێوە جانتاەکان لە جێگای خۆیان مانەوە و پێترا کۆتیس بۆ ئاوەی دەست بەسەر پیاوەکەیدا بگریتەوە، خۆی خەریکی تیژکردنی تەنیا کەرەسەیەکی شەڕ بوو، کە مەمە نەیدەتوانی بەو کەرەسەوە بچێتە بەربەرەکانیی باوکی. ئەو کارەش زەحمەتێکی بێ سوود بوو، چونکە مەمە بە هیچ جۆر بە خەیاڵ نەبوو لە کارەکانی تایبەتی باوکیدا دەخاڵەت بکا و، ئەگەر قەراریش با ئەو کارەی کردبا، بێگومان بە قازانجی گراوی باوکی دەیکرد. کاتێک بۆ مەمە نەدەمایەوە هەتا خەڵکی پێ ئازار بدا، هەروا کە لە مەدرەسەی شەوانەڕۆژی فێریان کردبوو، هەر خۆی ژوورەکەی گەسک لێدەدا و تەختی خەوەکەی ڕێکوپێک دەکرد. ڕۆژانە خەریکی کاری خۆی بوو و لە هەیوانێ گوڵدۆزیی دەکرد و بە چەرخی خەیاتی کۆنی ئامارانتا شتی دەدروو. دوای نیوەڕۆیان، کاتێک ئەوانی دیکە دەنووستن، ئەو دوو سەعات مەشقی کلاوسێنی دەکرد و دەیزانی کە تەمرینی ڕۆژانە فێرناندا ئارام رادەگرێ و بەو مەبەستەش هەر چەند داواکان ڕۆژبەڕۆژ کەمتر دەبوون، ئەو لە جێژنەکانی خێراتی کڵێسا و مەدرەسەدا کۆنسێرتی دەکرد. لای ئێواران خۆی ڕێکوپێک دەکرد و لیباسێکی ساکاری دەبەر دەکرد و جووتێک کەوشی ڕەحەت و ئەگەر لەگەڵ باوکی بەرنامەی نەبا دەڕۆیشتە ماڵی هاوڕێکانی و هەتا شام لەوێ دەمایەوە. زۆر بەکەمی هەڵدەکەوت ئۆرلیانۆی دووهەم بە دوایدا نەهاتبایە و نەیبردبا سینەما.

لە نێو هاوڕێکانی مەمەدا سێ کچی جوانی ئەمریکای باکوور هەبوون، کە خۆیان لە ناوچەی تێلدڕوو دەرکێشابوو، لەگەڵ کچانی خەڵکی ماکۆندۆ گەلاڵەی دۆستایەتییان داڕشتبوو. یەکێک لەوان پاتریشیا براون[٢] بوو. ئاغای براون بۆ ئەمەکناسی لە میواندارییەکانی ئۆرلیانۆی دووهەم دەرگای ماڵەوەی بۆ مەمە کردەوە و ئەوی بۆ سەمای شەممەشەو بانگهێشت کرد و ئەوە تەنیا دانیشتنێک بوو کە بیانییان و خەڵکی ماکۆندۆی بە یەکەوە بانگ دەکرد. کاتێک فێرناندا بەوخەبەرەی زانی بۆ ئانێک ئامارانتا ئۆرسوڵا و

---

[٢]– Patricia Brown

پزیشکانی نادیاری لەیاد بردەوە و هەرایەکی ساز کرد و بە مەمەی وت: "هیچ بیرت لێ کردۆتەوە کە سەرهەنگ لە گۆڕدا دەڵێ چ؟" دیارە پێویستی بە پشتیوانیی ئۆرسوڵا هەبوو، بەڵام پیرێژنە کوێرە، بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی هەموویان، وتی کە لە بەشداریی مەمە لەو دانیشتنانەدا و سەما و دۆستایەتی لەگەڵ کچە ئەمریکاییە هاوتەمەنەکاندا، هیچ عەیبێک نابینێ. دیارە بەمەرجێک نەهێڵی بیکێشن بۆ دەستەی پرۆتستانەکان. مەمە ڕێزی دادەنا بۆ باوەڕی دایکەگەورەی، ڕۆژەکانی دوای مەجلیسی سەما زووتر لە هەمیشە لە خەو هەڵدەستا، هەتا بچێتە ڕێوڕەسمی نوێژی کڵێسا. دژایەتی فێرناندا هەتا ئەو ڕۆژە درێژەی کێشا کە مەمە پێیگوت ئەمریکاییەکان دەیانەوێ ئەو کلاوسینیان بۆ لێدا، بەوجۆرە چەکی کرد. ئامێری مۆسیقا جارێکی دیکەش لە ماڵەوە ڕۆیشتە دەر و گوێزرایەوە بۆ ماڵی ئاغای براون. هونەرمەندی لاو لەوێ لەگەڵ چەپڵەلێدانی ڕاستییانە و پیرۆزبایی خۆشەویستییانە بەرەوروو بوو. لەو کاتە بەدواوە، نەتەنیا هەمیشە بۆ سەما بانگهێشتن دەکرا، بەڵکو حەوتووی جارێک ڕۆژی یەکشەممەش لە میوانی نیوەڕۆخوان و مەلە لە ئیستەخردا بەشداریی دەکرد. مەمە مەلەی وەک مەلەوانانی پیشەگەر فێر بوو، تێنسیش فێر بوو و، گۆشتی بەرازی ڤێرجینیایی لەگەڵ وەرەقەی ئاناناس خوارد و لەپڕ لە کۆبوونەوەی سەمایان و تێنس و گۆمی مەلەدا خۆی لە نێو زمانی ئینگلیزیدا دۆزییەوە. ئۆرلیانۆی دووهەم ئەوەندە لە بەرەوپێش چوونی کچەکەی خۆشحاڵ بوو، کە لە فرۆشیارێکی گەڕۆک فەرهەنگێکی ئینگلیزی شەش بەرگی وێنەداری بۆ کڕی و، مەمە لە سەعاتی بێکاریدا خەریکی خوێندنەوەی بوو و، هەموو ئەو مەیلەی، کە پێشتر بۆ غەیبەتی ئاشقان و ئەزموونەکانی کە لەگەڵ هاوڕێکانی بەدەستیان هێنابوو، هەیبوو ئەوجار خستییە سەر کتێب خوێندنەوە. ئەو خۆی ناچار نەکردبوو بەڵکو هەر جۆرە مەیلێکی سەبارەت بەو نهێنییانەی کە لە هەموو شوێنێک دەنگۆ بوو لەدەست دابوو. مەست بوونی خۆی وەک بیرەوەرییەکی دەورانی منالی هێنایەوە یاد و ئەوەندەی پێ گاڵتەجار بوو کە بۆ ئۆرلیانۆی دووهەمی گێڕایەوە. بە چاو باوکی پێکەنینهێنەرتر بوو، بە شیوەی ئاسایی، کە هەر

کات مەمە رازێکی پێدەگوت پێدەکەنی، لە پێکەنینان دڵی لە خۆ بۆوە و وتی: "ئەگەر دایکت دەزانیٚ!" بەڵێنی لە مەمە وەرگرتبوو کە هەر بەو دڵنیاییەوە لە هەوەڵین رووداوی ئەوینی خۆیشی ئاگاداری بکا و، مەمە بۆی باس کرد لاوێکی موو خورمایی ئەمریکایی خۆش ویستووە، کە بۆ تێپەڕکردنی ماوەی پشووودان هاتبووە لای دایک و باوکی. ئۆرلیانۆی دووهەم پێکەنی و وتی: "زۆر چاکە! ئەگەر دایکت دەزانیٚ!" بەڵام مەمە پێیگوت کە کورە گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی خۆی و هەواڵێکی پیٚ نەگەیشتۆتەوە. زانایی مەمە سەفا و ئاشتیی بنەماڵەی لە سەر پیٚ راگرتبوو، لەو کاتەدا ئۆرلیانۆی دووهەم زۆرتر لە جاران کاتی خۆی لەگەڵ پێترا کۆرتیس دەبردە سەر و هەرچەند نە بە رووح و نە بە لەش وەک پێشوو حەوسەلەی میوانداریی نەبوو، بەوحاڵەش ئەگەر هەلێکی بۆ هەڵدەکەوت جێژنێکی ساز دەکرد و، ئۆکۆردیۆنەکەی کە هێندێک لە کلیلەکانی بە بەنی کەوشان لێک بەسترابوون دەهێنادەر. لە ماڵ، ئامارانتا هەروا خەریکی گوڵدۆزی بیٚ پسانەوەی کفنەکەی خۆی بوو و، ئۆرسولا خۆی بە دەستی دارزان سپاردبوو و، رۆژبەڕۆژ زۆرتر لە قووڵایی تاریکیدا نوقم دەبوو و، تەنیا شتێکی کە هێشتا لەو تاریکانەدا دەیدی تارمایی خۆزێ ئەرکادۆ بویندیا بوو لە بن داربەڕوەکە.

فێرناندا جارێکی دیکەش حکوومەتی گرتەوەدەست، نامەی مانگانە بۆ کوڕەکەی خۆزیٚ ئارکادیۆی، لەو کاتەدا درۆی تێدا نەبوو. تەنیا ئاڵوگۆڕی نامەی لەگەڵ پزیشکانی نادیار لیٚ شاردبۆوە. پزیشکان روونیان کردبۆوە کە لە ریخۆڵەی گەورەیدا لوولەیەک هەیە و خەریک بوون ئەویان بۆ عەمەلێکی نەشتەرگەریی تێلەپاتیک ئامادە دەکرد.

بەڕواڵەت ئاشتی و سەفا بە سەر کۆشکی ماندووی بنەماڵەی بویندیادا حکوومەتی دەکرد، کە مەرگی لەنەکاوی ئامارانتا جارێکی دیکە هەڵلای بەپا کرد، رووداوێکی چاوەڕواننەکراو بوو، ئامارانتا لەگەڵ ئەوەشدا پیر بوو و، خۆی لە هەمووان دوور دەگرت، هێشتا قەد راست و وەک هەمیشە ساخ بوو. لەو پاشنیوەڕۆیەوە کە بۆ ئاخرین جار سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیزی دەرکرد و دەرگای لە سەر خۆی داخست تا فرمێسکان هەڵڕیژیٚ، ئیدی

کەس نەیدەزانی چۆن بیر دەکاتەوە. کاتێک لە ژوورەکەی هاتەدەرەوە هەموو فرمێسکەکانی رشتبوو. کاتێک ڕێمیدیۆسی جوانکیلە بۆ ئاسمان بەرز بۆوە و کاتێک ئۆرلیانۆکانیان قەڵاچۆ کردن، ئەو فرمێسکێکی نەڕشت. هەر وەک بۆ مردنی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیاش فرمێسکێکی نەڕشت، کە لە هەموو کەس لە دونیادا خۆشتری دەویست و تەنیا کاتێک ئەو خۆشەویستییەی پیشان دا کە لاشەکەیان لە بن داربەڕووەکە دۆزییەوە، یارمەتیی کردن هەتا لاشەکەیان بەرز کردەوە و ئۆنیفۆرمی نیزامیی دەبەر کرد و ریشی تاشی و مووی سەری شانەکرد و سمێڵەکانی زۆر چاکتر لە خۆی لە زەمانی شانازیدا چەور کردن. هیچ کەس بە بیریدا نەهات کە لەو حەرەکەتانەدا چ ئەوینێک شاردراوەتەوە، چونکە هەموویان بە ئەندازەی ئامارانتا شارەزای ڕێوڕەسمی سەرەخۆشی بوون. فێرناندا، لەوە کە ئەو پێوەندیی ئایینی کاتۆلیکی لەگەڵ ژیان تێنەگەیشتووە و تەنیا پێوەندیی ئەو لەگەڵ مردن تێدەگا، هەستی بە ریسوایی دەکرد_ وەک بڵێی کاتۆلیک بوون ئایین نییە و تەنیا ئەرکێکی مردووشۆرانە. ئامارانتا وەها لە مەشخەڵی تاریکی بیرەوەرییەکاندا ون ببوو، کە ئەو داوا لێبووردنە بە هەستانەی نەدەبیست. بەتەواوی دڵتەنگییە دەست لێنەدراوەکانی خۆیەوە پیر ببوو. کاتێک گوێی دەدایە ئاهەنگەکانی ڤاڵسی پیترۆکرێسپی، دڵی دەیەویست هەروەک ساڵەکانی هەوەڵی لاوی لەگەڵیدا بگری، وەک بڵێی ڕەوتی زەمان و ئەزموون بەکاری هیچ نەهاتبوون، ئەو سەفحە ئاسنە مۆسیقایانەی پیانۆ، کە خۆی بە بیانووی ئەوەی نم رزاندوونی لە زبڵدانی هاویشتبوون، هەروا لە بیرەوەرییەکانی دەسووڕانەوە و لێیان دەدا. تێکۆشابوو ئەو مۆسیقایانەی، کە لە هەوەسێکدا ڕێگەی بە خۆی دابوو بەرامبەر بە برازاکەی ئۆرلیانۆ خۆزێ هەست بکا، بخنکێنێ و، تێکۆشابوو پەنا بۆ بن باڵی مەردانە و ئارامی سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بەرێ، بەڵام نەیتوانی بە سەر ئەودا سەرکەوێ. تەنانەت ناهومێدانەترین کردەوەی پیریش سوودێکی نەبوو. کاتێک کە خۆزێ ئارکادیۆیان ،سێ ساڵ پێش ئەوەی بچێتە مەدرەسەی فەقێیان، شووشت و، ئەوی نە وەک نەنکێک کە نەوەکەی دەلاوێنێتەوە، بەڵکو وەک پیاوێک دەلاواندەوە، وەک دەیانگوت، وەک ژنانی

فەرەنسیی، وەک کاتێک کە دوازدە یا چاردە ساڵی لە تەمەنی رادەبرد و.
هەر کات کە پیترۆ کریسپی بە شەڵواری تەنگی سەما و ئەو دارە جادووییە بەو زەمانی میترۆنۆمی دیاری دەکرد، دەدی، دلی دەیخواست دەستی لێ بدا. جاری وابوو، لەوەی بۆچی لە رێڕەوی ژیانیدا ئەو هەموو بەدبەختییەی خۆی بەجێ هێشتووە، هێندە دڵی بە خۆی دەسووتا و تێکدەچوو، دەرزیی دورمانانی لە ئەنگوستی خۆی رۆ دەکرد. بەڵام هەر چەند زۆرتری دەرد دەچێشت توورەییشی زۆرتر دەبوو. دارستانی کرمخواردوو و دڵنەوازی ئەوین، کە ئەوی بۆ لای مردن رادەکێشا جار لە جار زۆرتر ژیانی لێ تاڵ دەکرد. هەروا کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە بێ ئیرادە بیری لە شەڕ دەکردەوە، ئامارانتاش لە ئەندێشەی رێبێکادا بوو. بەوجیاوازییە کە براکەی توانیبووی بیری خۆی نەزۆک بکا و، ئەو بەپێچەوانە لە خۆیدا گەرمتری کردبوو. تەنیا شتێکی کە ساڵانی ساڵ لە خوای ویستبوو ئەوە بوو، سزای مەرگ دوای رێبێکا بە سەر ئەودا بێنێ. هەموو جارێ کە بە پێش ماڵی ئەودا ردەبرد و وێرانیی رۆژبەڕۆژ زۆرتری خانووەکەی دەبینی، بەو فکرەی کە دوعاکان قبووڵ دەکرێ، هەستی بە راحەتی دەکرد. رۆژێک دوای نیوەڕۆ، هەروا کە لە هەیوان دانیشتبوو و درووماني دەکرد، لە نەکاو لە دڵنیاییەکی سەیرەوە هیچ کەس لە ماڵەوە نەیزانی کە ئامارانتا کفنێکی جوانی بۆ رێبێکا درووە. کاتێک ئۆرلیانۆ هەستی کرد کاتێ هەواڵی مەرگی رێبێکای بۆ دێنن، ئەو هەر لەو جێگایە. بەو جۆرەی دانیشتووە و لە بەر ئەو تاوە دەبێ. لەوێ بە چاوەڕوانی دانیشت، وەک کەسێک کە چاوەڕوانی نامەیەک دەکا. دوگمەکانی دەپساندن و دەیدروونەوە هەتا بێکاری چاوەڕوانییەکەی درێژتر و وەڕەزتر نەکا. تریستە باسی کرد کە رێبێکای دیوە، بۆتە تارماییەک و پێستی گەنیوە و لە تەپڵەسەری رووتیدا تەنیا چەند تاڵەموو دەبیندرێن، ئامارانتا سەری سوڕ نەما، چونکە ئەو وێنەیە دروست وێنەیەک بوو کە ئەو زۆر لەوە وپێش لە بیری خۆیدا دابنابوو. بڕیاری وابوو لاشەی رێبێکای دروست کاتەوە و دەموچاوی خەسارەلێکەوتووی ئەو بە پارافین سواخ بدا و بە پرچی پیرۆزان کڵاومووبەکی"باررووکە" بۆ دروست بکا. دڵی دەیەویست مەیتێکی

جوان دروست بکا، بە کفنێکی کەتانی و تابووتی ئەستەرمەخمەر و لێوار ئەرخەوانی رەنگ و، ئەو کات لاشەکەی بە پێی رێورەسمی ناشتنی جەنازەیەکی بەشکۆ تەسلیمی کرمان بکا. بە بێزارییەکی ئەوتۆوە نەخشەکەی لە سەری خۆیدا دەهێنا و دەبرد، کە کاتێک بیری لێکردەوە تەنانەت ئەگەر قەرار با لە رووی ئەوینیشەوە کارێکی ئەوها بکا، ئەو هەموو وردی و وردەکارییەی دەکار نەدەبرد. لە ترسان لەرزی، بەڵام نەیهێشت ئەو ئاڵۆزیی بیرە پەرێشانی بکا و بە وردبینییەکی وەهاوە خەریکی تەواوکردنی وردەکارییەکان بوو، کە لە رێورەسمی مەرگدا لە مردووشۆرێک کارامەتر بوو.

تەنیا شتێکی کە لەو نەخشە سامناکەدا لە هۆشی نەبوو، ئەوەبوو کە لەگەڵ پاڕانەوە و داوا لە خواوەند، بۆخۆی پێش رێبێکا بمرێ. هەرواش بوو. بەڵام ئامارانتا لە ئاخر دەمدا هەستی بە وەرەزی نەکرد. بە پێچەوانەوە، هەستی کرد کە لەشی لە هەموو جۆرە خەم و تاڵی و سوێرییەک پاک بۆتەوە، چونکە مەرگ ئەو ئیمتیازەی پێ دابوو، کە چەندەها ساڵ زووتر خۆی پێ بناسێنێ، هێندە لە رۆیشتنی مەمە بۆ شەوانەڕۆژی تێپەڕ نەببوو کە لە دوانیوەڕۆژێکی زۆر گەرمدا، مەرگی بینی لە هەیوانێ لە لای دانیشتووە و دورمانی لەگەڵ دەکا. ئامارانتا دەسبەجێ ناسیی، شتێکی سامناک لە مەرگدا نەبوو، ژنێک بوو لیباسی شینی دەبەردا بوو و پرچی درێژ بوون. قیافەی هێندێک قەدیمی و کەمێکیش وەک پێلار تێرنێرا دەچوو. ئەو کاتانەی لە ئاشپەزخانە یارمەتیی ئەوی دەکرد چەند جارێکیان فێرناندداش لەوێ بوو و، لەگەڵ ئەوەشدا کە مەرگ ئەوەندە بەشەری و راست بوو، تەنانەت جار هەبوو تکای لە ئامارانتا دەکرد دەزووی بۆ بە دەرزییەوە بکا، بەوحاڵەش فێرناندا ئەوی نەدی. مەرگ پێی نەوت کەی دەبێ بمرێ و، پێشی نەوت کە پێشی رێبێکا ئەجەلی دەگاتێ، تەنیا فەرمانی پێدا رۆژی شەشەمی ئەپریلی داهاتوو دەست بە کفندروونی خۆی بکا. ئەوی ئازاد کرد هەتا هەر چۆنێکی پێی خۆشە کفنەکەی لە سەرەخۆ و بە وردی بدروێ، تەنیا دەبوو بەڕاستی و لە قووڵایی دڵەوە بیدروێ. هەر وەک کفنی رێبێکای ئامادە کردبوو. مەرگ پێیگوت کە لە شەوی ئەو رۆژەیدا دروونی کفن تەواو

دەبێ، بە بێ دەرد و بە بێ ترس و بە بێ خەم دەمرێ، ئامارانتا دەستووری دا دەزووی کەتانی ئەستووریان بۆ هێنا، لە کاتێکدا تێدەکۆشا ئەوەندەی بکرێ کات بە فیرۆ بدا، خۆی بەنی پارچەی کفنەکەی رست. وا بە وردی پارچەکەی چنی کە چوار ساڵی تەنیا بۆ چنینی پێ چوو و، دوایەش گوڵدۆزی دەستی پێکرد. هەروا کە بەرە بەرە لەو کۆتاییە لە چارەنەهاتووە نزیک دەبۆوە، زۆرتر بۆی دەردەکەوت، کە تەنیا مووجیزەیەک مومکینە کفندروونەکەی ئەو دوای مردنی ڕێبێکا درێژە بدا. بەڵام هەر ئەو بیر کۆنە ئارامییەکی پێ بەخشی، کە بۆ باوەڕکردن بە خەیاڵی تێشکانی خۆی، پێویستی پێی هەبوو، ئەو کاتە بوو کە مانای بازنەی تەواونەبووی ماسییە بچکۆڵە زێڕەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای بۆ دەرکەوت. دونیا تەنیا شوێنەواری لە سەر پێستی جێهێشتبوو، ئەگینا دڵی لە هەموو جۆرە رق و کینەیەک خاڵی بوو. بەداخ بوو کە بۆچی مەرگ ساڵەها پێشتر خۆی پێشان نەداوە، کاتێک کە هێشتا پاککردنەوەی بیرەوەرییان ئیمکانی هەبوو و دەکرا دونیای دووبارە لە ڕووناکاییەکی نوێتردا ساز کەیەوە، کاتێک کە هێشتا دەتوانرا بە بێ لەرزین لە بۆنی عەتری پێترۆکرێسپی درێژە بە ژیان بدەی و، دەکرا ڕێبێکای نە بە خاتری بێزاری یان ئەوین، بەڵکو بە خاتری تێگەیشتنێکی بێ پێوانەی تەنیایی لەو وێرانەی بەدبەختییە رزگار بکەی. لە بێزارییەکی کە شەوێک لە قسەکانی مەمەیدا هەست کرد، نارەحەت بوو، چونکە پێوەندیی بە خۆیەوە هەبوو. خۆی لە کچێکی لاوی دیکەدا دووپات بۆوە دەدی، خۆیشی لەو تەمەن و ساڵەدا هەر چەند لە نێوەوە دڵی هەر ئەو کاتە بە کینە گومڕاببوو، ئارام و پاک و بێگەرد دەهاتە بەرچاو. لەو کاتەدا قبووڵی چارەنووس ئەوەندە بۆی قووڵ ببۆوە، کە تەنانەت باوەڕ بەوە کە دەرگای هەموو ئیمکانێکی چاکبوونەوەی لێداخراوە، نارەحەتی کرد. ئێستا تەنیا ئامانجی تەواوکردنی کفنەکەی بوو. لە جیاتی ئەوەی وەک سەرەتا دروونەکەی بە وردەکاری بێهوودە درێژە پێ بدا، کارەکەی وەپەلە خست. حەفتەیەک پێش وادەی مردن، حیسابی کرد کە ئاخرین دەرزی شەوی چواری فێوریە لە کفنەکەی رۆ دەکا و بە بێ ئەوە هۆیەک ببینێتەوە پێشنیاری بە مەمە کرد کە

کۆنسێرتی کلاوسێن، کە بۆ بەیانی ئەو تاریخە لەبەر چاو گیراوە، وەپێش بخا. بەڵام مەمە گوێی نەدایە قسەکانی و ئەو کات ئامارانتا تێکۆشا هەر چۆنی بێ تەواوکردنی کارەکانی چل و هەشت سەعات دوابخا و، تەنانەت وایزانی مەرگ خەریکە ئارەزووەکانی دێنێتەدی، چونکە شەوی چواری فیورییە بوو بە تۆفان و دایرەی ناوەندی کارەبای شار سەدەمەی پێکەوت. بەڵام ئەو، بەیانیی ئەو رۆژە، سەعات هەشتی سەر لە سبیانێ، ئاخرین دەرزیی لە کفنەکەی خۆی رۆکرد. کفنەکەی جوانترین دەسکردێک بوو کە هەتا ئەو زەمانەی ژنێک توانیبێی گوڵدۆزیی بکا. بە بێ ئەوە هەراوهوریا ساز کا، رایگەیاند؛ لای ئێوارە دەمرێ. نەتەنیا بنەماڵەی خۆی، بەڵکو هەموو شاری ئاگادار کردەوە، چونکە لەو باوەڕدا بوو کە دەکرێ عومرێک خراپە بە جێبەجێ کردنی داوایەکی دنیایی تۆڵە بکەیەوە و، کەوتە سەر ئەو بیرەی هیچ کارێک لەوە باشتر نییە نامە بۆ مردووان بەرێ.
ئەو هەواڵە، کە ئامارانتا بەرەبەری تاوپەڕان دەچێتە دونیای دیکە، هەتا نامە بۆ مردووان بەرێ، هێشتا نەبیوو بە نیوەڕۆ لە تەواوی ماکۆندۆ گەڕا و، سەعاتی سێی پاشنیوەڕۆ سندووقێکی پڕ لە نامە لە سالۆنی میوانداری بوو. هەر کەس کە نەیدەویست نامە بنووسێ، ئامارانتای رادەسپارد و ئەویش لە دەفتەرچەی بیرەوەریدا ناو و تاریخی مردنی وەرگری پەیامی دەنووسی و دەیگوت: "نیگەران مەبە، هەر کە گەیشتمە ئەوێ، هەوەڵین کارێکی دەیکەم سۆراخی دەکەم و راسپاردەی ئێوەی دەدەمێ." وا دەهاتە بەرچاو کە لە شانۆیەکی گاڵتەجاڕدا یاری دەکا. نە هەستی بە ئازار دەکرد و نە دەترسا، تەنانەت وا دەهاتە بەرچاو بە خاتری ئەرکێکی کە دەیکا هێندێکیش جحێڵ بۆتەوە. وەک هەمیشە قەد و باڵای راکشاوی زیرەک و چالاک بوو و، ئەگەر لە بەر رووومەتی دەرپەڕیو و چەند ددانی کەوتووی نەبا، کەمتر لە تەمەنی راستیی خۆی دەردەکەوت. بۆخۆی فەرمانی دا نامەکان لە سندووقێکی قیرەسواخ باوێن و تەنانەت پێشانی دا کە سندووقەکە چۆن لە گۆڕدا دابنێن، هەتا نم کاری تێنەکا. بەیانی بە دوای دارتاشێکیدا ناردبوو بێ، تابووتەکەی ئەندازە بگرێ. لە نێوەراستی سالۆندا لە سەر پێ راوەستابوو، دەتگوت بۆ دروونی لیباس ئەندازەی دەگرن. لە سەعاتی

ئاخردا ئەوەندە هەڵسووڕاو ببوو، فێرناندا وایزانی لە راستیدا ئەو گاڵتە بە هەموویان دەکا. ئۆرسوولا، کە بە تاقیکردنەوە بۆ دەرکەوتبوو ئەندامانی بنەماڵەی بویندیا بە بێ نەخۆشی دەمردن، گومانی نەبوو کە ئامارانتا مردنی خۆی پێشبینی کردووە. بەڵام بە هەر حاڵ زۆر نیگەران بوو، چونکە دەترسا کە نامەنووسەکان لە ئاڵۆزیی ئەو هەموو نامەیەدا و بەپەرۆشی بۆ ئەوەی هەرچی زووتر بگەنە شوێنی مەبەست، چاوەڕوانی مەرگی ئامارانتا نەبن و بە زیندوویی بە خاکی بسپێرن. سەرەنجام خەریکی چۆڵکردنی ماڵەوە بوو، بە سەر زەحمەت دەراندا قیژاندی و شەڕی لەگەڵ کردن، بە هاتنی سەعاتی چواری پاشنیوەڕۆ، لە کاری خۆیدا سەرکەوت. هەتا ئەو سەعاتە ئامارانتا شتومەکی خۆی بە سەر هەژاراندا دابەش کردبوو و، لە نێو تابووتی داری ساکار تەنیا دەستێک جل و کەوشی راحەتی پارچەی خۆی دانابوو کە لە سەفەری مەرگدا دەبەریان بکا. ئەو پارێزەی لە دەست نەدا. چونکە بیری کەوتەوە کە کاتێک سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا مرد، ناچار ببوون جووتە کەوشێکی نوێ بۆ بکڕن، ئەو تەنیا جووتە دەمپاییەکی کۆنەی لە پاش بەجێ مابوو کە لە کارگا لە پێی دەکرد. کەمێک پێش سەعاتی پێنج، ئۆرلیانۆی دووهەم بە دوای مەمەدا هات بیبا بۆ کۆنسێرت و، لەوە کە ماڵ بۆ رێوڕەسمی بەخاک سپاردنی جەنازە ئامادە کراوە سەری زۆر سوڕما. ئەگەر لەو دەمەدا کەسێک لەوێ زیندوو بوو، هەمان ئامارانتای ئارام بوو، کە تەنانەت دەرفەتی هێنابوو مێخەکەکانی لاقیشی ببڕێتەوە. ئۆرلیانۆی دووهەم و مەمە بە ماڵئاواییەکی گاڵتەوە جێیان هێشت و بەڵێنیان پێدا کە شەممەی داهاتوو بۆ دووبارە زیندبوونەوەی میوانییەکی گەورە بکەن، قەشەئەنتۆنیۆ ئیزابێل، کە لە خەڵکی بیستبوو ئامارانتا بویندیا بۆ مردووان نامە وەردەگرێ، سەعاتی پێنجی دوای نیوەڕۆیە،لەگەڵ فەقێیەکی منداڵ بۆ بە جێگەیاندنی ئاخرین رێوڕەسمی ئایینی هاتە ماڵەوە و ناچار بوو چارەگە سەعاتێک چاوەڕوان بێ، هەتا ئەوەی قەرار وایە بمرێ، لە حەمام بێتەدەرێ. کەشیشی پیر، کاتێک چاوی بە ئامارانتا کەوت کراسێکی درێژ و گوشادی لە پارچەی تەنکی کەتانی پۆشیوە و پرچی بە سەر شاناندا بڵاو کردۆتەوە، بەوخەیاڵە کە گاڵتەیان پێ کردووە، کوڕە

منداڵەکەی بەریٚ کرد، بەڵام بیری کردەوە باشترە دەرفەتەکە بە هەل بزانیٚ و دوای بیست ساڵان بێدەنگیی ئامارانتا، ددان بە تاوانەکانیدا بنیٚ، بەڵام ئامارانتا بە ساکاری وەڵامی دایەوە کە پیویستی بە هیچ جۆرە یارمەتییەکی رووحی نییە و ویژدانی پاک و راحەتە. فێرناندا، کە هەستی بە ریسوایی دەکرد، بە بیٚ ئەوەی لە گوێبداتە ئەوەی کەسانێکی قسەکانی دەبیسن چۆن بیر دەکەنەوە، بە دەنگی بەرز وتی، خودا دەزانیٚ کە ئامارانتا چ گوناحێکی گەورەی کردووە، کە ئامادەیە بە کافری بمریٚ و ددان بە تاوانەکانیدا نەهێنیٚ. ئەو کات ئامارانتا لە سەر تەختی نووستن راکشا و ئۆرسوٚلای ناچار کرد هەتا لە بەرچاوی هەموویان شاهیدی بۆ کچێنی ئەو بدا.

بۆ ئەوەی فێرناندا گوێی لیٚ بیٚ هاواری کرد: "باشترە هێندێک کەس خەیاڵی پووچ نەکەن. ئامارانتا بویندیا ئەو جیهانە هەروەک چۆن پێی تیٚناوە، هەرواش بەجیٚ دێڵیٚ."

ئیدی هەڵنەستایەوە و وەک نەخۆشان لە نێو جێگا درێژ بوو و هەروا کە مەرگ فەرمانی پێدابوو بچێتە نێو تابووت، بسکی درێژی بە سەر گوێیاندا بڵاو کردنەوە. دواتر ئاوێنەیەکی لە ئۆرسوٚلا داوا کرد و بۆ هەوەڵین جار دوای چل و ئەوەندە ساڵە، چاوی لە دەموچاوی تێکشکاو و لە زەمان و ئازار و کینە کرد و سەرسام ما کە هەتا چ رادەیەک وەک ئەو وێنەیە دەچیٚ کە لە خەیاڵیدا بوو. ئۆرسوٚلا لەبێدەنگیی ژوورەکە بۆی دەرکەوت هەوا بەرەو تاریکی دەڕوا. لە بەری پاڕایەوە کە: "لە فێرناندا ماڵئاوایی بکە. دەمێک ئاشتی لە عومرێک دۆستایەتی بایەخی پترە."

ئامارانتا لە وەڵامدا وتی: "ئێستا ئیدی بایەخی نییە."

مەمە کاتێک ساڵۆنیان رووناککردەوە و بەشی دووهەمی کۆنسێرتی خۆی دەست پێکرد، لە خۆوە ئامارانتای هاتەوە یاد. لە نیوەکانی ئاهەنگەکەدا کەسێک سرتەیەکی بە گوێیدا کرد و کۆنسێرت راوەستا. کاتێک ئۆرلیانۆی دووهەم گەیشتەوە ماڵیٚ، بەزەحمەتی رێگای خۆی لە نێو خەڵکدا کردەوە و لاشەی ناحەز و بێدەنگی پیرەکچی بە پەڕۆی رەشی دەستییەوە بینی کە لە ساڵۆن، لە کەنار سندووقی نامەکاندا لە کفنێکی یەکجار زۆر جوانەوە پێچراوە.

ئۆرسـوٚلا، دوای نـۆ رۆژ پرسـەی ئامارانتـا لە جێگـای خـۆی هەڵنەسـتایەوە. سانتا سۆفیا دێل پێداد خزمەتی دەکرد و ئاگای لێی بوو و، خواردنی بۆ دەبرد و ئاوی کارێزی دەبردە ژوورەکەی خـۆی پـێ بشـوا و، رووداوەکانی ماکۆنـدۆی بـۆ دەگێـڕایەوە. ئۆرلیـانۆی دووهەم دەهـات بـۆ چـاوپێکەوتنی و لیباسـی بـۆ دەهێنـا. ئۆرسـوٚلا جلەکـانی لەگەڵ پێویسـتییەکانی دیـکەی ژیـانی رۆژانەی لە تەنیشت تەختی خـۆی دادەنـان. لە مـاوەیەکی کورتـدا دونیـایەکی لە بەر دەستی خـۆی دروسـت کـرد، تـوانی ئامارانتـا ئۆرسـوٚلای بچـکۆڵە، کە تەواو وەک خـۆی دەچـوو، بەتوندی ئۆگـری خـۆی بکـا، فێـری خوێنـدنی کـرد. بەهۆشی ئۆرسوٚلا و توانایی لە کارەکانی خۆیدا بە هەموویـانی سـەلماند کە ئەو بە سەر گرانایی، یەک سـەدە تەمەنی خۆیـدا سـەرکەوتووە و، ئەگەرچـی ئاشـکرا بـوو سـۆمای چـاوانی هێنـدە بـاش نییە، بەڵام هـیچ کەس هـیچ کـات شـکی ئەوەی نەکـرد کە ئەو بەتەواوی کـوێر بـووە، لەو رۆژانەدا ئەوەنـدە ئاگاداری ژیـانی مـاڵەوە بـوو، ئەوەنـدەی وردی و بێدەنگی دەروونـی بەکـار هێنا، هەوەڵین کەس بوو کە بە خەم و پەژارەی بێدەنگی مەمەی زانی.

پێیگوت: "وەرە ئێرە. ئێستا کە من و تۆ تەنیاین، بەوپیرێژنە بێچارەیە بڵێ چ شتێک نارەحەتت دەکا."

مەمە بە پێکەنینێکی کورت لە قسەکردن لەگەڵ ئەو خـۆی خافڵاند. ئۆرسـوٚلا زۆرتری لە سەر نەڕۆیشت، بەڵام کاتێک بینی مەمە ئیدی بۆ سـەردانی نـایە، گومـانی بـوو بە دڵنیـایی. دەیزانـی کە لە هەمیشـە زووتـر ئامـادە دەبـێ و بە تەمـای چوونەدەرەوە لە مـاڵ ئـارام و ئـۆقرەی نییە. دەیزانـی کە شـەوانە لە ژووری تەنیشـتی، هەتـا رۆژ لە تەختـی خۆیـدا ئەو دیـو و ئەودیـو دەکـا و تەنـانەت فڕینـی پەپوولەیەکیش نـارەحەتی دەکـا. جارێکیـان بیسـتی خەریـکە دەچێ بۆ چاوپێکەوتنی ئۆرلیانۆی دووهەم و، زۆر سەری سوورما کە چۆن تێگەیشتنی فێرناندا ئەوەندە بەرتەسکە کاتێک مێردەکەی دێتەوە مـاڵەوە بـۆ بردنی کـچەکەی شـکی بـۆ هـیچ نەچـوو، یەکجـار زۆر ئاشـکرا بـوو کە مەمە زۆر پێش ئەوە فێرناندا لە سینەما چاوی پێ بکەوێ، پیاوێـک مـاچ دەکـا و خـانووی بە سـەر سـەری خۆیـدا بڕووخێنـێ، لە رووداوێکـی نادیـار لە چاوپێکەوتنە بەپەلەکان و نیگەرانییەکی گیانبەر گرفتار بوو.

مەمە خۆیشی لەو کاتەدا ئەوەندە پەشۆکابوو کە ئۆرسۆلای تاوانبار دەکرد جاسووسیی لێکردووە، بەڵام لە راستیدا تاوانی ریسوایی لە خۆیەوە بوو. ماوەیەک بوو لە پشت سەری خۆیەوە هێندێک شوێن پێی بەجێ دەهێشتن، کە تەنانەت کەمهۆشترین کەسیشی وەشک دەخست و، فێرناندا، چونکە بۆخۆی سەخت گرفتاریی پیوەندیی خۆی لەگەڵ پزیشکانی نادیار بوو، ئاگای لەوە نەبوو. بەوحاڵەش تەنانەت لەو وەزعەشدا هەستی بە بێدەنگیی قووڵ و راچەنینی لەنەکاو و گۆڕانی ئەخلاقی کاتی و قسەی بێ سەرەبەرەی کچەکەی کرد. هەڵسوکەوتەکانی بەڕواڵەت بە بێ موبالاتی و لە دەروونیدا بە ستەمکارییەکی دڵڕەقانە خستە ژێر چاوەدێری، رێگەی پێدا وەک هەمیشە لەگەڵ هاوڕێکانی بچێتە گەڕان. یارمەتیی لیباس دەبەرکردنی دا بۆ میوانداری شەممەشەوان و هەرگیز پرسیارێکی بی جێی لێنەکرد، کە مەمە وەشک کەوێ. ئێستا بەڵگەی زۆری بەدەستەوە بوو کە مەمە کاری دیکەش، بێجگە لەوەی دەیلێ دەکا. بەڵام لە بەر چاوەڕوانیی هەلێکی لەبار، ئاماژەیەکی بە گومان لێکردنی خۆی نەکرد. شەوێک مەمە وتی؛ لەگەڵ باوکی دەچێتە سینەما، بەڵام زۆری پێ نەچوو کە فێرناندا لە ماڵی پێترا کۆتیس دەنگی ئاگربازی جێژن و دەنگی لێدانی ئۆکۆردیۆنی ئۆرلیانۆی دووهەمی بیست. ئەو کات لیباسی پۆشی و رۆیشتە سالۆنی سینەما و کچەکەی خۆی لە نێوان کورسییە تاریکەکاندا بینی. لە نێوە ئەو هەستە شێتیهێنەرەی دڵنیابووندا نەیتوانی بزانێ کچەکەی چ کەسێک ماچ دەکا. بەڵام لە نێوان قاقای کەرکەری خەڵکەکە و دەنگی لەرزۆکی ئەوی بەرگوێ کەوت کە دەیگوت: "ئەوینەکەم، بەداخم." بە بێ ئەوەی وشەیەک لەگەڵ مەمە بدوێ. ئەوی لە سینەمایە دەرکێشا. شەرمی رابردن بە شەقامی پڕ هات و هاواری تورکەکانی بەلاوە نا و، سەرەنجام لە ماڵەوە دەرگای ژووری خەوی لە سەر داخست.

سبەینەی ئەو رۆژە، سەعات شەشی پاشنیوەڕۆ، دەنگی پیاوێکی کە بۆ چاوپێکەوتی هاتبوو ناسییەوە. پیاوەکە گەنجێکی رەنگ پەریوەی چاوڕەشی خەمناک بوو، ئەگەر فێرناندا کاولییەکانی بینیبان لە دیتنی چاوەکانی ئەو سەرسام نەدەبوو. کابرای لاو ئەوەندە حاڵەتێکی خەیاڵاوی و شاعیرانەی

هەبوو کە هەموو ژنێک ئەگەر کەمێک دڵی لە فێرناندا نەرمتر با، دەیتوانی تێبگا کچەکەی بۆ ئاشق بووە. کۆت و شەڵوارێکی کەتانی دەبەردا بوو، کە چیی وای بە بەرەوە نەمابوو و کەوشەکانی نموونەی بەرگریی ناهومێدانەی ئەو لە بەرامبەر پەلەی ناچاری سپی هەڵگەڕان بوو. کڵاوێکی حەسیری بەدەستەوە بوو، کە رۆژی شەممەی رابردوو کڕیبووی. لە هەموو تەمەنیدا هیچ کات ئەوەندە نەترسابوو. بەڵام لە سەرەخۆیی ئەوی لە سووکایەتی پێکردن رزگار کرد و حاڵەتی دروست و راستگۆیانەی ئەو. کە تەنیا لە بەر دەستانی کرێکاری و نینۆکی شکاوی کە لە بەر کاری زۆر گەیشتبووە ئەو رۆژەی رەنگی دەگۆڕێ. بە هەر حاڵ بۆ فێرناندا نیگایەک بەس بوو هەتا بزانێ ئەوە میکانیکە. زانی کە تەنیا ئەو کۆت و شەڵوارە باشەی هەبووە، دەبەری کردووە و لە بن کراسییەوە پێستی بەدەنی لەگەڵ زیپکەی نەخۆشیی گرویی شیرکەتی مۆز دیار بوو. فێرناندا مۆڵەتی نەدا قسە بکا، تەنانەت نەیهێشت بچێتە ژوورەوە و دەمێک دواتر ناچار بوو دەرگای لێ دابخا، چونکە ماڵەکەی پڕ ببوو لە پەپوولەی رەنگ زەرد.

پێیگوت: "لێرە بڕۆ، تۆ حەقتنییە پێ بنێیتە ماڵی خەڵکی بەڕێز."

ناوی ماوریسیۆ بابیلۆنیا بوو، لە ماکۆندۆ لەدایک و گەورە ببوو و لە گەراجی شیرکەتی مۆز شاگرد میکانیک بوو.

رۆژێک پاشنیوەڕۆ، کە مەمە لەگەڵ پاتریشیا براون رۆیشتبوونە ئەوێ تا ماشینێک وەربگرن و بچنە گەڕانی مەزرایە، بە هەڵکەوت لەگەڵ ئەو ببوو بە ئاشنا. رانندە نەخۆش بوو، لە ئەنجامدا بڕیار درا ئەو ماشێنەکە لێخوڕێ و مەمەش سەرەنجام توانیبووی لە لای رانندە دابنیشێ و ئاگاداری کارەکانی بێ. بە پێچەوانەی رانندەی هەمیشەییم ماوریسیۆ بابیلۆنیا دەرسی لێخوڕینی کردەیی پێگوت. ئەو مەسەلەیە کاتێک هاتە پێشەوە کە مەمە هاتوچۆی ماڵی ئاغای براونی دەکرد و خانمەکان هێشتا لێوەشاوەیی لێخوڕینیان نەبوو. لەبەر ئەوە، مەمە بە زانیاریی هونەریی لێخوڕین قەناعەتی کرد و هەتا چەند مانگ دواتریش ماوریسیۆ بابیلۆنیای نەبینی. زۆر دواتر وەبیری هاتەوە کە لەو گەڕانی بەماشێنەدا، جوانی جوامێرانەی ئەو هەتا چ رادەیەک سەرنجی راکێشابوو، هەر چەندە دەستە

ئەستوورەکانی بەدڵ نەبوون و تەنانەت دوایی بە پاتریشیا براونیشی وت؛ لە بـاوەڕ بەخۆبـوونی بێشـەرمانەی ئەو نـاڕەحەت بـووە. هەوەڵـین شـەممەیەک کە لەگەڵ بـاوکی ڕۆیشـت بـۆ سـینەما، دیسـان ماوریسـیۆ بابیلۆنیای بینی کۆت و شەڵواری کەتانیی خۆی دەبەر کردووە و چەند ڕیز لەپێش وان دانیشتووە. زانیی کوڕە لە جیاتی ئەوە تەماشـای فیلمەکە بکا، سەری وەرسووڕاندوە هەتا ئەو ببینێ. مەبەستی لەو کارە زۆرتر ئەوە بوو ە دەیویسـت مەمە بزانـێ لە جیـاتی فـیلمەکە تەماشـای ئەو دەکـا. مەمە لە بێشـەرمیی ئەو کـردەوەیە زۆر نـارەحەت بـوو. سـەرەنجام ماوریسـیۆ بابیلۆنیـا لەوان نزیـک بـۆوە هەتـا سـڵاو لە ئۆرلیـانۆی دووهەم بکـا و خـۆ بناسێنێ. ئەو کاتە مەمە تازە بۆی دەرکەوت ئەوان یەکتر دەناسن. کوڕە لە هەوەڵین ئیدارەی کارەبای ئۆرلیانۆ تریستەدا کاری کردبوو و لەگەڵ باوکی بەڕێزەوە هەڵسوکەوتی کرد. ئەو ڕووداوە مەمەی لە چنگ لەخۆبایی بوونی بێ جێ ڕزگار کرد. هیچ کات بە یەکەوە و تەنیا نەمابوونەوە و بێجگە لە سـڵاوی ئاسـایی، وشـەیەکیان ئـاڵوگۆڕ نەکردبوو. شـەوێکیان مەمە خەونـی بینـی ئەو لە کەشـتییەکی خەریـکە نـوقم دەبـێ ڕزگـاری دەکـا، لە جیـاتی ئەمەگناسـی، تـووڕە و نـارەحەت بـوو، چـونکە مەمە پـێچەوانەی ئەوەی دەویست، نەتەنیا لە ماوریسیۆ بابیلۆنیـا، بەڵکو لە هەر پیاوێکی دیکەش کە ئەوی خـۆش بـوێ. بـۆیە کە لەخەودابوو،ئەوەنـدە بێـزار وهەڵچـوو بـوو، سەرشـێتانە ئـارەزووی کـرد بیبینـێ. نیگەرانیی ئەو بە درێژایـی حەفـتە لە زیادبوونـدا بـوو و ڕۆژی شـەممە گەیشـتە ڕادەیەک، کاتێـک ماوریسـیۆ بابیلۆنیـا لە سـینەما سـڵاوی لێکـرد، ناچـار بـوو زۆر بەتونـدی پێشـی خـۆی بگرێ هەتـا ئەو نەزانێ کە دڵـی خەریـکە لە گەرووی دێتە دەرێ. هەروا کە لە هەستێکی نادیار تێکەڵ بە حەز و تووڕەیی، گێژ و وێژ ببوو، بۆ هەوەڵین جـار دەسـتی بـۆ لای ئەو درێـژ کـرد و تەنیـا ئەو کـاتە بـوو کە ماوریسـیۆ بابیلۆنیـا ڕێـگەی بە خـۆی دا دەسـتی بگوشـێ. کەمێـک دواتـر، مەمە لە کـردەوەی خـۆی پەشـیمان بـۆوە، بەڵام دەسـبەجێ کاتێـک زانـی دەسـتی ئەویش ئارەقی کردووە و ساردە، پەژیوانییەکەی بە ڕازی بوونێکی ناچـاری گۆڕا. هەر ئەو شەوە، زانیی هەتا کاتێک پووچیی هەوەسەکەی ماوریسیۆ

بابیلۆنیا نەسەلمێنێ تاوێک ناحەسێتەوە و، تەواوی حەفتە نیگەرانیی زۆرتر دەبوو. دەستی دایە هەموو فرۆفێڵێک، هەتا پاتریشیا براون بۆ وەرگرتنی ماشین، ئەویش لەگەڵ خۆی بەرێتە ئەوێ و، سەرەنجام لە کوڕە مووخورمایییەکەی خەڵکی ئەمریکای باکوور، کە لەو کاتەدا بۆ رابواردنی کاتی پشوودان هاتبووە ماکۆندۆ، کەڵکی وەرگرت و بە بیانووی تەماشای مودێلی تازەی ماشینان، لەگەڵ ئەو رۆیشتنە گەراج. مەمە لەو دەمەوە چاوی پێکەوت، دەستی لە خۆفریودان هەڵگرت و دانی بە راستییەکەدانا. لە لایەکەوە، نەیدەتوانی لە دەست وەسوەسەی تەنیا مانەوە لەگەڵ ماوریسیۆ بابیلۆنیا رابکا و، لە لایەکی دیکەشەوە دڵنیا بوون لەوەی ئەو هەموو شتێک تێگەیشتووە، دەبوو بە هۆی ئەوە هەست بە بچووکبوونەوە بکا.

مەمە وتی: "هاتووین مۆدێلی نوێ تەماشا بکەین."

ئەو وتی: "بەهانەی چاکە."

مەمە هەستی کرد ئەو خەریکە لە ئاوری لە خۆبایی بوونی خۆیدا دەسووتێ و شێتانە بە دوای رێگایەکەوە بوو هەتا سووکایەتیی پێبکا، بەڵام ئەو مۆڵەتی نەدەدا. لەسەرەخۆ پێی وت: "مەترسە، ئەوە هەوەڵین جار نییە ژنێک بە خاتری پیاوێک دەست دەداتە کارێکی شێتانە." مەمە وەها بێ دیفاع بوو، کە بە بێ ئەوەی چاو لەو مودێلە تازانە بکا کە لە کەراجەکەبوون، رۆیشتە دەرەوە. هەموو شەوێ لە جێگادا ئەمدیو و ئەودیوی کرد و لە بەر خۆ بەکەمزانین فرمێسکی رشت. کوڕەی مووخورمایی، کە مەمە لە راستیدا خۆشی نەدەویست، ئێستا لە بەر چاوی ببوو بە منداڵێکی ساوای سەرپشتی لانکە. لەو کاتەدا بوو کە پەپوولە رەنگ زەردەکانی بینی، کە نیشانەی دەرکەوتنی ماوریسیۆ بابیلۆنیا بوون. پێشتریش ئەو پەپوولانەی دیتبوو، بەتایبەتی لەگەراجدا، بەڵام وای زانیبوو کە پەپوولەکان لە بەر بۆنی رەنگان لەوێ کۆبوونەوە. چەند جاریش لە سینەما فڕەی باڵی ئەوانی لە دەوری سەری خۆی بیستبوو. کاتێک کە ماوریسیۆ بابیلۆنیا ئیدی لە فکری نەدەچووە دەرێ و وەک تارمایییەکی لێهاتبوو کە تەنیا ئەو دەیتوانی لە نێو کۆمەڵێکدا ببینێ، ئەو کات تێگەیشت کە پەپوولە زەردەکان بەشێوەیەک پێوەندییان بەوەوە هەیە. ماوریسیۆ بابیلۆنیا هەمیشە لە نێو ئەو کەسانەدا

بوو کە دەچوونە کۆنسێرت و سینەما و نوێژی کڵێسا و، مەمە پێویست نەبوو چاوی بەو بکەوێ هەتا بزانێ ئەو لەوێیە. بە هەر حاڵ پەپوولە رەنگ زەردەکان هەمیشە لەوێ بوون. جارێکیان ئۆرلیانۆی دووهەم ئەوەندە لە دەنگی فرەفرِی ئەو پەپوولانە توورە بوو کە مەمە هەستی کرد بە پێی قەولێکی داویە نهێنیی خۆی بۆ باوکی ئاشکر بکا. بەڵام هەر لەو کاتەدا، زانیی باوکی ئەو جارەیان بە بێگومان وەک پێشوو پێناکەنێ و ناڵێ: "ئەگەر داکت بزانێ چی دەڵێ!" رۆژێک بەیانی فێرناندا خەریکی هەڵپاچینی بنەگوڵە سووران بوو، کە لە نەکاو لە ترسان هاواری کرد و مەمەی لەو شوێنەی لێی راوەستابوو کشاندەوە. ئەوێ، شوێنێک بوو ریمیدیۆسی جوانکیلە لەوێوە رۆیشتبووە ئاسمان. فێرناندا لەپڕ بەبیریدا هاتبوو، ئیمکانە ئەو موجیزەیە جارێکی دیکە بۆ کچەکەی دووپات بێتەوە. چونکە دەنگی باڵەفرەی لەنەکاوی بەرگوێ کەوتبوو، پەپوولەکان بوون. مەمە ئەوانی بینی و دەتگوت لەپڕ لە نێو تیشکدا هاتوونە دونیاوە، دڵی داخورپا. دروست لەو کاتەدا ماوریسیۆ بابیلۆنیا بە بەستەیەکەوە هاتەژوور و دەیگوت دیارییەکە لە لایەن پاتریشیا براون. مەمە سوورهەڵگەرانی دەموچاوی شاردەوە و خەمی خۆی لەبیر بردەوە و تەنیا کاتێک کە تکای لێکرد لە بەر ئەوە دەستی پیسن بەستەکە لە سەر لێوی هەیوانێ دابنێ، توانی زەردەخەنەیەکی سروشتی بکا. تەنیا شتێکی فێرناندا لەو پیاوەیدا بینی رەنگ پەرِیویی پێستی بوو. چەند مانگ دواتر بە بێ ئەوەی بیری بکەوێتەوە ئەوی پێشتریش دیوە، هەر ئەو حاڵەتەی لەودا بینی.

وتی: "پیاوێکی سەیرە، لە رەنگی دەموچاوییەوە دیارە بەو زووانە دەمرێ."

مەمە وای بە بیردا هات دایکی لە پەپوولەکان ترساوە. کاتێک هەڵپاچینی لق و پۆپی بنەگوڵە سوورەکانیان تەواو کرد، دەستەکانی شووشتن و بەستە دیارییەکەی بردەوە ژووری خۆی بیکاتەوە. جۆرە لەیستۆکێکی یاریی دروستکراوی چینی بوو لە پێنج قوتووی یەک لە نێو یەکدا پێکهاتبوو. لە ئاخرین قوتوودا نووسراوێک بەرچاو دەکەوت کە دیار بوو دەستخەتی کەسێکی ناشارەزایە: "شەممە یەکتر لە سینەما ببینین." مەمە لەو ترسانە کە قوتووەکە ماوەیەک لەسەر لێوی هەیوانێ ماوەتەوە، نەوەک سەرنج و

نیگای فێرناندای راکێشابێ، زۆر پەرێشان بوو، ئەگەرچی لە نەترسی و ساویلکەیی ماوریسیۆ بابیلۆنیا هەستی بەخۆشحاڵی دەکرد، بەڵام زگی بە ساکاریی ئەو سووتا، کە هیوادار بوو بۆی بچێتە جێژوانێ. مەمە دەیزانی شەممەشەو ئۆرلیانۆی دووهەم کاری هەیە. بەو حاڵەش ئاوری نیگەرانی بەدرێژایی حەفتە ئەوەندەی سەرەونێو کرد، کە کاتێک رۆژی شەممە هات، باوکی رازی کرد رێگەی بدا ئەو بەتەنیایی بچێتە سینەما و دوای تەواوبوونی فیلمەکە بێ بە دوایدا. هەتا کاتێک چراکانی ساڵۆنی سینەمایە دایسان پەپوولە لە دەوری سەری فڕەفڕیان بوو و، ئەمجار کە چراکان کوژانەوە، ماوریسیۆ بابیلۆنیا هات و لە لایەوە دانیشت. مەمە هەستی کرد وردە وردە بە زۆنگاوی بێ قەراریدا دەچێتە خواری. زۆنگاوێک وەک ئەوەی لە خەودا بینیبووی، تەنیا ئەو، ئەو پیاوەی بۆنی رۆنی ماتۆڕی لێدەهات و لە تاریکیدا بەزەحمەت دەیتوانی ببینێ، دەتوانێ لە نوقم بوون لەودا رزگاری بکا.

ئەو وتی: "ئەگەر نەهاتبای، ئیدی هەرگیز منت نەدەدیتەوە."

مەمە قورسایی دەستی وی لە سەر رانی هەستپێکرد و زانی کە هەردووکیان خەریکە دەگەنە قوڵایی بێ قەراری."

بزەی هاتێ و گوتی: "ئەوەی کە لە تۆ نارەحەتم ئەوەیە، هەمیشە ئەوەی کە دەبێ نەیڵێی دەیڵێی: "شێتانە ئاشقی ئەو بوو. خەو و خواردنی لەبیر چۆوە، وەها لە تەنیاییدا رۆچووبوو، تەنانەت حەوسەڵەی باوکیشی نەمابوو. لە وادەی چاوپێکەوتنی بەدرۆ ئەوەندە رایەڵ و پۆی دەسەریەک کردەوە هەتا رێگەی خۆی لە فێرناندایش ون کرد. دەستی لە بینینی هاورێیان شووشت و وازی لە چوونە سەما هێنا، هەتا بتوانێ لە هەر جێگایەک لەگەڵ ماوریسیۆ بابیلۆنیا بێ. لە بەراییدا رووقایمیی ماوریسیۆ کەمێک نارەحەتی دەکرد. کەرەتی هەوەڵ کە لە کۆنەمەزرای پشتی گەراج تەنیا بەیەکەوە مانەوە، بەوپەڕی دڵڕەقییەوە ئەوی کێشایە حاڵەتێکی ئەوتۆی حەیوانی، کە بە ماندوو و مردووی لە بنی هاتەدەرێ. ماوەیەکی پێچوو هەتا تێگەیشت کە ئەو حاڵەتەش جۆرێک خۆشەویستی و جوانییە. ئەودەم ئاسوودەیی خۆی بەتەواوی لەدەستدا و، تەنیا بۆ ئەو ژیا و ویستی لە بۆنی رۆنی گریسی

لەشی ئەودا، کە بە سابوون شۆرابۆوە، نوقم بێ. ماوەیەکی کورت پێش مردنی ئامارانتا، لە نێو ئەو شێتییە لەنەکاوە، لە دەمی وشیاریدا، لە دوارۆژێکی بێ دڵنیابوون لەرزی هاتێ، دوایی بیستی ژنێک هەیە، بە فاڵی وەرەق داهاتوو پێشبینی دەکا و بە دزییەوە بۆ چاوپێکەوتنی رۆیشت. پیلار تێرنێرا بوو. پیلار هەر کە چاوی پێکەوت هۆی هاتنی بۆ ئەوێ تێگەیشت و پێی وت: "دانیشە، من بۆ پێشبینیی ژیانی بنەماڵەی بوێندیا پێویستم بە وەرەق نییە." مەمە نەیدەزانی و قەتیش نەیزانی کە ئەو جادووگەرە سەد ساڵەیە نەنکی خۆیەتی، هەروەک ئیمکان نەبوو باوەڕ بکا ئەو بە چ راستگۆییەکی بێرەحمانە پێی بڵێ دڵەخورپەی ئەوین تەنیا لە تەختی خەوتندا دەنیشتێوە و بەس. ماوریسیۆ بابیلۆنیاش هەر ئەو فەلسەفەی هەبوو. بەڵام مەمە ئامادە نەبوو بۆچوونی ئەو قبووڵ بکا و لای وابوو باوەڕێکی نەفامانەی کابرایەکی میکانیکە. ئەو کات بەبیریدا هات کە ئەوینی لایەک ئەوینی لایەکەی دیکە دەبەزێنێ، چونکە سروشتی پیاوان ئەمەیە هەر کات ئیشتیایان بە سەرچوو حاشا لە برسیایەتی دەکەن. پیلار تێرنێرا نەتەنیا ئەوی لە هەڵە دەرهێنا، بەڵکو پێشنیاری کرد تەختی خەوتنی خۆی پێ بدا، تەختێک کە ئارکادیۆ، باپیری مەمە و دواییش ئۆرلیانۆ خۆزێی لە خۆی رازی کردووە، تەنانەت فێری کرد چۆن بە دووکەڵی ماجوومی کاڵەکە مارانە پێشی ئاوس بوون بگرێ و ناوی چەند شەربەتیشی دایە کە ئەگەر هات و بێ موبالاتیی کرد تەنانەت "پەیامی ویژدانیش"ی لە نێو دەبرد. دیارە ئەو ورەیەکی دا بە مەمە، کە لە شەوی ئارەق خواردنەوەدا هەستی پێکردبوو. بەو حاڵەش مەرگی ئامارانتا بڕیاری مەمەی بەدوا خست. لە نۆ رۆژی پرسەدا، تەنانەت یەک ئانیش لە ماوریسیۆ بابیلۆنیا، کە لەگەڵ خەڵک هاتبووە ماڵێ، جیا نەبۆوە. ئەو رۆژانە پڕ بوو لە ئاڵۆزیی دەروونی و نیگەرانیی مرۆکوژ و پێویستیی بەپەلە، بەجۆرێک هەوەڵین شەوی کە مەمە توانی لە ماڵەوە بچێتەدەرێ، یەک راست رۆیشت بۆ ماڵی پیلار تێرنێرا و، بە بێ هیچ بەرگرییەک، بە بێشەرم، بە بێتەشریفات، بە ئامادەییەکی سروشتی و بڕیارێکی ئاقڵانەوە خۆی دایە دەستی ماوریسیۆ بابیلۆنیا. ئەگەر پیاوێکی دیکە لە جێگای ئەو بایە، بێگومان ئەو هەڵسوکەوتەی ئەوی

لەگەڵ ئەزمـــوونێکی ئاشــکرا لێدەگــۆڕا. لە پەنــا هاودەســتیی پاکـــانەی ئۆرلیـانۆی دووهەم، کە بە بـێ بچـووکترین گومـانی خــراپ، بـاوەڕی بە بیانووهێنانەوەکـانی کــچەکەی دەکــرد هەتــا لە چنــگ ســـەرەڕۆیی دایکــی رزگـاری بکـا، مـاوەی سێ مانگان، حەفتەی دووجـار، خەریکی ئەویـنداری بوون.

ئەو شەوەی کە فێرناندا ئەوانی لە سینەما خافڵگیر کرد. ئۆرلیانۆی دووهەم بە ویژدانـی راحەتەوە چـوو بـۆ ئەو ژووره خەوەی کە فێرنانـدا مەمەی لـێ حەبس کردبوو. دڵنیا بـوو کە کچەکەی ئەو نهێنییـانەی پێی قەرزدارە، بـۆی ئاشکرا دەکا. بەڵام مەمە حاشای لە هەموو شتێک کرد. وەها لە خـۆی دڵنیـا بـوو و لە تەنیـایی خۆیـدا لەنـگەری گرتبوو، کە ئۆرلیـانۆی دووهەم گەیشـتە ئەو ئەنجـامەی رایەڵێـک ئەوان بەیەکەوە گـرێ نـادا و هـاوڕێیی و هـاودڵی، بـێجگە لە بیرێکـی پـووچ لە رابـردوو، شـتێکی دیـکە نییە. بەو بیـرەوە کە ئاغـایەتی کـۆن، لە قســەکردن لەگەڵ ماوریســیۆ بابیلۆنیـا قـازانجی دەبـێ، بڕیـاری دا بچێـتە لای، بەڵام پیتــرا کـۆتیس رازیـی کـرد کە ئەو کـارانە بە ئەستۆی ژنانە. بەو بۆنەوە لە دوو رێیانی سەرگەردانیدا مایەوە. تەنیا دڵنیا بوو کە سەرەنجامی تەنیایی، گیروگرفتی کچەکەی چارەسەر بکا.

مەمە نیشـانەیەکی لە خەم و پەژارەی خـۆی نەنوانـد. بە پێچەوانە، ئۆرسـۆلا لە ژووری تەنیشتی دەنگی هەناسەی ئارامی خەوی ئەوی دەبیست و ئاگای لە هەڵسوکەوتی ئارام و نەزمی نان خواردن و سڵامەتیی ئەو هەبوو. تەنیـا شـتێکی کە پـاش مانگێـک و چەنـدڕۆژ لە سـزای ئەو رادەبـرد، بـوو بە هـۆی سەرسـووڕمانی ئۆرســۆلا، ئەوە بـوو کە مەمە بە پـێچەوانەی ئەنـدامەکانی دیـکەی بنەمـاڵە، بەیانیـان حەمـام ناکـا و ســەعاتی حەوتــی شــەو دەچێـتە حەمـام. چەنـد جـار ویسـتی ئەو لە دووپشـکان بترسـێنێ، بەڵام مەمە، بەو بیرەوە کە ئەو جاسووسی لە سەر کردووە، وەهای لـێ دوور کەوتبۆوە کە ئۆرسۆلا بڕیاری دا بە دەستتێوەردانی نەنکانەی خۆی نەبێتە هۆی ئـازاری. مـاڵ لای ئێـواران پـڕ دەبـوو لە پەپـوولەی زەرد. هەرکـات شـەوانە مەمە لە حەمــام دەگەڕایەوە، فێرنانــدای دەدیــت کە بەمێشکــوژە، وەک شــێتان پەپوولان دەکوژێ و دەڵـێ: "بەدەبەختییەکی چەنـد گەورە، تەواوی تەمەنـم

پێیان وتووم پەپوولە شوومن." شەوێکیان، کاتێک مەمە لە حەمامدا بوو، فێرناندا بەهەڵکەوت رۆیشتە ژوورەکەی ئەو، ئەوەندە پەپوولە کۆ ببوونەوە، هەناسە هەڵنەدەکێشرا. فێرناندا پارچەیەکی دەست دایە ئەوانە دەر بکا و، بە دیتنی ماجوومی کاڵەکەمارانە، کە لەسەر مێزەکە خلۆر بوونەوە، کە بیری لە پەیوەندیی ئەو دەرمانە و حەمامی شەوانەی کچەکەی کردەوە ، لە ترسان سارد بوو. بە پێچەوانەی کەرەتی یەکەم ، لە چاوەڕوانیی هەلی لەبار نەوەستا. رۆژی دوواتر، شارەوانی بۆ نانی نیوەڕۆ بانگێشت کرد، شارەوانی نوێش وەکو خۆی خەڵکی باکوور بوو. داوای لەوکرد هەتا لە پشت ماڵەوەیان پاسەوانی شەوانە دابنێن. چونکە وایدەزانی کە شەوان مریشکی لێ دەدزن. ئەو شەوە، ماوریسیۆ بابیلۆنیا خەریک بوو کاشەییەکانی لە سەر میچی حەمام لادەبرد، هەتا بچێتە ئەو جێگایە کە مەمە وەک هەموو شەوانی مانگی رابردوو رووت و لەرزان لە نێو پەپوولە و دووپشکاندا چاوەڕوانی بوو، کە پاسەوانەکە تەقەی لێکرد. گوللە وەمۆرەی پشتی کەوت و هەتا کۆتایی ژیان لەپێی خست. لە پیری و تەنیاییدا بە بێ رەخنە و ناڵاندن و، بە بێ ئانێکی پەشیمانی و، لەگەڵ ئازاری بیرەوەرییەکان و پەپوولە زەردەکانەوە، کە دەمێک وچانیان پێ نەدەدا، مرد. دەرکراوی هەموو لایەک بوو، وەک مامردزان.

رووداوێک، کە دوایین زەبری لە ماکۆندۆدا، کاتێک دەستی پێکرد کە کوڕی مەمە بویندیایان هێنایەوە ماڵەوە. لەو کاتەدا وەزعی گشتی ئەوەندە سست و ناسەقامگیربوو بوو، کە کەس حەوسەڵەی نەبوو قسە لە ریسوایی تایبەتی خەڵک بکا. هەر بۆیە فێرناندا دەرفەتی بەهەل زانی و منداڵەکەی وەها لە بەرچاوان شاردەوە کە هەروەک نەبوووبێ وابوو. ناچار بوو قبووڵی بکا، چونکە لە وەزعێکدا بۆیان هێنا ئیمکانی وەرنەگرتن و گەڕاندنەوەی نەبوو. پێچەوانەی ویستی خۆی، ناچار بوو هەتا کۆتایی ژیان لەگەڵی هەڵبکا. چونکە کاتێک لەگەڵ راستیی بوونی ئەو بەرەوڕوو بوو، ورەی ئەوەی لە خۆیدا نەدی منداڵەکە لە گۆمیلکەی حەمامدا بخنکێنێ. ئەوی لە کارگای قەدیمی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا دانا و دەرگای لە سەر قفڵ کرد. سانتا سۆفیا دێلا پێدادی رازی کرد بڵێ مناڵەکەی لە قەرتاڵەیەکدا لە

سەر ئاوی رووباریَ گرتۆتەوە. ئۆرسۆلا هەتا مرد بنە و بنەچەکەی مناڵەکەی بۆ روون نەبۆوە. ئامارانتا ئۆرسۆلای بچکۆڵەش، کە جارێکیان. کاتێک فێرناندا خواردنی دەدا بە مناڵەکە چووبووە ژووری کارگەکە و داستانی سەوەتەی سەرئاوی باوەڕ کردبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم لە بەر دژکردەوەی نادروستی ژنەکەی سەبارەت بە وەزعی بەپەرۆشی مەمە. سەرەنجام بەتەواوی لێی جیابۆوە و هەتا سێ ساڵ دوای هێنانی مناڵەکە بۆ ماڵەوە، هەتا ئەو رۆژەی مناڵەکە، لە خافڵبوونی فێرناندا کەڵکی وەرگرت و لە زیندان هەڵات و بۆ دەمێک لە سەر دیواری هەیوان دەرکەوت، لە بوونی مناڵەکە ئاگادار نەبوو. مووەکانی تێکەڵوپێکەڵ و سەرتاپا رووت و سیرەتی وەک دندووکی قەلەموونە بوو، دەتوت ئینسانی ئەورۆپیی نییە و وێنەیەکە لە مرۆڤی سەرەتایی، لە فەرهەنگی لۆغەتدا.

فێرناندا حیسابی بۆ دەستەویەخەبوونی چارەنووس نەکردبوو. مناڵەکە شوورەییەکی دەسەلماند، کە ئەو وایدەزانی بۆ هەتاهەتا لە ماڵیَ خۆی وەدەرناوە. هەر کە ماوریسیۆ بابیلۆنیایان بە مۆرەی پشتی شکاوەوە لەویَ بردەدەریَ، فێرناندا لە بیری خۆیدا نەخشەیەکی گەڵاڵە کرد، هەموو شوێنەواری ئەو پەڵە شوورەییەی لە نێو بەریَ. بەیانیی ئەو رۆژە، بە بێ قسەکردن لەگەڵ مێردەکەی، باولی خۆی داخست.

لە باولێکی چکۆڵەدا سێ دەست لیباسی دانا کە ئیمکان بوو کچەکەی پێویستی پێیان بێ و، نیو سەعات پێش هاتنی قەتار رۆیشتە ژوورەکەی ئەو و وتی: "ریناتا وەرە با برۆین."

لە سەری نەرۆیشت.مەمەش نە چاوەڕوانی روونکردنەوە بوو و نە روونکردنەوەشی دەویست. نەیدەزانی دەچنە کویَ، چونکە ئەگەر بۆ کوشتارگاشیان بردبا، بۆ وی وەک یەک بوو. لەو کاتەوە دەنگی تەقاندنی گولله و هاواری دڵتەزێنی ماوریسیۆ بابیلۆنیای لەولای حەوشەوە بیستبوو، ئیدی قسەی نەکردبوو و هەتا کۆتایی ژیانیش قسەی نەکرد. کاتێک دایکی فەرمانی پێدا لە ژووری خەو دەرکەویَ، نە سەری شانە کرد و نە دەموچاوی شووشت. کاتێک سواری قەتار بوو، هەر وەک لە خەودا بە رێگادا بڕوا. تەنانەت پەپوولە زەردەکانیشی نەدیت کە بۆ بەرێکردنی

هاتبوون. فێرناندا، قەت نەیزانی و زەحمەتێکیشی بە خۆی نەدا بزانێ، ئەرێ ئەو بێدەنگییە بەردئاسایە لە ئەنجامی ئیرادەی بەهێزی کچەکەیەتی، یان لە بەر شوێنەواری زەبری ئەو رووداوە لاڵ بووە. مەمە زۆر گوێی نەدایە سەفەرەکەی خۆی بە نێو ناوچەی جادووییدا. مەزرا پڕ سێبەر و لەپسان نەهاتووەکانی مۆزی نەدیتن، ماڵی سپی رەنگی بێگانەکانی نەدی. باخە بە تۆز و خۆڵ و گەرما سووتاوەکانی نەدیتن، هەروەک ئەو ژنانەشی نەدی کە کراسی شینی رێ‌ڕێ و شەلواری کورتیان دەبەردا بوو و لە هەیوانی ماڵەکانیان گەمەی وەرەقیان دەکرد. عەرەبانە کەڵەکانی بە باری مۆزەوە کە بە جادەی خاکیدا دەڕۆیشتن، نەدی. ئەو کچانەشی نەدی کە وەک ماسی لە ئاوی روونی رووباردا هەڵدەبەزین و داخی ئەو مەمکە جوانانەیان لە سەر دڵی هاتووچۆکەران دادەنا. کۆخی گچکە و رەنگاوڕەنگی کرێکارانی نەدی، ئەو کۆخانەی کە لە پێش دەرگاکانیان مناڵانی شینهەڵگەڕاو لە پیساییدا، لە سەر لەگەن هەڵترووشکاو و، ژنانی زگ پڕ، کە جنێویان بە قەتار دەدا، ئەو دیمەنە رەوەک و خێرایانەی کە کاتێک لە قوتابخانە دەگەڕاوە ماڵێ، هێندە خۆشحاڵیان دەکرد، ئێستا بە بێ لەرزین بە سەر دڵیدا دەڕۆیشتن. لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەی نەکرد. تەنانەت ئەو کاتەش کە نمی ئاورینگی مەزراکان تەواو بوو و قەتار لە نێوان دەشتی شلێران، کە پاشماوەی بوونە رەژووی کەشتی چارۆکەداری ئیسپانیۆلییەکان هێشتا لەوێ دەبیندرا ، تێپەڕی و رێگای خۆی بۆ لای ئەو دەریا پیس و کەفاوییەی درێژە دا، کە نزیکەی سەد ساڵ لەمەوپێش، هیوای خۆزێ ئارکادیۆ بویندیای پووچەڵ کردەوە.

سەعاتی پێنجی دوای نیوەڕۆ، کاتێک گەیشتنە ئاخرین ئیزگەی ناوچەی زۆنگاوێ، مەمە تەنیا بەو خەیاڵەی فێرناندا هاتۆتەخوارێ، دابەزی. سواری دروشکەیەکی وەک چەکچەکیلەی گەورەبوون، کە ئەسپێک بە هەناسەهەڵکێشان رایدەکێشا، بە نێو شارێکی خەمناکدا رۆیشتن، کە خوێ شەقامەکانی شوشتبۆوە، دەنگی راهێنانی پیاونۆیەک دەبیسرا، دروست وەک ئەو راهێنانانەی پیانۆ، کە فێرناندا لە سەعاتەکانی دوای نیوەڕۆی دەورانی بلووغی خۆیدا بیستبووی. سواری کەشتییەکی لاوەکی بوون، کە

چەرخە دارەکەی دەنگـــی ســـووتانی لێـــدەهات و وەرەقە ئاســـنە ژەنگلێـدراوەکانی وەک دەرگـای ئـاگردان دەلەرزیـنەوە. مەمە دەرگـای کابینەی لە سەر خۆی داخست و فێرناندا رۆژی دوو جار دەوریی خواردنی لە تەنیشت تەختەکەی دادەنا و رۆژێ دوو جار دەوریی دەست لێنەدراوی خواردنەکەی دەبردەوە دەرێ. مەمە لێنەبڕابوو، خۆی لە برسان بکوژێ، بە بۆنی خواردنەکە دڵی تێکەڵ دەبوو و گەدەی تەنانەت ئاویشی هەڵنەدەگرت. نەیـدەزانی کە ئـاوس بـوون بە سـەر ماجوومەکـانی کـاڵەکە مـارانەدا سـەرکەوتووە. هەروا کە فێرنانـداش هەتـا سـاڵێک دوایـی، کە منداڵەکەیـان هێنایەوە ماڵەوە، نەیزانیبوو. لەو کابینە خنکێنەرەدا، کە هەواکەی بە دەنگ و لەرزینەوەی دیوارە ئاسنەکان و بۆگەنیوێکی چەرخی داری کەشتییەکە بە هۆی لێکدانی قوڕ و پیسایی پێکی هێنابوو و خنکێنەرتر ببوو، مەمە حیسابی رۆژەکـانی لە دەسـت دەرچـوو.ئەو کـاتی ئـاخرین پەپـوولەی زەرد لە نێـو سـووڕانی لێوارەکـانی ئاسنی پانکەکەدا کوژرا، زۆر رابردبوو و مەمە لێی سـوور بـوو کە ماوریسـیۆ بابیلۆنیـا مـردووە. بەو حـاڵەش نەیهێشـت ناهومێـدی بە سـەریدا زاڵ بـێ. کاتێـک بە سـواری هێسـتر، بەو دەشـتە خەیـاڵاوییەدا دەڕۆیشـتن، کە ئۆرلیـانۆی دووهەم بـۆ دۆزینـەوەی جـوانترین ژنـی جیهـان تێیـدا ون ببـوو و، ئەو کـاتەی کە بە جـادەی سووڕپێسـتەکاندا رابردن و گەیشتنە ئەو شارە خەمهێنەرەی دەنگی سی و دوو زەنگی مسـی پرسەی، لە کۆڵانە بەردڕێژ و پێچەڵاوپێچەکانی هاڵابوو، ئەو هەر بیری لە ماوریسـیۆ بابیلۆنیـا دەکـردەوە. ئەو شـەوەیان لە کۆشـکی چـۆڵکراوی ئەربابیدا گوزەراند. لە سـەر ئەو تەختەدارانە، کە فێرنانـدا لە سـاڵۆنی پڕ لە گیـاکەڵە داینـابوون خەوتـن. پێخەفیـان پەردەی پەنجەرەکـان بـوون، بە هەر کەلەکەگۆڕینێک پەردەکان دەدران. مەمە زانیی لە کوێن، چونکە لە گەرمەی ترسـی بێخەویـدا، ئاغایەکی بینی جلی رەشـی دەبەردا بـوو و هەمـان کەس بـوو کە لە شـەوی یەکێـک لە کریسمەسـەکانی دوور لە نێـو سـندووقێکی مسیدا بۆ ماڵی ئەوان هاتبوو. بۆ بەیانی، دوای رێورەسمی نوێژ لە کڵێسـا، فێرنانـدا ئەوی بەرەو خـانوویەکی رەش هەڵگەڕاو رێنـوێنی کـرد و مەمە بە وەبیرهێنـانەوەی داسـتانەکانی دایکـی لە حوجرەیەکـدا، کە ئەویـان بـۆ

بوونەشاژن پەروەردە کردبوو، دەست بەجێ ئەو شوێنەی ناسی و زانیی کە گەیشتوونە کۆتایی سەفەرەکەیان. هەروا، کە فێرناندا لە ژوورێکی تەنیشتەوە لەگەڵ کەسێک قسەی دەکرد، مەمە لە ساڵۆنێکی دیوارەکانی بە وێنەی کەشیشان خاڵ خاڵ ببوو، مایەوە و لە سەرمان هەڵلەرزی. هێشتا کراسێکی ناسکی کەتانی گوڵڕەشی لە بەردا بوو و، کەوشەکانی بە سەرمای دەشتەکانی باکوور هەڵمسابوون. بەپێوە لە نێوەڕاستی ساڵۆنەکە راوەستابوو، تەماشای ئەو تیشکە رەنگ زەردەی دەکرد کە لە پەنجەرە رەنگاورەنگەکانەوە دەهاتەژوورێ و بیری لە ماوریسیۆ بابیلۆنیا دەکردەوە، کە راهیبەیەکی جوان لە نووسینگەوە هاتە ژوورێ، باوڵەکەی ئەوی بەدەستەوە بوو، کە سێ دەست لیباسەکەی تێدابوو و، هەروا کە بەویدا رادەبرد بە بێ ئەوەی راوەستێ، دەستی مەمەی گرت.

پێی گوت؛ "ریناتا وەرە با بڕۆین."

مەمە دەستی گرت و بە گوێڕایەڵی بە دوایدا رۆیشت. ئاخرین جار کە فێرناندا ئەوی بینی کاتێک بوو خەریک بوو هەنگاوەکانی لەگەڵ هەنگاوی راهیبە رێک دەخست و دەرگای ئاسنی پەیژەداری بە دوادا داخرا. مەمە هەروا بیری لە ماوریسیۆ بابیلۆنیا دەکردەوە، لە بۆنی رۆن ماتۆرەکەی و، خەرمانەی پوپوولە زەردەکانی دەوری سەری. بە بێ ئەوەی هەتا کۆتایی ژیانی وشەیەکی بە سەر زماندا بێ، هەتا زەمانێک، کە لە سیحری رۆژێک لە رۆژەکانی پاییزی دوورەدەستی پیر، بە سەری تاشراو و ناوی گۆڕا و لە نەخۆشخانەیەکی خەمهێنەری شاری کراکوویا[1] مرد ، هەموو رۆژێ بیری لەو کردبۆوە.

فێرناندا بە قەتارێک، کە گاردی پۆلیس پارێزگاریی لێدەکرد، گەڕایەوە ماکۆندۆ. لە ماوەی سەفەرەکەدا بە بێ قەراریی موسافیرەکانی نەزانی. ئامادەباشیی سەربازان لە شارەکانی نێوان رێگادا وای پێشان دەدا بەزوویی رووداوێکی سامناک دەقەومێ. بەڵام فێرناندا هەتا نەگەیشتەوە ماکۆندۆ، هەواڵێکی لەو بارەوە نەزانی. بە گەیشتنەوە شار بۆیان باس کرد؛ خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم کرێکارانی کۆمپانیای مۆزی هاندەدا دەست لە

---

[1]- Cracovia

کار بکێشنەوە. فێرناندا بە بیریدا هات: "هەر ئەمەمان کەم بوو، خراپکارێک لە نێو کۆی بنەماڵەدا!"
مانگرتن دوو حەوتوو دواتر دەستی پێکرد، بەڵام ئەو ئەنجامە خراپەی کە دەترسان بەدوایەوە بێ، بەدی نەهات. ویستی کرێکاران ئەوە بوو ناچار نەکرێن رۆژی یەکشەممان مۆزی لێ کەنەوە و بەستەبەندی بکەن. ئەو ویستە عادڵانە بوو، کە تەنانەت باوکی رووحانی ئانتۆنیۆ ئیزابێلیش حەقی دا بە کرێکارەکان، چونکە ئەوی لەگەڵ یاساکانی خواوەندی مەزن بەرێک دەزانی. ئەو سەرکەوتنە و کردەوەکانی دیکە کە لە مانگەکانی دواییدا دەستیان پێکرد، خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی بێ کەڵکی لە نەناسراوی هێنادەرێ. ئەو زەمانی هەموو لە سەر ئەو باوەڕە بوون، تەنیا کەڵکی ئەوە بووە شاری پڕ لە فاحیشەی فەڕەنسی کردووە. هەر بەو بڕیارە لەنەکاوەی، کە کەڵەشێرە شەڕکەرەکانی هەراج کردبوو، هەتا کەشتیرانی لە چەمدا دامەزرێنی، لە دەمڕاستیی خۆی لە کۆمپانیای مۆز دەستی کێشایەوە و لایەنگریی لە کرێکاران کرد. بەڵام زۆری پێ نەچوو، تاوانی پیلانگێڕیی نێوەنەتەوەیی دژی نەزمی گشتییان بۆ هەڵبەستا. شەوێک لەو حەفتەیەی وەزع بە دەنگۆی سەیر و جۆراوجۆر رەش هەڵگەڕابوو، ئەو لە کاتی دەرکەوتن لە دانیشتنێکی نهێنیدا، بە شێوەیەکی موجیزەئاسا لە چوار گوللە کە نەناسراوێک پێوەی نابوو، گیانی رزگار کرد. لە مانگەکانی دواییدا وەزعەکە وای لێهات کە تەنانەت ئۆرسۆلاش لە گۆشەی تاریکاییەوە، لە ئاڵۆزییەکە گەیشت و وای بە مێشکدا هات کە دیسان گەڕاونەوە ئەو زەمانە پڕمەترسییەی کوڕەکەی، ئۆرلیانۆ، لە گیرفانیدا "چاشن"ی تەقینەوەی دەبردە ئێرە و ئەوێ. هەوڵی دا لەگەڵ خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم قسە بکا و، لە رابردووی ئاگادار کاتەوە، بەڵام ئۆرلیانۆی دووهەم دەیگوت لە شەوی هەوڵی کوشتنەکەیڕا هیچ کەس بە شوێن وپەناگەی ئەو نازانێ.
ئۆرسۆلا وتی: "دروست وەک ئۆرلیانۆ، دەڵێی مێژوو دووپات دەبێتەوە."
فێرناندا لە وەزعی ئاڵۆزی ئەو رۆژانە لە ئەماندا بوو. بە دوای ئەوەیدا کە لەگەڵ مێردەکەی، لە سەر ئەوە بە بێ پرسی ئەو لە سەر چارەنووسی مەمەی بڕیاری داوە، شەڕێکی تەواویان کرد، پێوەندیی خۆی لەگەڵ دنیای

دەرەوە پساند. ئۆرلیانۆی دووهەم خۆی ئامادە کردبوو بە یارمەتیی پۆلیس بەرگری لە مافی کچەکەی بکا. بەڵام فێرناندا هێندێک نووسراوەی پێشاندا کە دەیسەلماند کچەکەیان بە مەیل و ئیرادەی خۆی رۆیشتووەتە حوجرە. لە راستیدا،کاتێک دەرگای ئاسنی حوجرەی لە پشتەوە لێ داخرا، هەر بەو بێ تەفاوەتییە کە توانیبووی کچەکەی بۆ ئەوێ راکێشێ، خۆی ئەو پەڕانەی مۆر کردبوو. بەڵام ئۆرلیانۆی دووهەم راستیی ئەو بەڵگانەی زۆر قبووڵ نەکرد. هەروا کە هەرگیز باوەڕی نەکرد ماوریسیۆ بابیلۆنیا بۆ مریشک دزین رۆیشتبووە حەوشە. بەو حاڵەش هەر دوو بابەتە بۆ بەرژەوەندیی ئەو کەڵکیان ئەوە بوو کە ویژدانی راحەت بوو و، توانی بە بێ هیچ جۆرە پەشیمانییەک بگەڕێتەوە ژێر سێبەری پێترا کۆتیس. جێگایەک کە دیسان میوانداریيە پڕ هەراوهوریاکانی و تامەزرۆیی و ئیشتیا لە بنەهاتووەکانی دەست پێکردەوە. فێرناندا، کە ئاگای لە وەزعی ئاڵۆز و گۆڕاوی شار نەبوو و، گوێی نەدەدایە پێشبینییە خراپەکانی ئۆرسولا، دواقۆناخی نەخشەی خۆشی بەجێگەیاند. نامەیەکی تێر و تەسەلی بۆ کوڕەکەی، خۆزێ ئارکادیۆ، نووسی، کە بەو زووانە رێورەسمی بوونە کەشیشیی پیادەدەکرد و ئاگاداری کردەوە ریناتای خوشکی ، دوای رەشەڕشانەوە مردووە. ئەو جار پەروەردەکردنی ئامارانتا ئۆرسۆلای بە سانتا سۆفیا دێلا پێداد سپارد و، خۆی دیسان دەستی کردەوە بە نامەگۆڕینەوە لەگەڵ پزیشکانی نادیار، کە بە هۆی کارەساتی مەمە نیوەکارە مابۆوە. لە پێش هەموو شتێکدا وەختێ نەشتەرگەرییەکەی دیاری کرد، کە وەدرەنگی کەوتبوو، بەڵام پزیشکانی نادیار وەڵامیان دایەوە، هەتا کاتێک وەزعی ماکۆندۆ ئاڵۆزە، باشترە ئەو چاوپۆشی لەو نەشتەرگەرییە بکا. بەڵام فێرناندا، کە زۆر بێ تاقەت و ئاگای لە وەزع برابوو، لە نووسراوێکی دیکەدا بۆی شیکردنەوە وەزعەکە بە هیچ شێوەیەک ئاڵۆز نییە و هەموو شتێک تەنیا پێوەندیی بە سەرشێتییەکانی شوبراکەیەوە هەیە، کە لەو زەمانەدا لە یەکیەتی کرێکاراندا خەریکی تێکۆشان بوو. دروست وەک ئەو دەورانەی کە هەوەسی کەڵەشێری شەڕکەر و دانانی هێڵی کەشتیرانی لە رووباردا سەرگەرمی کردبوو. هەتا چوارشەممەیەکی زۆر گەرم، کە راهیبەیەکی پیر سەبەتێک

بەدەستەوە لە دەرگای دا، فێرناندا هێشتا نەیتوانیبوو لەگەڵ پزیشکانی نادیار بگەنە یەک.

کاتێک سانتا سۆفیا دیلا پیداد دەرگای لە راهیبەکە کردەوە، بەو خەیاڵە دیاریی هێناوە، ویستی سەبەتەکەی، کە تۆڕێکی جوانی بە سەردا درابوو، بەزۆری لە دەست دەربێنێ، بەڵام راهیبە نەیهێشت، چونکە فەرمانی پێدرابوو سەبەتەکە بە نهێنی و بە دەستی خۆی بدا بە سەرکار خانم فێرناندا کارپیۆ بویندیا_مندالی مەمە بوو. بەڕێوەبەری رووحانی حوجرەی پێشووی فێرناندا لە نامەکەیدا روونی کردبۆوە، کە منالەکە دوو مانگ بەر لە ئێستا هاتۆتە دونیاوە و ئەوان رێگەیان بە خۆیان داوە هەتا وەک، باپیری ناوی ئۆرلیانۆی لە سەر دابنێن. چونکە دایکی منالەکە دەمی نەکردەوە، رای خۆی دەرببڕێ. خوێنی فێرناندا لەو گاڵتەجارییەی چارەنووس بەتوندی هاتە جۆش. بەڵام لانیکەم لە بەرچاوی راهیبە خۆی راگرت.

بزەی هاتێ و وتی: "دەڵێین کە منالەکەمان لە نێو قەرتاڵەیەکدا لە رووبار گرتۆتەوە."

راهیبە وتی: "هیچ کەس باوەڕ ناکا."

فێرناندا وەڵامی دایەوە: "خەڵکی باوەڕیان بە ریوایەتی ئینجیل کرد، کەوابوو هۆیەک نییە قسەی من قبوول نەکەن."

راهیبە بە چاوەڕوانی قەتاری گەڕانەوە، نانی نیوەڕۆی لە ماڵی ئەوان خوارد. وەک لە خۆپارێزیی ئەو چاوەڕوان دەکرا، ئاماژەیەکی بۆ منالەکە نەکرد، بەڵام فێرناندا، کە ئەوی بە شاهیدی بێ ئابڕوویی خۆی دەزانی، ناڕەزایی دەربڕی کە بۆچی وەک دابی سەدەکانی نێوەڕاست قاسیدی ناخۆش خەبەر لە دار نادەن. هەر ئەو کاتە بوو بڕیاری دا هەر کە راهیبە لەوێ رۆیشت، منالەکەی لە حەوزوکەی حەمامدا بخنکێنێ، بەڵام ورەی پێویستی نەبوو و، وای بەباش زانی سەبر و حەوسەڵەی هەبێ و چاوەڕوان بێ هەتا بەزەیی لەبڕان نەهاتووی خواوەندی لەو بەڵایەی رزگار بکا.

ئۆرلیانۆی تازە ببووە یەک ساڵە، کە وەزعی گشتی لەناکاو ئاڵۆزکا. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم و ڕێبەرەکانی دیکەی یەکیەتی کرێکاران، کە هەتا ئەو زەمانی بە نهێنی درێژەیان بە تێکۆشان دابوو، لە نەکاو لە ڕۆژێکی حەفتەدا خۆیان ئاشکرا کرد و لە هەموو گوندەکانی ناوچەی پەروەردەکردنی مۆز دەستیان بە خۆپیشاندان کرد. پۆلیس تەنیا کاری بە سەر پارێزگاریی نەزمی گشتییەوە بوو. بەڵام شەوی دووشەممە ڕێبەرەکانی لە ماڵەکان دەرکێشا و زنجیری ئاسنی پێنج کیلۆیی لە لاقان بەستن و بۆ زیندانی ناوەندیی ئوستانیان بەڕێکردن. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم و لۆرینزۆگاڤیلان[٢] یش، کە لە شۆڕشی مەکسیکدا دەرەجەی سەرهەنگی هەبوو و دووریان خستبۆوە بۆ ماکۆندۆ و، دەیگوت شاهیدی عەمەلیاتی هاوڕێی خۆی ئارتیمۆکرووز[٣] بووە، لە نێو ئەو کۆمەڵەدا بوون. بەڵام دوای سێ مانگان ئازادیان کردن، چونکە لە نێوان دەوڵەت و کۆمپانیای مۆز لە سەر بەخێوکردنی ئەوانە ناکۆکی دروستببوو.
ئەوجارەیان ڕەخنەی کرێکاران سەبارەت بە کەمبوونی کەرەسەی لەشساخی و نەبوونی خزمەتەکانی تەندروستی و وەزعی خراپی کار هاتە پێشەوە. هەروەهادەیانگوت کرێکەیان لە جیاتی پوول بە کۆبۆن دەدەنێ. ئەویش تەنیا بۆ کڕینی ژامبۆنی ویرجینیا[٤] لە فرۆشگای کۆمپانیای مۆز بەکەڵک دێ. هۆی زیندانیکردنی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم ئەوە بوو کە وتبووی ئەو شێوە کۆبۆن دانە فێڵێکە کۆمپانیا بەکاری هێناوە، هەتا بتوانێ لە خەرجیی کەشتییەکانی، کە میوە بار دەکەن کەمکاتەوە، چونکە ئەگەر لە بەر هەڵگرتنی شتومەک بۆ سۆپێرمارکێتەکان نەبا، ناچار بوون لە شوێنی خۆیانەوە لە نیو ئۆرلیان[٥] بە بەتاڵی بگەڕێنەوە بەندەری بارکردنی مۆز.لە نارەزایەتییەکانی دیکەی کرێکاران، هەموو ئاگادار بوون، پزیشکانی کۆمپانیا هەموو نەخۆشەکانیان بە بێ چاولێکردن ڕیز دەکرد و پەرستارێک حەبێکی

---

[٢]– Lorenzo Gavilan

[٣]– Artemio Cruz

[٤]– Virginya

[٥]– New Urleans

سەوزی لە سەر زمانیان دادنا و فەرقی نەدەکرد مەلاریایان هەبا یان سووزەنەک یان قەبزی. ئەو شێوە موعایەنەیە ئەوەندە بە برەو بوو کە منالآن چەند جار لە سەر یەک لە ریزیدا رادەوەستان بە جێگای ئەوە حەبەکی قووت بدەن، حەبیان دەبردەوە ماڵەوە هەتا لە جیاتی ژێتۆنی بینگۆ کەڵکی لێ وەربگرن. بنەماڵەی کرێکاران لە کۆخی هەژارانەدا تێکەوەیان دەهاویشت. ئەندازیاران لەو خانووانە ئاودەستیان دروست نەکردبوو و هەموو جێژنێکی کریسمەس ئاودەستێکی گەڕۆکیان دەهێنا کە بۆ پەنجا کەس بەکار دەهات و پێشانیان دەدان کە چۆن کەڵکی لێ وەربگرن خراپ نەبێ. پاریزەرانی پیر و لە کارکەوتووی رەشپۆش، کە لە رابردوودا دەورەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایان دەدا و ئێستا پاریزەری کۆمپانیای مۆز بوون، ئەو تۆمەتەیان بە داوەریی جادووگەرانەی خۆیان ڕەتدەکردەوە. زۆری کێشا هەتا داوای گشتیی کرێکاران بەرەسمی بە کۆمپانیای مۆز راگەیەنرا. ئاغای براون، هەر کە لەو رووداوە ئاگادار بوو، واگۆنی جوان و شووشەیی خۆی بە قەتار بەستەوە و لەگەڵ چەند نوێنەری ناسراوی دیکەی کۆمپانیای مۆز لە ماکۆندۆ بزر بوو. بەو حاڵەش چەند کەس لە کرێکاران رۆژی شەممەی دوایی یەکێک لەوانەیان لە فاحیشەخانە دۆزییەوە و ناچاریان کرد، هەروا بەڕووتی لە بەر چاوی ئەو ژنەی کە یارمەتیی دابوون لە داوی باوێن، بەراکشاوی روونووسی داوای کرێکاران مۆر بکا. پاریزەرانی رەشپۆش لە دادگا سەلماندیان کە ئەو پیاوە هیچ پێوەندییەکی بە کۆمپانیاوە نەبووە و لە بەر ئەوەی کەس گومان لە قسەکانیان نەکا کابرایان وەک ساختەچی زیندانی کرد، کەمێک دواتر ئاغای براونیان، کە بە شاراوەیی لە واگۆنیەکی دەرجە سێ بە قەتار دەڕۆیشت، خافلگیر کرد و روونووسێکی دیکەی داوای کرێکارانیان پێ مۆر کرد. سبەی ئەو رۆژە. ئاغای براون بە مووی رەشەوە لە بەرامبەر دادوەراندا ئامادە بوو و بە ئیسپانیۆلییەکی رەوان وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە.

قازییەکان رایانگەیاند کە ئەو کەسە ئاغای جەک براون بەڕێوەبەری کۆمپانیای مۆز، لە دایکبووی پراتوویل[٦] ی ئەیالەتی ئالاباما[٧] نەبووە، بەڵکو

---

٦- Prattville

فرۆشیارێکی بێ ئازاری گیای دەرمانییە، بە ناوی داگۆبیرتۆ فونسیکا[8] و لە دایکبووی ماکۆندۆیە و هێندەی پێنەچوو کە دادوەرەکان بەئاشکرا شایەدی نامەی مردنی ئاغای براونیان بە کرێکاران نیشان دا، کە بە هۆی کونسوول و وەزیرانی دەرەوە مۆر و ئیمزا کرابوو و دەیگەیاند کە ئەو کەسە لە رۆژی نۆی ژووئەنی رابردوو لە شیکاگۆ[9] کەوتۆتە ژێر ماشینی ئاگرکوژاندنەوە و مردووە. کرێکارەکان، کە لەو هەموو درۆ ودەلەسەیەدا گیریان خواردبوو، دەستیان لە کاربەدەستانی ماکۆندۆ شوشت و نارەزایی خۆیان دایە دەستی دادگای بەرز. ئەو کاتە پاسەوانەکان رایانگەیاند ئەو نارەزایەتییانە لە بنەرەتەوە نرخیان نییە، چونکە کۆمپانیای مۆز نە لە رابردوودا کرێکاری هەبووە و نەلە حاڵی ئێستاشدا، ئەو چەند کەسەی بە ناوی کرێکاریش دامەزرابوون، گرێبەستی کاتییان هەبووە و بەو جۆرە داستانێکی ژامبۆنی ویرجینیا و حەبی یەکاویەک و ئاودەستەکانی کریسمەسیش هەڵوەشانەوە و رای دادگا بە شێوەی فەرمان راگەیەنرا: کۆمپانیای مۆز هیچ کات کرێکاری نەبووە.

مانگرتنی گەورە لێک بڵاو بوو، چقاندن نیوەکاوە مایەوە، میوە بە دارانەوە رزین و قەتاری سەد و بیست واگۆنی لە سەر هێڵی ئاسنی مردوو، راوەستا. کرێکارانی بێکار و بێعار بە شاران وەربوون، شەقامی تورکان، دەتگوت هەموو رۆژێ شەممەیە، چەند رۆژان لە سەر یەک دەبریسکایەوە و ژووری بیلیاردی هۆتێلی یاقووبی بیست و چوار سەعاتە جمەی دەهات. رۆژێک کە راگەیەنرا ئەرتەش بڕیاری داوە جارێکی دیکە نەزمی گشتی رێکخاتەوە، خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم لەوێ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو پیاوی پێشبینی نەبوو، ئەو هەواڵە بۆ ئەو وەک فەرمانی مەرگ بوو. مەرگێک، کە لەو رۆژە دوورەدەستەوەی سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بردبووی بۆ تەماشای گوللەباران، چاوەڕوانی دەکرد. بە هەر حاڵ ئەو هەواڵە ناخۆشە زۆری ئاڵۆزکاو نەکرد، نەخشەی خۆی جێبەجێکرد و

---

[7]- Alabama

[8]– Dagoberto Fonseca

[9]- Chocago

ئامانجی پێکا. هێندێک دواتر، دەنگی دەهۆڵ و شەیپوور و هەراوهوریای راکردن و هاواری خەڵک، وریایان کردەوە، کە نەتەنیا گەمەی بیلیارد تەواو بووە، بەڵکو گەمە بێدەنگ و تاکەکەسییەکەش، کە لە بەیانیی رۆژی گوللەبارانەکەوە دەستی پێکردبوو، سەرەنجام گەیشتۆتە کۆتایی. ئەو کات رۆیشتە شەقام و ئەوانی بینی. سێ هێز بوون بە مارشی هاودەنگیان بەو تەپڵە مەرگهێنەرانە زەوییان دەلەرزاند. رمب و هۆڕی ئەژدیهای چەند سەریان، رووناکایی نیوەڕۆیان بە هەڵمی تاعوونێ تەماوی دەکرد. هەموویان کورتەباڵا و بەخۆوە ودڵڕەق بوون، وەک ئەسپ ئارەقەیان دەڕشت و بۆنی چەرمی بەرهەتاویان لێدەهات و خۆڕاگریی بێ خەوشی پیاوانی باکووریان هەبوو.
هەر چەند رابردنیان سەعاتێکی خایاند، بەڵام وا دەهاتە بەرچاو کە چەند دەستەن و لە بازنەیەکدا بەدوای یەکدا دێن، چونکە هەموو یەک شێوە بوون، کۆمەڵێک حەرامزادە کە هەموویان بە قورسایی کۆڵەپشتی و قومقومە راهاتبوون و شەرمی تفەنگی سەرنێزەداری خۆیان بەچاکی هەڵدەگرت و، پووزەوانەی فەرمانبەری کوێر کوێرانە و هەستی شانازییان رادەکێشا. ئۆرسۆلا لە جێگای تاریکی خۆیەوە دەنگی رابردنی ئەوانی بیست و دەستی خۆی و قامکەکانی، کە نیشانەی خاچیان دروست کردبوو. هەڵێنانەوە. سانتا سۆفیا دێلا پێداد، کە سەری بە سەر روومێزییەکی گوڵچندراودا گرتبوو، دەمێک وەخۆ هاتەوە و بیری لە کوڕەکەی، خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم، کردەوە کە بە بێ ئەوەی قیافەی گۆڕابێ، لە پێش دەرگای هۆتێلی یاقووب راوەستابوو و تەماشای رابردنی ئاخرین سەربازەکانی دەکرد.
یاساکانی نیزامی، دەسەڵاتی داوەریی دابوو بە ئەرتەش، بەو حاڵەش هیچ جۆر هەنگاوێک بۆ پێکهاتن نەهاویژرا. سەربازەکان هەر کە کۆتاییان بە رێژەی خۆیان لە ماکۆندۆ هێنا، تفەنگەکانیان بەلاوە نا و مۆزەکانیان لە دار کردەوە و باریان کردن و قەتاریان بەڕێ خست. کرێکارەکان کە هەتا ئەو کاتەی تەنیا هەر چاوەڕوانییان دەکرد رۆیشتنە دارستان و بێشەکان و بەتەنیا چەکی خۆیان، یانی چەقۆ، دەستیان بە خراپکاری لە خراپەکاری

داکرد. مەزرا و داچێندراو و چەقاویان ئاگر تێبەردا. ڕێلی ڕێگای ئانیان بڕی، هەتا ڕێ لە هاتوچۆی قەتار بگرن، کە بەزۆری سەرەنێزە دەهات و دەچوو. سیمی تێلگراف و تەلیفۆنیان بڕێ، عەمباراوەکان خوێناوی بوون، ئاغای براون، کە لە ناوچەی پارێزراوی ماکۆندۆ ساخ و سەلیم و زیندوو بوو، بە پشتیوانیی هێزی ئەرتەش بە بنەماڵە و هاوشارییەکانی خۆیەوە نێردران بۆ شوێنێکی هێمن. زۆر نەمابوو شەڕێکی بێ وێنەی نێوخۆیی دەست پێ بکا کاتێ کاربەدەستانی ئەو کارانە بە کرێکارانیان ڕاگەیاند واز لە ماکۆندۆ بێنن. ڕاگەیەندرا کە فەرماندەی گشتیی نیزامی و غەیرەنیزامیی ئوستان ڕۆژی هەینیی داهاتوو، بۆ پێڕاگەیشتن بە مەسەلەکە دێتە ئەوێ.

خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم لە نێو خەڵکانێک بوو کە لە بەیانیی ڕۆژی هەینییەوە لە ئیزگەی قەتار کۆببوونەوە. ئەو دوای بەشداری لە کۆبوونەوەی ڕێبەرانی یەکیەتی کرێکاران، پێی سپێردرابوو لەگەڵ سەرهەنگ گاویلان بڕۆنە نێو خەڵک و، بە گوێرەی وەزع ڕێبەرییان بکەن. کاتێک زانی کە ئەرتەش لە دەوران دەوری مەیدانی چکۆڵەدا ڕەشاشی دابەستوون و ناوچەی تێلدرووکراوی کۆمپانیای مۆز بە چەند تۆپان پارێزگاری لێدەکرێ، هەستی کرد ئاوێکی سوێر لە زاریدا کۆ بۆتەوە. لای سەعاتی دوازدە زۆرتر لە سێ هەزار کەس، کرێکار، ژن و منداڵ بە تەمای قەتارێک، کە نەدەهات، لە پانتایی پێش ئیزگە کۆببوونەوە. خەڵکەکە فشارێکی زۆریان بۆ شەقامەکانی دەوروبەر دەهێنا، کە بە ڕیزی ڕەشاشان بەسترابوون. وا دەهاتە بەرچاو خەڵکەکە لە بازارێکی حەوتووانەیە نەک کۆمەڵێکی چاوەڕوان. کیوسکی خواردن و نۆشابەیان لە شەقامی تورکەکانەوە بۆ ئەوێ هێنابوو و خەڵکەکە چاوەڕوانی و گەرمای سووتێنەریان بە خۆشحاڵییەوە قبووڵ کردبوو. کەمێک پێش سەعاتی سێ وا بڵاوبۆوە کە قەتاری ڕەسمی هەتا سبەی نایە. خەڵکی ماندوو، بە هاتوهاوار هەناسەیەکی سەرشۆڕییان هەڵکێشا. سێتوانێک ڕۆیشتە سەربانی ئیزگە و لە شوێنێکەوە کە چوار ڕەشاش بەرەو خەڵکەکە دابەسترابوون، داوای لە خەڵک کرد بێدەنگ بن. لە نزیکی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم، ژنێکی زۆر قەڵەو و پاپەتی بە دوو منداڵەوە، کە یەکیان نزیک چوار

ساڵانە و ئەوی دیکە یازدە ساڵبوو، راوەستابوو. ژنە منداڵە چکۆڵەکەی لە باوەش کرد و بە بێ ئەوەی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم بناسێ، داوای لێکرد منداڵەکەی دیکە لە زەوی بەرز کاتەوە هەتا باشتر بزانێ چ دەڵێ. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم منداڵەکەی لە سەر شانی دانا. ساڵانی دوایی، هەر چەندە کەس باوەڕی بە قسەکانی منداڵەکە نەدەکرد، بەڵام ئەو هەروا دەیگێڕایەوە کە سیتوان بە هۆی بووتی گرامافۆن راگەیەندراوی ژمارە چواری فەرماندەیی گشتیی نیزامی و غەیرەنیزامی خوێندۆتەوە. راگەیەنراوەکە بە مۆر و ئیمزای ژێنراڵ کارلۆس کۆرتیز ڤارگاس[10] و جێگرەکەی سەرگورد ئینریکە گارسیا ئیسازا[11] لە سێ لاپەڕەی هەشتا وشەییدا مانگرتووەکانی بە لویچێک خراپەکار ناو دەنا و دەسەڵاتی بە ئەرتەش دەدا کە تەقەیان لێبکا و بیانکوژێ.

دوای خوێندنەوەی ئاگاداری، لە نێوان فیتوولێدانی کەرکەری خەڵکەکە، سەروانێک بە جێگای سیتوانەکە رۆیشتە سەربانی ئیزگە و بە هۆی بووقی گرامافۆنەکە ئاماژەی کرد کە دەیهەوێ قسە بکا، خەڵکەکە دیسان بێدەنگ بوون.

سەروان بە دەنگێکی لەسەرەخۆ و هێندێک ماندوو وتی: "خانمەکان و ئاغاکان، پێنج دەقیقە مۆڵەتتان دەدرێتێ هەتا بڵاوەی بکەن."

دەنگی فیتوو و نەڕەنەڕی خەڵک بوو بە دوو بەرابەر و، دەنگی شەیپوور، دەسپێکردنی پێنج دەقیقە مۆڵەتی لە خۆیدا خنکاند. هیچ کەس لە جێگای خۆی نەبزووت.

سەروان هەر بە شێوەی هەوەڵێ وتی: "پێنج دەقیقە تەواو بوو، دەقیقەیەکی دیکە تەقە دەکەین."

خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم کە ئارەقەیەکی ساردی بە لەشدا دەهاتەخوار، کۆڕەکەی هێناخوارێ و دایەوە بە دایکی. ژنە پرتاندی کە: "لەو نامەردانە هیچ بە دوور نییە کە بەراستی تەقە بکەن." خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم دەرفەتی قسەکردنی نەما، چونکە دروست هەر لەو ئانەدا دەنگی دوو

[10]– Carlos Cortes Vavgas

[11]– Enrigue Garcia Isaza

رەگەی سەرهەنگ گاویلانی بەرگوێ کەوت کە وشەکانی ژنەی دووپات دەکردەوە. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم، کە لە نیگەرانی و جوانیی ئەو بێدەنگییە قووڵە و باوەڕ بەمە کە هیچ هێزێک ناتوانێ ئەو خەڵکە، کە بەو جۆرە بە جەزبەی مردن ئاشنان، لە جێگای خۆیان ببزێوێ سەرمەست بوو، لە پشت ئەو کەسانەوە کە لە پێشی بوون خۆی هەڵکێشا و بۆ هەوەڵین جار لە عومریدا دەنگی بەرز کردەوە و هاواری کرد: "قورمساخینە ئەو دەقیقە زیادییە سەرتان بخوا."

لە کۆتایی هاوارەکەی ئەودا، ئەوەی روویدا نەتەنیا ئەوی نەترساند، بەڵکو حاڵەتێکی سەیر و جوانی پێ بەخشی. سەروان فەرمانی تەقەی دا و دەستبەجێ چاردە رەشاش وەڵامیان دایەوە. بەڵام هەموو شتێک گاڵتەجار دەهاتە بەرچاو، دەتگوت رەشاشەکان بە گوللەی بەدرۆ پڕ دەکرانەوە، چونکە هەروا کە دەنگی هەناسە و پشووسواری رەشاشەکان و تفکردنەوەی فیشەکەکان دەبیسرا، بچووکترین دژکردەوە لە خەڵکەکە دیار نەبوو، لە خەڵکێک کە دەتگوت لە دەمێکی موجیزەئاسادا، برین هەڵنەگر و وەک بەرد لە جێگای خۆیان راوەستابوون. نە دەنگی ناڵە هەستا و نە دەنگی هاوار و، لەنەکاو لە لایەکی ئێزگەوە هاوارێکی مەرگهێنەر ئەو حاڵەتە جەزبەیەی تێکشکاند: "ئای ... دایە." دەنگێکی لەرزێنەر وەک بوومەلەرزە و هەناسەیەک وەک تەقینەوەی لووتکەی بورکان و گرمەیەکی بە سام لە خەڵکەکە بەرز بۆوە و بە هێزێکی سەرسووڕهێنەر لە هەموو شوێنێک بڵاوبۆوە. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم تەنیا دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخسا منداڵەکە لە زەوی بەرز کاتەوە. ژنە بە منداڵەکەی دیکەیەوە لە نێو گەردەلوولی خەڵکدا، کە لە ترسان دەسووڕا، قووت درا.

ساڵانی ساڵ دواتر، ئەو منداڵە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو بە پیرەپیاوێکی شێتۆکەیان دەزانی، دەیگێڕایەوە کە چۆن خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم ئەوی لە سەرشانی داناوە و لە هەوادا نوقمی ترسانی خەڵک، بۆ شەقامێکی لەو نزیکانەی بردووە. وەزع و شوێنێک کە کورە هەیبووە، بووە هۆی ئەوە ببینێ کە خەڵکەکە لەگەڵ ئەوەدا کە سوار شان و کۆڵی یەکتر ببوون، گەیشتبوونە سەر پێچە شەقامێک. ریزی رەشاشان تەقەیان دەست

پێکردبـوو. چەنـدین دەنـگ هاوکـات وێکـرا هاواریـان کردبـوو: "خۆتـان لە ئەرزی دەن! خۆتان لە ئەرزی دەن."

کەسانێک کە لە پـێش هەمـووان راوەسـتابوون، پێشتر بە شـەپۆلی گـوللان کەوتبوونە سـەرزەوی. کەسـانێک، کە هێشـتا زینـدوو بـوون، لە جیـاتی ئەوە خۆ لە ئەرزی بـدەن، تێدەکۆشـان بگەڕێنەوە مەیدانە چکـۆڵەکە. تـرس وەک کلکـی ئەژدیهـا دەجـووڵایەوە و ئەوانـی وەک شـەپۆلێکی بەرزبـۆوە، بـۆ لای شـــەپۆلێکی بەرزبـــۆوەی دیـــکە رادەدا، کە لەپەڕی دیـــکەی شـــەقامەوە، بە جـووڵانی کلکـی ئەژدیهـا هەڵـرژابـوونە ئەوێ. لەوێـش رەشاشـەکان بە بـێ هەدادان تەقەیــان دەکـرد. گەمــارۆ درابــوون، لە گەردەلــوولێکی مەزنــدا بە دەوری خۆیاندا دەسـووڕانەوە، گەردەلوولێک کە بەرە بەرە لە ئەسـتوورایی کەم دەبۆوە، چـونکە دەوروبەری وەک پێسـتی پیـازی، بە مقسـەتی تیـژ و لە سـەریەکی رەشاشـــان لێـدەکرانەوە. منـاڵەکە چـاوی بە ژنێـک کەوت، لە شوێنێک وەک موجیزە لە هێرش بەدوور چۆکی داداوە و دەستی وەک خاچ هەڵێنـــاون. خـــۆزێ ئارکـــادیۆی دووهەم لەو دەمەدا کە بە دەموچـــاوی خوێنـاوییەوە کەوتە سـەر زەوی، منـاڵەکەی لەوێ لە ئەرزی دانـا و پـێش ئەوەی هەنگـی مەزن، مەیـدانی ئـاوالا و ژنە چـۆک دادراوەکە بکێشـێتە ژێـر تیشـکی ئاسـمانی ویشکەسـاڵ چێشـتوو، لەو دونیـای قەحبەسـفەتیدا، کە ئۆرسـۆلا ئیگـواران ئەو هەمـوو دەعبـا چکـۆڵە ئـاوی نەباتییـانەی فرۆشـتبوو، چۆکی دادا.

کاتێک خۆزێ ئارکادیۆ هـاتەوەهۆش، لە تاریکاییدا بە پشتدا کەوتبوو. زانـی کە بە قەتارێکی بێکۆتـایی و بێدەنگ سـەفەر دەکا و مـووی سـەر بە خـوێنی دەڵەمەبـووی بە یەکەوە نووسـاون و، هەمـوو ئێسـقانی لەشـی ژان دەکەن. هەسـتی کـرد دەیەوێ دوور لە تـرس و خـۆف چەنـد سـەعاتان بنـوێ. سـووڕایە سـەر کەڵەکەی دیکەی، کە کەمتـری ژان دەکـرد و تـازە ئەو جـار زانـی کە لە سـەر مـردووان راکشـاوە. بـێجگە لە دالانـی سـەرەکیی قەتـار، هەمـوو شـوێنێک پـڕ بـوو لە کەلاک. بێگومـان چەنـد سـەعات لەو قەلاچـۆیە رابردبـوو، چـونکە لاشـەکان وەک گێچـی زسـتانێ سـارد بـوون و رەقـایی گێچی بەردبوویان هەبوو. کەسانێک لاشـەکانیان لە واگۆنـان هاویشـتبوو لە

دەرفەتدا ئەوانیان بە ڕێکوپێکی لە سەر یەک دانابوون، دروست وەک ئەوە کە سندووقە مۆزان بۆ هێنان و بردن لە سەریەک دادەنێن. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم بۆ راکردن لەو کابووسە، لە نێو قەتارەکەدا لە واگۆنێکەوە خۆی دەخشاندە واگۆنێکی دیکە و لە بەر ئەو رووناکاییەی کە کاتی رابردن بە نێو دێهاتی نووستوودا،بە نێوان تەختەدارەکاندا دەهاتە ژووری، پیاوانی مردوو، ژنانی مردوو و منداڵانی مردوو ببینێ کە بۆ لای دەریا دەبرێن، هەتا وەک مۆزی رزیو لە بەحریان باوێژن. لەو نێوەدا تەنیا توانی ژنێک بناسێتەوە کە لە مەیدانێ نۆشابەی دەفرۆشت و سەرهەنگ گاویلان کە کەمەربەندە قولاپزیوەکەی کە بەو تێکۆشابوو خەڵکی درِ دا و رێگای خۆی بکاتەوە هێشتا بەدەستەوە بوو دەیکوشی. کاتێک گەیشتە واگۆنی هەوەڵێ، خۆی فرێ دایە نێو تاریکی خوارەوە و هێندە لە قەراخ رێگای ئاسن مایەوە هەتا قەتارەکە تێپەرِی. درێژترین قەتار بوو کە لە ماوەی ژیانیدا دیبووی، نزیکەی دوو سەد واگۆنی باری و دوو لیکۆمۆتیو لەو سەر و لەمسەری و یەکیش لە نێوەراست. قەتارەکە چرای نەبوو، تەنانەت چرای مەترسیی سەوز و سووریشی نەبوو، بە چوستی دزانە و شەوانە تێپەرِی، لە سەری واگۆنەکان لە سەر بان تارمایی سەربازانی چەکدار بە رەشاش دەبیندران. دوای نیوەشەو رێژنە بارانێکی توند دەستی پێکرد. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم نەیدەزانی لە کوێ خۆی فرێداوەتە خوارێ، تەنیا دەیزانی بە رۆیشتن بەرەو لای پێچەوانەی قەتار دەگاتەوە ماکۆندۆ. دوای سێ سەعات پیادەرەوی سەرەتا پێ تلیساوە لە باران بە سەرئێشەیەکی زۆر لە بوولێلی بەیانیدا چاوی بە خانووان کەوت.

بە بۆن کردنی بۆنی قاوە رووی کردە ئاشپەزخانەیەک کە ژنێک منداڵ بە باوەشەوە سەری بە سەر ئاگردان دا گرتبوو.

ماندوو و مردوو وتی: "سەلام، من خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم بویندیام."

بۆ ئەوە دڵنیابێ زیندووە ناوی خۆی بەتەواوی و بە راوەستان لە سەر هەر بەشێک گوتەوە. کارێکی ئاقلانە بوو، چونکە ژنە، بە چاوپێکەوتنی کە پیس و سەرتاپا خوێناوی و دەستی مەرگهێنەر هاتبووە ژوورەوە، وایزانیبوو تارماییە. ئەوی ناسی، پەتوویەکی بۆ هێنا هەتا جلەکانی لە کەنار ئاور

ویشک دەبنەوە، لە خۆیەوە پێچی، بۆ شوشتنەوەی برینەکانی ئاوی گەرم کرد، برینەکانی سەرپێست بوون، باندێکی خاوێنی دایە لە دەوری سەری هاڵێنێ. دوایی قۆرییەکی قاوە بۆ برد. تاڵ و بێ شەکر. هەروا کە بیستبووی دابی بنەماڵەی بویندیایە، لیباسەکانیشی لە نزیک ئاگر هەڵخستن. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم هەتا هەموو قاوەکەی نەخواردەوە قسەیەکی نەکرد.

ورتاندی: "بێگومان نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون."

ـ چیت وت؟

ئەو شییکردەوە: "لاشەکان. بێگومان هەموو ئەو کەسانە بوون کە لە ئێزگە کۆببوونەوە."

ژنە بە چاوێکی بەبەزەوە تەماشای کرد و وتی: "لێرە کەس نەکوژراوە. لە زەمانی مامەگەورەتەوە، سەرهەنگ، لە ماکۆندۆ هیچ ڕووداوێک نەقەوماوە." لە سی ئاشپەزخانە کە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم پێش چوونە ماڵەوەیان سەری لێدان، هەموویان هەر ئەمەیان پێوت: "کەس نەکوژراوە." لە مەیدانی پێش ئێزگە تێپەڕی. ئەو مێزانە کە خواردەمەنییان لە سەر دەفرۆشت لە سەریەک دانرابوون، لەوێش هیچ شوێنەوارێک لە کوشتاری بەکۆمەڵ نەدەبیندرا. شەقامەکان لە ژێر باران یەک هەوا بوون و ماڵەکانی دەرگا و پەنجەرە داخراو کە نیشانەیەکیان لە ژیانی ژوورەوە تێدا نەدەبیندرا خاڵی بوون. تەنیا نیشانەی ئاشکرا، هەوەڵین دەنگی ناقووسان بوو بۆ نوێژێ. لە دەرگای ماڵی سەرهەنگ گلاویانی دا. ژنێکی زگ پڕ، کە چەند جار پێشتر دیتبووی، دەرگای لێ داخست و بە ترسەوە وتی: "ئەو لێرە ڕۆیشتوە و گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتی خۆی." لە بەر دەرگای ناوچەی پارێزراو، وەک جاران دوو پاسەوانی خۆجێی وێستابوون دەتگوت لە بەر باران بوونە بەرد. بارانی دەبەر و چەکمەی لاستیکیان دەپێ دابوو. ڕەشپێستەکانی خەڵکی ئانتیل لە کۆڵانەکانی لاوەکیی گەڕەکی خۆیان سروودی شەممەیان دەخوێندەوە. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم بە سەر دیواریدا خۆی فڕیدایە حەوشە و لە ڕێگەی ئاشپەزخانەوە ڕۆیشتە ژووری ماڵەوەیان. سانتا سۆفیا دێلا پێداد دەنگی خۆی کەمێک بەرز کردەوە و پێی گوت: "مەهێڵە

فێرناندا چاوی پێت بکەوێ، ئێستا لە خەو هەڵدەستێ." کوڕەکەی خۆی بردە (ژووری لەگەنەکان) و تەختی خەوتنی سەفەری تێکشکاوی مێلکیادێسی بۆ ئامادە و سەعاتی دووی پاشنیوەڕۆ، کاتێک فێرناندا لە خەوی دوای نیوەڕۆیدا نوقم ببوو، دەورییەکی خواردن بۆ برد.

ئۆرلیانۆی دووهەم کە زیندانی بارانێ بوو، لە ماڵەوە خەوتبوو، لە سەعات سێی دوانیوەڕۆ هێشتا چاوەڕوان بوو باران لێبکاتەوە. سانتا سۆفیا دێلا پێداد بە دزییەوە هەواڵی پێدا و، ئەو لەو سەعاتەدا بۆ چاوپێکەوتنی براکەی رۆیشتە ژووری مێلکیادێس. ئەویش رووداوی قەلاچۆ و شەمەندەفەری پڕ لە لاشەی کە بۆ لای دەریا دەچوو باوەڕ نەکرد. شەوی پێشتر ئاگادارییی نائاسیی، کە بۆ ئاگاداری گشتی بڵاو کرابۆوە، خوێندبۆوە. لە ئاگاداریییەکەدا گوترابوو کە کرێکاران ئێزگەیان چۆڵ کردبوو و لە دەستە دەستەی ئارامدا بەرەو ماڵی خۆیان گەڕابوونەوە و رێبەرانی یەکیەتی کرێکاران بەهەستی نیشتمانپەروەریی خۆیان، داواکانیان داشکاندبوو تەنیا بە دوو خاڵ، چاککردنی خزمەتی دەرمانی و دروستکردنی ئاودەست بۆ ماڵی کرێکارەکان.کاربەدەستانی نیزامی بە دوای رێککەوتن لەگەڵ کرێکاران، بە پەلە ئاغای براونیان ئاگادار کرد و ئەو نەتەنیا مەرجەکانی تازەی قبووڵ کرد، بەڵکو پێشنیاری کرد کە بۆ تەواوبوونی ئەو ناکۆکییە ئامادەیە پارەی پێویست بۆ سێ رۆژ جێژنیش بدا. بەڵام کاتێک کە نیزامییەکان لێیان پرسی چ کاتێک ئاشتینامەکەی مۆر دەکا، کابرای ئەمریکای باکوور لە پەنجەرەوە چاوێکی لەئاسمانی خاڵ خاڵ لە هەورە تریشقە کرد و بە گومانەوە گوتی: "هەر کات باران لێی کردەوە. هەتا کاتێک باران دەباری، هەموو جۆرە تێکۆشانێک بەلاوە دەنێین."

سێ مانگ بوو باران نەدەباری و خەریک بوو ببێتە ویشکەساڵ. کاتێک کە ئاغای براون بڕیاری خۆی دا، رێژنەیەک کە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی لە گەڕانەوە بۆ ماکۆندۆ تلیساندبۆوە، لە هەموو ناوچەی مەزرای مۆز دەستی پێکرد. حەفتەیەک دواتریش باران هەر دەباری. بڕیارنامەی رەسمی کە هەزاران جار دووپات کرابۆوە و بە هەموو جۆرە کەرەسەیەکی پێوەندی، کە بە دەست دەوڵەتەوە بوو، لە سەرتاسەری وڵاتدا متمانەیی خۆی

لەدەست دابوو، سەرەنجام قبووڵ کرا هیچ کەس نەکوژرابوو. کرێکارانی رازی گەڕانەوە لای بنەماڵەی خۆیان و کۆمپانیای مۆز هەموو جۆرە چالاکییەکی هەتا کۆتایی باران راگرتبوو. حکوومەتی نیزامی لە بەر ئەوەی گریمانە دەکرا بە هۆی رەگباری لەبراننەهاتووی خەڵک پێویستی بە یارمەتیی دەستبەجێ هەبێ، هەر بەرقەرار بوو و هێز لە سەربازخانە دامەزرابوو، بە درێژایی رۆژێ، نیزامییەکان بە نێو لافاودا لە شەقامەکان قەدەمیان لێ دەدا"پیاسەیان دەکرد". دەلینگی شەڵواریان هەڵدەدایەوە و لەگەڵ منالان گەمەی لۆتکەیان دەکرد و شەوانەش دوای لێدانی شەیپووری بێدەنگی، بە قۆنداخە تفەنگ دەرگای مالانیان دەشکاند و کەسانی گومان لێکراویان لە ماڵەوە دەردەکێشا و لەگەڵ خۆیان بۆ سەفەری بێ گەڕانەوەیان دەبردن.
کوشتاری بەکۆمەڵی خراپەکاران و پیاوکوژان و سووتێنەران و یاخیبووانی ئاگاداریی ژمارە چوار هەروا درێژەی هەبوو، بەلام نیزامییەکان ئەوەیان تەنانەت لە لای خزمی قوربانییەکانی خۆشیان حاشا دەکرد کە بۆ هەواڵ زانین لە ئیدارەکانی فەرماندەیی کۆ دەبوونەوە و، پێیان دەگوتن: "رەنگە خەونتان دیبێ. لەماکۆندۆ نە هەواڵێک بووە، نە هەواڵێک دەبێ و نە هەواڵێک دێتە پێش، ئێرە شارێکی خۆشبەختە." و بەو جۆرە کوشتنی رێبەرانی یەکیەتی کرێکارانیان تەواو کرد.
تەنیا کەسێک کە گیانی رزگار کرد. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم بوو. شەوێک لە شەوەکانی مانگی فیوریە دەنگی قۆنداخە تفەنگانیان، کە وەدەرگا دەکەوتن، بە چاکی بیست. ئۆرلیانۆی دووهەم کە هەروا چاوەڕوان بوو، باران لێکاتەوە هەتا لە ماڵەوە دەرکەوێ، دەرگای لە شەش سەرباز و فەرماندەکەیان، کە دەرەجەدارێک بوو، کردەوە. ئەوان کە سەرتاپێ لە بەر باران تەڕ ببوون، بە بێ ئەوەی وشەیەک لە دەمیان دەرپەڕێ، ماڵەکەیان ژوور بە ژوور و گەنجە بە گەنجە لە ساڵۆنەوە هەتا عەمباران پشکنی. ئۆرسولا کاتێک چرای ژوورەکەیان هەڵگرد، لە خەو رابوو. هەتا ئەو کاتەی گەڕان لە ماڵ درێژەی هەبوو هەناسەی نەدەدا و ئەنگوستەکانی وەک خاچ بۆ هەر لایەک سەربازەکان دەڕۆیشتن

دەسووڕاند. سانتا سۆفیا دێلا پێداد توانی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم کە لە ژووری مێلکیادێس نووستبوو، ئاگادار بکاتەوە، بەڵام ئەو بۆی دەرکەوت کە بۆراکردن زۆر درەنگ بووە. بۆیە کاتێک سانتا سۆفیا دێلا پێداد دەرگای داخستەوە، ئەو کراسەکەی دەبەرکرد و پێلاوەکانی دەپێ کرد و بە چاوەڕوانیی ئەوان لە سەر تەختەکەی دانیشت. لەو ئانەدا خەریکی گەڕانی کارگای زێڕنگەری بوون ئەفسەرەکە فەرمانی دابوو قفڵەکەی بکەنەوە و بە حەرەکەتێکی توندی فانۆس سەیرێکی مێزی کار، بوتری ئەسیدان و کەرەسەی کار کە خاوەنەکەی هەروا بەجێی هێشتبوون بکەن. بەڕواڵەت وا دەهاتە بەرچاو کە تێگەیشتووە کەس لەو ژوورەدا ناژی. بەو حاڵەش بە زیرەکییەکی تەواو لە ئۆرلیانۆی دووهەمی پرسی کە ئایا پیشەی تۆ زێڕنگەرییە؟ ئەو بۆی باس کرد کە ئەو ژوورە، کارگای ئۆرلیانۆ بویندیا بووە. ئەفسەر وتی: "ئاخ'، چرای هەڵکرد و فەرمانی دا وەها بەوردی ئەوێ گەڕان کە تەنانەت هەژدە دانە ماسیی چکۆڵەی تەلایی نەتواوەش کە لە نێو قوتووی حەڵەبی پشتی بوترییەکان شاردرابوونەوە لە بەرچاوی ون نەبوون. ئەفسەرەکە ئەوانی یەکە یەکە لە سەر مێزی کار سەروبن کرد و ئەوجار بوو بە مرۆڤ گوتی: 'ئەگەر ڕێگە بدەی، پێم خۆشە یەکێک لەوانە هەڵگرم.کاتێک ئەو ماسییە نیشانەی هێز و رووخاندن بوون، بەڵام ئێستا تەنیا بیرەوەرین و بەس." ئەفسەر لاو بوو، وەک کوڕە منداڵ، کەم روو نەبوو و رووخۆشیشی هەتا ئەو ئانە ئاشکرا نەکردبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم ماسییەکی چکۆڵەکەی زێڕی پێدا، ئەفسەر چاوی وەک چاوی منداڵان دەدرەوشایەوە، ماسییە زێڕەکەی لە گیرفان نا و بە دواییدا ئەوانی دیکەی لە قوتووە حەلەبییەک هاویشتەوە و لە سەر جێگای خۆی دانایەوە.

وتی نرخی ئەو یادگارە یەکجار زۆرە. سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا یەکێک لە گەورەترین پیاوەکانی ئێمە بووە."

بەڵام چەن ئانێک بوونە مرۆڤ، گۆڕانێکی لە رەفتاری رەسمیی ئەودا پێک نەهێنا، لە پشت دەرگای مێلکیادێس کە دیسان قفڵی لێدرابۆوە، سانتا سۆفیا دێلا پێداد بەوپەڕی ناهومێدییەوە وتی: "سەد ساڵە کەس لەو ژوورە نەژیاوە." ئەفسەرەکە دەستووری دا قفڵی دەرگایان کردەوە و شۆقی

فانووسیی دەژوورەکە گێڕا. ئۆرلیانۆی دووهەم و سانتا سۆفیا دێلا پێداد. لەو دەمەدا کە نووری فانۆسەکە کەوتە سەر دەموچاوی ئارکادیۆی دووهەم و چاوی عەرەبیی ئەویان بینی، هەستیان کرد کە ئەو ئانە کۆتایی نیگەرانییەک و سەرەتای نیگەرانییەکی دیکەیە. کە تەنیا بە تەسلیم بوونی چارەنووس هێمن دەبێتەوە، بەڵام ئەفسەرەکە هەروا بە رووناکایی فانۆسەکە لە ژوورەکە دەگەڕا و شتێک سەرنجی رانەکێشا، هەتا دەرگای گەنجەکەی کردەوە و چاوی بە حەفتا و دوو لەگەن کەوت کە لە سەریەک دانرابوون، ئەو جار چرای ژوورەکەی هەڵکرد. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم ئامادەی دەرکەوتن، بە ئەدەبتر و بەفکرتر لە هەمیشە لە سەر لێواری تەختەکە دانیشتبوو. لە کۆتایی ژوورەکە، کتێبی بەرگپچڕاو و تۆماری لوولەکراو دەبیندران. مێزی کارەکە خاوێن بوو. مەرەکەبی دەواتەکان هێشتا تازە بوون. تازەیی هەوا، بریقە و پارێزراوی سەبارەت بە تۆز و خۆڵ و وێرانی، کە ئۆرلیانۆی دووهەم لە منالیی خۆیدا بینیبووی و، تەنیا سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا نەیتوانیبوو ببینێ، هەروا لەو ژوورەدا فەرمانڕەوایی دەکرد. بەڵام تەنیا لەگەنەکان سەرنجی ئەفسەرەکەیان راکێشابوو.

پرسی: "چەند کەس لەو ماڵەدا دەژین."

ـ پێنج کەس.

ئەفسەرەکە شتێکی لێ حاڵی نەبوو. چاوی لە شوێنێکی ژوورەک بڕیبوو کە ئۆرلیانۆی دووهەم و سانتا سۆفیا دێلا پێداد هەر لەو شوێنە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمیان دەدیت. بۆخۆشی تێگەیشت کە ئەفسەرەکە بە بێ ئەوەی ببینێ چاوی تێبڕیوە. ئەفسەر چرای کۆژاندەوە و دەرگای داخست. کاتێک لەگەڵ سەربازەکانی قسەی دەکرد، خۆزێ ئۆرلیانۆی دووهەم زانیی ئەفسەری گەنج بە چاوی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا تەماشای ژوورەکەی کردووە. بە سەربازەکانی دەوت: "راستە دەڵێن سەد ساڵە کەس پێی لەو ژوورە نەناوە، بێگومان ماریشی لێیە."

کاتێک دەرگای ژوورەکە بەسترایەوە، خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم دڵنیابوو شەڕی ئەو کۆتایی هاتووە. چەندین ساڵ پێشتر سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا

لە جوانیی شەڕ قسەی بۆ کردبوو و تێکۆشابوو بە ئەزموونەکانی خۆی پێشانی بدا.
ئەو بڕوای بە قسەکانی کردبوو، بەڵام شەوێک کە سەربازەکان، لە حاڵێکدا ئەو بیری لە وەزعی ئاڵۆزی چەند مانگی رابردوو و بەدبەختی و زیندان و ترس لە ئیزگە و قەتاری هەڵگری لاشە دەکردەوە، بە بێ ئەوەی چاویان بەو کەوتبێ، سەیریان کردبوو، خوزێ ئارکادیۆی دووهەم گەیشتە ئەو ئەنجامەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوێندیا بێجگە لە شانۆکار یا کابرایەکی گەوج، شتێکی دیکە نەبووە. چونکە نەیدەزانی ئەو بۆ شیکردنەوەی ئەو شتانەی لە شەڕدا هەستی پێکردبوون، بۆچی پێویستی بەو هەموو واژانە هەیە، لە کاتێکدا تەنیا یەک وشە بەس بوو: ترس. لە بری ئەوە لە ژووری مێلکیادێسدا، لە پەنا ئەو نوورە سەرووسروشتییەوە، دوور لە باران و بەو هەستە، کە نابیندرێ، ئارامییەکی وەدەست هێنا، لە ژیانی دەروونیی خۆیدا تەنانەت بۆ یەک ئانیش بەدەستی نەهێنابوو. تەنیا ترسێکی بۆی مابۆوە، ئەوە بوو مەبادا زیندەبەچاڵی بکەن. ترسی خۆی لە لای سانتا سۆفیا دێلا پێداد باس کرد و ئەو بەڵێنی دا بە هەموو توانایەوە لە بەرمابەر مەرگدا راوەستێ و زیندوو بمێنێتەوە، هەتا نەهێڵێ ئەوی زیندە بەگۆڕ بکەن. خوزێ ئارکادیۆی دووهەم، بە خەیاڵێ ئاسوودە لە هەر جۆرە ترس و خۆفێک، دیسان خەریکی لێکۆڵینەوەی نووسینەکانی مێلکیادێس بوو و، هەتا زۆرتر لێیان تێنەدەگەیشت بۆ کۆڵینەوەی زۆرتر هان دەدرا. کاتێک لەگەڵ ڕیتمی باران ڕاهات کە دوای یەک دوو مانگ بارین، ببوو بە شێوەیەکی نوێ لە بێدەنگی، تەنیا شتێکی کە خەڵوەتی تەنیایی تێکدەدا هاتووچوونی سانتا سۆفیا دێلا پێداد بوو. سەرەنجام داوای لێکرد کە دەوری خواردنەکەی بۆ لە بەر پەنجەرە دابنێ و دەرگای قفڵ بکا. کەسانی دیکەی بنەماڵە ئەویان فەرامۆش کرد. تەنانەت فێرناندا لەو کاتەوەی زانیبووی سەربازەکان بە بێ ئەوەی ببینن تەماشایان کردبوو، بەچاکی دەزانی لێی گەڕێ هەروا بێ. دوای شەش مانگان کە ئەو دەرگای لە سەرخۆی داخستبوو و لەوەوە کە نیزامییەکان ماکۆندۆیان بەجێ هێشتبوو، ئۆرلیانۆی دووهەم لە کەسێک دەگەڕا هەتا باران دەوەستێتەوە هاودەنگی بێ، قفڵی

دەرگـای کـردەوە. هەر کە دەرگـا کـرایەوە بـۆگەنێکی تونـد بە بەر لـوتی هەڵاهات و چاوی بە لەگەنەکان کەوت کە لە سـەر ئەرز ریز کرابوون، هەر یەکەیـان چەنـدین جـار بەکـار هێنرابـوو. خـۆزێ ئارکـادیۆی دووهەم، کە مـووی سـەری بەتەواوی وەریبـوو، بە بـێ گوێـدان بە بـۆگەنی ئەو هەڵـمە بێزهێنەرانە، هەروا خەریکی خوێندنەوەی ئەو نووسـراوانە بوو کە هیچیان لـێ تێنەدەگەیشـت. خەرمـانەیەک وەک فریشـتان ئەوی روونـاک کردبـۆوە. بەدەنگی کرانەوەی دەرگـا، سـەری بەرز کـردەوە، بەڵام هەر ئەو نیگـایە بـۆ بـراکەی بەس بـوو کە دووپـاتبوونەوەی چارەنووسـی لەچارەنەهـاتووی باپیری لەودا ببینێ.
خۆزێ ئارکـادیۆی دووهەم تەنیا وتـی: "لە سـێ هەزار زۆرتـر بـوون. ئێستا ئیدی دڵنیام هەموو ئەو کەسانە بوون کە لە ئیزگەی قەتار کۆببوونەوە."
چوار ساڵ و پازدە مانگ و دوو رۆژ باران باری. لەو ماوەیەدا جاری واش هەبوو کە ورد دەباری، ئەو کات هەموو سەرتاپێ لیباسیان دەبەر دەکرد و بە قیافەیەکی نەخۆشانە چاوەڕێیان دەکرد کۆتایی هاتنی باران بکەنە جێژن. بەڵام زۆری پێ نەچوو کە خەڵـک راهـاتن، ئەو خۆشـکردنەوانە بە سـەرەتای دووبەرابەربوونی باران لێک بدەنەوە. ئاسـمان بە تۆفـانە وێرانکەرەکانییەوە بـارانی هەڵدەڕژانـد و لە لای بـاکوورەوە، گێژەڵـووکە، سـەربانی مـاڵانی هەڵدەگرت و دیوارەکانی دەڕووخاند و ئاخرین داری مۆزی لە مەزراکان لە ریشـەوە هەڵدەکەند. دروسـت وەک ئەوە لە زەمـانی نەخۆشـیی بـێ خەویدا پێش هـاتبوو _ و ئۆرسـۆلا دروست لەو رۆژانەدا، بیـری لەوە دەکـردەوە_ ئەو بەڵایە ببوو بە هۆی ئەوە کە هەموو لە بەرامبەر یەک هەوابوونی ژیـان. بەرگری لە خۆیان بکەن. ئۆرلیانۆی دووهەم یەکێک لەو کەسـانە بـوو کە بـۆ ئەوەی تووشـی ئەو داهێزرانە نەبـێ، زۆرتـر لە جـاران خـۆی خەریـک کـرد. شـەوێک کە ئاغـای براون، لغاوی لە سـەری تۆفـان دامـاڵیبوو، بـۆ ئەنجـامی کارێک رۆیشتبووە ماڵەوەیان. فێرناندا دەیویست چەترێکی نیوەشـکاو، کە لە گەنجەیەکدا دۆزیبوویەوە، بیداتـێ، بەڵام ئەو وتـی: "پێویسـت ناکا دەمێنمەوە هەتـا بـاران لێـی دەکـاتەوە." هەڵـبەت ئەو بەڵێنە زۆریـش راوەسـتاو نەبـوو. بەڵام ئەو وەفـای پێکـرد. چـونکە جلەکـانی لە مـاڵی پێتـرا کـۆتیس بەجـێ

مابوون، هەر سێ ڕۆژ جارێک هەموو لیباسەکانی دەبەریدا بوون، دایدەنان و بە ژێر شەڵوارییەکەوە چاوەڕوان دەبوو هەتا جلەکانی بۆ دەشۆن. بۆ ئەوەی حەوسەڵەی نەچێ، خەریکی چاککردنەوەی ئەو شتانە بوو کە لەماڵەوە پێویستیان بە چاککردنەوە هەیە. لاولاوەکانی چاک کردەوە و ڕۆنی لە قفڵەکان دا و دەسگیرەکانی توند کردنەوە. چەند مانگان ئەویان دەدیت بە قوتوویەک ئامرازی کارەوە، کە بێ شک، لە زەمانی خوزێ ئارکادیۆ بویندیاوە کاولییەکان لەوێ لەبیریان چووبوو، لە ماڵەوە بەملا و ئەولادا هەڵدەسووڕێ. هیچ کەس نەیزانی ئایا لە بەر ئەو یارییە نائاساییە بوو، یان لە بەر یەک پشوویی زستان و تێکۆشانی ناچاری، کە وردە وردە زگی وەک دۆدانەی کونکراو نیشتەوە و دەموچاوی وەک کیسەڵێ، سووری خۆی لەدەست دا و بەرچێڵەی تواوە و لە سەر یەک ئەوەندە لە کێشی دابەزی کە دیسان توانی دابێتەوە و قەیتانی کەوشەکانی توند بکا.
فێرناندا کاتێک دەیدیت، ئەو لە لایەک فەنەری نێو سەعاتان دەردێنێ و لە لایەکی دیکە فەنەران دەخاتەوە نێو سەعاتان، بە فکریدا هات ڕەنگە ئەویش تووشی نەخۆشیی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بووبێ، کە لە لایەک دروست دەکا و لە لایەکی دیکەوە دەڕووخێنێ_وەک سەرهەنگ لەگەڵ ماسییە زێڕەکانی، ئامارانتا لەگەڵ دروونی کفن و دوگمەکانی، خوزێ ئارکادیۆی دووهەم لەگەڵ نووسراوەکان و ئۆرسۆلا لەگەڵ بیرەوەرییەکانی. بەڵام بەو جۆرە نەبوو. بەدبەختی لەوەدا بوو کە باران وردە وردە کاری لە هەموو شتێک کردبوو، تەنانەت ویشکترین ماشین، ئەگەر هەر بە سێ ڕۆژ جارێکی چەوریان نەکردبا لە نێو گێڕەکانی گوڵ دەڕوا. بەنی پارچەی زەڕی ژەنگ لێی دا و پارچە تەڕەکان کەڕوویەکی ڕەنگ زەعفەرانیان لە سەرنیشت. هەوا ئەوەندە تەڕ بوو کە ماسییەکان دەیانتوانی بە دەرگادا بێنەژوور و لە نێو هۆدەکاندا مەلە بکەن و لە پەنجەرەکانەوە بڕۆنەدەرێ. ڕۆژێک بەیانی، ئۆرسۆلا لە خەو هەستا و هەستی کرد کە تەمەنی لە لاوازییەکی ئارامدا بەرەو کۆتایی دەڕوا. داوای کردبوو، کە ئەگەر لە سەر تەختی ڕەوانیش بێ، بیبەن بۆ لای باوکی رووحانی ئانتۆنیۆ ئیزابێل. کاتێک کەمێک خۆی بەرز کردوە، سانتا سۆفیا دێلا پێداد تەماشای کرد سەرتاسەری لە زەروو

داپۆشراوە. لە پێش ئەوەیدا زەرووەکان هەموو خوێنەکەی بمژن، ئەوانی یەک یەک بە گازی لە پشتی کردەوە و سووتاندیانن. بۆ بەتاڵکردنی ئاو لە ژوورەکان ناچار بوون بە قەراغ دیواری ژوورەکاندا جۆگە بکێشن_هەتا بتوانن لە شەڕی بۆق و شەیتانۆکە رزگار بن و تەختی ژوورەکە ئیشک بکەنەوە. خشتەکان لە بن پایەی تەختەکان دەربێنن و دیسان بە کەوشەوە لە نێو ماڵ هاتووچۆ بکەن. ئۆرلیانۆی دووهەم، کە تەواوی وەختی خۆی بە هەزاران گرفتاریی وردەوە خەریک بوو، نەیزانیبوو کە هێدی هێدی پیر دەبێ، هەتا رۆژێک ئێوارە، لە سەر سەندەلی دانیشتبوو، چاوی لە تاریکایی زووهاتوو بڕیبوو، بە بێ ئەوەی لەرزی هەوەسی هەبێ بیری لە پێترا کۆتیس کردەوە. بۆ ئەو گرفتێک نەبوو هەتا دیسان بەرەو ئەوینی لەززەتی فێرناندا، کە جوانییەکەی بە تێپەڕینی زەمان حاڵەتێکی دژواری هەبوو، بگەڕێتەوە، بەڵام باران هەر جۆرە پەلەکردنێکی هەوەساوی لەودا خنکاندبوو و ئارامییەکی ئەسفەنجانەی لە بێئیشتیایی پێ بەخشیبوو. بەو بیرەوە، کە ئەگەر ئەو بارانە ئێستا نزیکەی ساڵێک درێژەی هەیە، ئەگەر لە رابردوودا باریبایە ئەو چ نەدەما نەیکا، بیری خۆی خەریک دەکرد و رایدەبوارد. ئەو یەکێک لە هەوەڵین کەسان بوو، تەنانەت پێش ئەوەش "شیروانی" قرمیت لە رێگای کۆمپانیای مۆز لەوێ بڕەو پەیدا بکا. قرمیتی هێنابووە ماکۆندۆ. دەیویست بانی خانووی پێترا کۆتیس بکاتە قرمیت، هەتا بەدەنگی بارانێک کە لەو کاتدا دەباری لەگەڵ ئەو هەست بە نزیکایەتیی زۆرتر بکا. بەڵام تەنانەت بیرەوەرییەکانی شێتانەی لاویش ئاوری هەوەسێکی لە دڵدا هەڵ نەکرد. دروست وەک ئەوەی هەموو هەوەسی خۆی لە ئاخرین خۆشگوزەرانییەکانیدا خاڵی کردبوو و تەنیا هەر ئەوەندەی بۆ مابۆوە ئەوان بە بێ خەم و پەشیمانی یاد بکاتەوە. دەتگوت ئەو لافاوە ماوەی دابوویە دابنیشێ و بیر بکاتەوە. کاتێک بە کار و رۆنکارییەوە سەرگەم بوو، بە خاتری هەموو ئەو کارە باشانەی دەیتوانی لە ژیانیدا بیانکا و نەیکردبوون، دڵتەنگییەکی دیرهاتوو بە لەشیدا چووەخواری. بەڵام وەسوەسەی خانەنشینی، کە ئەوەی لە باوەشی گرتبوو، بەرهەمی داهێنانێکی نوێ، یان دەرسی ئەخلاق نەبوو، لە

جێگـایەکی دوورتـرەوە سـەرچاوەی هەڵگرتبـوو. بە چەنگـی بـاران لە ژێـر خاک رۆژانێک سەریان دەرهێنابوو، کاتێ لە ژووری مێلکیادێس دا ئەفسـانە خۆشـەکانی قـالیچە سـیحراوییەکانی پەرەنـدە و نەهەنگـانێکی کەشـتییان بە موسـافیرەوە قـووت داوە، دەخوێنـدەوە. لەو رۆژانەدا بـوو کە لە دەمێکـی خافڵاندا، ئۆرلیانۆی گچکە لە سەر هەیوانێ دەرکەوت و بابەگەورەی نهێنـی بوونی ئەوی بۆ ئاشکر ابوو، مووی سەری کورت کردەوە و لیباسـی دەبەر کرد و فێری کرد نـابێ لە خەڵکی بترسـێ و بەزوویـی دەرکەوت کە منـاڵەکە بەو سـەرگۆنە دەرپەڕیـوانە و نیگـای سەرسـوورمان و حـاڵەتی تەنیـایی، ئۆرلیانۆ بویندیایەکی راستییە. فێرناندا خەیاڵی راست بوو. زۆر دەمێک بـوو لە خۆبایی‌بوونی خۆی هەڵدەسەنگاند و چارەیەکی بۆی نەدەدۆزییەوە، هەتـا زۆرتر دوای رێگاچارە دەکەوت، کەمتر دەگەیشـتە چارەیەکی شیاو. ئەگەر دەیزانـــی کە ئۆرلیـــانۆی دووهەم بە حەزی بـــابەگەورەبوون، رووداوەکە هەروەکی چۆنە ئـاوای قبـووڵ دەکـا، هێنـدە بەخـۆڕایی ئـازاری نەدەکێشـا و خۆی لە دەست ئەو نیگەرانییەی لە ساڵێک پێشترەوە دەمی لە جەرگی نـاوە، رزگار دەکرد. ئامارانتا ئۆرسـۆلا، کە ئێستا ددانی تازەی هاتوون، لای وابوو خوشـکەزاکەی یـارییەکی گەڕۆکە و ئەوی لە دەسـت شـەڕی یەک پشـووی بـاران رزگـار دەکـرد. ئۆرلیـانۆی دووهەم ئەو جـار کەوتە بیـری فەرهەنگـی ئینگلیـزی، کە ئیـدی کەس لە ژووری پێشـووی مەمە کـاری پێـی نەبـوو. وێنەکـانی بە منـاڵەکـان پێشـان دەدا، بەتـایبەتی وێـنەی حەیوانـات، کەمێـک دواتـر، نەخشـەی جوغرافیـا و وێنەی سـەرزەمینە دوورەکـان و کەسایەتییە ناسراوەکان، لە بەر ئەوەی ئینگلیزی نەدەزانی و تەنیا دەیتوانی شـارەکان و کەسـایەتییە زۆر بەناوبانگەکـان بناسـێ، بـۆ رازیکردنـی هەسـتی کـۆڵینەوەی تێرنەخۆری منـاڵەکان، لە خۆوە دەستی دایە دروستکردنی ناو و ئەفسانان.

فێرنانـدا، بەراسـتی وایـدەزانی مێردەکەی چـاوەڕوانە بـاران لێـی کـاتەوە و بچێتەوە لای گراوییەکەی. لە هەوەڵین مانگەکانی باراندا لەوە دەترسا مەبادا مێردەکەی بێتەژووری خەوی ئەو و ئەو ناچـار بێ ئاشـکرای بکـا کە دوای لە دایکبـوونی ئامارانتـا ئۆرسـۆلا ئەو ئیـدی توانـای سـەرجێیی نییە. هـۆی نـامەگۆڕینەوە پـڕ نیگەرانییەکەشـی لەگەڵ پزیشـکانی نادیـار، کە بە هـۆی

وەزعی خراپی پۆست پچڕابوو، هەر ئەو هۆیە بوو. لە هەوەڵین مانگەکانی باراندا، دوای ئەوەی زانییان کە قەتارەکان لە بەر باران لە ڕێل دەرچوون، نامەیەک لە لایەن پزیشکانی نادیارەوە ئەوی ئاگادار کردەوە کە نامەکانی وەرناگرن. دوایی کاتێک پێوەندیی لەگەڵ ئەو نامەنووسە نەناسراوانە پچڕا، بەجیددی کەوتە ئەو بیرەی کەوڵەسەری ئەو پڵینگەی مێردەکەی لەو کەرنەڤاڵە خوێناوییەدا بە سەرخۆیدا کێشابوو، بە دەموچاوی خۆیدا بدا و بە ناوێکی دیکە بۆ موعایەنە بچێتە لای پزیشکی کۆمپانیای مۆز. بەڵام کەسێک لەو خەڵکەی زۆرجار هەواڵی خراپی لافاویان دەگەیاندە ئەوێ، پێی گوت کۆمپانیای مۆز خەریکە تەشکیلاتی خۆی دەگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی وشک. ئەو کاتە بوو، هۆمێدی بەردا و تەسلیم بوو و چاوەڕوانی وەستانی باران بوو هەتا وەزعی پۆست دیسان ڕەوتی ئاسایی خۆی دەست پێ دەکاتەوە. هەر لەو حاڵەدا ئازارە نهێنییەکانی بە خەیاڵاتی خۆی هێدی کردەوە، چونکە ئامادە بوو بمرێ و خۆی نەداتە دەست تەنیا پزیشکێک کە لە ماکۆندۆ مابۆوە ـ پزیشکێکی فەرەنسی کە وەک وڵاخان گیای دەخوارد. بەو هیوایەی ئۆرسوڵا بتوانێ بۆ هێرشی دەردەکانی دەرمانێک بدۆزێتەوە. لە پیرێژن نزیک بۆوە، بەڵام عادەتی بێ جێی، کە هیچ شتێکی بە ناوی خۆی ناو نەدەبرد، دەبوو بە هۆی ئەوەی، ئەوەی دەبێ هەوەڵێ بیڵێ، ئاخری دەیگوت و یا پێچەوانە، بەجۆرێک کە بۆ سووککردنەوەی شەرمی بابەتەکە "زانی" دەکردە "... کردن" و "سووتانەوەی" ناو دەنا "تکانەوە". لەو رووەوە ئۆرسوڵا زۆر مەنتیقی بەو ئەنجامە گەیشت کە نەخۆشییەکەی پێوەندیی بە "مناڵدان"ەوە هەیە و لە "ریخۆڵە"ی ئەوەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ و بۆی دانا کە بەیانیان لە خورێنی کەوچکێک (کلمل) بخواتەوە. ئەگەر لە بەر ئەو نەخۆشییەی، بێجگە لە خودی نەخۆشەکە، سووکایەتیی بۆ کەس نەبوو و لەبەر بزربوونی نامەکان نەبایە، باران بۆ فێرناندا هیچ گرنگ نەبوو، چونکە ژیانی ئەو بە هەر جۆر وەک رابردوو بوو، کە دەتگوت هەمیشە باران باریوە. لە عادەتەکانی خۆی دەستی هەڵنەگرت و تەنانەت لێشی کەم نەکردنەوە. کاتێک پایەکانی مێزی نانی نیوەڕۆی لە سەر خشت و پایەی کورسییەکان لە سەر تەختە بەرد داندرابوون، هەتا پێی

کەسانێکی نان دەخۆن تەڕ نەبێ، ئەو هەروا رووەمێزێ کەتانی بە سەر مێزەکەدا دەدا و قاپ و قاچاخی نان خواردنی چینیی ریز دەکردن و کاتی شام خواردن شەمەکانی هەڵدەکردن و لە سەر مێزی دادەنان، چونکە لەو باوەڕەدا بوو کە هیچ بەڵایەک نابێ داب و عادەتەکان تێک بدا. ئیتر کەس نەڕۆیشتبووە شەقام. ئەگەر بە مەیلی فێرناندا بووایە بەتەنیا لەو کاتەوە باران دەستی پێنەدەکرد، بەڵکو لە زۆر لەوە پێشیش کەس پێی لە ماڵەوە نەبردبا دەرێ، چونکە ئەو باوەڕی وابوو کە دەرگایان بەو مەبەستە داهێناوە کە هەمیشە داخرابێ و لێکۆڵینەوە سەبارەت بەو شتانە کە لە شەقام روویان دەدا کاری فاحیشانە. بەو حاڵەش، کاتێک هەواڵیان دا کە دەستەی بەرێکردنە قەبرانی جەنازەی سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بە خەیاباندا رادەبرێ، بۆخۆی هەوەڵین کەس بوو کە سەرنجی راکێشرا، هەر چەند ئەو دیمەنەی تەنیا لە پەنجەرەی نیوەکراوەوە چاو پێکەوت، بەڵام وەها خەمبار بوو کە هەتا ماوەیەکی زۆر لەعنەتی لە ورەی لاوازی خۆی کرد.

نەیدەتوانی رێورەسمێکی لەوە خەمهێنەرتر بێنێتە بەرچاوی خۆی. تابووتیان لە عارەبانەیەکی کەلان نابوو و لە سەرەوەی، تاقێکیان بە گەڵای مۆزان بۆ دروست کردبوو، بەڵام باران ئەوەندە چاک دەباری و شەقامەکان ئەوەندە قوڕ و چڵپاو بوون، کە هەرچەند هەنگاوێک چەرخەی عارەبانەکە لە قوڕی دەچەقی، تاقی گەڵاکان خەریکی هەڵوەرین بوو. بە هەڵڕژانی ئاوی خەمهێنەر بە سەر تابووتەکەدا ئاڵایەکی بەسەریاندا دابوو وردە وردە بە ئاو تلیسایەوە. هەمان ئاڵای خوێناوی و بارووتاوی پشەرکەرە لێوەشاوەترەکان قبووڵیان نەکردبوو. کەمەربەندەکەشیان لە سەر تابووتەکە دانابوو. هەما کەمەربەندی شۆرابەی زێو و ئاوریشمی پێوە بوون و هەمیشە پێش ئەوەی بچێتە ژووری خەیاتی ئامارانتا لە خۆی دەکردەوە، هەتا بە چەکەوە نەچێتە لای. لە پشت عارەبانەکە ئاخر کەسانکی دوای تەسلیم بوونی نێرلاندیا بەساخی دەرچووبوون، دەلینگی شەڵوارەکانیان هەڵدابۆوە و پاپەتی بە نێو قوڕوچڵپاودا بۆ پێشەوە دەڕۆیشتن و گۆچانی دار بە دەستێک، بەدەستەی دیکە تاجە گوڵێک لە

گــوڵی کــاغەزی کە لە بەر بــارانێ کــاڵ ببــوونەوە. وەک دیمەنێکــی باوەڕپێنەکراو گەیشــتنە شــەقامێک، کە هێشــتا نــاوی ســەرهەنگ ئۆرلیــانۆ بویندیای بەسەرەوە بوو و، لە حالی تێپەڕبووندا هەموویان چاویان بڕیبە ئەو ماڵە. لە سەر پێچی شەقامەکە بۆلای مەیدان سووڕانەوە و لەوێ ناچار بوون، چونکە عارەبانەکە لە قوڕێدا ڕۆچووبوو، داوای یارمەتی بکەن. ئۆرسوڵا بە یارمەتیی سانتا سۆفیا دێلا پێداد خۆی گەیاندبووە دەرگای ماڵەوە. ئەوەندە بەوردی سەیری رابردنی سەنگینی ڕێوڕەسمی بەڕێکردنی جەنــازەی دەکــرد، هــیچ کەس نەیزانــی ئەو نایــانبینێ، چــونکە دەســتی بەرزبۆوەی وەک دەستی جوبرائیل لەگەڵ تەکانی عارەبانەکە هاودەنگیی دەکرد.

هاواری کرد: 'خوا ئاگادارت بێ، خرینیلدۆ، کوڕم، سڵاوی من بە کەسەکانم بگەیەنە و پێیان بڵێ کاتێک باران لێی کردەوە دێمە سۆراخیان."

ئۆرلیانۆی دووهەم یارمەتیی دا هەتا بگەڕێتەوە سەر جێگا و بانی و، بە وتەیەکی غەیرە رەسمی، کە هەمیشە بەرامبەر بەو هەیبوو مەبەستی ماڵئاواییەکەی پرسی.

ئۆرسوڵا وتی: "ڕاست دەڵێم، تەنیا چاوەڕوانم باران لێی کاتەوە هەتا بمرم."

وەزعی شەقامەکان ئۆرلیانۆی دووهەمی دوودڵ کردبوو. بە نیگەرانییەکی درەنــــگ گەیشــــتوو، ســــەبارەت بە چارەنووســــی حەیوانەکــــانی، پارچەمشــەممایەکی بە ســەریدا دا و ڕۆیشــتە مــاڵی پیتراکــۆتیس. ئەوی لە حەوشەی چۆڵ بینی کە ئاو هەتا نیوەقەدی هاتووە و خەریکە کەلاکی ئەسپێک دەردەکێشێ. ئۆرلیانۆی دووهەم بە بێڵێک یارمەتیی دا. کەلاکی گەورەی حەیوانەکە بە سەر خۆیدا وەرگەڕا و لەگەڵ لافاو و قوڕ سواخ درا. لەوکاتەوە باران دەستی پێکردبوو پێترا کۆتیس تەنیا کاری هەر بەتاڵکردنی حەوشەبوو لە کەلاکی حەیوانەکان. لە ماوەی حەفتەکانی هەوەڵدا چەندین جار پەیامی بۆ ئۆرلیانۆی دووهەم نارد، هەتا بۆ بەربەست کردن هەنگاوی پێویست هەڵێنێ، بەڵام ئەو وەڵامی دابۆوە، پەلەی پێ ناوێ و لە خۆوە سەری لێنەشێوێ، کاتێک باران خۆشیکردەوە چارەیەکی دەکەن. پێترا کۆتیس دیسان پەیامی نارد کە ئاو کۆخە مریشکەکانی داگرت

و رانە حەیوانەکان بۆلای ئەو زەوییە بەرزانە رادەکەن کە هیچ لەوەڕێکی بۆ خواردنی ئەوان پێوە نییە. زەوی و زارێکی پڕ بوون لە پڵینگ و تاعوون. ئۆرلیانۆی دووهەم وەڵامی نارد کە ناتوانێ هیچ کارێک بکا، کاتێک باران لێیکردەوە حەیوانی دیکە زاوزێ دەکەن، پێترا کۆتیس دەیدی حەیوانەکان دەستە دەستە دەمرن و تەنیا کاتی ئەوەی هەبوو ئەو حەیوانانەی لە قوڕدا گیریان دەکرد لەت و پەت بکا. بە بێ ئەوەی هیچ کارێکی لە دەست بێ، دەیدی سێلاو بە بێ بەزەیی سامانێک، کە زەمانێک بە گەورەترین و راوەستاوەترین سامانی ماکۆندۆ دەژمێردرا، لە نێو دەبا و لە جێگای تەنیا بۆنی پیس بەجێ دێڵی، بەڵام سەرەنجام، کاتێک ئۆرلیانۆی دووهەم بڕیاری دا بۆ راگەیشتن بە کارەکان بچێتە ئەوێ، لە کاولی تەویلەدا تەنیا کەلاکی ئەسپ و یەسترێکی پیسی بینی. پێترا کۆتیس بە بێ دەربڕینی خۆشحاڵی و بە بێ سەر سوورمان یان پەشیمانی چاوی لە هاتنی ئەو کرد و تەنیا رێگەی بە خۆیدا بزەیەکی سەرگۆنای بێتێ.
وتی: "زۆر زوو تەشریفیان هێنا!"
پیر ببوو،ببووە چەنگێک پێست و ئێسقان، چاوەکانی، کە هەمیشە وەک جانەوەرێکی دڕندە دەبریسکایەوە، هێندە تەماشای بارانی کردبوو خەمبار و رام ببوون. ئۆرلیانۆی دووهەم زۆرتر لە سێ مانگان لە ماڵی ئەو مایەوە، نە لە بەر ئەوەی وەزعی لەوێ لە ماڵی خۆی باشتر بوو، بەڵکو تەنیا لە بەر ئەوە کە دەرفەتی نەبوو هەتا جارێکی دیکە مشەممایەکەی بە سەری خۆیدا داتەوە. هەروا کە لە ماڵی خۆیشیان وتبووی، دەیگوت: "پەلەی ناوێ، هیوادارم هەتا چەند سەعاتی دیکە ببێتەوە ساو." لە ماوەی حەفتەی هەوەڵ خووی بەو چرچ و لۆچانەوە گرت کە زەمان و باران لە گراوییەکەیدا پێکیان هێنابوو و وردە وردە ئەوی وەک پێشوو هاتەوە بەرچاو و شۆر و شەوقی ئەو و ئەو بەرهەمهێنەرییە سەر سووڕهێنەرەی، کە ئەوینی ئەو لە حەیوانەکان پێکی هێنابوو، هاتەوە یاد و لە حەفتەی دووهەمدا کەمێک بە خاتری ئەوین و هێندێکیش لە بەر خۆشی، شەوێک بە لاواندنەوە ئەوی لە خەو هەستاند. پێترا کۆتیس بە بێ دەست وەبەرنان بە نارەحەتی وتی: "بێدەنگ بنوو کاتی ئەو کارانە نییە." ئۆرلیانۆی دووهەم خۆی لە ئاوێنەکانی

میچدا بینی، مۆرەکانی پشتی پێترا کۆتیسی بینی وەک ریزە ئێسقانێ، بە رەگی لاوازییەوە بەن کرابن، زانی حەق بەوە نەک لە بەر وەزعی زەمانە، بەڵکو لە بەر خۆیان کە ئیدی توانای ئەو جۆرە کارانەیان نەمابوو.
ئۆرلیانۆی دووهەم بەو دڵنیاییەوە، کە نە تەنیا ئۆرسوڵا، بەڵکو تەواوی خەڵکی ماکۆندۆ چاوەڕوانن باران لێیکاتەوە هەتا بمرن، بە سندووقەکانی خۆیەوە گەڕایەوە بۆ ماڵ. کاتی رابردن تەماشای خەڵکی دەکرد کە لە ماڵەکانیان دانیشتبوون و چاویان بە مۆڵەق وەستاوە و دەستیان لە بەریەک رۆکردوون و گوێیان لە دەنگی رەوتی زەمانە، زەمانی رام نەبوو. سەرنجیان ئەوەندە بە لای بارانەوە راکێشرابوو، کە ئیدی دابەشکردنی زەمان بە سالان و مانگان و، دابەشکردنی رۆژان بە سەعاتان بێ سوود بوو. منالەکان بە خۆشحالی و هەڵپەوە پێشوازییان لە ئۆرلیانۆی دووهەم کرد. چونکە دەیانزانی دیسان ئۆکۆردیۆنیان بۆ لێدەدا. بەڵام لەو کۆنسێرتانە بە ئەندازەی تەماشای فەرهەنگ خۆشیان نەدەهات. لە بەر ئەوە دیسان لە ژووری مەمە کۆبوونەوەی تەماشای وێنان دەست پێکرایەوە. خەیاڵپڵاوی ئۆرلیانۆی دووهەم کەشتییەکی ئاسمانی دەکردە فیلێکی پەرەندە کە لە لابەلای هەوراندا بۆ شوێنی خەوتن دەگەڕا. جارێکیان چاوی بە وێنەی پیاوێک کەوت، کە سواری ئەسپێک بوو و هەر چەند لیباسی سەیری لە بەردا بوو، بەڵام قیافەی ئاشنا بوو. لە دوای ئەوەی لە نزیکەوە تێیڕوانی بەو ئاکامە گەیشت کە ئەو وێنەیە وێنەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیایە. وێنەکەی بە فێرناندا نیشان دا، ئەویش ئەو لێکچوونەی سەلماند، نەتەنیا لەگەڵ سەرهەنگ، بەڵکو لەگەڵ تەواوی بنەماڵە. لە راستیدا ئەو وێنەیە، وێنەی شەڕکەرێکی تاتار بوو. ئۆرلیانۆی دووهەم زەمانێ بەو جۆرە لە نێوان هەیکەلی غوولپەیکەری شاری رید[1] و ئەفسوونکەرانی مار بردە سەرێ، هەتا ئەمەی ژنەکەی خەبەری پێدا کە لە عەمبار تەنیا شەش کیلۆ گۆشتی خوێکراو و کیسەیەک برینج ماوە.
پرسی: "باشە دەتەوێ چ بکەم؟"

---

[1]- هەیکەلی هێلیووس لە دوورگەی رد لە یونان ـ سەدەی سێهەمی پێش زایین کە لە ساڵی ٢٢٤ پێش زانین بەهۆی بوومەلەرزە لە نێو چوو ـ و.

فێرناندا وەڵامی دایەوە: "پێوەندیی بە منەوە نییە، ئەو کارانە ئەرکی پیاوانن؟"
ئۆرلیانۆی دووهەم وەڵامی دایەوە: "زۆر باشە، کاتێک باران وەستایەوە، کارێک دەکەین".
لە جیاتی ئەوە خەریکی گیروگرفتیماڵەوە بێ و تەنانەت ئەو کاتەش کە ناچار بوو بۆ نانی نیوەڕۆ تەنیا بە کوتەگۆشتێک و لوێچە برینجێک رابوێرێ. زۆرتر لە جاران غەرقی تەماشای فەرهەنگ بوو. دەیگوت: "ئێستا کە ناتوانین هیچ بکەین. ئەو بارانەش هەتا ئەبەد نابارێ." هەروا کە پیویستی پڕکردنەوەی عەمبار توند بوو، نارەحەتیی فێرناندش لە زیادیی دا. هەتا رۆژێکیان بەیانی، رەخنەی جار بە جاری و شەڕی زۆر بە کەمی، بوو بە لافاوێکی سەررێژ و یاخی. لە پێشدا وەک لێدانەکانی ئاوازی گیتار بوو و هەر کە رۆژ دەگەیشتە نیوەی، لێدانی گیتار توندتر و دەوڵەمەندتر دەبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم هەتا سبەی ئەو رۆژە نەیزانی ئەو دەنگە چییە ، لە سەر نانی بەیانی زانیی دەنگی وزەوزێکی یەکئاواز بوو کە بە دەنگێک کە بە ئاوازتر و بەرزتربوو لە دەنگی رێژنەباران، ئەوە دەنگی فێرناندا بوو کە بە ماڵێدا دەگەڕا و بە بۆڵە وزەوزی دەکرد. کە ئەو وەک شاژنێک گەورە بووبوو، ئێستا لە شێتخانەیەکدا قەرەواشی دەکا و مێردە تەمبەڵ و بێکارەکەی لاقی لە سەر لاقی داناوە و چاوەڕوانە لە ئاسمانەوە لە جیاتی باران نان ببارێ و ئەویش خەریکە خۆی دەکوژێ، هەتا ئەو ماڵەی بە دەرزی پێکیییەوە ناوە لە غەرق بوون رزگاری کا و، ئەو هەموو کارە هەیە کە دەبێ بکرێ و ئەو هەمووە دەبێ رایکێشی و ئەو هەمووە دەبێ دروست کەیەوە ..... لە تاوکەوتنەوە هەتا شەوێ، کە کاتی خەوتن دەهات دەیگوت و دەیگوتەوە و، سەرەنجام بە چاوی پڕ لە وردەشووشەوە خەوی لێدەکەوت، بە بێ ئەوەی هیچ کەس سبەی ئەو رۆژە پێی بڵێ کە: "بەیانیت باش فێرناندا، دوێشەو چۆن خەوتی؟ " هیچ کات کەسێک تەنانەت لە رووی ئەدەبیشەوە بووبێ، لێی نەدەپرسی: "فێرناندا بۆچی رەنگت ئەوها پەڕیوە، بۆچی بەو ئاڵقە رەشانەی دەوری چاوەکانت لە خەو هەستاوی؟" بەڵام ئەو چاوەڕوانیش نەبوو کە کردەوەیەکی ئەوتۆ لەو بنەماڵەیە بکرێ ـ

بنەماڵەیەک کە لە قوڵایی دڵەوە هەمیشە وەک ئازاردەرێک چاویان لێکردبوو و دایمە لە کەلێن و قوژبنی ماڵەوە وەک دەسگرەی مەنجەڵی سەر ئاگردان یان بووکەڵەی خوار و خێچی دیوار ناویان دەهێنا و پاشملە باسیان دەکرد. پێیان دەگوت مشکی کلێسا و ساختەچی و ڕێوی سفەت و، تەنانەت ئامارانتای خوالێخۆشبووش وتبووی: "ئەو لەو کەسانەیە کە بە کونگی دەڵی پف پف بە دوامدا مەیە بۆنت لێ دێ". خوایە چ واژانێک و ئەو هەمووی ئەو شتانەی لە بەر خوای مەزن بە سەبر و لەخۆبووردوویی قبووڵ کردبوو. بەڵام ڕۆژێک تاقەتی لێبڕابوو کە ئەو خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمە وەحشییە وتبووی، بەدبەختی بنەماڵەی ئەوان لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد کە باکوورییەکیان هێناوەتە ماڵی خۆیان: "بیری لێ بکەنەوە باکوورییەکی زۆردار، خوا لە فریامان بێ، کچی باکوورییەکی پیس لە نژادی ئەو کەسانە کە دەوڵەت ناردبوونی هەتا کرێکاران قەلاچۆ بکەن. "بەڵێ، خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم بێجگە لەو، تانەی لە کەسی دیکە نەدەدا، بە منداڵی تەعمیدی دوک ئالبا[٢]، بە خانمێک کە بە پلە و شکۆداریی خۆیەوە ژنی سەرکۆمارانی دەلەرزاند، بە خانمە ئەشرافزادەیەکی ئەسڵ کە مافی هەبوو بە دوازدەناوی سەد لە سەد ئیسپانیۆلی ناوی بنەماڵەیی خۆی مۆر بکا و، لەو شارە حەرامزادەیەدا تەنیا کەسێک بوو کە لە چاوپێکەوتنی شازدە دەست کەوچک و چەنگاڵ و کار سەری لێ نەدەشێوا. ئەو کات ئەو مێردە خیانەتکارە خش خش پێدەکەنی و دەیگوت ئەو هەموو کارد و چەنگاڵە هی مرۆڤ نییە، بۆ نان خواردنی هەزارپێ دەبن. تەنیا کەسێک بوو کە بە چاوبەستراوی دەیتوانی بڵێ شەرابی سپی دەبێ چ کاتێک بخۆریتەوە و لە چ لیوانێکدا و لە کام لاوە دە لیوان بکرێ و شەرابی سوور چ کات بخۆریتەوە و لە کام لاوە دەبێ دەلیوان بکرێ _ نەوەک ئەو ئامارانتا دێهاتییە خوالێخۆشبووەی لای وابوو شەرابی سوور دەبێ ڕۆژ بخۆریتەوە و شەرابی سپی شەوانە. لە سەرتاسەری مەڵبەندی کەناردا تەنیا کەسێک بوو کە دەیتوانی شانازی بە خۆیەوە بکا کە لە لەگەنی زێڕدا دەست بەئاو دەگەیەنێ و ئەو کات سەرهەنگ ئۆرلیانۆی خوالێخۆشبوو بە کەماڵی

[٢]– Suce di Albe

پڕڕوویی و رووهەڵماڵراوی بەو زمانشڕییە حەمباڵانە بڵێ: "ئەو لە کوێوە ئەو باڵادەستییەی پێداوە؟" کەوابوو رەنگە لە جیاتی گوو گوڵەگەنم دادەنێ!" بیری لێبکەنەوە دروست بەو وشانە! و ئەو جار ریناتا کچەکەی خۆی کە بە خۆکاوی و ناکاو پیساییەکەی لە ژووری خەوی ئەودا بینیبوو ئاوای وەڵام داوەتەوە: "دیارە راستە ئەو لەگەنە هەمووی لە زێڕی خالیس دروست کراوە و نیشانەی بنەماڵەیشی لێ هەڵکەندراوە، بەڵام بێجگە لە گوو چی تێدا نییە، گوویەکی خالیس و پیستر لە هەموو گووی دیکە." بۆچی، چونکە گووەکە، گووی باکوور بوو. بیری لێبکەنەوە، کچی مرۆڤ خۆی! کەوابوو لە کەسانی دیکەی بنەماڵە چ چاوەڕوانییەک دەبێ هەبێ، بەڵام بە هەر حاڵ، لە مێردەکەی هێندێک زۆرتر چاوەڕوانیی هەبوو، چونکە چاک یان خراپ، هەر چۆنی بێ مێردی بوو و هەمدەمی بوو و گراوی یاسایی بوو و بە مەیل و ئیرادەی خۆی مێردی پێ کردبوو، مێردێک بوو کە بەرپرسایەتیی قورسی جیاکردنەوەی ئەوی لە ماڵی باوکی بەئەستۆ گرتبوو. لەو جێگایە، کە لە هیچی کەم نەبوو، هیچ کات لە بەر نەبوونی شت بۆڵەی نەکردبوو و تەنیا لە بەر کات بەسەربردنی و خۆیشی تاجی گوڵی بەرێکردنی جەنازەکەی دروست دەکرد و کاتێک باوکی تەعمیدی نامەی بۆ دەنارد، تەنانەت مۆری ئەنگۆستیلەی خۆی لە لاکی پاکەتەکەی دەدا تەنیا بۆ ئەوەی پێی بڵێ، دەستی کچە تەعمیدییەکەی بۆ کاری ماڵەوە دروست نەکراون، بەڵکو بۆ لێدانی کلاوسێن دروست کراون. بەو حاڵەش ئەو مێردە شێتەی بەو هەموو راسپاردە و ئەملا و ئەولا کردنە، ئەوی لە ماڵی باوکی جوێ کردەوە و هێنایە ئەو تاوە جەهەننەمییەی ئینسان نەیدەتوانی لە بەر تینی گەرما هەناسە هەڵکێشێ و، پێش ئەوەی بتوانێ دەورەی رۆژووی خۆی تەواو کا بە باولە دەربەدەرەکانی خۆیەوە و ئەو ئۆکۆردیۆنە وێڵگەردانەییە چووبوو هەتا خەیانەت بەو بکا، ئەویش لەگەڵ ژنێکی بەلالێدراوی بێ قەوارە، کە تەنیا ئەوەندە بەس بوو تەماشای کونگی بکەی. ئاخ!

ـ چاکە چ دەکرێ بیکەی ئەو وشەیەی لە دەمی دەرپەڕیبوو ـ ئەوەندە بەس بوو ئەماشای نەرمەی سمتی وەک ماینی بکەی کە چۆن خۆی دەلەنگێنێ، هەتا بزانی دروست پێچەوانەی ئەوبوو، ئەو کە ژنێکە، ژنێک،

ژنێک، خانمێک بوو کە لە رۆژی لەدایکبوونەوە، چ لە سەر مێز و چ لە نێو تەختی نووستندا خانم بوو، بەترس لە خوا، فەرمانبەری یاساکانی خوا، بەندەی دەستوورەکانی خوا و، دیارە مێردەکەی نەیدەتوانی لەگەڵ ئەویش وەک یەکی دیکە مۆنی و کێشەی لەگەڵ بکا، یەکی دیکە ئامادەی هەموو کارێک دەبوو دروست وەک ئەو ژنە فەڕەنسییانە و رەنگە زۆر خراپتریش لەوان، چونکە لانیکەم ئەوان شەرافەتی ئەوەیان هەبوو کە لە پشت دەرگای ژووری خۆیان چرای سوور هەڵکەن. بیری لێ بکەنەوە، لەو پیسکارییانە، لەگەڵ ئەو، تەنیا کچی خۆشەویستی دوناریناتا ئارگۆتە[٢]، و دۆن فێرناندا کرپیۆ، بەتایبەتی باوکی، کە پیاوێکی پیرۆز بوو، مەسیحییەکی شیاوی پێداهەڵگوتن بە پێناسەیەکی گرنگی مەزهەبی، لەو کەسانەی راستەوخۆ لە لایەن خواوەندەوە بە وەرگرتنی ئەو ئیمتیازە دەگەن، کە لە نێو گۆڕی خۆیاندا نەڕزن، بە پێستی ساف وەک کوڵمەی بووک و چاوانی زیندوو و بریسکەدار وەک زومرود.

ئۆرلیانۆی دووهەم بۆڵەبۆڵی بڕی و گوتی: "ئەو یەکەیان ئیتر راست نییە، کاتێک هێنایان بۆ ئێرە لاشەکەی بۆنی گرتبوو."

دوای ئەوەی رۆژێکی تەواو پرتەوبۆڵەی ئەوی بیست و هەڵی کرد، سەرەنجام جومگەی دەستی گرت. فێرناندا بە بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەکانی ئەو، تەنیادەنگی خۆی هێندێک کەم کردەوە. ئەو شەوە، لە سەر نان خواردنی شەو، دەنگی ئەو وزەوزەی شێتیهێنەرە بە سەر دەنگی باراندا سەرکەوتبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم زۆر کەمی نان خوارد. لە تەواوی ماوەی شام خواردندا سەری خۆی بەر دایەوە و دوای شامیش دەسبەجێ رۆیشتە ژووری خۆی، بەیانیی ئەو رۆژە، لە سەر مێزی نان خواردنی بەیانی، فێرناندا کە دیار بوو شەوی پێشتر زۆر چاک نەنووستبوو، دەلەرزی و دیار بوو هەموو دەردە دڵەکانی هەڵڕشتووە. بەو حاڵەش کاتێک مێردەکەی داوای لێکرد ئەگەر ئیمکان هەیە هێلکەیەکی بۆ دەڵەمە بکا، ئەو لە جیاتی ئەوە بە ساکاری وەڵامی داتەوە کە هێلکە مریشکەکان لە حەوتووی هەوەڵی بارانەوە تەواو بوون، دەستی کرد بە رەخنەگرتن لە

[٢]– Renata Argote

پیاوانێک کە دایمە لە فکری زلکردنی زگی خۆیان دان و ئەمەندە بە چاو و روون لە سەر مێزی نانخواردن جەرگی کۆترەبارێکە داوا دەکەن. ئۆرلیانۆی دووهەم وەک هەمیشە منداڵەکانی لەگەڵ خۆی برد بۆ دیوی مەمە بۆ تەماشای فەرهەنگ و، فێرناندا بەو بیانووە کە دەیەوێ ژووری مەمەی رێکوپێک بکا رۆیشتە ئەوێ، دیارە تەنیا لە بەر ئەوە پرتەو بۆڵەی خۆی لەوێ دەگوێی باخنێ و پێی بڵێ کە زۆر رووهەڵماڵراوییە بەدرۆ بەو منداڵە بێگوناحانە بڵێی وێنەی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە فەرهەنگ دایە. دوای نیوەڕۆ کاتێک منداڵەکان خەوتبوون، ئۆرلیانۆی دووهەم رۆیشت لە هەیوان دانیشت، بەڵام فێرناندا نەیهێشت لەوێش بحەسێتەوە، ئازاری دا، هانی دا، بە وزوزی توندی مێشەکەرانەی خۆی بە دەوروبەریدا هەڵخولا. دەیگوت ئێستا لێرە بەدواوە دەبێ بەردان بخۆن، بەڵام مێردەکەی وەک پاشایانی رۆژهەڵات لە هەیوانێ دانیشتووە و تەماشای بارانێ دەکا، دیارە روونە، چونکە ئەو بەرەڵڵایانە، کەسێک کە بە دەردی هیچ شتێک نایە و دەیەوێ هەمیشە خەڵکی خزمەتی بکەن، لە لۆکەش نەرمترە، عادەتی کردووە ماڵ و سامانی ژنان بخوا و وا دەزانێ لەگەڵ ژنی یونس زەماوەندی کردووە کە باوەڕی بە داستانی نەهەنگ کردبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم، دوو سەعاتی تەواو، بە بێ ئەوەی حاڵەتی بگۆڕێ، دروست وەک پیاوێکی کەڕ، گوێی دایە قسەکانی و پرتە و بۆڵەی ئەوی هەتا پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ نەبڕی _هەتا ئەو کاتەی نەیتوانی لەوە زۆرتر گوێ بداتە دەنگی ئەو تەپڵەی کە مێشک ئازار دەدا.

بە داواکردن لەو وتی: "تکایە کڕبە."

فێرناندا بەپێچەوانە دەنگی بەرزتر کردەوە کە: "بۆچی من کڕ بم؟ هەر کەس نایەوێ دەنگی منی گوێ لێ بێ، باشتر وایە بچێتە شوێنێکی دیکە." ئەو کاتە ئۆرلیانۆی دووهەم خۆی پێ نەگیراو، دروست وەک ئەوەی دەست و پێی خۆی راکێشێ، بە بێ تاڵووکە لە جێگای خۆی هەستا و بە رقێکی تەواو حیسابکراو، یەک بە دوو یەکدا، گوڵدانە بگۆنیاکان، گوڵدانە شەمعدانییەکان و گوڵدانە پنگەکانی هەڵگرتن و بە زەوی حەوشەی دادان و وردی کردن. فێرناندا زۆر ترسا چونکە هەتا ئەو دەمە لە هێزی دەروونی

و تواناى خۆى نەگەيشتبوو، بەڵام بۆ چاككردنەوەى رەوتەكە، زۆر درەنگ ببــوو. ئۆرليــانۆى دووهەم، كە بە هــۆى تەوژمـــى لافــاويكى دەروونـــى دەرمـانخوارد ببوو، شووشـەى گەنجەى سرويسـە چينييەكانى شكاند و بە بێ پەلە، يەكە بە يەک دەورييە چينييەكانى لە گەنجە دەرهێنان و بە ئەرزيدا دان، هەڵسـوكەوتى ريكوپێـک و ئـارام بـوو، دروسـت وەک ئەو كـاتەى سەرتاسـەرى مـاڵەوەى بە پـارە داپۆشـيبوو. ئەمجـار دەسـتى كـرد بە هەڵداشـتنى كريسـتاڵەكانى ديـوار و گوڵـدانەكانى بە دەسـت نەقاشـيكراو و تابلۆى كچانى جوان لە قايقى پڕ لە گوڵى سوور و ئاوێنەكانى قاپزێڕ، لە ساڵۆنەوە هەتا عەمبار هەرچى شتى شكانێ بوو شكاندنى و وردى كرد. سەرى ئاخر گۆزەى گەورەى سەفالى نێوەڕاستى ئاشپەزخانەى هەڵگرت و فرێـى دايە نێوەڕاسـتى حەوشـە و تەقيـيەوە و ورد بـوو. ئەو جـار دەسـتى شوشــتنەوە و پــارچە مشــەممايەكى بە ســەريدا دا و رۆيشــت و، پــێش نيوەشەو بە چەند پارچە گۆشتى گەورەى خوێكراو، چەندين گوێنى برينج و گـولەگەنمى تـازە و چەنـد سـندووق مـۆز گەڕايەوە مـاڵەوە. لەوە بەدوا كەمبوونى خواردەمەنى لە ماڵەوە نەما.

ئامارانتـا ئۆرسـۆلا و ئۆرليـانۆى چكـۆلە دەورانـى بارانيـان وەک دەورانێكـى خـۆش يـاد دەكـردەوە، لەگەڵ سـەختگيرى فێرنانداشـدا خۆيـان لە قـولكە پڕئاوەكـانى حەوشـــە داويشــت و مارمێلكەيــان دەگــرتن و بە تيغــى لە بەريەكيـان هەڵـدەدڕين و كـاتێكيش سـانتا سـۆفيا دێـلا پێـداد هۆشـى لە جێگايەكى ديكە بوو، بەو خەياڵە كە خەريكن سووپەكەى دەرمانداو دەكەن. تـۆزى بـاڵە پەپوولانيـان تێـدەكرد. ئۆرسـۆلا گەورەتـرين كەرەسـەى يـاريى سەرگەرميى ئەوان بوو. پێيان وابوو ئەو بووكەڵەيەكى گەورەى شكاوە، بە دواى خۆيانــدا بــۆ ئەو گۆشــە و ئەو گۆشــە رايان‌دەكێشــا و، پــارچەى رەنگاورەنگيان دەبەر دەكرد و دەموچاويان بە دووكەڵ و خاكەڕەژى رەش دەكرد. جاريكيان كەمى مابوو هەروەک چاوى بۆقێكيان دەرهێنابوو، چاوى ئەويش بە مەقەستى باخەوانى لە كاسەسەرى دەربێنن. بەڵام لە هيچ شتێک بە ئەندازەى قسە بزڕكاندنى خۆشييان نەدەهات. لە راستيدا نزيكەى سێهەم ساڵى بـاران بـوو كە بێگومـان شـتێک لە مێشـكى ئۆرسـۆلادا ببـووە هـۆى

ئەوەی راستیی هەموو شتێکی لێ تێک چێ، زەمانی ئێستای لەگەڵ زەمانەکانی زۆر دووری ژیانی خۆی لێ تێک دەچوو، بە جۆرێک جارێکیان، سێ رۆژی تەواو، بە خاتری مردنی نەنکی، پێترۆ نیلا ئیگواران، کە سەد ساڵ پێشتر مردبوو، فرمێسکی رشت. وەها گێژ ببوو کە لای وابوو ئۆرلیانۆی چکۆڵە منالی خۆیەتی، سەرهەنگ ئەوەی بردبوویان بۆ دیتنی سەهۆڵ و خۆزێ ئارکادیۆ کە لەو زەمانیدا هێشتا لە مەدرەسەی فەقێیان بوو، کورە گەورەیەتی کە لەگەڵ کاولییەکان رۆیشتووە، ئەوەندە بۆ منالەکان، بەدوور و درێژی، قسەی لە بنەماڵە کرد کە منالەکان، دیدارەکانی خەیاڵییان بۆ پێک هێنا، نەتەنیا لەگەڵ ئەوانەی کە زۆر دەمێک بوو مردبوون، بەڵکو تەنانەت لەگەڵ ئەو مەوجوودانەی کە لە دەورانەکانی جۆربەجۆردا ژیابوون. ئۆرسۆلا بە بسکی خۆڵەمێشاوی و دەموچاوێک کە لە رووسەرییەکی سوورییەوەی پێچابوو، لە سەر تەختی دادەنیشت و لە نێو ئەو قەومە خەیاڵییانە کە منالەکان بە بێ پەراندنی بچووکترین تایبەتمەندییەکان بۆیان باس دەکرد، هەستی بە خۆشبەختی دەکرد. دروست وەک ئەوە وابوو کە منالەکان بەراستی ئەو قەومانە دەناسن. ئۆرسۆلا لەگەڵ باوباپیرانی خۆی سەبارەت بە رووداوانێک کە لە پێش لەدایکبوونی خۆی روویان دابوو دەدوا و، لەو هەواڵانەی پێیان دەدا خۆشحاڵ دەبوو و، لەگەڵ ئەوان بۆ ئەو کەسانە دەگریا کە زۆر پێش مردنی میوانە خەیاڵییەکانی مردبوون. زۆری پێ نەچوو منالەکان زانییان کە ئۆرسۆلا لەو دیدارانەدا لەگەڵ تارامییان، هەمیشە دەپرسێ کە چ کەسێک هەیکەلی گێچی حەزرەتی یوسفی بە ئەندازەی سروشتی لە زەمانی شەڕدا هێناوەتە ماڵی و بەوی سپاردووە، هەتا دوای کۆتایی وەرزی باران بێ بۆ وەرگرتنەوەی. ئەوە بوو کە ئۆرلیانۆی دووهەم بیری ئەو سامانە گەورەیەی کەوتەوە، کە لە شوێنێکی شارابۆوە و تەنیا ئۆرسۆلا پێی دەزانی. بەڵام زیرەکییەکانی کە لەو بارەیەوە دەینواندن بەخۆڕایی بوو، چونکە ئۆرسۆلا لە لابەلای بزرکاندنەکانیدا دەتگوت بەشێک لە هۆشی بەتایبەتی رووناک هێشتۆتەوە، هەتا ئەو نهێنییەی نەدرکێنێ. ئەوی تەنیا بە کەسێک دەوت کە بیسەلمێنێ بەراستی خاوەنی ئەو زێرە شاراوەیە،

ئەوەنده لە بیری خۆیدا شارەزا و یەک دەندە بوو کە کاتێک ئۆرلیانۆی دووهەم یەکێک لە هاورێکانی دەورانی میوانییەکانی خۆی فێر کرد خۆی وەک خاوەنی ئەو سامانە بە ئۆرسۆلا بناسێنێ، ئۆرسۆلا بە پرسیاری ورد و داوی پێشبینی نەکراو بەزاندی.

ئۆرلیانۆی دووهەم بە دڵنیایی ئەوە کە ئۆرسۆلا ئەو نهێنییە دەباتە بن گڵ. بە بیانووی ئەوە کە دەیەوێ حەوشەی لوولەکێشی بکا، چەند کرێکار و وەستایەکی گرت و بۆخۆشی لەگەڵ ئەوان بە هەموو جۆرە کەرەسەیەک خەریکی هەڵکەندن بوو. لە سێ مانگی هەڵکەندندا شتێکی کە پێی بڵێن زێر. نەیاندۆزییەوە. ئەو کات بە هیوای ئەوە کە رەنگە فالی وەرەق چاکتر لە زەوی هەڵکەندن یارمەتیی بدا، رۆیشت بۆ لای پیلا تێرنێرا، بەڵام ئەو وتی هەر کارێکی بکەی بێ فایدەیە. مەگەر ئۆرسۆلا بۆخۆی وەرەقەکان لێک بدا. هەر چۆنی بێ بوونی گەنجەکەی سەلماند و بەناوهێنانی وردی ئەوەی کە حەوت هەزار و دووسەد و چاردە سکەی زێڕە، لە سێ کیسەدا کە زارکیان بە سیمی زێو بەستراوە و لە بارنەیەکی بە پانایی سەدوبیست و دوو میتریدا هەڵکەوتووە، کە تەختی ئۆرسۆلای لە ناوەندی ئەو بازنەیدایە. هەروەها وتی کە دۆزینەوەی گەنجەکە لە پێش کۆتایی باران ئیمکانی نییە و کاتێک ئیمکانی دەبێ کە تاوی سێ مانگی ژووئەنی لە سەریەک تۆپەقوڕان بکاتەوە گڵ. شێکردنەوە و درێژەپێدانی زۆر و روون نەبوونی ریکەوتەکە لە روانگەی ئۆرلیانۆی دووهەم وەک داستانی ئەرواحان دەچوو. لە بەر ئەوە هەر چەند لە مانگی ئووتدا بوون و بۆ وەڕاستگەڕانی ئەو پێشگۆییە سێ ساڵی سەبر دەویست، بەڵام ئەو هەر چۆنی بێ دەستی لە هەڵکەندن هەڵنەگرت. ئەوەی کە یەکجار زۆر ببووە هۆی سەرسووڕمانی و گێژی کردبوو، ئەوە بوو کە لە تەختی ئۆرسۆلاوە هەتا ئاخری دیواری حەوشە دروست سەدوبیست و دوو میتر بوو. فێرناندا بە چاوپێکەوتنی ئەو، کە خەریکە زەوی دەپێوێ و لەوێش خراپتر فەرمانی بە زەوی هەڵکەندن دا هەتا قووڵکەکان میترێک قووڵتر کەن، ترسا کە مەبادا ئەویش وەک برا دووانەکەی شێت بووبێ، ئۆرلیانۆی دووهەم کە هەوەسی لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی لە باپیرییەوە بەمیرات بۆ مابۆوە، ئاخرین نیشانەی قەڵەویی دانا

و وێچوونی پێشووی لەگەڵ بـرا دووانەکەی ڕۆژ بە ڕۆژ ئاشـکراتر بـوو. نەک تەنیا لە بەر کزبوون، بەڵکو لە بەر ئەو حـاڵەتی تەنیـاییە. لە مناڵەکـان دوور کەوتبۆوە، جاروبـار نـانێکی دەخـوارد، سـەرتاپا قـوڕاوی لە گۆشـەی ئاشپەزخانە شتێکی دەخـوارد و جاروبـاریش وەڵامـی پرسـیارەکانی سـانتا سـۆفیا دێـلا پێـدادی دەدایەوە. فێرنانـدا کە چـاوی لێکـرد بە پـێچەوانەی بۆچوونی ئەو ، ئـاوا کـار دەکا، وایزانـی ئەو بێ قەرارییە نیشـانەی کـار و کۆشش و تەماحەکەشی نیشانەی لەخۆبووردنە و ئەو لە دەروونەوە لەوەی بەو هەمـوو تونـدی و تـووڕەییەوە هێرشـی کردبووەسـەر، بە هـیچ جـۆر حەوسەلەی  ئاشتبوونەوەی دڵسۆزانەی نەبوو. بە لاسکە ویشکەڵ و گوڵە رزیـوان سـواخ درابـوو، دوای هەڵکەنـدنی حەوشـە و حەوشـەی خەڵـوەت، زەوی باخچەیشی ئاوەژوو کردەوە و هەڵکەندنی لە لای ڕۆژهەڵاتـی مـاڵەوە ئەوەنـدەقووڵ کـردەوە، شـەوێکیان، هەمـوو لە ترسـی ئەوە کە بـوومەلەرزە هـاتووە، لە خەو ڕاپەڕیـن. مـاڵ دەلەرزیـیەوە و پایەکـانی دەنگیـان لێـوە دەهـات، لە ڕاسـتیدا سێ لە ژوورەکـان دەڕووخـان و زەوی لە هەیـوانەوە هەتا ژووری فێرناندا بە درزێکی بەسام قەڵەشابۆوە. بەو حاڵەش ئۆرلیانۆی دووهەم دەسـتی لە گەڕان هەڵنەگـرت،  تەنـانەت کاتێـک کە هیـوابڕ بـوو و تەنیا شتێکی هێشـتا مـابوو هەر پێشگۆیی وەرەقە بوو. پایەی خـانووەکەی لەو بەشـەی وێـران ببـوو چـاککردەوە، درزی ئەرزەکەی بە چیمەنتـۆ پـڕ کـردەوە و هەڵقەنـدنی لە بەشـی ڕۆژئـاوا دەسـت پێکـرد. لە حەوتـووی دووهەمی مانگی ژووئەنی ساڵی دوایە هێشتا هەر خەریکی هەڵکەنـدن بـوو، کە باران وەردە وردە هێدی بۆوە، هەورەکان لە بەریەک ترازان و دیار بوو کە بـاران بەزوویی دەوەشـێتەوە، هەرواش بـوو. ڕۆژێکی هەینی، سـەعاتی دووی پـاش نیـوەڕۆ، هەتـاوێکی گەورە، سـوور و ژوور وەک خاکەخشـتی سـوور و فێنـک وەک ئـاو دنیـای ڕوونـاک کـردەوە و هەتـا دە سـاڵ دواتـر باران نەباری.

ماکۆندۆ بەرەو وێرانی دەچوو. ئاخرین بیرەوەرییەکانی ئەو کۆمەڵانەی کە وەحشـیانە هـاتبوون و دڕنـدانەش ڕایـانکردبوو، لە شـەقامەکانی مـوردابێ دەبینـدران. شـوێنەواری مۆبـڵ و شـتومەک و کەلاکـی وشـکهەڵاتووی

جانەوەرانێک کە گوڵەسوورەکەیان لە سەر رووابوو، لە هەموو شوێنێک دەبیندران و ئەو خانووانەی لە گەرماگەرمی هەوەسی مۆزدا، وەک کارگ لە زەوی هەڵتۆقیبوون، چۆڵ کرابوون. کۆمپانیای مۆز دامەزراوەکانی خۆی تێکدا، ئەوەی لە ناوچەی پارێزراو بەجێ ما، کۆمەڵێک وێرانە بوو، خانووە دارەکان، هەیوانە فێنکەکان، وەرەقبازییەکانی دوای نیوەڕۆ، دەتوت لەگەڵ پێشەنگی تۆفانی نووح، کە ساڵانی دواتر شاری ماکۆندۆی لە سەر زەوی نەهێشت، بەبادا چوون. تەنیا نیشانەی مەڵبەندێک کە لەودا تۆفان قووت درابوو، لینگە دەستکێشی پاتریشیا براون بوو لە ئوتومبێلێکدا، پێچووکە داپۆشێبوو و لە خۆیدا خنکاندبووی. ناوچەیەکی جادوویی، کە خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا، لە ئاسۆی ئەودا کەفی بێدەنگی دەریای دەهاتە بەرچاو. هەوەڵین یەکشەممە ئۆرلیانۆی دووهەم لیباسی ویشکی دەبەر کرد و لە ماڵەوە دەرکەوت هەتا جارێکی دیکە شارەزای شاری خۆی بێ، پەژارە دایگرت. ئەو کەسانەی لە دەست تۆفان رزگاریان ببوو، هەمان کەسانێک بوون پێش ئەوەی ماکۆندۆ بکەوێتە بەر لافاوی مۆز، لەوێدا دەژیان. لە شەقامەکان بڵاو ببوونەوە و لە هەوەڵین هەتاو خۆیان هەڵخستبوو، پێستی لەشیان هێشتا لیتەی سەوزی پێوە بوو و بۆنی کەڕوویەکیان لێ دەهات، باران بە سەریدا رشتبوون. بەڵام لە قووڵایی دڵەوە لە وەدەست کەوتنەوەی شارەکەیان، کە زێدیان بوو، خۆشحاڵ بوون. شەقامی تورکەکان دیسان وەک جاری جارانی لێهاتبۆوە. وەک ئەو زەمانەی کە عەرەبی نەعل دەپێ و ئاڵقە لە گوێ بە دەوری دونیایەدا دەگەڕان و شتومەکی خۆیان بە تووتی دەگۆڕییەوە _ کەسانێکی لە سەرگەردانی سەدساڵەی خۆیاندا، ماکۆندۆیان بۆ ژیان هەڵبژاردبوو. شتومەکی بازار، لێک هەڵدەوەشا، شتومەکێک کە لە پێش دەرگای دووکانان داندرابوو، بە کەڕوو داپۆشرابوو و، بەو حاڵەش عەرەبەکانی نەسلی سێهەم، هەر لەو جێگایە و هەر بەو حاڵەتە بێ ترس و لەشکاننەهاتووە لە بەرامبەر زەمان و کارەسات، نە زیندووتر و نە مردووتر لە کاتی دوای تاعوون و بێ خەوی و سی و دوو شەڕی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بوون. ورەیان لە بەرامبەر وێرانەکانی مێزی گەمە، کیوسکەکانی خواردەمەنی و ژوورەکانی

تیرئەندازی و چادرێک کە پێشگۆیی و خەونیان تێدا لێکدەدایەوە. ئەوەندە لە سەر بوو کە ئۆرلیانۆی دووهەم بە سەرسوورمانەوە و بە شێوەی خۆماڵی پرسیاری لێکردن، پەنایان بۆ کام سەرچاوەی نهێنی بردووە کە لە تۆفاندا نەکوژراون و چییان کردووە نەخنکاون. ئەوانە یەک بە دووی یەکدا، دووکان بە دووکان، بە بزەیەکی فێڵەزانانە و نیگایەکی خەیاڵاوی، بەبێ پرس و مەشوەرەتی پێشوو لەگەڵ یەکتر، هەموو هەر ئەو وەڵامەیان دایەوە: "مەلە"

پێترا کۆتیس رەنگە تەنیا ژنی خۆجێی بوو کە رووحیەتی عەرەبی هەبوو. بە چاوی خۆی شاهیدی کاولبوونی تەویلەکان و هۆڵەکانی بوو، کە لافاو رایدابوون، بەڵام توانیبووی خانووەکە بە سەر پێوە رابگری. لە ساڵی دواییدا دوو پەیامی بۆ ئۆرلیانۆی دووهەم ناردبوو، بەڵام ئەو لە وەڵامدا رایسپاردبوو کە نازانێ کەی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی ئەو، بەڵام هەر کات بگەڕێتەوە، سندووقێکی پڕ لە سکەی زێڕ لەگەڵ خۆی دێنێ هەتا ژووری خەوەکەیانی پێ فەرش بکا. لەو کاتەدا بوو کە پێترا کۆتیس لە قووڵایی دڵییەوە خوازیاری هێزێک بوو، کە بتوانێ لە بەرامبەر ئەو بەڵایەدا بەرگریی لێبکا. بە تووڕەییەکی عادیلانەوە سوێندی خوارد کە سامانێک کە فاسقەکەی کۆی کردبۆوە و تۆفان و سێڵاو لە نێوی بردبوو، دیسان کۆی کاتەوە. بڕیارەکەی ئەوەندە شێلگیرانە بوو کە ئۆرلیانۆی دووهەم هەشت مانگ دوای ئاخر پەیامی ئەو گەڕایەوە بۆ لای. بینی کە سەوزە و ئاڵۆزە، پێڵووی چاوی داکەوتووە و پێستی کەڕووی هەڵێناوە و لە سەر کوتەکاغەزێکی هێندێک ژماران دەنووسێ، هەتا دووبارە لۆتەری دانێتەوە. ئۆرلیانۆی دووهەم زۆر سەری سووڕما، هەرچی ژنەشە،بەو سەرە تێکهاڵاو و ڕواڵەتە شێواوەی، زۆری نەمابوو وابزانێ ئەو کەسەی هاتووە بۆ سەردانی، ئەو کەسە نییە کە هەموو تەمەنی ئاشقی بووە، بەڵکو برا دووانەکەیەتی.

به پێترای وت: "شێت بووی، رەنگە بتەوێ ئێسقانان بکەیە لۆتەری."

ئەو کات پێترا پێی وت سەرێکی هۆدەی خەوتن بدا و ئۆرلیانۆی دووهەم چاوی بە ئێسترێک کەوت. پێستی حەیوانەکەشی وەک پێستی خاوەنەکەی

بە ئێسقانییەوە نووسابوو، بەڵام بەو حاڵەش وەک خاوەنەکەی زیت و زیندوو بوو. پێترا کۆتیس تووڕەیی خۆی دەرخوارد دابوو و دوایەش کە نەگیا مابوو نە گوڵەکان، فەرشە ئێرانییەکان و رووتەختی ئاوریشم. پەردەی مەخمەر، پەردەکانی زەڕی و ریشۆڵە ئاوریشمەکانی دەوری تەختی خەوتنی کەشیش، هەمو دەرخواردی ئێسترەکە دابوو.

ئۆرسۆلا ناچار بوو زەحمەتێکی زۆر بکێشی، هەتا بتوانێ بەو وادەیە وەفا بکا، یانی مردنی دوای وەسفانەوەی باران. دوای مانگی ئووت کاتێک بایەکی ویشک و گەرم هەڵی کرد و پنچکە گوڵە سوورەکانی ئیشک کردن و گۆمە قوڕەکانی کردن بە بەرد و بەدواییشدا رەملێکی گەرمی بە سەر ماکۆندۆد پرژاند، کە قرمیتە ژەنگلێدراوەکان و دارە بادامە سەد ساڵەکانی بۆ هەمیشە داپۆشین، رووناکایی زەینی کە لە ماوە هەور و باراندا کەم بوو، ئێستا زۆرتر ببوو، ئۆرسۆلا کاتێک تێگەیی کە زۆرتر لە سێ ساڵان بۆتە گەمەی دەستی مناڵەکان، فرمێسکی پەژارەی لە چاوان هاتنە خوار. دەموچاوی رەنگکراوی خۆی شووشتەوە و کاغەزە رەنگییەکانی لە خۆی کرندەوە و بۆق و مارمێلکە ئێشکهەڵاتووەکان و بەرمووورە لۆبیایی و گەردنبەندە عەرەبییەکانی، کە مناڵەکان وێیان خستبوو. لە خۆکردنەوە و بۆ هەوەڵین جار، دوای مردنی ئامارانتا، بە بێ یارمەتیی کەسێک، خۆی لە تەختەکەی هاتەخوار هەتا جارێکی دیکە پێ بنێتەوە ژیانی نێو بنەماڵەوە. دڵی لە شکان نەهاتووی، ئەوی لە تاریکیدا رێنوێی دەکرد و ئەگەر پێی لە شتێک گیرسابا یان دەستی وەک جوبرائیل کە لە راست سەری هەڵیهێنابوو بەر کەسێک کەوتبا، وایاندەزانی لە بەر کەنەفتی پیربوونە کە ناتوانێ بەچاکی بە رێگەدا بڕوا، بەڵام نەیاندەزانی کوێرە. پێویست نەبوو ئۆرسۆلا بە چاو ببینێ، هەتا بزانێ ئەو گوڵانەی کە لە زەمانی یەکەم چاکردنەوەی خانووەکەدا بە هەزاران زەحمەت چاندبووی، بە هۆی باران و هەڵقەندنەکانی ئۆرلیانۆی دووهەم لە نێو چوون و، دیوار و لەپی ژوورەکانی درزیان داوە و کەرەسەی نێومال کاڵ بوونەوە و تێکشکان و. دەرگا لە لاولاوان هاتوونەتەدرێ و بنەماڵە وردە وردە خۆ دەداتە دەست ناهومێدی، شتێکی لە زەمانی ئەودا هەر بە خەیاڵیشدا نەدەهات. هەروا کە

بە نێو هۆدە چۆڵەکاندا بە دەستەکوتە دەگەڕا، دەنگی کرتەکرتی مۆریانە و کرتە کرتی مۆرکانی لە گەنجەکان دا و دەنگی مێرووڵە سووورە گەورەکانی دەبیست، کە لە زەمانی باراندا زیادیان کردبوو و ئێستا خەریک بوون بناخەی خانوویان دەجوو. ڕۆژێکیان دەرگای سندووقی هەیکەلی پیرۆزانی کردەوە و ناچار بوو داوای یارمەتی لە سانتا سۆفیا دێلا پێداد بکا هەتا لە دەست ئەو سیسرانەی ڕزگار بکا کە لە سندووقێ دەر پەڕیبوون و هێرشیان بۆ بردبوو. سیسرەکان سەڵتەی پیرۆزەکانیان ئەوەندە جوییبوو کردبوویاننە تۆز. دەیگوت: "درێژەی ژیان بەو وەزعە هیچ ئیمکانی نییە، ئەگەر هەر بەو شێوەیە بڕوا دەبینە خۆراکی جانەوەران." لەوەبەدوا حەجمینی نەما، پێش سەحەری لە خەو هەڵدەستا و هەر کەسی دەست کەوتایە، تەنانەت منداڵەکانیش، داوای یارمەتیی لێدەکردن. چەند پارچە لیباسێک کە هێشتا کەڵکیان پێوە مابوو، لە بەر هەتاوی هەڵخستن و سیسرەکانی بە مێشکوژی گەورە کوشتن و کونەمۆریانەکانی لە سەر دەرگا و پەنجەران تاشین و قسڵاوی لە کونە مێروولەکان کرد. تاو لەرز ئەوی کێشایە ژوورە فەرامۆشکراوەکان. سپاردی هەتا ئەو تارە جاڵجاڵووکە و تۆز و خۆڵانە لەو هۆدەیەی پاک کەنەوە، کە خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا ئەقڵی خۆی لە سەر دۆزینەوەی حوجرەی فەیلەسووفان دانابوو، کارگەی زێڕنگەری کە سەربازان تێکیاندابوو ڕێکوپێکی کردەوە سەرەنجام لە کلیلەکانی ژووری مێلکیادێسی پرسی، هەتا بزانێ وەزعەکە لەوێ چۆنە. سانتاسۆفیا دێلا پێداد کە دەیەویست بەو بەڵێنەی خۆی سەبارەت بە داخوازی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم وەفا بکا، کە قەدەخەی کردبوو هەتا کاتێک دڵنیا نەبن مردووە نابێ هیچ کەس پێ بنێتە ئەو هۆدەیە. دەستی دایە هەر جۆرە فڕوفێڵێک هەتا ڕێگای ئەو ژوورەی لە ئۆرسۆلا بزر بکا. بەڵام بڕیاری ئۆرسۆلا بۆ لەنێو بردنی مێش و مەگەز تەنانەت لە دوورترین و شاراوەترین گۆشەی ماڵەوەدا ئەوەندە بەهێز و مکوڕبوو، کە بە سەر هەموو ئەو کەند و کۆسپانەی لە سەر ڕێگایان دانابوو تێپەڕی و دوای سێ ڕۆژ پێداگرتن، سەرەنجام دەرگای ژوورەکەیان بۆ کردەوە، بۆگەنیوێکی ئەوەندە پیس دەهات کە ناچار بوو دەست بە دەستگیرەی دەرگاوە بگرێ تا

نەکەوێ، بەڵام لە ئانێکدا بیری کەوتەوە کە حەفتا و دوو لەگەڵ کچە خوێندکاردکانیان لەو ژوورە دانابوو و لە یەکێک لە هەوەڵین شەوەکانی دەورەی باراندا کۆمەڵێک سەرباز، هەموو ماڵەوە بۆ دۆزینەوەی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم گەڕابوون و نەیان دیتبۆوە.

دروست وەک ئەوە هەموو شتێکی ببینێ، بە سەر سوورمانەوە وتی: "خوایە بەزەیی! ئەوەندەمان زەحمەت کێشا تا فێرە ئەدەب و خاوێنیت بکەین و تۆش وەک بەراز دەژیی." خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم هێشتا هەر خەریکی خوێندنەوەی نووسراوە کۆنەکان بوو. تەنیا شتێکی لە نێو سەروکەللەی ئاڵۆزیدا دیار بوو چاوی زەق و ددانەکانی بوون، کە لە بەر چڵکنی شین ببوون. بە ناسینەوەی نەنکی خۆی سەری هەڵێنا و روانییە لای دەرگا و هەوڵی دا بزەی بێتێ و بە بێ ئەوەی ویستبێ یەکێک لە وتەکانی کۆنی ئۆرسۆلای بەدەمی دا هات.

بە پرتە وتی: "چاوەڕوانی چیت دەکرد، زەمان رادەبرێ."

ئۆرسۆلا وتی: "راستە، بەڵام نەک بەو تاڵووکەی ئەتۆ دەڵێی."

بە وتنی ئەو قسەیە زانیی هەر ئەو وەڵامەی داوەتەوە، کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا لە ژووری زیندان پێی دابۆوە و، لە ترسی ئەوە، هەروا کە چارەنووس سەلماندبووی، زەمان تێناپەڕێ، بەلکو تەنیا خۆی دووپات دەکاتەوە، دیسان لەرزی، بەڵام دیسان تەسیلم نەبوو. وەک لەگەڵ منالێک بەشەڕ بێ، لەگەڵ خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم بە شەڕ هات و پێی لێداگرت کە دەبێ حەمامێ بکا و ریش بتاشێ و هێزی خۆی بۆ تەواوکردنی چاککردنەوەی ماڵەوە بەکار بێنێ. خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم، بە خەیاڵی ئەوەی ژوورێک بەجێ دێڵی کە ئەو هەموو ئارامێی فکرەی پێ بەخشیوە، ترسا. هاواری کرد هیچ کەس ناتوانێ ئەو لەو ژوورە بێنێتەدەر، چونکە نایهەوێ ئەو قەتارە ببینێ کە پڕە لە لاشە و هەموو رۆژێ تاوپەڕان لە ماکۆندۆوە بەرەو دەریا دەڕوا. هاواری دەکرد؛ 'تەواوی ئەو کەسانەی لە ئێزگە بوون سێ هەزار و چوار سەد و هەشت کەس." ئەو کاتە بوو کە ئۆرسۆلا زانی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم گرفتاری دنیایەک بووە کە تاریکاییەکەی لە تاریکایی دونیای ئەو زۆر چڕترە. دونیایەکی تێنەپەڕ و

تەنیا، دروست وەک دنیای باپیری ئەو. لە ژوورەکەدا بەجێیهێشت، بەڵام ئەوانی دیکەی ناچار کرد لێرە بەدواوە قفڵ لە دەرگاکەی نەدەن و هەموو رۆژێ ژوورەکە خاوێن کەنەوە و لەگەنەکان لە زبڵدان هاوێژن و تەنیا یەک دانە بهێڵنەوە و خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم هەمیشە بەپاک و خاوێنی رابگرن. دروست وەک باپیری لە دەورەی ژیانی خۆیدا لە بن داربەڕووەکە، فێرناندا لە سەرەتادا هاتووچۆی ئۆرسۆلای بە حیسابی شێتیی زەمانی پیری دانابوو و بەزەحمەت پێشی تووڕەبوونی خۆی گرتبوو، بەڵام هەر لەو دەورەیەدا، خۆزێ ئارکادیۆ لە رۆمەوە نامەی بۆ نووسی کە پێش ئاخرین رێورەسمی کۆتایی بە نیازە بگەڕێتەوە ماکۆندۆ و ئەو هەواڵە خۆشە ئەوەندەی وەزەوق خست، لە بەیانییەوە هەتا شەو، رۆژێ چوار جار گوڵەکانی ئاو دەدان هەتا کوڕەکەی لە بینینی وەزعی ماڵەوە بەوشێوەیە نەترسێ. دیسان هەر بەو هۆیە نامەگۆڕینەوەی خۆی لەگەڵ پزشکانی نادیار زێتر کرد و دیسان گوڵدانە بگۆنیا و پنگەکانی تەنیا پێش ئەوە ئۆرسۆلا بزانێ کە ئەو گوڵدانانە لە بەر رق و تووڕەیی ئۆرلیانۆی دووهەم ورد بوون دیسان لە سەر هەیوانی دانانەوە. هێندێک دواتر قاپ وقاچاخەکانی کارد و چەنگاڵە زیوەکانی فرۆشت و دەوری کاشی و سووپخۆری و مەلاقەی رووکێش و کارد و چنگاڵی ئامپاکاری کرین و بەو جۆرە هەژاریی خستە نێو گەنجەکان، ئەو گەنجانەی کە خوویان بە قاپ وقاچاخی چینی و کریستاڵەوە گرتبوو. ئۆرسۆلا تێدەکۆشا هەنگاو بەرەو پێشتر باوێژێ. هاواری دەکرد: "دەرگا و پەنجەران بکەنەوە، گۆشت و ماسی بکوڵێنن، کیسەڵی گەورەتر بکڕن، رێگە بدەن خەڵکی غەریبە بێن و دوشەگەکانیان لێرە و لەوێ رابخەن، لە بن پنجە گوڵە سوورەکاندا بمیزن، لە سەر مێز دابنیشن و هەر چەند کەڕەتی پێیان خۆشە نانی بخۆن، قرپان بێننەوە، جنێوان بدەن، بە چەکمەی قوڕاوی هەموو شوێنێک پیس کەن و هەر بەڵایەکی پێیان خۆشە بە سەرمان بێنن. ئەوە تەنیا رێگای رزگاربوونە لە کاول بوون."

بەڵام هیوایەکی پووچ بوو. ئەو ئیدی زۆر پیر ببوو، لەوە پتر ژیابوو کە بتوانێ مووجیزەی ئاوە نەباتەکان دووپات کاتەوە. هیچ کام لە درێژەدەرانی

نەسلی ئەویش توانای ئەوی بەمیرات نەبردبوو. ماڵەوە فەرمانەکانی فێرناندایان بەڕێوە نەبرد.
ئۆرلیانۆی دووهەم کە بە باولەکانییەوە گەڕابۆوە ماڵی پێترا کۆتیس، بە زەحمەتێکی یەکجار زۆرەوە، تەنیا ئەوەندەی دەتوانی شتێک پەیدا بکا بنەماڵەکەی لەبرسن نەمرن. ئەو و پێترا کۆتیس یەسترەکەیان کردە لۆتەری و،بەوەش چەند حەیوانێکی دیکەیان کڕی و توانیان لۆتەرییەکی بچکۆلانە ساز بکەن. ئۆرلیانۆی دووهەم ماڵ بە ماڵ دەگەڕا بلیتی لۆتەری بفرۆشی. بلیتەکانی بۆخۆی بە مەرەکەبێکی ڕەنگ نەقاشی دەکردن، هەتا جوانتر و سەرنجڕاکێشتر بن و ڕەنگە نەیزانیبێ خەڵکێکی زۆر لە بەر ئەمەگناسی و کۆمەڵێکی زۆرتر لە بەر دڵسۆزی بلیتی لێ دەکڕن. هەر چۆنێک بێ، تەنانەت بۆ دڵسۆزترین کڕیارەکانیش ئەوە دەرفەتێک بوو هەتا بە دانی بیست سینتاو ببنە خاوەنی گوێلکێک و ئەو هیوایە وەهای وەشەوق دێنان، سێ شەممە شەوەکان لە حەوشەی ماڵی پێترا کۆتیس، لە چاوەڕوانی ئەوەی ئەو منداڵەی هەڵی دەبژێرن، ژمارەی براوە لە نێو کیسە دەربێنێ، سواری شان و سەری یەک دەبوون. بەزوویی ماڵەکە بوو بە بازاڕی مەکارەی حەوتووانە. لە ئێوارەوە، مێزی خواردەمەنی و نۆشابە ئامادە دەکرا و زۆر جار براوەکانی لۆتەری، ئەو حەیوانەی بردبوویانەوە. هەر لەوێ دەیانکردە قوربانی، دیارە بەو مەرجەی ئەوانی دیکە پارەی مەشروب و مۆسیقایان دابا. وەزعەکە بەجۆرێکی لێهات، ئۆرلیانۆی دووهەم بە بێ ئەوەی بیهەوێ، لە پڕ زانی دەستی بە لێدانی ئۆکۆردیۆن کردۆتەوە و لە ململانەی خواردندا بەشداری دەکا. دووپاتبوونەوەی هەژارانەی خۆشگوزەرانیی پێشوو بوو، بە هۆی ئەوە کە ئۆرلیانۆی دووهەم تێبگا هەتا چ ڕادەیەک رووحیەتی پێشووی لە دەست داوە و لێزانی لە بەڕێوەبردنی جێژنەکاندا هەتا چ ڕادەیەک هاتۆتە خوارێ، گۆڕابوو. کێشی سەد و بیست کیلۆیی لە زەمانی ملبەملە لەگەڵ فیلی مێدا هاتبووە سەر حەفتا و هەشت کیلۆ. دەموچاوی هەڵمساوی پێشووی، کە وەک کیسەڵ دەچوو، ئێستا دەتگوت ڕێوییە. دایمە بێ حەوسەلە و ماندوو بوو. بەو حاڵەش، پێترا کۆتیس قەت ئاوهای خۆش نەویستبوو، ڕەنگە لەبەر دڵسۆزی و بەزەیی ئەو سەبارەت بە خۆی ـئەو

هەستە بە یەکەوە لکانەی هەزاری لە هەر دووکیاندا زیندوو کردبۆوە بە ئەوین وەردەگێڕا. تەختە خەوە شکاو و لە بەریەک دەرهاتووەکە وەک جاران شوێنی ئەویندارییی شێتانەی ئەوان نەبوو و ببوو بە پەناگەیەکی دووکەسە، ئێستا کە لە شەڕی ئەو ئاوێنانەی وێنەی ئەوانی لە بەری میچی دووپات دەکردەوە، رزگارییان ببوو، ئەو ئاوێنانە کە بۆ کڕینی حەیوانی دیکە بۆ بەلۆتەری دانان فرۆشابوون. لە نێو ئەو ئەتلەس و مەخمەرانەی کە هێستر جویبوونی، شەوانە بە ئەمینی وەک بابەگەورە و دایەگەورەیەکی بێخەو، هەتا درەنگ بە خەبەر دەبوون و لە دەرفەت کەڵکیان وەردەگرت و پووڵەکانیان دەبژارد. جاری وابوو تا کەڵەباب خوێندنی بەیانیان، ئەوان هەر خەریکی دەستتێوەردانی پووڵە وردەکان بوون. لە کۆیەک مستێکیان هەڵدەگرت و بە سەر کۆیەکی دیکەیاندا دەکرد. چنگێک بە سەر ئەو کۆیەدا بۆ رازیکردنی فێرناندا، چنگێک بە سەر ئەو کۆیەدا بۆ کەوشی ئامارانتا ئۆرسۆلا،ئەو کۆیەش بۆ سانتا سۆفیا دیلا پیداد، کە لە زەمانی هێرشی بێگانەکانەوە لیباسی بۆخۆی نەکڕیبوو. ئەوە بۆ کڕینی تابووتی ئۆرسۆلا، ئەوە بۆ کڕینی قاوە کە هەر بە سێ مانگان یەک پووڵەوردە گران دەبێ، ئەوە بۆ کڕینی شەکر کە هەر جارەی شیرناییەکەی کەمتر دەبێ، ئەوە بۆ کڕینی دار کە لە زەمانی بارانەکەوە هەر تەڕن و، ئەمەشیان بۆ کڕینی کاغەز و مەرەکەبی رەنگی بلیتەکانی لۆتەریی و ئەوەی دەشمایەوە دەیاندا بە براوەی گوێلکی مانگی ئاوریل کە پێستەکەی ببوو بە هۆی رزگاری. چونکە کاتێک هەموو بلیتەکان فرۆشابوون گوێلکە تووشی نەخۆشیی لارەشە ببوو. ئەو رێوڕەسمە هەژارانەیە بەجۆرێکی ئەوتۆ بە نیازپاکی بەڕێوە دەچوو کە هەمیشە کۆمای گەورەی پارەوردەکەیان بۆ فێرناندا دادەنا و ئەمەش لە بەر پەشیمانی و دڵسۆزی نەبوو، بەڵکو بەتەواوی لەبەر ئەوە بوو کە ئاسایشی فێرناندا، لە بەخۆشی ژیانی هەردووکیان گرنگتر بوو. هەر چەند هیچ کام لەوانە نەیاندەزانی کە فێرناندا بۆ ئەوان کچێک بوو ویستبایان و نەیانویستبا ـ بەجۆرێک کە جارێکیان سێ رۆژ گەنمەشامییان کوڵاند هەتا فێرناندا بتوانێ روومێزییەکی هۆڵەندی بکڕێ. بەو حاڵەش هەر چەندی کاریان دەکرد و هەر چەندی پووڵیان پەیدا دەکرد

و دەستیان دەدایە هەر فرۆفێڵێک و هەرچەند بۆ پەیداکردنی پووڵی باش ژیانی سکەکانیان بێرەو بەرە پێدەکرد. لە سەعاتەکانی بێخەویی پوولە وردە بژاردندا لە خۆیان دەپرسی لە دونیادا چ قەوماوە، کە حەیوانەکانیان وەک جاران زاوزێ ناکەن و بۆچی پارە بەو هاسانییە لە دەستیان هەڵدەخلیسکێ و دەڕوا و بۆچی ئەو کەسانەی کە ماوەیەک پێش لە میوانییەکاندا بەستەبەستە ئەسکیناسیان "پووڵی کاغەز" یان ئاگر تێبەردەدا ئێستا لە گرانیی شەش مریشک بە قیمەتی دوازدە سینتاو ئاهوناڵەیانە و بە گرانفرۆش و دزی دەزانن. ئۆرلیانۆی دووهەم، بە بێ ئەوەی شتێک بڵێ بیری کردەوە تاوانی دونیا نییە، بەڵکو تاوانەکە بە ملی گۆشەیەک لە دڵی پێترا کۆتیسە، کە لە زەمانی پاڕانەوە رووداوێکی تێدا قەوماوە، کە حەیوانەکانی نەزۆک و پارەی کەم کردۆتەوە. بە خاتری دۆزینەوەی ئەو مەتەڵە ئەوەندە لە دڵی ئەودا کەندەوە و کاژەوەی کرد، لە جیاتی قازانج، ئەوینی دۆزییەوە. کاتێک ویستی ئەو ناچار کا خۆشی بوێ. خۆی دیسان سەبارەت بەو رۆژبەرۆژ زۆرتر دەبوو و بەو جۆرە لە گەرمەی پایزی تەمەندا دیسان باوەڕی بە خورافاتی لاویتی هێنایەوە، کە هەژاری بەندەی ئەوینە. هەردووکیان ئەو خۆشرابواردنە بێسوودە و ئەو سامانە زۆرە و ئەو ئەویندارییە شێتانەیان دەهێنایەوە یاد و هەستیان بە پەشیمانی دەکرد، چۆنیان تەمەنی خۆیان بە هەدەر داوە هەتا بگەنە ئەو بەهەشتە تەنیاییە دووکەسەیە. لە دوای سالانی ساڵ هاودەستی بێبەرهەم، شێتانە ئاشقی یەکتر بوون و لە خۆشەویستیی یەکتر چ لە سەر مێز و چ لە تەختی نووستدا حەزیان دەبرد و رۆژبەرۆژ ئەوەندە زۆرتر هەستیان بە خۆشبەختی دەکرد، کە تەنانەت ئەو کاتەی بیوونە دوو مەوجوودی پیر و رزیوش، دیسان وەک دوو کەروێشک سواری کۆڵ و ملی یەک دەبوون و وەک دوو سەگ بە یەکەوە بەشەڕ دەهاتن.

لۆتەری قازانجێکی ئەوتۆی نەدەکرد.لە پێشدا ئۆرلیانۆی دووهەم حەفتەی سێ رۆژان لە ژووری کاری خۆی دەمایەوە بلیتەکانی گەلاڵە دەکرد و لە سەر بلیتەکان بە پێی ئەو حەیوانەی کە بە لۆتەری دادەندرا، بە لێزانییەکی تایبەتی، گایەکی سوور، بەرازێک بە دەستە جووجکەیەکی شینی،نەقاشیی

دەکرد و بەوردی ئەو ناوەی کە پێترا کۆتیس دایهێنابوو، دەیهێنایەوە، هەتا دروست وەک چاپی بینووسێ (لۆتەریی خواوەندی مەزن). بە تێپەڕبوونی زەمان، دوای ئەوەی حەفتەی دوو هەزار بلیتی گەلاڵە کرد، وەها ماندوو بوو کە سپاردی حەیوانەکان و ناو و ژمارەکانیان لە سەر مۆرێک هەڵکەند و ئەوجار تەنیا کارێک دەیکرد مۆرکردنی کاغەزەکانی رەنگی بوو. لە ساڵەکانی ئاخری عومریدا بە مێشکیدا هات کە شوێنی ژمارەکان لەگەڵ مەتەڵ بگۆڕێ و جایزە لە نێو هەموو ئەو کەسانەدا بەش بکرێ کە مەتەڵەکە هەڵدێنن، بەڵام کاتێک پیر بوو، بە کردەوە ئەوەندە بە گرێ و گۆڵ و بوو بە هۆی شک و گومان، کە پاش یەک دووجار وازیان لە درێژەی ئەو شیوەیە هێنا. هێندە ئۆرلیانۆی دووهەم گرفتاری پاراستنی ئابڕووی لۆتەریی خۆی بوو، هەلی بۆ دیتنی منداڵەکانی نەبوو. فێرناندا، ئامارانتا ئۆرسۆلای بردە قوتابخانەیەکی تایبەتی،بەڵام ڕازی نەبوو ئۆرلیانۆی بچووکی نەوەی،کوڕەکەی میمە، بەرێتە قوتابخانەیەکی گشتی، بڕوای وابوو هەر ئەوەندە کە هێشتوویە لە هۆدە بچێتە دەرەوە، زۆر بووە. لەگەڵ ئەوەشدا، لەو زەمانەدا قوتابخانەکان تەنیا منداڵی قانوونیی ژن و مێردایەتیی کاتۆلیکەکانیان قبووڵ دەکرد و، لە پێناسەی ئۆرلیانۆ، کە کاتێک هێنایانەوە بۆ ماڵ بە سنجاخ لە ژێر کراسەکەیان دابوو، نووسیبوویان، ئەوە منداڵێکە لە کۆڵانان هەڵگیراوەتەوە.

بەو هۆیەوە، ئەو کە لە ماڵەوە زیندانی بوو، لە ژێر چاوەدێریی دڵسۆزانەی سانتا سۆفیا دێلا پێداد و لێڵیی فکری ئۆرسۆلادا گەورە بوو و لە دنیای بەرتەنگی ماڵەوە تەنیا ئەو شتانە فێر دەبوو کە دایەگەورەکان پێیان دەگوت. منداڵێکی ناسک و باریک و ئەوەندە بەپرسیار بوو، دەورووبەرەکانی تووڕە دەکرد، بەڵام لە بەرامبەردا وەک منداڵی سەرهەنگ نیگایەکی بریسکەداری هەبوو، کە جار جار بە شێوەیەکی جادوویی دەدرەوشایەوە و مژۆڵی لێکدەدان. کاتێک ئامارانتا ئۆرسۆلا لە قوتابخانە بوو، ئەو لە ماڵەوە کرمی دەگرتن و لە حەوشە مێش و مەگەزی ئەشکەنجە دەدان. ڕۆژێکیان، کە خەریک بوو دووپشکی لە نێو قوتوویەک دەنا هەتا بیباتە نێو نوێنی ئۆرسۆلا، فێرناندا بە سەریدا چوو، لەوەبەدواوە بردیانە

هــۆدەی پێشــووی مەمە و لەوێ چەنــد ســەعاتان تەماشــای وێنەکــانی فەرهەنگی دەکرد

ئۆرسۆلا (مقطر)ی بە نێو ماڵدا دەپرژاند، کوڕەی لەوێ هەست پێکرد لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیزانی لەوێیە، لێی پرسی کێیە.

ئەو وتی: "من ئۆرلیانۆ بویندیام."

ئۆرسۆلا وتـی: "ڕاسـت دەکەی، ئێسـتا کاتی ئەوە هـاتووە کاری زێڕنگەری فێر بی."

دیسـان ئەوی لەگەڵ کـوڕەکەی خـۆی لێتێک چووبـوو، بـایەکی گەرم کە بە دوای ســێڵاوەکاندا دەســتی پێکردبــوو و، جــاران شــەپۆلی کەموێــنەی بریسـکانەوەی دەدایە مێشـکی ئۆرسـۆلا، کۆتـایی هـاتبوو. ئیـدی ئەقڵـی بـۆ هەمیشــە لەدەســتدا. کاتێـک ڕۆیشـتە ژووری خەوتـن، پێتـرۆ نـێلا ئیگـواران لەوێ بــوو، کە ژێردامەنــی ئاســنی خــۆی دەبەر کردبــوو و کراســی زیـوەردۆزی پۆشـیبوو. لیباسـێک کە بـۆ میوانـدارییە ڕەسـمییەکان لە بەری دەکرد. نەنکی خۆی، ترانکو ئیلینا ماریا مینیاتا ئالاکۆکە بویندیا[1]ی دەدیت لە سەندەڵیی ئیفلیجییەکەیدا دانیشتووە و بەپەڕی تـاوس خـۆی باوەشێن دەکا. بـاپیری خـۆی ئۆرلیـانۆ ئارکـادیۆ بویـندیا[2]ی بە کـۆتی ئۆنیفـۆرمی قـولاپی گاردی جێنشینی پاشاوە دەدیت. باوکی خـۆی ئۆرلیـانۆ ئیگوارانی دەبینی، دوعایەکی داهێناوە کە دەیخوێننەوە کرمی لە لەشی گاوگۆتاڵدا ڕەق هەڵدێنا و دەکەوتنە سـەر زەوی. دایکـی شـەرمێون و کـوڕە مـامە کلـک بەرازەکە و خۆزێ ئارکادیۆ بویندیا و کوڕە مردووەکانی دەدیتن، کە هەموویان لە سـەر کورسـیی پشـت بە دیوارەکـان دانیشـتوون. نەوەک سـەردانێک، بەڵکـو وەک ڕێوڕەسـمی سـەرەخۆشـی. لەگەڵ ئەوان خەریکـی قسـەکردن بـوو و باسـی ڕووداوە جۆراوجۆرەکـانی زەمـانی ڕابـردووی دەکـرد، بەجۆرێـک کاتێـک ئامارانتا ئۆرسۆلا لە قوتابخانە دەگەڕایەوە و ئۆرلیانۆ لە تەماشای وێنەکانی فەرهەنـگ مانـدوو دەبـوو، دەیـانبینی کە لە سـەر تەختـی دانیشـتووە و لە لابەلای پـڕ لە خەڵکـانی مـردوودا ون بـووە و لەگەڵ خـۆی قسـەی دەکـرد.

---

[1]– Teanquilina Maria Miniata Alacoque Buendia

[2]– Aureliano Aecadio Buendia

جارێک لە ترسـان هـاواری کـرد: "ئـاگر" و بـۆ تاوێـک تەواوی مـاڵەوەی ترساند، بەڵام ئەوەی ئەو دەیـدیت ئـاگری تەویـلەیەک بـوو کە لە تەمەنـی چوار ساڵیی خۆیدا چاوی پێکەوتبوو. گەیشتە رادەیەک وەهـا رابردوو و ئێستای تێکەڵ دەکرد، لە یەک دوو جار پێش مردنی کە ئەقڵی لە سـەرەخۆ بـوو، هـیچ کەس بەتەواوی نەیزانـی سـەبارەت بەو شـتانە قسـە دەکـا کە هەستیان پێدەکا، یان ئەو شتانەی بیری دەکەوتنەوە!. سیس و ژاکاو ببوو و خەریک بوو بۆگەنی دەبوو و بەزیندوویی مومیای دەکرا، بە جۆرێک کە لە مانگەکـانی کۆتـایی تەمەنیـدا، وەک هوڵـوویەکی ئیشـک لە کراسـە هەراوەکەیـدا ون ببـوو و، دەسـتی کە هەروا بەرز کـردەوە دەتگـوت پەنجەدەستی مەیموونە. چەند رۆژان بە بێ ئەوەی ببزوێ،لە شـوێنی خۆی دەمایەوە و سانتا سۆفیا دیلا پێداد بۆ ئەوەی بزانێ ماوە یـان نـا، بەتونـدی رایدەوەشـاند، بە باوەشـییەوە دەگـرت هەتـا کەوچـک کەوچـک قەنـداوی دەگەرووی کا ـ ببوو بە بپیرێژنێکی تـازە لەدایکبوو. ئامارانتا ئۆرسـۆلا و ئۆرلیـانۆ لە ژوورەوە ئەویـان بـۆ ئەولا و ئەمـلا رادەکێشـا و لە سـەر میحرابیان دادەنیشاند، هەتا بڵێن تەنیا کەمێک لە هەیکەلی منـاڵیی حەزرەتی عیسا گەورەترە و، رۆژێکیش دوای نیوەڕۆ ئەویان لە گەنجەیەکی ئەمباردا شاردەوە هەتا مشکان بیخۆن. یەکشەممەی خورما، کە فێرناندا چووبوو بۆ کڵێسـا چـوونە ژووری خەوەکەی، یەکیـان پێـی گـرت و یەکیـان پشـت ملـی. ئامارانتا ئۆرسۆلا وتی: "بێچارە دایەگەورە! لە پیریان مرد."

ئۆرسۆلا زۆرتر ترسا و وتی: "ئەمن زیندووم."

ئامارانتا ئۆرسۆلا پێشی پێکەنینی خۆی گرت و وتی: "تەماشـای هەناسەشـی نایە"

ئۆرسۆلا هاواری کرد؛ "من ئەوە نییە قسە دەکەم."

ئۆرلیانۆ وتـی: "تەنانەت نـاتوانێ قسـەش بکـا، وەک جیرجیرەیەکی بچکۆلانە مرد!"

ئەو کـات ئۆرسـۆلا خۆیـدایە دەسـت راسـتی و لە سـەرەخۆ بە خـۆی وت: "خودایە، کەوابوو مردن ئاوایە."

دەسـتی کـرد بە دوعـایەکی دوورودرێـژ، دوو ڕۆژی خایانـد و ڕۆژی سێشەممە بوو بە پاڕانەوە لە بەرخودا، کە نەهێڵێ مێروولە سوورکە ماڵێ دابگرن، چرای ژێر وێنەی ڕێمیدیۆس هەمیش بایسێ، نەهێڵێ هیچ کات بنەماڵەی بویندیا لەگەڵ یەکتر زەماوەند بکەن، دەنا مناڵەکانیان بە کلکەوە لەدایـک دەبـن. ئۆرلیـانۆی دووهەم کـاتەکەی بە هەل زانـی هەتـا لە بزرکاندنەکانی کەڵک وەربگرێ و شوێنی زێڕەکانی پێ ئاشکرا بکا. بەڵام دیسان پاڕانەوەکانی سوودی نەبوو، ئۆرسوڵا وتی: "کاتێک خاوەنەکەی بێ. خوا زێڕەکان هەڵدەکا هەتا خاوەنەکەی بیاندۆزێتەوە." سانتا سۆفیا دێلا پێداد دڵنیا بوو کە کاتی مردنی ئۆرسوڵا هاتووە، چونکە لەو ڕۆژانەدا شێواوییەکی لە سروشتدا بەدی دەکرد، گوڵە سوورەکان بۆنی گیایان لێدەهات،کیسە نۆکێک ڕژایە سەر زەوی و نۆکەکان لە سەر ئەزر شکڵێکی وردی ئەندازەییان بەخۆوە گرت، وەکو ئەستێرەیەکی دەریایی. شەوێکیان لە ئاسمان بینی چەند شتی نارنجی خڕ دەفڕن.

بەیانیی ڕۆژی پێنجشەممەی پیرۆز، تەماشان کرد مردووە. ئاخر جار،کاتێک لە زەمانی کۆمپانیای مۆز یارمەتییان دابوو تا تەمەنی خۆی حیساب بکا. گەیشـتبوونە ئەو ئەنجـامەی دەبـێ تەمەنـی لە نێـوان سـەد و پـازدە هەتـا سەدوبیسـت و دوو سـاڵ بـێ. تـابووتەکەی کەمێـک لەو سـەوەتەی کە ئۆرلیانۆیـان تێـدا هێنـابۆوە مـاڵەوە، گەورەتـر بـوو. لە ڕێوڕەسـمی بەخاکسپاردنی دا ژمارەیەکی کەم بەشدار بوون، لە لایەک ئەوانەی ئەویان دەناسی زۆرنەبوون و لە لایەکی دیکەشەوە ئەو ڕۆژانە هەوا ئەوەندە گەرم داهات کە باڵندەی سەر لێشێواو وەکو تەرزە خۆیان بە دیوارانـدا دەدا و لە تۆڕی ئاسنی پەنجەران تێدەپەڕین و لە ژووری خەوی ماڵاندا دەمردن.

لە پێشـدا وایـانزانی تـاعوونە. ژنـی ماڵەکـان ئەوەنـدەیان باڵنـدەی مـردوو گەسک دابوو هیلاک ببوون و پیاوەکان بە عەرەبانە باڵندە مردووەکانیان لە ڕووبار دەخست. ڕۆژی یەکشەممەی جێژنی پاک، باوکی ڕووحانی ئانتۆنیۆ ئیزابێلی سەدساڵە لە مینبەری خۆیەوە ڕایگەیاند؛ مردنی باڵندەکان پێوەندیی بە شوێنەواری خراپی "یەهوودی سەرگەردانەوە" هەیە کە شەوی پێشتر بە

چاوی خۆی لەوێی بینیبوو. ئەوی بە شێکڵێکی ئەوتۆ تاریف کرد کە پێوەندییەک بوو لە گیسکی نێر و کافرێکی مێ، جۆرە جانەوەرێکی جەهەننەمی کە هەناسەی هەموو شوێنێکی پیس دەکرد، ئەگەر بووکێک چاوی پێ بکەوتایە لە جیاتی مناڵ جانەوەرێکی رەموورنەی دەبوو. خەڵکی زۆریان گوێ نەدایە، چونکە لەو باوەڕەدا بوون کە کەشیش لە بەر پیری قسەی هاتەران پاتەران دەکا، بەڵام بەیانیی رۆژێکی چوارشەممە، ژنێک هەموو خەڵکی لە خەو هەستاند، چونکە جێ پێی جانەوەرێکی سمداری دووپێی لە زەوی دیتبوو. جێ پێیەکە ئەوەندە ئاشکرا و هەڵەهەڵنەگر بوو کە هەر کەس دیت گومانی نەما کە دەعبایەکی سامناکە. دروست وەکو ئەوەی کەشیش تاریفی کردبوو هاتۆتە ئەوێ و، هەموو یەکیان گرت کە لە حەوشەکانیان تەڵە دابنێنەوە و بەوجۆرە بوو کە توانیان ئەو لە داو بخەن. دوو حەفتە بە دوای مردنی ئۆرسوڵادا پێترا کۆتیس و ئۆرلیانۆی دووهەم بە دەنگی بۆڕەی گوێلکێکی کە لەو نزیکانە دەهات لە ترسان لە خەو رابوون، کاتێک لە جێگا هاتنەدەر، دەستە پیاوێکیان بینی حەیوانەکەیان لەو قوڵکەیە هەڵدەکێشایەوە کە بە گەڵا داپۆشرابوو، لە خوارەوە بە شیشەئاسنی تیژەوە ببوو. ئیدی نەیدەبۆڕاند. هەر چەند بە لەش بە ئەندازەی مناڵێک بوو، بەڵام بە قەد گایەک قورس بوو، لە برینەکانی خوێنی سەوز و رۆناو دەچۆڕایەوە. بەدەنی تووکاوی و پڕ بوو لە گەنە و پێستی وەکو ماسی پوولەکەی هەبوو، بەڵام بە پێچەوانەی تاریفی کەشیش ئەندامی بەشەریی ئەو زۆر وەکو فریشتەیەکی نەخۆش دەچوو هەتا وەکو مرۆڤ، چاوی گەورە و خەمبار بوون و لە سەر شانەکانی جێگای باڵ دەبیندرا کە بێگومان بە بیور بڕابوونەوە. ئەویان لە مەیدانێ بە دارە بادامێکەوە هەڵواسی هەتا هەموو کەس ببینی. کاتێ بۆگەن بوو سووتاندیان، چونکە نەیاندەزانی دیاری بکەن کە سروشتی حەرامزادەی ئەو حەیوانە و، دەبێ لە رووبار هاوێژرێ یان بەشەرە و دەبێ بە خاک بسپێردرێ. هەرگیز روون نەبۆوە کە ئایا بەڕاستی ئەو جانەوەرە ببوو بە هۆی مردنی باڵندان یان نا. بەڵام هەر چۆنێ بێ تازەبووکەکان رەموورنەی پێشبینیکراویان لێ نەبوو و لە گەرمای هەواش کەم نەبۆوە..

ڕێبێکا لە کۆتـایی ئەو سـاڵەدا مـرد. ئارخینـدای کـارەکەری، کە لە تەواوی عومریـدا خزمەتـی کردبـوو، داوای پـارمەتیی لە کاربەدەسـتان کـرد کە دەرگـای ژووری خەوی ئەو بشـکێنن کە سـێ ڕۆژ بـوو نەهـاتبووەدەرێ، کاتێک دەرگای ژوورەکەیان شکاند دیتیان کە لە سەر تەختی تەنیـایی وەک گـولەی دەریـایی چـۆتە پـاڵ یەک. سـەری لە بەر کرمـان ڕووتـاوەتەوە و هەروا کە ئەنگوسـتی خـۆی مشـتووە، مـردووە. ئۆرلیـانۆی دووهەم ڕێورەسمی بەخاکسپاردنی بەئەستۆ گرت. هەوڵی دا ماڵەکەی چاک کاتەوە و بیفرۆشـێ. بەڵام ویرانـی ئەوەنـدەی کـار لە خـانووەکە کردبـوو هەر کە دیوارەکانیـان ڕەنـگ کـردەوە رووخـایەوە و، ئەوەندەشـیان چیمەنتۆ دەست نەکەوت هەتا پێشی تێکدانی لەپی هۆدەکانی پێ بگرن و نەهـێڵن پێچووکە درزەکان داپۆشن.

لە دوای ئەو لافـاو و بـارانە وەزعەکە بەمجـۆرە بـوو، سسـتیی خەڵـکەکە. لەگەڵ ئیشتیای فەرامۆشـی یەکیان نەدەگرتەوە، وردە وردە بیرەوەرییەکان بێبەزەییـانە فەرامـۆش دەکران، هەتـا جێگـایەک کە لەو زەمـانەدا، بە بـۆنەی سـاڵرۆژی پەیمـانی نێرلانـدیا، چەنـد نـوێنەر لە لایەن سـەرکۆمارەوە هـاتنە ماکۆنـدۆ، هەتـا سـەرەنجام نیشـانی لێوەشـاوەیی، کە زۆر جـار لەلایەن سـەرهەنگ ئۆرلیـانۆ بوینـدیا ڕەت کرابـۆوە، بیـدەن بە بنەمـاڵەکەی. پـاش نیـوەڕۆیەکی تەواو بە دوای کەسـێکدا گەڕان، کە بزانـێ و پێیـان بڵـێ پاشماوەی بنەماڵەیـان لە کوێ دەژین. ئۆرلیانۆی دووهەم بەو خەیـاڵەی کە میداڵەکە زێڕی خالیسە دڵاودڵی دەکرد، نیشـانە لێوەشاوەییەکە قبووڵ بکا. بەڵام پێترا کۆتیس نەیهێشت ئەو کارە ناشایستەیە بکا، دیارە دروست لە کاتێکـدا کە نوێنەرەکـان خۆیـان بـۆ قسـەکردن لەو ڕێورەسـمەدا ئامـادە کردبـوو، هەر لەو کاتـانەدا، کاولییەکـانیش گەڕابـوونەوە، ئـاخرین پاشـماوەکانی زانسـتی مێلکیـادێس، شـاریان ئەوەنـدە تێکشـکاو و خەڵکیـان ئەوەنـدە تەریکـی دنیـا بینی، جارێکی دیکەش دەستیان کرد بە ماڵەومـاڵ و ئاسنفرێنیان بە جۆرێک نواند کە دەتوت بەڕاستی ئاخرین داهێنانی زانایـانی بابلە و، جارێکی دیکەش بە زەررەبینی گەورە تیشـکی ڕۆژیـان کۆکردەوە و

ژمارەی ئەو کەسانە کەم نەبوو، کە بە دەمی کراوە لە سەر سوورڕمان، تەماشای ئەو قۆری و مەنجەڵانەیان دەکرد کە دەکەوتنە سەر زەو و دەبزووتن. کەسانێکیش هەبوون کە پەنجا سینتاویان دابوو هەتا بزانن ژنێکی کاولی چۆن ددانی دەسکرد لە دەمی دەنێ و دەیهێنێتەوەدەر. قەتارە زەردە لەت و پەتەکە، کە نە کەسی پێدەهات و نەکەسی پێ دەڕۆیی تاوێک لە ئێزگەکە رادەوەستا، ئەوە تەنیا شتێک بوو کە لەو قەتارە دوور و درێژە مابۆوە_ قەتارێک کە ئاغای براون واگۆنە میچبلوورییەکە و مۆبڵە کەشیشییەکانی خۆی لێ دەبەست و سەدوبیست واگۆنی بۆ کێشەوەی میوە هەبوو، کە تەنیا تێپەڕبوونی پاشنیوەڕۆیەکی دەخایاند. نوێنەرانی مەزهەبی، کە بە دوای راپۆرتی مردنی سەرسووڕهێنەری باڵندان و قوربانی کردنی "یەهودای سەرگەردان" بۆ لێکۆڵینەوە هاتبوونە ئەوێ، باوکی رووحانی ئانتۆنیۆ ئیزابێلیان دۆزییەوە، کە لەگەڵ چەند منداڵ خەریکی چاوشارکێن بوو. بەو خەیاڵە کە رەنگە راپۆرتەکەی بە هۆی شێتی زەمانی پیرییەوە بێ، لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ پیرخانەیەک. کەمێک دواتر باوکی رووحانی ئۆگەستۆ ئەنگێل[٢] یشیان بۆ ئەوێ نارد. شەڕکەرێکی شەڕەکانی خاچی لە نەسلی تازە بوو، ئازا و بەورە و زۆردار. بۆ خۆی رۆژی چەند جار ناقووسەکانی کڵێسای لێدەدان هەتا خەڵکی خوو بە تەمبەڵی نەگرن و بۆخۆی ماڵ بە ماڵ دەگەڕا خەڵکی لە خەو هەڵدەستاند هەتا بڕۆنە نوێژێ. بەڵام هێشتا ساڵێک نەبوو هاتبوو و ئەویش تووشی ئەو بێ موباڵاتییە بوو کە هەوای ئەوێ هەڵیدەگرت. بە هۆی ئەو تۆز و خۆڵە هەمیشەییەی هەموو شتێکی پیر و سیس هەڵدەگێڕا و هەستی داهێزانێک کە کفتەی خوانی نیوەڕۆ لە خەوی نیوەڕۆیان دا پێکی دەهێنا، تێکشکا.

ماڵەکەی بە دوای مەرگی ئۆرسوڵادا بەرەو کاول بوون دەڕۆیشت و تەنانەت ئیرادەی بەهێز و زیپک و زاکوونەکانی ئامارانتا ئۆرسوڵاش توانای رزگارکردنی نەبوو. ساڵانی دواتر، کاتێک ببوو بە ژنێکی خۆشبەخت و شارستانی و چاوی کرابۆوە، دەرگا و پەنجەرەکانی کردنەوە هەتا وێرانی لە ماڵ رادا، باخەکەی چاک کردەوە، مێرووە سوورەکانی، کە بە رۆژی

---

[٢]– Augusto Angel

رووناک لە دالانێ دەگەڕان، کوشت و بە خێرایی هەوڵی دا میوانداریيەکانی فەرامۆشکراو دیسان زیندوو بکاتەوە. چلەکێشیی توندی فێرناندا لە بەرامبەر سەد ساڵی پڕخرۆشی ئۆرسۆلادا بەربەندێکی قایمی پێکهێنابوو. کاتێک بایە گەرمەکە دامرکایەوە، نەتەنیا ئامادە نەبوو دەرگا و پەنجەرەکان بکاتەوە، بەڵکو بە پێچەوانە، ڕایسپارد دەرگا و پەنجەرەکانیان لە دەرەوەڕا بە بزماری داری وەک چاچ بزمارڕێژ کرد، هەتا بە دەستووری باوکێک، خۆی زیندەبەچاڵ بکا. لە نامەگۆڕینەوە بەنرخەکانی لەگەڵ پزیشکانی نادیار تێشکابوو، بە دوای وەدرەنگی کەوتنی یەک بە دوای یەکدا، لە بەروار و سەعاتێکی دیاریکراودا دەرگای ژوورەکەی لە سەرخۆی داخست و بەرەو باکوور درێژ بوو و تەنیا مەلافەیەکی بە سەر خۆیدا هەڵکێشا. سەعاتی یەکی دوای نیوەشەو هەستی کرد دەموچاوی بە پارچەیەکی تەڕ و ساردی وەک سەهۆڵ دادەپۆشن. کاتێک لە خەو هەستا، ڕۆژ لە پەنجەرەوە دەدرەوشایەوە، لە سەر لەشی لە بنی ڕانییەوە هەتا لەگەنی سمتی، درزێکی وەک کەمانی چاو پێکەوت کە تەقەڵیان لێ دابوون. لە پێش ئەوەدا زەمانی پشوودانەکەی بۆیان دانابوو کۆتایی بێ، لە لایەن پزیشکانی نادیارەوە نامەیەکی بۆهات کە ئاگادارییان کردبوو، دوای شەش سەعات چاولێکردنی ورد، نەیانتوانیبوو نەخۆشییەکەی لەگەڵ ئەو نەخۆشییەی کە ئەو بەو هەموو دوودڵییەوە بۆی باس کردبوون پێکی بگرن. لە ڕاستیدا ئەو عادەتەی ئەو، کە هیچ شتێکی بە ناوی ئەسلی خۆی ناو نەدەدا، ببوو بە هۆی سەر لێشێواندنێکی تازە. ئەوەی کە پزیشکانی نادیار لەو نەشتەرگەرییە لە مەودایەکی دوورەوە روونیان کردبۆوە، کەوتنە خوارەوەی منداڵدان بوو، کە دەکرا بە هاسانی بە کاپووتی ژنانە چارەسەر کرابا. فێرناندا ناهومێد بوو و هەوڵی دا زانیارییەکی روونتریان لێ وەربگرێ، بەڵام پزیشکانی نادیار وەڵامی نامەکانیان نەدایەوە. هەستی کرد وردە وردە لەژێر قورسایی ئەو واژە نەناسراوەدا تێک دەشکێ و ئەوجار بڕیاریدا دەست لە شەرمێونی هەڵگرێ و مانای کاپووت بپرسێ، بەڵام بۆی دەرکەوت کە دکتۆری فەڕەنسی سێ مانگ لەوەپێش خۆی خنکاندووە و بە هۆی یەکێک لە هاوڕێ نیزامییەکانی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا بە

پێچەوانەی مەیلی خەڵکەکە، لەوێ بەخاک ئەسپێردراوە. ئەو جار نهێنی خۆی بۆ کوڕەکەی، خۆزێ ئارکادیۆ، نووسی. ئەو لە ڕۆمەوە لاستیکەکانی بۆ نارد لەگەڵ شێوەی بەکار هێنانیان، فێرناندا دوای ئەوەی شێوەکەی لە بەر کرد لە ئاودەستی هاویشت هەتا کەس بە نەخۆشییەکەی نەزانێ. پارێزێکی بەخۆڕایی بوو، چونکە تەنانەت دانیشتووانی ماڵەوەش گوێیان نەدەدایە. سانتا سۆفیا دێلا پێداد، کە لە تەنیایی پیریی خۆیدا سەرگەردان بوو، تەنیا ئەو خواردنە کەمەی دەیانخوارد لێیدەنا، نزیکەی تەواوی کاتی خۆی بۆ خۆزێ ئارکادیۆ دانابوو. ئامارانتا ئۆرسۆلا، کە هێندێک لە جوانی ڕێمیدیۆسی جوانکیلەی بەمیرات پێ برابوو، کاتی خۆی، کە لە رابردوودا بەخۆڕایی بەئازاردانی ئۆرسۆلا بەفیڕۆی دابوو، خستە سەر دەرسخوێندن. هێندەی پێ نەچوو نیشانیدا کچێکی ئاقڵ و تێگەیشتوو و دەرس خوێنە، هیوایەکی ،کە مەمە، لە ئۆرلیانۆی دووهەمدا پێکی هێنابوو، دیسان لەویدا دۆزییەوە. قەولی پێدا بوو بۆ درێژەی خوێندن بینێرێ بۆ برۆکسێل و، ئەوە کارێک بوو لە زەمانی کۆمپانیای مۆزەوە لەوێ ببوو بە داب. ئەو هیوایە ببوو بە هۆی ئەوەی ئەو زەوییانەی لافاو تێکی دابوون سەر لە نوی چاک بکاتەوە. ئەو جارە کەمانەی کە دەهاتەوە ماڵێ لەبەر ئامارانتا ئۆرسۆلا بوو. تێپەڕینی زەمان بەتەواوی لەگەڵ فێرناندای کردبوو بە بێگانە. ئۆرلیانۆی بچکۆڵەش هەتا گەورەتر دەبوو گۆشەگیرتر دەبوو. ئۆرلیانۆی دووهەم هیوادار بوو کە فێرناندا بە هۆی پیری هێندێک دڵنەرمتر بێ و مناڵەکە بتوانێ بە بێ ئەوەی کەس کاری بە بن و بنەچەیەوە هەبێ، بێتە نێو ژیانی شارستانی، بەڵام ئۆرلیانۆ تەنیایی و گۆشەگیریی پێ باشتر بوو و، بچووکترین مەیلی بەو دنیایەوە نەبوو، کە لە پشت دەرگای ماڵەکەیانەوە دەستی پێدەکرد. کاتێک ئۆرسۆلا دەرگای ژووری مێلکیادێسی کردەوە، مناڵەکە جار بە جار لە پشت دەرگای ژوورەکە هەڵوێستەیەکی دەکرد و جاری واش بوو بە دەرگای نیوەکراوەدا سەرێکی بە ژوورەکەدا دەگرت. کەس نەیدەزانی کەی ئەو پەیوەندییەلەنێوان ئەو و خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم دروست بووە، کە دواتر بووە خۆشەویستییەکی هاوبەشی نێوانیان. ئۆرلیانۆی دووهەم زۆر دوای ئەوەی دۆستایەتییەکە پێکهاتبوو

پێی زانی _ کاتێک بیستی کە منداڵەکە سەبارەت بە قەڵاچۆی کۆمپانیای قەتار دەدوێ. رۆژێک لە سەر مێزی نانخواردن، کەسێک دەیگوت لە وکاتەوە کۆمپانیای مۆز لەوێ رۆیشتووە شار بەرەو وێرانی چووە و. ئۆرلیانۆ وەک ئینسانێکی گەورە و ئاقڵ دروست بە پێچەوانەی ئەو قسەی کرد. باوەڕی ئەو بە پێچەوانەی رای گشتی ئەوە بوو، کە هەتا کۆمپانیای مۆز ئەوێی تێکنەدابوو و لاڕێی نەکردبوو و، شیرەی نەمژیبوو، ماکۆندۆ شوێنێکی خۆشبەخت و بۆ پێشەوەڕۆ بوو. کۆمپانیای مۆز بارانی بۆ وەدواخستنی داواکانی کرێکاران کردبووە بیانوو. جۆرێکی قسە دەکرد وا دەهاتە بەرچاوی فێرناندا کە نواندنێکی گاڵتەیە، لە دەمەتەقەی حەزرەتی مەسیح لەگەڵ دوکتوران، کوڕە منداڵە بە شیکردنەوەیەکی دوور و درێژ و پێسەلماندن، شییکردەوە کە چۆن ئەرتەش زۆرتر لە سێ هەزار کرێکاری لە ئیزگەی قەتار دایە بەر دەسرێژی رەشاشان و چۆن لاشەکانی بەقەتاری دووسەد واگۆنی بار کردبوو تا لە دەریایان بهاوێژن. فێرناندا، کە وەک زۆربەی خەڵک، ئەو راستییە رەسمییەی گوایە هیچ کارەساتێک نەقەوماوە. قبووڵ کردبوو، بەو خەیاڵە کە رەنگە کوڕە مەیلی ئەنارشیستیی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای بەمیرات بۆ بەجێ مابێ، زۆر تووڕە بوو و دەستووری پێدا بێدەنگ بێ. ئۆرلیانۆی دووهەم بەپێچەوانە، لە قسەکانی کوڕەدا داستانی برا دووانەکەی ناسییەوە. هەرچەند لەو زەمانەدا هەموو لایان وابوو خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم شێتە. لە راستیدا ئەو ئاقڵترین ئەندامی ئەو بنەماڵەیە بوو، ئۆرلیانۆی بچووکی فێری خوێندن و نووسین کرد و فێری کرد کە چۆن نووسینی سەرپێستان بخوێنێتەوە. لێکدانەوەی خۆی لە سەر شوێنەواری کۆمپانیای مۆز لە چارەنووسی ماکۆندۆدا وەها دەگوێی کوڕەی سەپاندبوو، کە سالانی دوایی، کاتێک ئۆرلیانۆ پێی نایە دنیای دەرەوەی ماڵەوە هەموو وایانزانی دەبزڕکێنێ، چونکە وتەکانی لە بناخە و ریشەوە بە پێچەوانەی ئەو قسانە بوون کە مێژوونووسان دایانهێنابوو و لە کتێبی دەرسیدا گونجاندبوویان. لەو ژوورە چکۆڵە و دوورەپەرێزەدا، کە نەبای گەرم دەیگرتەوە و نە تۆز و خۆڵ و گەرما، ئەو دوو کەسە، هەردووکیان، پیرەپیاوێکیان دەدی کە پشتی لە پەنجەرە کردووە و کڵاوێکی

وەک باڵی قاژووی لە سەر ناوە و لە دونیایەک قسە دەکا کە لە پێش لە دایکبوونی هەردووکیان هەبووە. هەردووک زانییان کە لەو دونیایەدا، هەمیشە مانگی مارس و هەمیشەش رۆژی دووشەممەیە و ئەو کات تێگەیشتن کە خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم پێچەوانەی بۆچوونی بنەماڵە شێت نییە، بەڵکو تەنیا کەسێکە کە بە ئەندازەی پێویست ئاقڵ و زانیاریی هەیە، هەتا بزانێ کە تەنانەت زەمانیش تووشی هەڵە دەبێ و لە ئەنجامدا دەتوانێ ئانێک لە ژوورێکدا بۆ ئەبەد لە جێگای خۆی رابگرێ. لەگەڵ ئەوەشدا، خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم توانیبووی پیتی رەمزی نووسراوەکان دەستەبەندی بکا. دڵنیا بوو کە ئەو پیتانە لەگەڵ ئەلف و بێی چل و حەوت و پەنجا و سێ پیتی یەک دەگرنەوە، کاتێک جیاجیان قرژاڵ بۆقن،بەڵام لە دەستنووسی وردی مێلکیادێسدا وەک ئەو جلانەن کە بۆ ویشککردنەوە بە تەناقی ئاسن هەڵواسرابن. ئۆرلیانۆ هاتەوە یادی کە لەوحێکی ئەوتۆی لە فەرهەنگە ئینگلیزییەکەدا دیتووە. ئەوی هێنایە ژوورەکە هەتا لەگەڵ لەوحەی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی بەراورد بکا، هەر دوو نووسراو لە راستیدا وەک یەک بوون.

ئۆرلیانۆی دووهەم لەو دەورەیەدا کە بە مێشکیدا هاتبوو لۆتەریی بە شێوەی مەتەڵ دامەزرێنێ، لە خەو رادەپەڕی و هەستی دەکرد گەرووی گیراوە، دروست وەک ئەوەی بوغز گەرووی دەگوشێ. پێترا کۆتیس ئەوەشی بە ئەستۆی خراپیی وەزعەکە داهێنا. زۆرتر لە ساڵێک هەموو رۆژێ هەنگوینی لە گەرووی هەڵسوو و شەربەتی سینگی دەرخوارد دا. کاتێک ئەوەندە گەرووی گیرا کە بەزەحمەت دەیتوانی هەناسە هەڵکێشێ، رۆیشتە لای پیلار تێرنێرا، هەتا بەڵکو ئەو بۆ چارەی گەرووی دەرمانە گیا بناسێ. دایەگەورەی لەشکاننەهاتووی ئەو، کە بە بەسەرراگەیشتنی فاحیشەخانەیەکی چکۆڵەی غەیرەقانوونی گەیشتبووە تەمەنی سەد ساڵی، تەنیا بە چارەسەری خورافاتییەوە نەوەستا و ویستی فاڵی وەرەقێکیش بگریتەوە . سەربازی دڵی بینی کە بە هۆی کچی پیک بریندار بووە. بەو ئاکامە گەیشت کە فێرناندا بەکەڵکوەرگرتن لە شێوەی کۆنی دەرزی لە وێنەرۆکردن تێدەکۆشێ ئەوی بۆ لای خۆی بگێڕێتەوە ماڵەوە، بەڵام چونکە

لەو جادووگەرییەدا شارەزایی تەواوی نییە، بۆتە هۆی ئەوەی لە گەرووی ئەودا گرولەیەک دروست بێ.
چونکە ئۆرلیانۆی دووهەم، بێجگە لە وێنەی زەماوەندی خۆی، وێنەی دیکەی نەبوو و تەواوی کۆبۆنەکانیشی لە ئالبۆمی بنەماڵەییدا لە سەر جێگای خۆی بوو، کاتێک بە بێ ئاگاداریی ژنەکەی تەواوی ماڵەوەی بۆ دۆزینەوە سەروژێر کرد و سەرەنجام لە بنی گەنجەدا شەش دانە لە لاستیکەکانی، کە لە قووڵایی ئەسڵی خۆیاندا بوون دۆزییەوە، بەو خەیاڵە کە ئەو ئاڵقە سوورە لاستیکییانە کەرەسەی جادووگەرین، یەکێک لەوانەی لە گیرفانی نا هەتا بە پیلار تێرنێرای نیشان بدا. بەڵام ئەو سەرەدەری لێ دەرنەکردن و، هەر چۆنی بێ، چونکە بە شتی گومانلێکراوی هاتنە بەرچاو، هەموویانی لە ئاورێکی لە حەوشە کردبوویەوە، سووتاندن. بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەگەری جادووی فێرناندا، پێشنیاری بە ئۆرلیانۆی دووهەم کرد کە مریشکێکی کورک تەڕ بکا و بە زیندوویی لە ژێر داربەڕووەکەی حەوشە لە قوولکەی بخا و ئەو، ئەو کارەی وەها بە نیازپاکی کرد کە کاتێک سەری بە گەڵای ئیشک داپۆشییەوە هەستی کرد چاکتر نەفەس هەڵدەکێشێ. فێرناندا لە لایەن خۆیەوە بزربوونی لاستیکەکانی بەحیسابی تۆڵەی پزیشکانی نادیار دانا و لە سەر ژێرکراسەکەی خۆیەوە گیرفانێکی لێدروو و ئەو لاستیکە تازانەی، کە کوڕەکەی بۆی ناردبوو، لەوێی نان.
شەش مانگ دوای زیندەبەچاڵی مریشکەکە، نیوەشەوێک، ئۆرلیانۆی دووهەم بە هێرشە کۆخەیەک لە خەو راپەڕی هەستی کرد کە شتێک لە گەروویدا وەک گیرەی قرژاڵی خەریکە دەیخنکێنێ، ئەو کاتە بوو کە تێگەیی هەر چەند لاستیکی جادوویی لە نێو ببا و هەر چەندە مریشکی بۆ بەتاڵکردنەوەی جادوو زیندەبەچاڵ بکا، تەنیا راستیی تاڵ و خەمبار ئەوەیە، خەریکە دەمرێ. ئەوەی بە کەس نەگوت، لەوە ترسا بمرێ و نەتوانێ ئامارانتا ئۆرسولای بنێرێتە بروکسێل[٤]، لە هەموو کاتێک زۆرتر خەریکی کار بوو، لە جیاتی لۆتەرییەک حەوتووی سێ لۆتەریی پێکدەهێنا. دەیانبینی کە بەیانی زوو بە شاردا دەگەڕێ و تەنانەت لە گەڕەکە سەرپەڕ و

٤- Brucelles

هەژارەکانیش هەوڵی دەدا بلیتی لۆتەری بفرۆشێ. نیگەرانیی ئەو، تەنیا ئەو کەسە تێی دەگەیشت کە زانیبای بەو زووانە دەمرێ. رایگەیاند کە: "لۆتەریی خوای مەزنە. هەلەکە لە کیس مەدە چونکە هەر بە سەد ساڵان جارێک دێ" تینی بۆخۆی دەهێنا سەرحاڵ و خۆشحاڵ بێتە بەرچاو، بەڵام رەنگی بە رووانەوە نەمابوو، ئەو ئارەقەی لە دەموچاوی هەڵدەرژا باسی لە مردن دەکرد. جاری وابوو رێگای خۆی دەگۆڕی و رووی دەکردە شوێنێ نەناسراو هەتا کەس نەیبینێ. لەوێ دادەنیشت هەتا لە دەست ئەو قرژاڵانە کە خەریک بوون لە نێو گەروویدا بیخنکێنن بحەسێتەوە. نیوەشەوانی هێشتا لە گەرەکی فاحیشەکان بوو، هەوڵی دەدا بە قسەی خۆش دڵی ئەو ژنە تەنیایانە بداتەوە کە لە کەنار گرامافۆندا هۆڕ هۆڕ دەگریان و، هەوڵی دەدا دڵنیایان بکا خۆش شانسن. بلیتەکانی پێ نیشان دەدان و دەیگوت: "ئەو ژمارەیە چوار مانگە نەهاتۆتە دەرێ، هەل لە کیس خۆتان مەدەن ژیان زۆر لەوە کورتترە کە بیری لێدەکەنەوە." سەرەنجام ئەو هەموو رێزەی بۆیان هەبوو لەدەستیان دا و لە مانگەکانی کۆتایی تەمەنیدا وەک هەمیشە بە دۆن ئۆرلیانۆ بانگیان نەدەکرد و بە رووهەڵماڵدراوی پێیان دەوت (کاکی خواوەندی مەزن). ورده ورده دەنگی دەکەوت، بە جۆرێک کە سەرەنجام دەنگی وەک حەپەحەپی سەگی لێهات، بەڵام دیسانیش خۆراگریی دەکرد لەو هیوایە، هەروا کە کەمکەم دەنگی لە گەروویدا دەخنکا و دەیزانی کە ئیدی توانای نەماوە، دەشیزانی کە بە پووڵی هەراجی بەراز و بزنان ناتوانێ کچەکەی بنێرێتە برۆکسێلێ، ئەو کات کەوتە سەر ئەو بیرەی دەست بکا بە هەراجی زەوییە لافاولێدراوەکانی، هەتا ئەو کەسانەی پارەی زۆریان هەیە ئاوەدانیان کەنەوە. ئەو نەخشەیە ئەوەندە مەزن بوو، شارەوان بۆخۆی، لە ئاگادارییەکدا ئەوەی راگەیاند و هێندێک کۆمپانیا بۆ کڕینی بلیتەکان دانەی بە نرخی سەد پێزۆ دامەزرا و تەواوی بلیتەکان لە ماوەی کەمتر لە حەوتوویەکدا فرۆشران. شەوی هەراجەکە براوەکان شەونشینییەکی بەشکۆیان پێکهێنا، کە لەگەڵ جێژەکانی زەمانی کۆمپانیای مۆزدا بەرامبەری دەکرد. ئۆرلیانۆی دووهەم بۆ ئاخرین جار هەوای

فەرامۆشکراوەی فرانسیسکۆی پیاوی بە ئۆکۆردیۆنی خۆی لێدا، بەڵام نەیتوانی گۆرانی بڵێ.
دوو مانگ دوایی ئامارانتا ئۆرسوڵا رۆیشتە برۆکسێلێ. ئۆرلیانۆی دووهەم نەتەنیا پووڵی هەراج، بەڵکو ئەو پووڵەشی، کە توانیبووی لە ماوەی مانگەکانی رابردوودا کۆی بکاتەوە، لەگەڵ ئەو پارە کەمەی کە لە فرۆشی پیانۆ و کلاوسێن و شتی شکاوی دیکە دەستی کەوتبوو، هەمووی دا بەو. فێرناندا هەتا دەقیقەی ئاخیر دژی ئەو سەفەرە بوو و لە بەر ئەو فکرەی برۆکسێل هێندە لە پاریسی فاسید نزیکە، دەترسا. بەڵام باوکی رووحانی ئەنجێل خەیاڵی ئاسوودە کرد، نیشانی پانسیۆنێکی بۆ کچانی لاوی کاتولیک دایە، کە بە هۆی راهیبان بەڕێوە دەچوو و ئامارانتا ئۆرسوڵا قەولی دا کە هەتا کۆتایی دەورەی خوێندن هەر لەوێ بژی. لەگەڵ ئەوەشدا کەشیش توانی لە ژێر چاوەدێریی دەستەیەک کەشیش، کە دەچوونە شاری تۆلێدۆ.[٥] رەوانەی سەفەری بکا. هیوادار بوون لەوێوە کەسانێکی جێی متمانە بدۆزنەوە و لەگەڵ ئەوان بینێرن بۆ بەلچیکا. هەروا کە بۆ چارەسەری ئەو مەسەلانە نامە گۆڕینەوە دەکرا. ئۆرلیانۆی دووهەم، بە یارمەتیی پێترا کۆتیس شتومەکی ئامارانتا ئۆرسوڵایان ئامادە دەکرد. شەوێک کە شتومەکی ئەویان لە سندووقی جیازیی فێرناندا دەنا، هەموو شتێک وەها بە رێکوپێکی لە سندووق دانرا کچە لە بەری بوو کە لیباس و کەوشە راحەتییەکانی مەخمەر، کە دەبێ لە کاتی رابردن بە زەریای ئەتڵەسیدا دەبەریان بکا، لە چ شوێنێکی سندووقەکەدان، پاڵتۆی سوورمەیی دووگمەئاسن و کەوشە چەرمییەکان، کە دەبێ لە کاتی پیادەبوون لە کەشتی دەبەریان بکا، لە کوێن. دەیزانی کە چۆن سواری کەشتی بێ لە ئاوێ نەکەوێ، دەیزانی کە نابێ بە هیچ جۆرێک تاوێک لە کەشیشەکان جیا بێتەوە و تەنیا بۆ نان خواردن لە ژووری خۆی بێتە دەر و. بە هیچ جۆر نابێ لە ماوەی سەفەرەکەدا وەڵامی پرسیاری خەڵکی بێگانە بداتەوە. چ نێر و چ مێ. شووشەیەکی قەترە پێ بوو بۆبەرگری لە دڵ تێکهەڵهاتن و ڕشانەوە و دەفتەرچەیەکی دوعا کە کەشێش ئەنجێل بە دەستخەتی خۆی

---

٥– Toledo

شەش دوعای دژی تۆفانی بۆ لێ نووسیبوو. فێرنانداش کەمەربەندێکی پارچەی بۆ دروو کە پووڵەکانی لە نێو ئەو بنێ، کەمەربەندێک کە تەنانەت کاتی خەوتنیش نەدەبوایە لە خۆی کردبایەوە. هەوڵی دا لەگەنە زێڕەکەشی کە بە قسڵاو شوشتبووی و بە ئالکۆڵ خاوێنی کردبۆوە بداتێ لەگەڵ خۆی بەرێ، بەڵام ئامارانتا ئۆرسوڵا لە ترسی ئەوەی کە مەبادا هاوپۆلەکانی گاڵتەی پێ بکەن، قبووڵی نەکرد. چەند مانگ دواتر، ئۆرلیانۆی دووهەم، لە دەمی سەرەمەرگدا، ئەوی هەر بەو جۆرە هاتەوە بەرچاو کە بۆ ئاخر جار دیتبووی _ کاتێک هەوڵی بێهوودەی دەدا، دەیویست پەنجەرەی واگۆنی پیسی دەرەجە دووی قەتارەکە بەزۆر داکێشێ، هەتا گوێی لە ئاخر سپاردەکانی فێرناندا بێ، کراسێکی ئاوریشمی سوورەتی رەنگی دەبەردابوو و دەسکەگوڵێکی وەنەوشەی دەسکردی لە شانی چەپەیدا بوو. کەوشی چەرمی پانیەکورتی گرێداری لە پێدا بوو و گۆرەویی ساتین، کە بە کێش دەگەیشتنە بن رانی، قەدی چکۆڵە و پرچی کە بە سەر شاناندا بڵاو کرابوونەوە و چاوی بەهۆشی، هەموو وەک ئۆرسوڵای دەچوون لەو تەمەنەدا و کاتێک ماڵئاوایی کرد، بە بێ ئەوەی زەردەخەنەیەکی پاک بکا یان فرمێسکێک هەڵرێژێ، وەک بەتوانایی رووحیی ئۆرسوڵا دەچوو. هەروا کە قەتارەکە توندتر دەرۆیی، ئۆرلیانۆی دووهەم قۆڵی فێرناندای گرتبوو هەتا نەکەوێ و تەنیا توانی دەستێک بۆ کچەکەی راوەشێنێ کە بە سەر پەنجان ماچێکی بۆ ناردبوو. ئەو دووانە، لە بەر هەتاوی سووتێنەر، بێ جووڵە راوەستان و هەروا تەماشای قەتارەکەیان دەکرد کە لەگەڵ خاڵی رەشی راوەستاوی ئاسۆ تێکەڵ دەبوو. بۆ یەکەم کەڕەت دوای زەماوەندیان باسکی یەکتریان گرت.

رۆژی نۆهەمی مانگی ئووت، کە هێشتا هەوەڵین نامە لە برۆکسێلەوە نەهاتبوو، خۆزێ ئارکادیۆی دووهەم لە هۆدەی مێلکیادێس لەگەڵ ئۆرلیانۆ قسەی دەکرد، کە لە پڕ بە بێ ئەوەی پێوەندیی بە دەقی قسەکانەوە هەبێ، وتی: "هەرگیز فەرامۆشی مەکە. زۆرتر لە سێ هەزار کەس بوون و ئەوانیان لە دەریا هاویشت." ئە وکات بە سەر نووسراوەکانی پێستی مێلکیادێسدا کەوت و مرد و چاوی لێک نەنان. دروست هەر لە دەمەدا، لە

جێوبانی فێرناندا برا دووانەکەی لە ئازاری دووروودرێژی قرژاڵە ئاسنەکان، کە گەرووویان هەڵدەدڕی، رزگاری بوو. حەوتوویەک پێشتر، بە بێ ئەوەی دەنگێک لە گەرووی بێتەدەر و بتوانێ هەناسە هەڵکێشێ، لە کاتێکدا هەر ئێسک و پێستی لێ مابۆوە، بە باوله سەرگەردانەکانی و ئۆکۆردیۆنی بەرەڵڵای گەڕابۆوە ماڵی خۆی، هەتا بە پەیمانی خۆی، کە دەمی مردن لە لای ژنەکەی بێ، وەفای کردبێ. پێترا کۆتیس لە کۆکردنەوەی شتومەکەکانی یارمەتیی دا. بە بێ ئەوەی فرمێسکێکی لە چاوی بێ. ماڵئاوایی لێکرد، بەڵام لە بیری چوو ئەو کەوشانەی کە دەیویست لە تابووتدا دەپێی دابن بیداتێ، لەو بارەوە کاتێک هەواڵی مردنی زانی، لیباسی رەشی دەبەر کرد و کەوشەکانی لە رۆژنامەیەکەوە پێچاو ئیجازەی لە فێرناندا خواست جەنازەکەی چاو پێ بکەوێ، بەڵام فێرناندا رێگەی ماڵەوەی نەدا.

پێترا کۆتیس بە پاڕانەوە وتی: "خۆت لە جێگای من دابنێ و بزانە چەندەم خۆش ویستووە، کە ئەو هەموو نزمی و سەرشۆڕییە قبوول دەکەم."

فێرناندا وتی: "گراوییەکان شیاوی هەر جۆرە سووکایەتییەکن، چاوەڕوان بە هەتا یەکی دیکە لە فاسقە زۆرەکانت بمرێ و کەوشەکان دەپێی ئەو بکەی."

سانتا سۆفیا دێلا پێداد بۆ ئەوە بە قەولی خۆی وەفای کردبێ گەرووی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی بە چەقۆی ئاشپەزخانە هەڵدڕی هەتا دڵنیابێ بەزیندوویی نایبنێژن. هەردوو تەرمەکەیان لە دوو تابووتی یەک شکڵ نان و ئەو جار هەموو بۆیان دەرکەوت کە دووانەکان، هەروا کە بە منداڵی وەک یەک دەچوون، بە مردوویش هەروایان لێ هاتۆتەوە. هاوڕێیانی کۆنی زەمانی خۆشگوزەرانیی ئۆرلیانۆی دووهەم تاجەگوڵێکیان لە سەر تابووتەکەی ئەو دانا، کە لە سەر رووبەندی بنەوشی ئەودا نووسرابوو: "گاجووتەکان لێک جیا بنەوە،ژیان زۆر کورتە". فیرناندا وەها لەو سووکایەتییە تووڕە بوو کە تاجەگوڵەکەی لە سەبەتەی زبڵی هاویشت. لە شلۆقیی سەعاتی ئاخردا، ئەو مەستە خەمبارانە کە تابووتەکانیان لە ماڵەوە

دەبردەدەرێ، تابووتەکانیان لێ گۆڕا و هەریەکەیان لە گۆڕی ئەوی دیکەدا بەخاک سپارد.
ئۆرلیانۆ، هەتا ماوەیەکی زۆر لە ژووری مێلکیادێس نەهاتەدەرێ، داستانە خۆشەکانی کتێبە کۆنەکان، ئاویتەی زانیارییەکانی هێرمان[1] ی گۆج، نووسراوەکانی سەبارەت بە زانستی شەیتان، ناسی. ڕێنوێنییەکانی دەستکەوتنی بەردی فەیلەسووفەکان، پێشبینییەکانی نۆستردامۆس و لێکۆڵینەوەکانی ئەو لە بارەی تاعوون، هەموویانی ئەوەندە خوێندەوە لە بەری کردن. بە جۆرێک کاتێکی گەیشتە تەمەنی بلووغی شتێکی لە زەمانی خۆی نەدەزانی و لە باتییان زانیاریی سەدەکانی نێوەڕاست فێر ببوو. لە هەر سەعاتێکدا کە سانتا سۆفیا دیلا پێداد دەڕۆیشتە ژووری، دەیدی غەرقی خوێندنەوەیە. بەیانیان قۆرییەکی قاوەی بێ شەکر و نیوەڕۆیان قاپێکی برینج لەگەڵ مۆزی سوورەوەکراوی بۆ دەبرد و، ئەوە تەنیا شتێک بوو کە دوای مردنی ئۆرلیانۆی دووهەم لە ماڵەوە دەیانخوارد. ئاگاداریی دەکرد و مووی سەری چاک دەکرد، ڕشکەکانی لە سەری خاوێن دەکردەوە و لە سندووقە فەرامۆشکراوەکان لیباسی بە ئەندازەی ئەوی دەردەهێنا و، کاتێک لە سەر لێوی بۆرایی سمێڵی دەرکەوت، گوێزانی ڕیشتراشینی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای لەگەڵ قاپێکی چکۆڵەی ئاوی گەرمی بۆ هێنا. هیچ کام لە منداڵەکانی سەرهەنگ، تەنانەت ئاۆرلیانۆ خۆزێش، بە ئەندازەی ئەو منداڵە زلە وەک ئەو نەدەچوون، بەتایبەتی زەوت کوڵمانی و درزی ئاشکرا و نامیهرەبانی لێوانی، دروست وەک ئەو زەمانەی کە ئۆرلیانۆی دووهەم لەو هۆدەیەدا خەریکی خوێندنەوە بوو و ئۆرسۆلا وایدەزانی لەگەڵ خۆی قسە دەکا. سانتا سۆفیا دیلا پێدادیش وایدەزانی ئۆرلیانۆ دەگەڵ خۆی قسە دەکا. بەڵام ئەو لەڕاستیدا لەگەڵ مێلکیادێس قسەی دەکرد. هێندێک دوای مەرگی دووانەکان، لە نیوەڕۆیەکی گەرمدا، لە نێو ڕووناکایی تیشکی پەنجەرەدا پیرەپیاوێکی خەمبار، کڵاوێکی وەک باڵی قاژووی لە سەر بوو، وەک بیرەوەریی ئەو هەیکەلە بینی، کە زۆر پێش لەدایکبوونیشی لە مێشکیدا بوو. ئۆرلیانۆ ڕیزکردنی ئەلف و بێی نووسراوە

[1]- Hermann

کۆنەکـانی تەواو کردبـوو، کاتێـک مێلکیـادیس لێـی پرسـی کە دەزانـێ نووسـراوەکان بە چ زمانێـک نووسـراونەوە، ئەو بە بـێ رامـان وتـی: 'سانسکریت.'
مێلکیـادێس پێـی وت ئیمکـانی گەڕانەوەی بـۆ ئەو ژوورە زۆر کەمە، بەڵام ئێستا دەتوانێ بە فکرێکی ئاسوودەوە بەرەو مەزراکانی مەرگ بڕوا، چونکە ئۆرلیـانۆ مـاوەی دەبێ لەو سـاڵانەدا کە مـاویەتی بۆ سـەد سـاڵەی تەمەنـی نووسـراوە کۆنەکـان زمـانی سانسـکریت فێـر بـێ و، بتـوانێ نهێنییەکـان بـدۆزێتەوە. خـۆی نیشـانەیەکی دا بە ئۆرلیـانۆ، لە کـۆڵانێکی بـاریکی دەچێتە سـەر رووبـار، لە هەمـان کـۆڵانی کە لە زەمـانی کۆمپانیـای مـۆزدا مانـای خەونیـان لێـک دەدایەوە، زانـایەکی ئیسـپانیۆلی دووکـانێکی کتێبفرۆشـیی هەیە، لەوێ کتێبی دەستووری زمانی سانسکریت دەست دەکەوێ و ئەگەر پەلە بۆ کڕینی نەکا، هەتا شەش ساڵی دیکە مۆرانە دەیخوا. سـانتا سـۆفیا دیـلا پێـداد بـۆ هەوەڵـین کەڕەت لە ژیانیـدا، کاتێـک ئۆرلیـانۆ داوای لێکـرد کتێبێکی کە لە ئاخیری لای راستی تەبەقەی دووهەمی کتێبفرۆشییەکە دا لە نێـوان cerusalem-liberata[٢] و شـێعرەکانی میلتـۆن[٣] دایە، بـۆی بێنـێ، هەسـتێکی لە خـۆی پێشـان دا، هەسـتی سەرسـووڕمان. چـونکە بۆخـۆی خوێنـدەواریی نەبـوو فەرمانەکـانی لە بەر کـرد و پـووڵی پێویستیشـی بە فرۆشی یەکێک لەو حەقدە ماسییە زێڕانە کە لە کارگایە بوو بەدەست هێنا. دوای ئەو شەوەی کە سەربازەکان ماڵەکەیان سەروبن کردبوو تەنیا ئەو و ئۆرلیـانۆ بە شـوێنی ماسـییە زێڕەکانیـان دەزانـی. هەروا کە دیـدارەکانی مێلکیادێس بەرە بەرە کەم دەبوونەوە و خۆیشی لە رووناکایی بریسکەداری نیـوەڕۆدا دوورتـر و ونبـووتر دەبـوو، ئۆرلیـانۆ لە فێـر بـوونی زمـانی سانسکریتدا بەرەو پێش دەچوو. ئاخر جار کە ئۆرلیانۆ هەستی بە بوونی ئەو کـرد، ببـوو بە شـتێکی نەبینـراو کە بە نارەنـار دەیگـوت: "مـن لە کەنارەکانی سنگاپووردا بە نۆبەتێ مردم." لەوە بەدوا، تـۆز و خـۆڵ، گەرمـا،

---

[٢]– Torquate Tasso شاعیری ئیتالیایی ٩٥_ ١٥٤٤_ و

[٣]– Juhn Milton شاعیدی ئینگلیزی ١٦٧٤_١٦٠٨ _و

مۆریانە، خۆرکە و مێرووله سووره ژوورەکەیان داگرت. هێندەی نەمابوو زانست و زانیاریی کتێبەکان و مەکتەبییەکانی بکەنە مستەخۆڵێک.
ئیدی خواردن لە ماڵەوە کەم نەبوو، سبەینەی رۆژی مەرگی ئۆرلیانۆی دووهەم، یەکێک لەو هاورێیانەی کە تاجەگوڵەکەی بەو نووسراوە بۆ ئەدەبانەوە هێنابوو، پێشنیاری کرد پوولێک کە بە ئۆرلیانۆی دووهەم قەرزدارە بیدا بە فێرناندا. لەوەبەدوا هەموو حەفتان رۆژانی چوارشەممە کورێکی منداڵ سەبەتەیەکی خواردەمەنی بۆ ماڵەوەیان دەهێنا کە بەشی حەفتەیەکی دەکرد. هیچ کەس هەرگیز نەیزانی کە ئەو خواردەمەنییە پێترا کۆتیس بۆ ئەوێی دەنێری، چونکە لای وابوو سەدەقەیەکی بەردەوام، رێگایەکی لەبارە بۆ تۆڵەی سووکایەتیی کەسێک کە سووکایەتیی پێکردوە. بەهەر حاڵ رقەکەی زۆر لەوە زووتر، کە خۆی چاوەڕوانی دەکرد، لە دڵ دەرچوو و لێرە بەدواوە خواردەمەنییەکی بە لەخۆبایی بوون و سەرەنجام لە رووی دڵسۆزییەوە بۆ دەناردن. چەند جار کاتێک هیچ حەیوانی نەدەما بە لۆتەریی دابنێ و خەلکی مەیلیان بە لای هەراج و لۆتەرییەوە نەما، خۆی برسیتیی کێشا، هەتا فێرناندا خواردنی هەبێ و ئەو بە برسیبوونەی هەتا ئە رۆژە درێژە پێدا، تا چاوی بە رێورەسمی بەخاکسپاردنی فێرناندا کەوت.
کەمبوونەوەی دانیشتووانی ماڵەکە بۆ سانتا سۆفیا دێلا پێداد حەسانەوەیەک بوو کە دوای نیو سەدە و شتێک کارکردن مافی خۆی بوو. هەرگیز کەسێک نەیبیستبوو کە ئەو ژنە کۆشا و لەشکاننەهاتووە شکایەت لە شتێک بکا. ژنێک کە نەمامی ئاسمانی رێمیدیۆسی جوانکیلە و شکۆی شاراوەی خۆزێ ئارکادیۆی دووهەمی لەو بنەماڵەیەدا ناشتبوو، ژنێک کە هەموو تەمەنی لە بێدەنگی و تەنیایی دا بەختی گەورەکردنی چەند منالێک کردبوو، کە تەنانەت لە بیری نەمابوو منالی خۆین یان نەوە، وەها پارێزگاریی لە ئۆرلیانۆ دەکرد کە دەتوت لە خۆی بووە و تەنانەت نەیدەزانی نەنکییەتی. تەنیا لەو ماڵەدا دەزاندرا کە ئەو هەمیشە لە عەمبارێ لە سەر دۆشەکێک لە نێو خشپ و هۆڕی مشکاندا نووستووە و، قەتیش بۆ کەسی نەگێڕابۆوە کە شەوێکی هەستی کردبوو کەسێک لە تاریکاییدا چاوی لێدەکا و لە خەودا راپەڕیبوو تەماشای کردبوو مارێک بە سەر زگیدا

رادەخوشێ. دەیزانی ئەگەر ئەوە بۆ ئۆرسۆلای بگێڕێتەوە، ئۆرسۆلا لەگەڵ خۆی دەینوێنێ، بەڵام زەمانێک بوو کەس لە کەس حاڵی نەدەبوو ، مەگەر ئەوە لە هەیوانێ بە دەنگی بەرز راگەیەنرابا، چونکە لەبەر دەنگەدەنگ و شلۆقی ئاورگی ئاشپەزخانە و رووداوەکانی پێشبینی نەکراوی شەڕ و گەورەکردنی ماڵەکان، کاتێک بۆ ئەوە نەدەمایەوە بەخۆشی و ئاسوودەیی وەک خەڵکی بیر بکەنەوە. پێترا کۆتیس، کە هیچ کات ئەوی نەدیبوو، تەنیا کەسێک بوو کە وەبیری دەهاتەوە و چاوەدێریی دەکرد کە دەبێ حەتمەن کەوشی باشی بۆ دەپێ کردنی دەرەوە هەبێ و هەمیشە لیباسی رێکوپێک بێ، تەنانەت ئەو کاتەش کە ئەو و ئۆرلیانۆی دووهەم بۆ پارە پەیداکردن هێندە خۆیان بە لۆتەرییەوە هیلاک دەکرد. فێرناندا کە لە پێشدا هاتبوو بۆ ئەو ماڵە، لای وابوو ئەو ژنە کارەکەرێکی ئەبەدیی ئەو ماڵەیە، هەر چەند زۆری بیستبوو کە ئەو ژنە دایکی مێردەکەیەتی، بەڵام لە بیرمانی ئەو مەسەلەیە لە فەرامۆش کردنی گرانتر بوو. بەڕواڵەت سانتا سۆفیا دێلا پێداد لەو وەزعە خەفەتاوییە هەستی بە نارەحەتی نەدەکرد و بەپێچەوانە، وا دەهاتە بەر چاو هەرچی زۆرتر کار دەکا رازیترە. تاوێک رانەدەوەستا و بە بێ ئەوەی گازندەیەک بکا ئەو ماڵە گەورەیەی رێکوپێک و خاوێن دەکردەوە. ماڵێکی ئەو لە کاتی گەنجییەوە تێیدا ژیابوو و لە زەمانی کۆمپانیای مۆزدا زۆرتر وەک سەربازخانە دەچوو، بەڵام بە مردنی ئۆرسۆلا هۆشی سەرووی بەشەریی سانتا سۆفیا دێلا پێداد و توانای لەبڕاننەهاتووی لەکزی دا. نەک لە بەر ئەوە پیر و دارزابوو، بەڵکو لە بەر ئەوە کە ماڵەکە لە ماوەی رۆژێکدا بە جارێک لە بەر قەبارەی پیری و کۆنی داتەپی، قەوزەیەکی نەرم دیوارەکانی داپۆشی، گیاکەڵەکان دوای ئەوەی هەموو حەوشەیان داگرت، لە نێوناسیمانی لەپێ هەیوانێدا بەرەو پێش رۆیشت و وەک شووشە چڕاندی و لە نێو درزەکاندا گوڵە زەردێک رووان کە ئۆرسۆلا سەد ساڵ لەمەوپێش لە نێو لیوانی ددانە دەسکردەکانی مێلکیادێسدا چاوی پێکەوتبوون. سانتا سۆفیا دێلا پێداد، کە ئیدی نە کات و نە کەرەسەی ململانەی لەگەڵ سروشت نەبوو، بە درێژایی رۆژێ مارمێلکەی لە ژووری خەوەکان فڕێ دەدا دەرێ و شەوانە دیسان پڕ

دەبوونەوە لە مارمێلکە. ڕۆژێکیان بەیانی چاوی بە مێرووە سووران کەوت کە لە باخچە تێپەڕبوون و لە دیوای هەیوانێ، کە گوڵە بگۆنیاکانی ڕەنگی خۆڵیان بەخۆوە گرتبوو، سەرکەوتبوون و هاتبوونە نێو دڵی ماڵەکەوە. لە پێشدا خەریک بوو بە گەسک بیانکوژێ و دوایە بە مێشکوژ و سەرەنجام بە قڵیا کەوتە گیانیان، بەڵام سبەی بەیانی مێرووەکان بەهێز و لەشکاننەهاتوو لە شوێنی خۆیان خەریکی کار و تێکۆشان بوو. فێرناندا کە غەرقی ئاڵوگۆڕی نامە لەگەڵ کوڕەکەی ببوو، ئاگای لە وێرانیی بەردەوام و بێبەزەییانەی خانووەکەی نەبوو. سانتا سۆفیا دیلا پێداد خەباتی خۆی بەتەنیایی درێژە پێدەدا. پێشی بە گیاکان گرتبوو نەگەنە ئاشپەزخانە. لە گۆشەی دیوارەکان بە لویچان تاری جاڵجاڵووکەی کۆدەکردەوە، بەڵام لە ماوەی چەند سەعاتاندا دەتەنرایەوە. کونە مۆریانەکانی تێکدان، بەڵام کاتێک زانی کە تەنانەت هۆدەی مێلکیادیسیش، کە ڕۆژێ سێ جار گەسک دەدرێ و خاوێن دەکرێتەوە، وەک ژوورەکانی دیکە پڕ بووە لە تاری جاڵجاڵووکە و تۆز و خۆڵ و، لەگەڵ ئەوەشا خاوێن دەکرێتەوە، بەرەو کاولبوون و تەپیوی دەڕوا، کە تەنیا سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا و ئەفسەرە گەنجەکە ئەمەیان پێشبینی کردبوو، تێگەیی کە لە خەباتی خۆیدا تێشکاوە. ئەو کات لیباسە کۆنەکانی ڕۆژانی یەکشەممەی دەبەر کرد و جووتێک لە کەوشەکانی ئۆرسوڵا و جووتە گۆرەوییەکی ئاوریشمی، کە لە ئامارانتا ئۆرسوڵای وەرگرتبوو، دەپێی کردن و بە دوو سێ دەست کۆنەکراس، کە بۆی مابوونەوە، بوخچەیەکی پێکەوە نا.

بە ئۆرلیانۆی وت: "من تەسلیم بووم. ئێسقانە کلۆڵەکانم تاقەتی ئەو ماڵەیان نەماوە."

ئۆرلیانۆ لێی پرسی دەچێتە کوێ، خۆیەکی بادا، وەکبڵێی خۆشی نازانێ بۆ کوێ. بەڵام بۆ ئەوەی وردتر بڵێ، وتی بەنیازە بڕوا و ساڵەکانی ئاخری عومری لەگەڵ کچە مامەکەی بژی کە لە ڕیۆهاشا دەژی. قسەکەی زۆر دڵگر نەبوو. لە دوای مردنی دایک و بابی لەگەڵ هیچ کەس لە ڕیۆهاشا پێوەندیی نەبوو و هیچ کاتێکیش نامە و ڕاسپاردەیەکی پێ نەگەیشتبوو و سەبارەت بە خزم و کەسانی خۆی قەت قسەیەکی نەکردبوو. ئەو تەنیا

دەیویست بەو شتانەوە کە هەیەتی لەوێ بڕوا، بەڵام ئۆرلیانۆ چاردە ماسیی زێڕ و یەک پیزۆ و پێنج سێنتاوی دایە و لە پەنجەرەی ژوورەوە چاوی لێ بوو کە بوخچەی لە بن هەنگڵیدا لە حەوشە تێدەپەڕێ و لاقی لە سەر ئەرزی دەخشاند و لەشی لە ژێر قورسایی ساڵەکانی تەمەندا کووڕ ببۆوە. بینی کە کاتێک لە دەرگای ماڵەوە رۆیشتەدەر، دەستی لە نێو دەرگاوە هێناوەتە ژوورەوە هەتا دڵنیابێ کە دەرگاکە داخراوەتەوە. ئیدی هەرگیز هەواڵێکی لێ نەزانرا.
فێرناندا کاتێک زانی ئەو هەڵاتووە، رۆژێکی تەواو سندووق و گەنجەکان و دەربیجەکانی بەگومانەوە سەرەونێو کرد هەتا دڵنیابێ کە سانتا سۆفیا دیلا پیداد شتێکی نەدزیبێ. کاتێک بۆ هەوەڵین جار لە ژیانیدا ئاگری هەڵدەکرد. دەستی سووتا و داوای لە ئۆرلیانۆ کرد بۆ یارمەتیی فێری بکا چۆن قاوە دروست دەکەن. لەگەڵ تێپەڕینی زەمان، ئۆرلیانۆ کاروباری ئاشپەزخانەی بەڕێوە دەبرد، فێرناندا کاتێک لە خەو هەڵدەستا، نانی بەیانی ئامادە کرابوو و دوایی تەنیا کاتێک لە ژوورەکەی دەردەکەوت کە بچێ و خواردنەکەی هەڵبگرێ کە ئۆرلیانۆ بۆی لە سەر ئاورگ دانابوو سارد نەبێتەوە. ئەو کات قاپەکەی دەهێنایە سەر مێز هەتا خواردنەکەی لە سەر روومێزی کەتانی هۆڵەندی و نێوان شەماندا بخوا، تاک و تەنیا لە سەر مێز دادەنیشت و چاوی لەو پازدە کورسییە خاڵیانە دەکرد کە لە دەوراندەوری مێزەکە دانرابوون. تەنانەت لەو وەزعەشدا ئۆرلیانۆ و فێرناندا یەکتریان لە تەنیایی خۆیاندا نەکردە شەریک و هەریەک بە جوێ و لە تەنیایی خۆیاندا درێژەیان بە ژیانی خۆیان دا و هەر کەسەی ژووری خۆی خاوێن دەکردەوە. تارە جاڵجاڵووکەکان بنەگوڵەسوورەکانیان لە خۆدا دەخنکاند و داری میچیان فەرش دەکرد و دیوارەکانی دادەپۆشی. لەو کاتەدا بوو کە فێرناندا هەستی پێکرد کە ماڵەکە بەرەبەرە پڕ دەبێ لە تارمایی، دروست وەک ئەوە وابوو کە هەموو شتەکان، بەتایبەتی ئەو شتانەی رۆژانە دەکران ، لە خۆوە شوێنەکانیان دەگۆڕن. زۆر بە دوای مەقەستدا دەگەڕا کە دڵنیا بوو لە سەر تەختی نووستنی داناوە، دوای ئەوەی هەموو شوێنێکی سەروبن دەکرد، مەقەستی لە سەر تاقەی ئاشپەزخانە دەدۆزییەوە، لە کاتێکدا چوار رۆژ بوو

پێی نەنابووە نێو ئاشپەزخانەوە، لە پڕ لە نێو کەشەوی قاپ و قاچاخی کارد و چنگاڵاندا تەنانەت یەک چنگاڵیشی نەدۆدۆزییەوە،لە باتیان شەش چنگاڵی لە سەر میحراب و سێ چنگاڵی لە قاپشۆرێدا دەدۆزینەوە. کاتێک دادەنیشت نامە بنووسێ، جێگۆڕکێی شتەکان سەیرتر دەبوو، دەواتی مەرەکەب کە ئەو لە لای راستی دادەنا لە لای چەپ دەردەکەوت و کاغەز ویشککەرەوە ون دەبوو و دوو رۆژ دواتر لە بن ناز باڵنجی دەیدۆزییەوە. ئەو نامانەی بۆ خۆزێ ئارکادیۆی دەنووسین، لەگەڵ کاغەزەکانی بۆ ئامارانتا ئۆرسۆلای نووسیبوو، لێ تێکەڵ دەبوو و هەمیشە دەترسا مەبادا پاکەتەکانی لێ بگۆڕدرێ و چەند جاریش ئەو کارەی کرد. جارێکیان قەڵەمەکەی گوم کرد و پازدە رۆژ دواتر پۆستچی کە لە کیفەکەی خۆیدا دۆزیبوویەوە و ماڵبەماڵ بە دوای خاوەنەکەیدا گەڕابوو، بۆی هێنایەوە. فێرناندا بەو خەیاڵە کە ئەو رووداوانەش وەک ونبوونی لاستیکەکان تاوانی پزیشکانی نادیارە، نامەیەکی پڕ لە پاڕانەوە و داواکاریی نووسی کە دەستی لێ هەڵگرن،بەڵام بۆ جێبەجێ کردنی کە ناچار بوو بچێتە دەرەوە کاتێک گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی، نەتەنیا ئەو نامەیەی کە دەستی پێ کردبوو نەیدۆزییەوە، بەڵکو تەنانەت مەبەستەکەشی بۆ نامەنووسینەکە فەرامۆش کرد. ماوەیەک وای بیر دەکردەوە هەرچی هەیە لە بن سەری ئۆرلیانۆی دایە. کەوابووهەڵسوکەوتەکانی خستە ژێر چاوەدێری و شتوومەکی لە سەر ێگای دادەنا هەتا لەکاتی بێنە و بەرەیاندا دەستی بگرێ، بەڵام دوای ماوەیەک بۆی دەرکەوت کە ئۆرلیانۆ تەنیا ئەو کاتانە لە ژووری مێلکیادێس دێتەدەرێ کە بیهەوێ بچێتە ئاشپەزخانە یان ئاودەستان و پیاوی ئەوەی نییە گاڵتەی پێ بکا. سەرەنجام گەیشتە ئەو ئاکامە کە هەموو شتێک پێوەندیی بە گەپجاریی ئەرواحانەوە هەیە و بڕیاری دا ئەو شتانەی پێویستە کەڵکیان لێ وەربگرێ لە شوێنێکیان قایم بکا. مەقەستی بە بەنێکی درێژ بە سەرەوەی تەختەکەی خۆی و کاغەز ویشککەرەوەشی بە پایەی تەختەکە بەتەوە و دەواتی مەرەکەبیش بە چەسپی بە لای راستی مێزەکە کە ئاسایی شتی لە سەر دەنووسی نووساند. گیروگرفتەکەی شتێک نەبوو کە بەئاسانی و لەماوەی یەک دوو رۆژاندا چارەسەر بکرێ. هێشتا چەند

ســـەعات لە بە بەنەوەکردنـــی مەقەســـتەکە تێنەپەڕیبـــوو کە زانـــی بەنەکە ئەوەندە درێژ نییە بتوانێ کار بە مەقەستەکە بکا، دەتوت ئەرواح بەنەکەیان کورت کردبێوە. هەر ئەو بەلایەش بە سـەر بەنـی قەڵەمەکە و تەنـانەت بە سەر باسکی خۆیشیدا هات. دوای ماوەیەک دەستی نەدەگەیشتە دەواتەکە. ئامارانتـا ئۆرسـوولا لە برۆکسـێل و خـۆزێ ئارکـادیۆ لە رۆمـێ، هیچیـان ئاگـاداری ئەو بەدبەختیـیە وردانە نەبـوون، فێرنانـدا بـۆی دەنووسـین بەختەوەرە. لە راستیشدا هەروا بوو چونکە هەستی بەوە دەکرد کە نـابێ هـیچ کارێـک بکـا. دەتـوت ژیـان وردە وردە بـۆ لای دایـک و بـاوکی رایدەکێشـێ، شـوێنێک کە هـیچ کەس ئـازاری بە دەسـت گیروگرفتـانەوە نەدەکێشـا، چـونکە پێشـتر لە خەیـاڵی خۆیانـدا چارەیـان کردبـوون. ئەو نامەنووسینە بێ برانەوانە، بەتایبەتی لەو کاتەوەی سانتا سۆفیا دیلا پیداد ئەوێی بەجێ هێشتبوو، هۆشی تێپەڕبوونی زەمانی لێ بڕی. فێرناندا ئەو عـادەتەی لە خۆیدا پەروەردە کرد کە رێکەوتـی گەڕانەوەی پێشبینیکراوی منداڵەکانی بکاتە سەرەتای مێژوو و، رۆژ و مانگ و ساڵان بەو ژمێرەیە حیسـاب بکـا. بەڵام کاتێک منداڵەکانی چەند جار بە دوای یەکدا رێکەوتـی گەڕانەوەی خۆیـان دواخسـت، رێکەوتەکـان تـێکەڵ بـوون و دەورەکـانی لێکدران و رۆژەکانی وەهـا لە یەک چوون کە ئەو ئیدی هەستی بە رەوتـی زەمـان نەکرد. لە جیاتی ئەوەی بێتـاقەت بێ، لەو درەنگانییەدا هەستی بە خۆشییەکی قووڵ دەکرد.لەوە نیگەران نەبوو کە بۆچی ئێستا، کە ساڵان لە دیـاریکردنی رێکەوتـی رێورەسـمی کەشـیش بـوونی خـۆزێ ئارکـادیۆ تێدەپەڕی، ئەو هێشتا دەنووسێ کە چاوەڕوانە خوێندنی خۆی لە زانستی بەرزی دینـی تەواو بکـا و دەسـت بە زانسـتەکانی سیاسـی بکـا، چـونکە دەیزانـی ئەو پلیکـانە پێچاوپێچـانەی دەگەنە تەختـی پیترۆسـی پیـرۆز، بە بەردی چ گیروگرفتێـک فەرش کـراوە. لە لایەکـی دیـکەوە، لە هەواڵێکـی ئیمکـانە بـۆ خەڵکـی دیـکە بـێ مانـا بـێ، یەکجـار زۆر خۆشـحاڵ دەبـوو. کوڕەکەی پـاپی مەزنـی دیبوو، کاتێک ئامارانتـا ئۆرسـوولا بۆی نووسـی کە نمرە بەرزەکانی، ئەو سەردەستییەی پێداوە کە باوکی پێشبینی نەکردبوو و لە ئەنجامدا خوێندنەکەی زۆرتر لەو کاتەی بۆ لەبەر چاو گیرابوو درێژەی

دەکێشێ، دیسان خۆشییەکی ئەوتۆی بۆ هاتەپێش. سێ ساڵ و شتێک لەو زەمانە رادەبرد سانتا سۆفیا دێلا پێداد کتێبی دەستووری زمانی سانسکریتیی بۆ ئۆرلیانۆ هێنابوو، کە ئەو توانی هەوەڵین لاپەڕەی وەرگێڕێتەوە و، ئەوە یەکەمین هەنگاو لە جادەیەکدا بوو کە کەس نەیدەتوانی پێشبینی بکا بنی لە کوێیە. بەڵام وەرگێڕانی ئیسپانیۆلییەکەی مانایەکی نەبوو. نوسخەی ئەسڵی بە ئەلف و بێی رەمز نووسرابوو و، ئۆرلیانۆ کەرەسەی پێویستی بۆ دەرخستنی رەمزەکان بەدەستەوە نەبوو. بەڵام چونکە مێلکیادێس پێیگوتبوو لە کتێبفرۆشی زانای ئیسپانیۆلی ئەو کتێبانە دەست دەکەون کە بۆ زانینی نیوەرۆکی مەکاتیبەکان پێویستن، بڕیاری دا لەگەڵ فێرناندا بدوێ و لەو ئیجازە وەربگرێ بە دوای سۆراخی کتێبەکاندا بڕوا. لە ژوورێکدا کە خۆڵە پۆتینە قووتی دابوو و زۆری زبڵ و زاڵ سەرەنجام تێکیشکاندبوو بە دوای رێگەیەکی لەباردا دەگەڕا هەتا ئەو داوایەی لێبکا، بەڵام کاتێک فێرناندای دەبینی کە خواردنەکەی لە سەر ئاورگ هەڵدەگرێ و ئەوە تەنیا دەرفەتێک بوو کە دەیتوانی قسەی لەگەڵ بکا، ئەو نەخشانەی کە لە مێشکی خۆیدا گەلاڵەی کردبوون بۆی دەرنەدەبڕدران و دەنگ لە گەروویدا دەخنکا. بۆ هەوەڵین و ئاخرین جار جاسووسیی لە سەر فێرناندا کرد، گوێی لە دەنگی پێی رادەگرت لە ژووری خەوتندا، دەیبیست کە بەرەو دەرگای ماڵەوە دەڕوا هەتا چاوەڕوانی هاتنی نامەی مناڵەکانی بکا و نامەکانی خۆی بدا بە پۆستەچی. هەتا شەو درەنگانێک گوێی لە سیرەی ویشک و ئەویندارانەی قەڵەمی ئەو رادەگرت کە بەسەر کاغەزیدا دەهێنا. بە دوایدا دەنگی بارانی کلیلی چرای بەرق و دەنگی ئارامیی دوعاکردنی لە تاریکاییدا دەبیست و ئەو کات بەو دڵنیاییەوە کە سبەی دەرفەتی لەباری بۆ هەڵدەکەوێ، خەوی لێدەکەوت. وەها لە وەرگرتنی ئەو ئیجازەیەدا لێبڕاو بوو کە رۆژێکیان بەیانی موورەکانی کە لەو کاتدا هەتا سەرشانان هاتبوون کورت کردەوە، ریشی لێکهاڵاوی تاشی، شەڵواری تەنگ و چەسپیوو و کراسێکی کە یەخەی جیای هەبوو و نەیدەزانی لە چ کەسێکەوە بۆی بەمیرات ماوە، دەبەر کرد و لە ئاشپەزخانە چاوەڕوان مایەوە هەتا فێرناندا بۆ فراوین دێ. لە جیاتی ژنی هەموو

ڕۆژان، کە سەری هەڵدێنا و حاڵەتێکی تووڕە و بەپێکی هەبوو، پیرێژنێکی زۆر جوان هاتە ئاشپەزخانەوە. کە شنێلێکی لە پێستی قاقمی بە سەر شانان‌دا دابوو و تاجێکی زێڕینی کاغەزی بە سەرەوە بوو. لە ڕوویەوە دیار بوو کە لە بەر تەنیایی فرمێسکی ڕشتوون. فێرنانـدا لەو کاتەوە کە ئەو لیباسانەی لە سندووقی ئۆرلیانۆی دووهەمدا دیبوونەوە زۆر جار ئەو شنێلە مۆرکە خواردووەی دەبەر دەکرد. ئەگەر کەسێک لە بەر ئاوێنە دیبایەی کە چۆن لە بەر ڕەفتاری شایانەی خۆی خۆشحاڵ دەبێ شکی لە شێتبوونیدا نەدەکرد، بەڵام شێت نەبوو، بەڵکو لەو لیباسانە تەنیا بۆ یادکردنەوەی بیرەوەرییەکانی کەڵکی وەرگرتبوو. هەوەڵین کەرەت کە دەبەری کرد بە خۆی نەبوو دڵی گیرا و چاوی پڕ بوون لە فرمێسک، چونکە لەو کاتەیدا چووبوو هەتا بیکاتە شاژن. ڕووحی لە دڵتەنگیی خەونی لەکیسچوو بریسکایەوە. ئەوەندە هەستی بە پیری و ماندوویی کرد و ئەوەندە خۆی لە باشترین سەعاتەکانی ژیان بەدوور زانی تەنانەت ناخۆشترین سەعاتەکانی ژیانیشی لە بیر چوو و ئەو کات تازە زانی کە چەندە دڵی بۆ عەتری پنگەکانی هەیوان، بۆ هەڵمی گوڵەسوورەکان لە تاوپەڕان، تەنانەت بۆ سروشتی وەحشیی ئەندامانی بە ئەژماری ماڵەوە تەنگ بووە. دڵی کە لە خۆڵەمێشی تێکسمڕاو دروست بوو و بەرگەی توندترین زەبری گورچووبڕی ڕاستییە تاڵەکانی ڕۆژانەی گرتبوو، بە هەوەڵین بیر هاتنەوەی بیرەوەرییەکانی، داتەپی. بە تێپەڕبوونی ساڵان، خەمباربوون بۆ ئەو وردە وردە بوون بە شتێکی ئاسایی. لە تەنیایی خۆیدا بوو بە مرۆڤ. بەو حاڵەش ڕۆژێک بەیانی کە ڕۆیشتە ئاشپەزخانە و بینی لاوێکی لاواز و ڕەنگ پەڕیوە، کە چاوەکانی لە بەر جوانی دەدرەوشانەوە، فینجانێکی قاوە بۆ تێ دەکا، پەنجەی پووچی ژانی دڵی لەبەر یەک هەڵدڕی. نەتەنیا ڕێگەی پێ نەدا، بەڵکو لەوە بەدوا کلیلەکانی ماڵەوەشی هەر لە نێو ئەو کیفە نا کە لاستیکە دەکارنەکراوەکانی تێدا بوو. وریاییەکی بەخۆڕایی بوو، چونکە ئۆرلیانۆ ئەگەر ویستبای دەیتوانی بەهاسانی لەوێ ڕابکا و دوایەش بە بێ ئەوەی ببینرێ، بگەڕێتەوە. بەڵام ئەو جیابوونەوە درێژخایەنە، ئەو دڵنیانەبوونە سەبارەت بە دونیا و، ئەو خووگرتن بە ژێرفەرمانییە، ڕیشەی

راپەڕینی لە دڵی ئەودا ویشک کردبوو، دیسان گەڕایەوە زیندانی خۆی هەتا پەڕی نووسراوەکان هەڵداتەوە و دیسان هەڵیان داتەوە و شەوانە هەتا درەنگ وەختان گوێ بداتە هۆڕەهۆڕی گریان فێرناندا لە ژووری خەوەکەیدا. ڕۆژێکیان بەیانی وەک هەمیشە ڕۆیشت بۆ هەڵکردنی ئاگردان و لە سەر ژیلکە کوژاوەکاندا، خواردنێکی بینی کە ڕۆژی پێشتر بۆ فێرناندای لەوێ دانابوو. ئەو کات بە کەلێنی دەرگادا تەماشایەکی ژووری خەوتنی ئەوی کرد، دیتی لەهەموو کاتێک جوانتر بە دەموچاوێکەوە کە وەک ڕەنگی عاج دەچوو، لە سەر تەخت ڕاکشابوو و شنێلی قاقمی بە سەر شاناندا دابوو. چوار مانگ دوای ئەوە، کاتێک خۆزێ ئارکادیۆ گەڕایەوە ئەوی هەر بەو جۆرە بە دەست لێنەدراوی لە شوێنێ خۆی بینی.

هیچ پیاوێک ئەوەندە وەک دایکی نەدەچوو.کراسێکی لە پارچەی تافتەی ڕەش بە یەخەی ئاهار و خڕی لەبەر کردبوو و، لە جیاتی کراوات رووبانێکی ئاوریشمی ناسکی وەک فعکول لە ملی هاڵاندبوو، حاڵەتێکی خومار و ڕەنگپەڕیو و سەرسووڕمان و لێوی داکەوتوو بوو. مووە ڕەش و ساف و بریقەدارەکەی وەک پرچی دەسکردی هەیکەلە پیرۆزەکان دەچوو و خەتێکی ڕاست و کەمرەنگی بە نێوەڕاستی سەریدا هاتبوو. سێبەری ریشێکی تەواو تاشراو لە سەر دەموچاوی پارافین لێدراوی کەوتبوو. ڕەگی سەوز لە دەستە ڕەنگپەڕیوەکانیدا دەبیندران و ئەنگوستی باریکی وەک ئەنگەڵ بوون. ئەنگوستیلەیەکی زێڕی نەقیم چاوپشیلە درشتی لە قامکی سەبابەی گەورەی دەستی چەپی دابوو. کاتێک ئۆرلیانۆ دەرگای لێکردەوە، پێویست نەبوو لێک بداتەوە بزانێ کێیە لە ڕێگای دوورەوە هاتووە. ماڵەکە بە ڕابردنی ئەو بۆنی ئەو ئودکڵۆنەی گرت کە کاتێک مناڵ بوو ئۆرسوڵا بە سەریدا دەکرد، هەتا لە تاریکیدا بزانێ بەرەو کوێ دەڕوا. بەجۆرێک کە ئیمکانی ناسینەوەی نەبوو، خۆزێ ئارکادیۆ پاش ئەو هەموو ساڵانە ون بوون هەر بە قەد جووجەڵەیەکی پاییزی لێ مابۆوە. غەمبار و تەنیا، یەکراست ڕۆیشت بۆ ژووری دایکی، ئەو جێگایەی کە ئۆرلیانۆ لە کوورەی بابەگەورەی بابەگەورەیدا، چوار مانگان جیوەی سووتاند هەتا بە پێی فۆرمولەکانی مێلکیادێس لاشەکە بە ساخی ڕابگرێ. خۆزێ ئارکادیۆ هیچ

پرسیارێکی نەکرد، نێوچاوانی مەیتەکەی ماچ کرد.لە گیرفانی ژوورەوەی ژێرکراسەکەی لاشەکە، شوێنێک کە هێشتا سێ لاستیکی دەکار نەکراوی تێدابوون. کلیلی گەنجەکانی دەرهێنان. لە گەنجە، مجرییەکی چکۆڵەی ئاستەر حەریری دەرهێنا، کە نیشانەی بنەماڵەی لە سەر بوو. لە نێو ئەو دا کە بەداری سەندەل بۆنخۆش کرابوو، نامەیەکی دوورودرێژی دۆزییەوە. زۆر لەو راستییانەی لەوی شاردبوونەوە، تێیدا نووسرابوون و لە دڵی خۆی وەدەر نابوون. بەپێوە راوەستا و بە ئێشتیا و بێ نیگەرانی نامەکەی خوێندەوە، کە گەیشتە لاپەڕەی سێهەم، هەڵوێستەیەکی کرد و بە چاوێک وەک بڵێی بۆ دووهەمین جارە ئۆرلیانۆی دەناسی تێی هەڵڕوانی.
بە دەنگێک کە وەک تیغی ریش‌تاشین بوو، وتی: "کەوابێ منداڵە حەرامزادەکە تۆی."
_ من ئۆرلیانۆ بویندیام.
خۆزێ ئارکادیۆ وتی: "برۆوە ژوورەکەت."
ئۆرلیانۆ رۆیشت و تەنانەت ئەو کاتەش کە گوێی لە رۆیشتنی خەمهێنەر و تەنیایی رێورەسمی بەرێکردنی جەنازەش بوو، بۆ زانین لە ژووری خۆی دەرنەکەوت. جارجار لە ئاشپەزخانەوە خۆزێ ئارکادیۆی دەدی کە لە ماڵەوە دەگەڕێ و هێندەی نەماوە لە بەر هەناسەهەڵکێشانی بەترسەوە بخنکێ و، دوای نیوەشەویش هەروا دەنگی پێی دەهات، کە لەو ژوورانەی کە خەریکە وێران دەبن، دەگەڕێ. هەتا چەند مانگان گوێی لە دەنگی ئەو نەبوو، نەک لە بەر ئەوەی کە خۆزێ ئارکادیۆ قسەی لەگەڵ نەکرد، بەڵکو لە بەر ئەوە کە خۆی پێی خۆش نەبوو شتێکی وەهاروو بدا. بێجگە لە نووسراوەکانی، دەرفەتی فکرلێکردنەوەی شتی دیکەی نەبوو. دوای مردنی فێرناندا، لە دوو ماسیی زێڕی کە مابوونەوە دانەیەکی هەڵگرت و بۆ دۆزینەوەی کتێبەکانی پێویست بوون رۆیشتە کتێبفرۆشی زانای ئیسپانیۆلی.گوێی نەدەدا ئەو شتانەی لە رێگا دەیدیتن، رەنگە لەبەر ئەوە بوو کە بیرەوەرییەکی نەبوو هەتا بە دیتنی ئەوانە بیری بکەوێتەوە. شەقام و خانووە کاولبووەکان هەر ئەوە بوون کە زەمانێک بۆ بینینیان ئامادە بوو گیانی خۆی فیدا بکا، هێنابوونیە بەر چاوی. ئیجازەیەک کە فێرناندا پێی

نەدابوو، خۆی دابووی بە خۆی. ئەویش تەنیا بۆ جارێک و بۆ ئامانجێکی دیاریکراو و بە کەمترین کاتی پێویست. بەو جۆرە نێوانی یازدە بلووکی ساختوومانی کە ماڵەکەی لەو شەقامە باریەک کە مانای خەونیان لێ لێکدەدایەوە جیا دەکردەوە. بە بێراوەستان رۆیی و بە هەناسەبرکە رۆیشتە شوێنێکی تاریک و رەنگاوڕەنگ کە بەزەحمەت جووڵەی تێدا دەکرد و زۆرتر وەک زبڵدانی کۆنەکتێبان دەچوو هەتا وەک دووکانی کتێبفرۆشی. کتێبەکان بە تێکەڵ و پێکەڵی، لە قەوەزی مۆرانان خواردوو و، گۆشەیی و تاری جاڵجاڵووکەگرتوو، تەنانەت لەو شوێنانە کە جێگای هاتووچۆی مشتەرییان بوو بە سەر یەکدا هەڵڕژابوون. لە سەر مێزێکی گەورە کە پڕ لە کۆمەڵە کتێب و کاغەز بوو، خاوەن دووکانەکە خەریکی نووسینی پەخشانێکی لەسەرخۆ بوو بە خەتێکی ئەوخەوانی و نووسینێکی غەیرەخۆجێی، لە سەر لاپەڕەکانی جیاکراوە لە دەفتەرێکی قوتابخانەدا دەینووسی. سەرێکی جوانی هەبوو، مووە زیوینەکانی دەتوت پەڕەتووتین بە سەر نێوچاوانیدا هاتوونەخوار. چاوە شین و بەهۆش و لێکنزیکبووەکانی هەروەک بلێی پیاوچاکێکە و هەموو کتێبەکانی عالەمی خویندۆتەوە. شەڵوارێکی کورتی دەپێ دا بوو لە بەر ئارەقە تەڕ ببوو. دەستی لە نووسین هەڵنەگرت بزانێ کێ هاتۆتە ژووری دووکانەکە. ئۆرلیانۆ لە نێو ئەو هەموو کۆمە تێکەڵ پێکەڵەدا لە دۆزینەوەی ئەو پێنج بەرگ کتێبەدا کە بە دوایاندا دەگەڕا تووشی گیروگرفت نەبوو، چونکە کتێبەکان دروست لەو شوێنە بوون کە مێلکیادێس نیشانی دابوویە. بێ ئەوەی وشەیەک لە دەمی بێتەدەر، کتێبەکانی لەگەڵ ماسیی زێڕە بچکۆڵەکە دایە دەستی کابرای ئیسپانیۆلی. پیاوە چاوێکی لە کتێبەکان کرد، پێڵووی چاوی وەک دوو سەدەف لێک بڵاو بوون، شانی هەڵتەکاندن و بە زاراوەی تایبەتیی خۆی وتی: "بێگومان شێت بووی." و ماسییە گچکە و کتێبەکانی دانەوە دەست ئۆرلیانۆ.

بە ئیسپانیۆلی وتی: 'لەگەڵ خۆتیان بەرە. ئاخرین کەس کە ئەو کتێبانەی خوێندوونەوە، دەبێ ئیساقە کوێر بێ[٤]، کەوابوو ئاگات لە خۆ بێ چ دەکەی."

---

٤– Isaacil Cieco مەبەست Jorge Isaacs نووسەری کۆلۆمبیاییە.

خۆزێ ئارکادیۆ ژووری نووستنی مەمەی چاک کردەوە و ناردی پەردە مەخمەرییەکان و حەریری دەوری تەختی خەوتنی پاشایانەی پینە و خاوێن کردنەوە. حەمامە کاولبووەکەی دیسان وەگەڕ خستەوە. حەوزەکەی حەمامێ بە تویژێکی ئەستوور و رەش داپۆشرابوو. ئیمپراتۆری بەرەو کاولبوونی خۆی بە لەبەرکردنی لیباسی سەیر و سەمەرە و عەتری دەستکرد و جەواهیراتی هەرزان‌بایی لەو دوو شوێنە دامەزراند. تەنیا شتێک کە وا دەهاتە بەرچاو ئەو نارەحەت بکا، هەیکەلە پیرەۆزکانی سەر میحرابی بنەماڵەیی بوون. رۆژێکیان دوای نیوەڕۆ هەموویانی لەو ئاگرەی لە حەوشەی ماڵەوەدا کردبوویەوە سووتاندن و کردنیە خۆڵەمێش. بەیانیان هەتا نزیک نیوەڕۆیە دەنووست. کاتێک دەڕۆیشتە حەمام، رۆب دوشامبرێکی رایەڵ بە دەرەوەی دەبەر دەکرد کە وێنەی چەند ئەژدیهای زێڕکفتی پیوەبوو و، سەرپاییەکانی دەپێ دەکردن گوڵینگی زەردیان پێوەبوو. رێورەسمێکی ئەوتۆی لە حەمام کردندا بەجێ دەهێنا کە لە بەر وردەکاری و ماوەدرێژی، خۆشوشتنەکانی رێمیدیۆسی جوانیلکەی دەهێنایەوە یاد. لە پێش خۆشووشتندا ئاوی حەوزەکەی بە سێ شووشە پۆسر کە لە شووشەی مەرمەریندا لەگەڵ خۆی دەبردن، ئاوەکەی بۆنخۆش دەکرد. خۆی بە لفکەی کەدوو نەدەشوشت، بەڵکو خۆی لەو ئاوە بۆنخۆشەدا نوقم دەکرد و دوو سەعاتی تەواو گێژ لە فێنکایەتی و بیرەوەرییەکانی ئامارانتادا لەوێ دەمایەوە. ماوەیەک دوای گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، جلە تافتەکانی بەلاوە نا. بێجگە لەوە بۆ ئەو شارد لیباسێکی گەرم و تەنیا کۆت و شەڵواریشی هەر ئەوە بوو. لە بری شەڵوار،چەسپانی دەبەر دەکردن کە وەک شەڵوارەکانی پیترۆکریسپی دەچوون، لە کاتی فێرکردنی سەمادا، کراسی ئاوریشمی ئەسڵیی دەبەر دەکرد کە پیتی هەوەڵی ناوەکەی لە سەر دڵی دروابوو. حەوتووی دوو جاران جلەکانی لە نێو حەوزۆکەی حەمامەکەدا دەشووشتن و بە رۆب دوشامبرەوە دەمایەوە هەتا ویشک دەبوونەوە. هیچی دیکەی نەبوو دەبەری بکا. هیچ کات لە ماڵەوە نانی نەدەخوارد. کاتێک گەرمای نیوەڕۆ بەرەو فێنکی ئێوارە دەڕۆیی، دەڕۆیشتە شەقام و هەتا درەنگانێکی شەو نەدەگەڕایەوە. ئەو کات بە نیگەرانییەوە

دەماڵەوە دەگەڕا و وەک پشیلە سوار و بیری لە ئامارانتا دەکردەوە. ئەو و نیگـای بەسـامی پیرۆزەکـان لە خەرمـانەی رووناکـایی شـەوانەدا دوو بیرەوەریـی بـوون کە لە مـاڵەوەی لەبیـر مـابوون. زۆرجـار لە گەرمـای سووتێنەری هـاوینی رۆمێدا، چاوی لە خەو هەڵبڕیبوو، ئامارانتـای بینیبوو کە بە ژێرپۆشـەکانی تـۆڕ و دەسـتی پەڕۆ لێپێچـراوی، لە حەوزێکی لێـوار مەرمەڕینەوە پـا دەنێـتەدەر. وێـنەی ئەو لەگەڵ دڵتەنگیـی دوورخراوەیـی دەبـوونە شـتێکی دڵخـواز. بە پـێچەوانەی ئۆرلیـانۆ خـۆزێ کە هەوڵـی دەدا وێنەی ئامارانتا لە پێکدادانەکانی شەڕی خوێناویدا نوقم کا، ئەو هەوڵـی دەدا ئەو لە حاڵەتێکی ئەویندارانەدا زینـدوو رابگرێ، هەر بەو جـۆرەی کە دایکی بە حیکایەتەکـانی بێبـڕانەوەی بـوونە پاپا سـەرگەرم کردبـوو. نە ئەو و نە فێرنانـدا هـیچ کامیـان هـیچ کـات نەیـانزانی کە نامەنووسـینەکانیان ئـاڵوگۆڕی خەیاڵاتە و هیـچی دیکە. خۆزێ ئارکادیۆ هەر کە گەیشـتە رۆمێ،مەدرەسـەی فەقێیانی بەجێ هێشت و درێژەی بە ئەفسـانەی ئووسـولی دیـن و مافەکانی دینـی دا، هەتـا لەو میـراتە زۆرەی کە دایکـی لە نـامە بزرکانـدنەکانی خۆیـدا بۆی دەنووسی، کەڵک وەربگرێ. ئەو میراتە دەیتـوانی ئەو لەو بەدبەختـی و هەژاریـیەوە دەربێنـێ، کە لە کەپرێـک لە کەپرەکـانی گەڕەکـی تراسـتیوێرە،[٥] لەگەڵ دوو کەس لە هاوڕێکانی تێیدا شـەریک بوون، دەژیا. کاتێک ئـاخرین نـامەی فێرنانـدای پێگەیشـت کە بە هەسـتی نزیکی لە مەرگەوە نووسـرابوو، پاشـماوەی شـکۆ و گەورەیـی لە باولێـک هاویشـت و بە کەشـتییەک کە زیارەتکەرانی وەک رانەمەڕی قوربانی هاویشتبوونە سـەریەک بە خـواردنی ماکارۆنی سارد و پەنیری پڕ کرمدا، لە زەریـا پەڕییەوە. پێش خوێندنەوەی وەسـیـەتنامەی فێرنانـدا، کە بـێجگە لە شـیکردنەوەی دوورودرێــژی بەدبەختییەکانی، شتێکی دیکە نەبوو، مۆبڵ و شـتومەکە شـکاوەکان و گیـای رووداو لە سـەر هەیـوان، تێیانگەیانـد کە بـۆ هەمیشـە، دوور لە رووناکـایی وەک ئەلمـاس و هەوای هـۆشپەڕێنی بەهـاری رۆمـێ کەوتـۆتە داوێکـی بـێ رزگـاربوون. لە بـێ خەوییەکـانی لە بەر تەنگەنەفەسـیدا، هەروا لەو مـاڵە پرسـێبەرەدا، کە هەڵـلای پیـری ئۆرسـۆلا ترسـی دونیـایەی لە دەروونیـدا

[٥]- Trastevere

گەشـــاندبۆوە دەگەڕا و، بەرینـــایی بەدبەختیـــی خـــۆی دەپێـــوا. ئۆرســـۆلا گۆشەیەکی لە ژووری خەوتن بۆ ئەو لە بەرچاو گرتبوو هەتا دڵنیابێ گومی ناکا و ئەوە تەنیا جێگایەک بوو کە دەیتوانی لە دەست ئەو مـردووانەی دوای بانگی شێوان لە ماڵەوە هاتووچۆیان دەکرد پارێزرابێ. پێی دەگوت: "هەر کارێکی خراپ بکەی پیرۆزەکان خەبەرم دەدەنێ." شـەوانی بە ترسی منـاڵی لەو گۆشـەی ژوورەوە هەتـا کـاتی خەوتـن لە کاتێکـدا لە ترسـان ئارەقەی دەڕشت،لە ژێر نیگای جاسووسانەی چاوەشینەکانی پیرۆزەکاندا لە سەر چوارپایەک بە بێ جووڵە دەمایەوە. شکەنجەیەکی بەخۆڕایی بوو چونکە ئەو هەر لەو زەمـانەوە لە هەرچی لە دەورووبەری بوو دەترسا و ئامادە بوو هەتا هەرچی لە دونیادا دەیبینێ لێی بترسێ. ژنانی کۆڵان کە خوێنیـان پـیس دەکـرد، ژنـانی مـاڵەوە کە منـاڵی کلکبەرازیـان دەبـوو و کەڵەشـێری شـەرکەر کە دەبوونە هـۆی مردنـی پیاوان و هـاواری ویژدانـی سەبارەت بەو رووداوە هەتا کۆتایی تەمەن درێژەی دەکێشا، ئەو چەکانەی کە هەر ئەوەنـدە بەس بـوو دەسـتت لـێ دابـان و بە بیسـت سـاڵ شـەڕ مەحکـووم دەبـوو و کۆمپانیـا سـەقامنەگرتووەکان، کە ئاکامیـان تەنیـا ناهومێـدی و شـێتی بـوو و بەکـورتی لە هەمـوو شـتێک، لە هەمـوو ئەو شـتانەی کە خوا بە بەزەیـی و بەخششـی لەبڕاننەهـاتووی خـۆی دروسـتی کردبوون و شەیتان لای دابوون. کاتێک لە ژێر تەوژمـی کامووسـەکانیدا لە خەو هەڵدەسـتا، جـوانی تیشـکی پەنـجەرە و لاوانـدنەوەکانی ئامارانتـا لە حەوزۆکەی حەمـامێ کە پـودرەی لە نێـو رانـان دەدا، ئەوی لە شـەڕی ئەو ترسـە رزگـار دەکـرد. تەنـانەت ئۆرسـۆلاش لە تیشـکی روونـاکی بـاخەکەدا دەبوو بە مرۆڤێکی دیکە، چونکە لەوێ تاریفی ئەو شتە مەترسـییدارانەی بـۆ نەدەکـرد، بەڵکـو ددانـی بە خـاکە رەژی دەسـوونەوە هەتـا زەردەخەنەی پڕشـنگداری وەک پاپای هەبێ و نینـۆکی دەکـردن هەتا کاتێک پاپا بـۆ ئەو زیـارەتکەرانە کە لە سـەرتاسـەری دونیـاوە هـاتبوون دەسـت بە دوعـا رادەوەستا، هەموویان سەریان لە دەستەجوانەکانی سـوڕ بمێنـێ و ئەوی لە ئۆدکلۆنـدا دەتلیسـاندەوە هەتـا بەدەن و لیباسـەکانی بـۆنی عەتـری پاپیـان لـێ

بێ. لە کاستیلگاندۆلفۆ[٦] پاپای لە سەر باڵکۆنێک دیبوو کە بە حەوت زمان قسەی بۆ زیارەتکەران کردبوو. تەنیا شتێکی کە لە راستیدا سەرنجی خۆزێ ئارکادیۆی راکێشابوو، سپی و ناسکی دەستەکانی پاپا بوو، کە دەتوت لە قلیایان هەڵکێشاوە، لەگەڵ بریقەی عاباکانی هاوینی ترووسکەدار و عەتری نهێنی ئەو بوو.
نزیکەی ساڵێک دوای گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە، لە بەر ئەوەی لە برسان نەمرێ شەمدانەکان و لەگەنە زێڕەکەی فرۆشت، بەڵام لە پڕێک راستی دەرکەوت کە تەنیا شتی زێڕی ئەو نیشانەی بنەماڵە بوو کە لە سەری هەڵکەندرابوو، تەنیا رابواردنی خۆزێ ئارکادیۆ ئەوە بوو کە چەن منالی کوڕی لە شەقامەکان کۆ دەکردنەوە و دەیهێنانەوە ماڵەوە گەمەی لەگەڵ بکەن. کاتێ خەوی پاشنیوەڕۆیان لەگەڵیان دەهاتەوە ماڵەوە و هەر لەو کاتەدا کە ئەوان خەریکی بازبازێن بە تەناف بوون و لە هەیوانی گۆرانییان دەگوت و بە سەر مۆبلی سالۆنیدا سەرمەقولاتیان لێ دەدا، ئەو بە نێویاندا دەگەڕا و دەرسی خۆشڕەفتاری و ئەدەبی پێدەگوتن. لەو زەمانەدا شەڵواری چەسپان و کراسی ئاوریشمی دەبەر نەدەکردن، بەڵکو لیباسی ئاسایی کە لە دووکانی عەرەبانی کڕیبوو، دەبەر دەکرد. بەو شێوەیەش هێشتا حاڵەتی خوماری پاپانەی خۆی هەر پاراستبوو. منالە کوڕەکان دروست وەک زەمانی مەمەی و هاوقوتابییەکانی، ماڵەکەیان داگیر کردبوو. هەتا شەودرەنگانێک هەراوهوریای گۆرانی وتن و سەمای فلامەنگۆی ئەوان دەبیسرا. ماڵەکە ببوو بە قوتابخانەیەکی بێ سەرەو بەرە. ئۆرلیانۆ هەتا ئەو کاتەی منالەکان لە ژووری مێلکیادیس ئازاریان نەدابوو، گرنگی بە هێرشی ئەوان نەدابوو. رۆژێک بەیانی، دوو کەس لە منالەکان بە زۆر دەرگای ژوورەکەیان کردەوە و لە بینینی پیسەپیاوێکی تووکن کە لە پشت مێزی کار خەریکی دەرهێنانی دۆزینەوەی نووسراوەکان بوو، ترسان. نەیاندەوێرا بڕۆنە ژوورەوە، بەڵام هەروا لە دەورووبەری ژوورەکە دەسووڕانەوە و بە کەلێناندا سەریان دەبردە ژوورەوە و نارەناریان دەگرتەوە و لە پەنجەرەی گچکەی سەرەوەی ژوورەکە جروجانەوەری زیندوویان هەڵدەدایە نێو

[٦]– Cadtelgandolfa هاوینەهەواری پاپ لە نزیک شاری رۆم.- و

هـۆدەکە و جارێکیـان دەرگـا و پەنجەرەیـان لە دەرەوە بزمـارڕێژ کـرد و نیـوەڕۆژێکی خایانـد هەتـا ئۆرلیـانۆ تـوانی دەرگـاکەی بەزۆر لە دیـوی ژوورەوەڕا بکاتەوە.
منالەکـان لەوە کە کەس سـزای نەدەدان خۆشـحاڵ بـوون، ڕۆژێکـی دیـکە، کاتێک ئۆرلیانۆ لە ئاشپەزخانە بوو، چوار دانەیان ڕۆیشتنە ژوورەکەی هەتا نووسـراوەکان لەنێـو بەرن، بەڵام کاتێـک دەسـتیان لەو پەڕە زەردانەدا، هێزێکی غەیبی پەڕەکـانی لە زەوی هەڵگـرت و ئەوەنـدەی لە هەوا ڕاگـرتن هەتا ئۆرلیانۆ گەڕایەوە و نووسراوەکانی لە دەست ئەوان ڕزاگار کرد. لەوە بەدوا ئازاریان نەدا.
چوار لە کوڕە منالەکانی گەورەتر، کە لەگەڵ ئەمەشدا گەیشتبوونە تەمەنی بلـووغی، هێشـتا دەرپێـی کورتیـان دەبەر دەکـرد. خـۆزێ ئارکادیۆیـان دەرازانـدەوە، زووتـر لەوانـی دیـکە دەهـاتنە ئەوێ و هەمـوو بەیـانییەک خەریکی ڕیش تاشین و شـێلانی بە خـاولی گەرم و نینـۆککردنی دەست و پێـی ئەو بـوون و سـەر لە بەر بە ئۆدکلـۆن بـۆن خۆشـیان دەکـرد. چەنـد جاریش ڕۆیشتنە حەمـام بۆ سـابوون لێدانی و ئەو لە حەوزەکەدا بیری لە ئامارانتا دەکردەوە. دوایی ویشکیان دەکردەوە و پۆدرەیان لە لەشی دەدا و لیباسـیان دەبەر دەکـرد. یەکێـک لە کوڕەکـان کە پرچـی زەردبـاوبوو و چـاوی وەک چـاوی کەروێشـک سـوور و شووشـەیی بـوو، شـەوانە لەوێ دەنووست. بە جۆرێک خووی بە خـۆزێ ئارکادیۆ گرتبوو کە بە بێ ئەوەی وشەیەک بڵێ، لە شەونخوونییەکانیدا لەبەر تەنگەنەفەسی، لەگەڵیدا بـوو و لە تاریکـایی مـاڵەوەدا لەگەڵـی دەگەڕا. شـەوێکیان لە شانشـین بـوون، ئەو شوێنەی ئۆرسـۆلا لێی دەخەوت. لە نێوان درزەکانی سیمانی لەپی ژوورەکە شـۆقێکی زەردیـان بینـی، دەتـوت ڕۆژێـک ژێرزەمینـی بـن ژووری نووسـتنی بلـوورین کـردووە. پێویسـتی بە چـرا نەبـوو، هەر ئەوەنـدە بەس بـوو تەختە شکاوەکانی سەر ئەو جێگایە، کە هەمیشە تەختی خەوتنی ئۆرسـۆلای لێبـوو، کە ڕووناکاییەکە زۆرتر بوو لابەرن، هەتا ئەو ژێرزەمینە نهێنییە بدۆزنەوە. کە ئۆرلیـانۆی دووهەم بە دەر و دیـوار هەڵکەنـدن خـۆی بـۆ دۆزینـەوەی هیلاک کردبوو. سێ کیسـەیان لەوێ دۆزییەوە کە زارکیـان بە سیمی مسـی

بەسترابوو، لە نێو کیسەکاندا حەوت هەزار و دووسەد و چاردە سکەی زێڕیان دەرهێنا کە لە تاریکاییدا وەکو عەمبەر دەدرەوشانەوە.
دۆزینەوەی گەنجەکە وەک تەقینەوەیەک وابوو. خۆزێ ئارکادیۆ بە جێگای ئەوە بەو سامانە زۆرەوە بگەڕێتەوە رۆمێ و، بە ئارەزووی خۆی بگا، کە زۆر بە هەژاری گەورە ببوو، ماڵەکەی کرد بە بەهەشتێکی جوانی، پەردەکانی بە مەخمەری تازە گۆڕین و پەرەکانی دەوری تەختەخەوەکەی گۆڕی و تەخت و دیوارەکانی حەمامێی کردن بە کاشی و دەربیجەکانی هۆدەی نەهارخواردنی پرکردن لە مرەبا و میوە و گۆشتی بەراز و ترشیاتی جۆراوجۆر. ئەنباری چۆڵ دیسان کرایەوە، هەتا ئەو شەراب و لیکوانە، کە خۆزێ ئارکادیۆ لە سندووقاندا لە ئێستگەی قەتارەوە دەیهێنانەوە و ناوی خۆی لە سەر نووسرابوون، لەوێ دابنێن.
شەوێکیان چوار کوڕە گەورەکان، میوانداریيەکیان ساز کرد هەتا بەری رۆژێی خایاند. سەعاتی شەشی بەیانی هەموویان سەرتاپا رووت لە ژووری خەوتن دەرپەڕین و حەوزچەکەی حەمامیان بەتاڵ کرد و پڕیان کرد لە شامپانی، بە دواییدا هەموویان لە سەر سەر خۆیان لە شامپانی هاویشت و وەک باڵندان لە کاتی فڕیندا لە ئاسمانی زێڕینی پڕ لە بڵقی بۆخۆش وەمەلە کەوتن. خۆزێ ئارکادیۆ لە کۆتایی جێژنەکەدا لە نێو گۆمیلکەی شامپانیدا لە سەر پشت نووستبوو، بە چاوی نەنووقاو دیسان بیری لە ئامارانتا دەکردەوە. کاتێک منداڵەکان ماندوو بوون و گەڕانەوە ژوورەکە و پەرەکانیان پچڕین، خۆی پێ وشک کەنەوە و لەو شلووقییەدا خۆیان بە ئاوێنەی کریستالدا دا شکاندیان و لە هێرش بۆ نووستنی سەر تەختی خەوتن پەردەی دەوری تەختی خەویان دڕاند، خۆزێ ئارکادیۆ، هەروا لە تاڵی و خەمی خۆشییە لێ پاوان کراوەکانی خۆیدا نوقم ببوو.
کاتێک لە حەمام گەڕایەوە بۆ ژوورەکە ئەوانی بینی کە لە هۆدەی نووستنی تێکقرماودا هەموویان بەیەکەوە سەر لە بەر رووت خەوتوون، لە بەر ئەوە نا کە ژوورەکەیان تێکدا بوو، بەڵکو لە بەر بێزاری و بەزەییەکی کە لە ماوەی ئەو جێژنەدا سەبارەت بە خۆی هەستی پێدەکرد، لە تووڕەییان شێت بوو و لە نێو سندووقێکدا کە کەرەسەی شکەنجەی تێدابوو،

شێلاقێکی نۆسەری هەڵگرت و لە کاتێکدا نەعرەتەی لێدەدا بە بێ بەزەیی بە شێلاقان تێیان کەوت و لە ماڵەوەی وەدەرنان، کارێک کە لەگەڵ دەستە کەمتیارێکیش نەکراوە. وەها تێکهەڵگلا کە تووشی هێرشی هێرشی پشووتەنگی هات و ئەو هێرشە چەند رۆژان درێژەی کێشا، دروست وەک ئاویلکەی مردنی بێتێ. لە سێهەمین شەوی ئازارکێشاندا، لەو کاتەدا کە هێندەی نەمابوو لە بەر نەفەس تەنگی بخنکێ، رۆیشتە ژووری ئۆرلیانۆ هەتا داوای لێبکا بچێتە دەرمانخانەیەک کە لەو نزیکانە بوو و تۆزێکی بۆ بکرێ کە دەبوایە لە وکاتانە هەڵیمشتبا و، بەو جۆرە ئۆرلیانۆ بۆ دووهەمین جار لە ماڵەوە رۆیشتەدەرەوە و چوو بۆ شەقام. دوای تێپەڕبوون لە دوو شەقام گەیشتە دەرمانخانەیەکی بچکۆلانە کە ویترینەکانی تۆز و خۆڵ گرتبوونی، دەفرە کاشییەکانی بەرچەسپی لاتینییان پێوە بوو و کچێکی جوانیی نهێنیی مارەکانی رووباری نیلی هەبوو، ئەو دەرمانەی دایە کە خۆزێ ئارکادیۆ لە سەر پارچە کاغەزێک بۆی نووسیبوو. دووهەمین دیداری شاری چۆڵ کە بە گڵۆپی زەردهەڵگەڕاوی شەقامەکان تۆزێک رووناک ببۆوە، نەیتوانی لە کەرەتی هەوەڵ زۆرتر سەرنجی ئۆرلیانۆی راکێشی. خۆزێ ئارکادیۆ وردە وردە وایزانی رایکردووە کە تەماشای کرد بە پشووسواری و بە تاڵووکە هاتەوە. لاقەکانی کە هێندە لە شوێنێک مابۆوە و نەیبزاوتبوون باریک و ئیشک ببوون لە دوای خۆی رایدەکێشان. ئەوەندە بێ موبالاتی دنیابوو کاتێک دوای چەند رۆژان خۆزێ ئارکادیۆ ئەو بەڵێنەی بە دایکی دابوو شکاندی و ئەوی ئازاد کرد هەر کات دەیهەوێ لە ماڵەوە بچێتەدەر. ئۆرلیانۆ وەڵامی دایەوە: "من لە شەقام کارێکم نییە."

دیسان خۆی لە ژوورەوە زیندانی کردەوە. لەو نووسراوانەی کە بەرە بەرە توانی تێیان بگا خۆی نوقم کرد، هەر چەندە هێشتا ماناکانی نەدەزانی. خۆزێ ئارکادیۆ زوێلەگۆشتی بەراز و مرەبای بۆ دەبرد کە تامی بەهاریان لێدەهات. یەک دوو جاریش شەرابی باشی بۆ برد. خۆزێ ئارکادیۆ زۆر گوێی نەدەدایە نووسراوەکان و لای وابوو وەخت رابواردنێکی سنووردارە و کەم کەس تێیدەگا، بەڵام لە باتیان سەرنجی سەبارەت زانیاریی کەم وێنە و زانایی دونیای بێ هاوتای خزم و کەسە گۆشەگیرەکانی راکێشر.

تێگەیشت کە ئەو دەتوانێ لە نووسینە ئینگلیزییەکان حاڵی بێ و لە ماوەی دەرهێنانی رەمزەکانی لاپەڕەی نووسراوەکاندا شەش بەرگی فەرهەنگی ئینگلیزیی وەک داستان لە لاپەڕەی هەوەڵەوە هەتا ئاخری خوێندۆتەوە. پێی وابوو کە ئۆرلیانۆ دەتوانێ بەو جۆرە سەبارەت بە رۆمێ قسە بکا کە دەتوت زۆر ساڵان لەوێ ژیاوە، بە حیسابی خوێندنەوەی فەرهەنگەکەی دادەنا، بەڵام زۆر زوو بۆی دەرکەوت کە ئەو زانیاریی دیکەشی سەبارەت بە رۆمێ هەیە کە پێوەندیی بە فەرهەنگەوە نییە، بۆ وێنە نرخی شتومەک، کاتێک لێی پرسی کە ئەو زانیارییانەت لە کوێوە دەست کەوتوون، ئۆرلیانۆ لە وەڵامدا تەنیا وتی: "هەموو شتێک ئاشکرایە." ئۆرلیانۆش کاتێک لە نزیکەوە تەماشای خۆزێ ئارکادیۆی دەکرد، لەوەی دەیدی هەتا ئەو رادەیە لەگەڵ ئەو وێنەیەی ئەو لە کاتی گەڕانی بەماڵەوەدا بۆخۆی دروست کردبوو، جیاوازە، بەش بەحاڵی خۆی سەری سوورمابوو. دەیتوانی پێبکەنێ و جارجاریش رێگەی بە خۆی دەدا دڵی بۆ رابردووی ماڵەوە تەنگ بێ، بۆ وەزعی فەقیرانەی ژووری مێلکیادێس نیگەران بێ. نزیکایەتیی دوو کەسی تەنیای هاوخوێن لە دۆستایەتی زۆر بەدوور بوو، بەڵام رێگەی بە هەر دووکیان دا هەتا باشتر خۆیان لە بەر ئەو تەنیاییە قووڵە رابگرن. تەنیاییەک کە ئەوانی هەروا کە لێک جیا دەکردنەوە، بە یەکەوەی دەبەستنەوە. خۆزێ ئارکادیۆ بۆ چارەسەری هێندێک لە گیروگرفتی بنەماڵەیی، کە شێتیان کردبوو، داوای یارمەتیی لە ئۆرلیانۆ دەکرد و ئۆرلیانۆ بە نۆرەی خۆی دەیتوانی لە هەیوانی دابنیشێ و شت بخوێنێتەوە و نامەکانی ئامارانتا ئۆرسولا، کە مەهیشە لە کاتی خۆیدا دەگەیشتن، وەربگرێ و لە حەمام، ئەو جێگایەی کە بە دوای گەڕانەوەی خۆزێ ئارکادیۆدا کەڵک لێوەرگرتنی بۆ ئەو قەدەغە کرابوو، کەڵک وەربگرێ.

لە هەوەڵین سەعاتی رۆژێکی گەرم و پشووبڕ، هەر دووکیان بە دەنگی لەدەرگادان، بە ترسەوە لە خەو راپەڕین. پیرەپیاوێکی سەوز بوو، بە چاوی گەورە و سەوزییەوە حاڵەتێکی رووپاک و رووحانی هەبوو و لە سەر نێوچاوانی نیشانەی خاچێک دەبیندرا.لیباس دڕدڕ، کەوشی لە بەریەک هەڵوەشاو و کوڵەپشتییەکی کۆن، کە شتومەکی خۆی لەنێو کردبوو بە سەر

شانیدا دابوو، ڕەنگی وەک سواڵکەران دەچوو، بەڵام هێندە بەئەدەب بوو کە ئاشکر ابوو لەگەڵ ڕواڵەتی جیاوازیی هەیە. هەر ئەوەندە بەس بوو چاوێکی لێ بکەی هەتا تەنانەت لە تاریکی وەتاغیشدا بۆت دەرکەوێ، ئەو هێزە نهێنییەی ڕێگەی ژیانی پێدا، غەریزەی بەرگری لەخۆ نەبوو، بەڵکو خووگرتن بوو بە ترسەوە. ئۆرلیانۆ ئامادۆر بوو، تەنیا کوڕی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کە لە حەڤدە کوڕەکانی بە دوای هەڵوێستەیەک لە ژیانی درێژ و پڕمەترسی و هەمیشەڕاکردوویدا بە زیندوویی مابۆوە. خۆی ناساند و لە بەریان پاڕایەوە لە ماڵەوە پەنای بدەن. ماڵێک کە لە شەوانی ژیانی دایمەڕاکردوویدا وەک ئاخرین شوێنی حەشارگەی ژیان بیری لێ کردبۆوە. بەڵام خۆزێ ئارکادیۆ و ئۆرلیانۆ ئەویان نەدەناسییەوە. بەو خەیاڵە کە بەرەڵڵایەکە، لە ماڵەوە دەریان کرد و فڕێیاندایە نێو شەقامان. ئەو کات هەردووکیان لە پشت دەرگاوە شاهیدی کۆتایی کارەساتێک بوون کە زۆر پێش ئەوەی خۆزێ ئارکادیۆ بگاتە تەمەنی ئاقڵی، دەستی پێکردبوو. دوو پاسەوان کە دەمێک ساڵ بوو بە دوای ئۆرلیانۆوە بوون و وەک سەگ نیوەی دونیایەی لێ گەڕابوون، لە پشت دارەبادامی پیادەڕەوی بەرامبەر، دەرپەڕین و دوو گوللەیان پێوەنا کە دروست لە نێوەڕاستی خاچی خۆڵەمێشی نێوچاوانیان دا. خۆزێ ئارکادیۆ لەو کاتەوە کوڕە مناڵەکانی لە ماڵەوە دەرکردبوو، چاوەڕوانی هەواڵێک لە کەشتی ئوقیانووسپێو بوو، کە بڕیاربوو پێش کریسمەس بۆ ناپوولی بچێ. ئەمەی بە ئۆرلیانۆ وتبوو و تەنانەت خەیاڵی هەبوو لە سەر کارێک دایمەزرێنێ هەتا بتوانێ خەرجی ڕۆژانەی دابین بکا، چونکە بە دوای مەرگی فێرناندا سەوەتە ئازووقەیان نەدەناردە ماڵەوە. بەڵام ئەو ئاخرین ئارەزووەش جێبەجێ نەبوو. بەیانیی ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی مانگی سێپتامبەر، خۆزێ ئارکادیۆ دوای ئەوە قاوەکەی لەگەڵ ئۆرلیانۆ لە ئاشپەزخانە خواردەوە، خەریک بوو خۆشوشتنی ڕۆژانەی خۆی تەواو دەکرد، کە ئەو چوار کوڕەی لە ماڵەوە دەریکردبوون، بە نێو کاشەییەکانی میچی حەمامەکەدا خۆیان فڕێ دایە خوارەوە، بە بێ ئەمەی بێڵن دەست بکاتەوە، هەروا بە لیباسەوە خۆیان هەڵدایە نێو حەوزەکەوە و مووی سەریان گرت و ئەوەندەیان سەر لە بن

ئاوەکەدا راگرت هەتا بڵقەکانی مەرگی لە سەری ئاوێ گیانیان دەرچوو و تەواو بوو و لاشەی وەک ماسی، بزرکاو و بێدەنگ لە نێو قووڵایی ئاوە بۆنخۆشەکاندا نوقم بوو. ئەو کات سێ کیسە زێڕەکەیان کە تەنیا خۆیان و قوربانییەکەیان بە شوێنەکەیان دەزانی لەگەڵ خۆ برد. کردەوەکەیان ئەوەندە توند و رێکوپێک و دڕندانە بوو، زۆرتر وەک هێرشێکی نیزامی دەچوو. ئۆرلیانۆ لە ژووری خۆی ئاگای لە هیچ نەبوو. هەر ئەو رۆژە دوای نیوەڕۆ، وەختێک خۆزێ ئارکادیۆی لە ئاشپەزخانە نەبینی، هەموو ماڵەوەی بەدوادا کرد و لە حەمام دۆزییەوە، کە لە ئاوێنەکانی بۆنخۆشی حەوزەکاندا خنکاوە، گەورە، هەڵمساو و هێشتا لەبیری ئامارانتا دایە، تەنیا ئەو کاتە بوو کە ئۆرلیانۆ تێگەیشت چەندە خەریک بوو خووی پێ بگرێ.
ئامارانتا ئۆرسۆلا لەگەڵ هەوەڵین فریشتەکانی مانگی دیسەمبەر، کە سواری شەوبای دەریایە دەبن، لە حاڵێکدا قەرێتەیەکی ئاوریشمی لە ملی مێردەکەی کردبوو و بە دوای خۆیدا رایدەکێشا، گەیشتەوە. بە بێ ئاگاداریی پێشتر لە نەکاو پەیدا بۆوە، کراسێکی لە رەنگی عاج لە بەردا بوو و گەردنبەندێکی مرواریی لە مل دا کە دەگەیشتە نزیک ئەژنۆیانی. ئەنگوستیلەی زومورڕود و زەبەرجەدی لە قامکان کردبوو و غولامانەی ساف و لووسیی لە پشت گوێیان کۆکردبۆوە. ئەو پیاوەی شەش مانگ پێشتر زەماوەندی لەگەڵ کردبوو. باریکەڵە و خەڵکی بێلژیک و بەتەمەنتر لە خۆی بوو، وەک مەلەوانان دەچوو. ئامارانتا ئۆرسۆلا هەر کە پاڵی بە دەرگایساڵۆنەوە نا و هاتە ژوورێ، زانی کە غوربەتی ئەو، زۆر لەوە درێژتربووە کە پێشتر بیری لێدەکردەوە، درێژ و کاولکەر بووە.
هاوارێکی کرد کە زۆرتر لە خۆشییان بوو هەتا لە ترسان، وتی: "خوایە ... ئەو ماڵەدا چەندە بێ ژن و چۆڵە!"
ئەوەندەی شتومەک هەبوو کە لە هەیوانێ دا جێگایان نەبۆوە. بێجگە لە سندووقی قەدیمی فێرناندا کە کاتێک دەچوو بۆ قوتابخانە لەگەڵیان خست، دوو سندووقی گەنجەیی و چوار باولی گەورە و کیسەیەکی گەورە بۆ چەترەکانی بەر هەتاو و هەشت قوتوو کڵاو و قەزەیەکی زۆر گەورەشی بە پەنجا کەنارییەوە، دووچەرخەی مێردەکەشی کە لە بەریەکیان دەرهێنابوو

و لە قوتووەیەکیان نابوو هەتا بکرێ وەک کەمانچە بەدەستییەوە بگرن. لە دوای ئەو سەفەرە دووردرێژە، تەنانەت ڕۆژێکیش بۆ حەسانەوە پشووی نەدا. دەستە لیباسێکی کۆنەی کەتانی، کە مێردەکەی لەگەڵ شتومەکی پێویستی دیکەی ماتۆرسواری هێنابوونی، دەبەری کرد و خەریکی چاککردنەوەی سەر لە نوێی ماڵەکە بوو. مێرووە سوورەکانی هەموو هەیوانیان داگرتبوو راو نان، ریشە گوڵە سوورەکانی دیسان زیندوو کردنەوە، گیاژارەکانی لە ریشەوە دەرهێنان و لە سەرڕا لە نێو گوڵدانەکانی هەیوانێ پنگە و شەمدانی و بگۆنیای چاندنەوە، چەند دارتاش و قفڵساز و کرێکار و وەستای بانگ کردن و قەڵشتەکانی لەپێ ژوورەکانیان پڕ کردنەوە، دەرگا و پەنجەرەکانیان وەلاولاوە خستنەوە و کەرەسەکانیان چاک کردنەوە و دیوارەکانیان لە ژوورەوە و دەرەوە سپی کردنەوە.
سێ مانگ دوای گەڕانەوەی ئەو، دیسان ماڵەکە حاڵەتی جوانی و شادیی دەورەی پیانۆلای بەخۆوە گرتەوە، هیچ کەس لە هیچ وەزعێکدا ئەوەندە ئامادەی گۆرانی گوتن و سەماکردن و شت فرێدانەدەرەوە و ڕێوڕەسمی کۆن نەبوو. بە دەمەگەسکێک بیرەوەریی تازیەبارانە و کۆمەڵی شتومەکی بێکەڵک و کەرەسەی خورافاتی، کە لە گۆشە و کەلێنی ماڵەوە کەڵەکە ببوون فرێی دانە دەرەوە. تەنیا شتێکی بە ڕێزگرتن لە بیرەوەریی ئۆرسۆلا رایگرت، وێنەی ڕێمیدیۆس بوو لە ساڵۆندا. قاقا پێدەکەنی و هاواری دەکرد: "تەماشا کەن چە جوانێکە! دایەگەورەیەکی چواردەساڵە." کاتێک یەکێک لە بەنناکان پێیگوت ماڵەکە پڕ لە ئەشباحە و تەنیا ڕێگای دەرکردنیان دۆزینەوەی گەنجێکە کە لێیان بەجێ ماوە، ئەو پێکەنی و لە وەڵامدا وتی. کە پیاوەکان باش نییە هێندە خۆرافاتی بن. هێندە سەربەست و ساکار بوو و ئەوەندە شێوەی ڕووناکبیری هەبوو کە ئۆرلیانۆ بە هاتنەوەی ئەو بۆ ماڵەوە نەیدەزانی چ بکا. ئامارانتا ئۆرسۆلا بە خۆشحاڵییەوە باوەشی کردەوە و هاواری کرد: "چەندە سامناکە! بڕوانن، ئینسان خۆری خۆشەویستیی من چەندە گەورە بووە!" لە پێش ئەوەدا ئۆرلیانۆ دژکردەوەیەک لە خۆی نیشان بدا، ئەو قەوانێکی لە سەر گرامافۆنی دەستی، کە لەگەڵ خۆی هێنابووی، دانا، هەتا فێری سەماکانی تازە و مۆدی

ڕۆژی بکا. ناچاری کرد ئەو شەلوارە پیسەی کە لە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بوینیدیاوە بۆی بەجێ مابوو، فرێی بدا و کراسی ڕەنگکراوی جحێلانە و کەوشی دوورەنگی پێشکەش کردن. هەر کاتێک زۆری دەخایاند و لە ژووری مێلکیادێس دەرنەدەکەوت بەزۆر دەینارده دووکان و بازار.

وەک ئۆرسولا کۆشا و وردیلە و کێوی بوو و هەتا ڕادەیەک جوانیی هاندەرانەی ڕێمیدیۆسی جوانکیلەی بەمیرات بردبوو. لە داهێنانی مۆد زیرەکییەکی زۆری هەبوو. ئاخرین گۆڤاری مۆدی کە بە هۆی پۆست پێی دەگەیشتن، تەنیا بۆ ئەوە دەکرین کە بزانێ لەو مۆدێلانەدا لە پێشتر بۆخۆی گەڵاڵەی کردبوون و بە چەرخی خەیاتیی دەستی قەدیمیی ئامارانتا درووبوونین هەڵەی کردەوە یان نا. تەواوی گۆڤاری مۆد و هونەر و مۆسیقای چاپی ئورووپایان ئابوونە کردبوو و، تەنیا چاوخشاندنێک بۆ ئەو بەس بوو هەتا بزانێ دونیا دروست بەو شێوە دەڕواتەپێش کە ئەو بیری لێدەکردەوە. بەزەحمەت دەزانرا ژنێک بەو شێوە بیرکردنەوە، چۆن گەڕاوەتەوە شارێکی مردووی خەریکبوو بەرە بەرە لە ژێر تۆز و خۆڵ و گەرمادا ون دەبێ. ئەویش لەگەڵ مێردێکی هێندەی پووڵ هەبوو دەیتوانی لە هەر جێگایەکی دونیادا بیهەوێ بژی و، ئەوەندە ئاشقی ژنەکەی بوو، ڕیگەی دابوو قەلادەی ئاوریشمی ملی بۆ هەر شوێنێک پێ خۆش بوو ڕاکێشێ. هەر چۆنی بێ، لەگەڵ ڕەوتی زەمان، مەبەستی مانەوەی ئەو لەوێ ڕوونتر دەبۆوە، چونکە هەموو ئەو نەخشانەی دایدەنان نەخشەی درێژخایەن بوون و، پلانەکانی بەتەواوی پێوەندییان بە ڕابواردنی ژیانێکی تێر و ئاسوودەی زەمانی پیرییەوە هەبوو لە ماکۆندۆ.

قەفەزی کەناری وایدەنواند کە نەخشەکانی ئاکامی پلانی کوتوپڕ نییە. ب وەبیری هاتەوە دایکی لە نامەیەکیدا بۆی نووسیبوو هەموو باڵندەکان مردوون، چەند مانگ سەفەرەکەی خۆی دواخستبوو هەتا بتوانێ سواری کەشتییەک ببێ کە لە دورگەی فۆرتووناتە[1] ڕاوەستێ و، لەوێ بیست و پێنج جووتەی کەناریی لە هەمووان جوانتری هەڵبژاردبوو، هەتا جارێکی دیکەش ئاسمانی ماکۆندۆ پڕ بێتەوە لە فڕینی مەلان. ئەو هەنگاوە لە

---

[1]– Fortunate – ناوی پێشووی دورگەکانی قەناری- و

ناخۆشترین پلانە زۆرە بێ ئاکامەکانی ئەو بوو. باڵندەکان وردوردە زیادیان دەکرد و ئامارانتا ئۆرسۆلا جووتە جووتە بەرەڵڵای دەکردن و مەلەکانیش، لەگەڵ بەرەڵلابوون، لە شار رایان دەکرد بە خۆرایی تێدەکۆشا سەرنجیان بۆ لای ئەو قەفەزە راکێشێ کە ئۆرسۆلا لە هەوەڵین چاککردنەوەی خانووەکەدا دروستی کردبوو. بە بێ سوود هێلانەی دەسکردی بۆ لە سەر دارە بادامەکان دروست دەکردن و هەرزنی بە قەوەزەکان وەردەکرد و بە خۆرایی مەلەکانی نێو قەوەزی ناچار دەکردن بخوێنن هەتا بەڵکو دەنگی خوێندی ئاوان مەلە راکردووەکان بگێرنەوە شوێنی خۆیان، چونکە باڵندەکان لە هەوەڵین دەرفەتدا دەردەپەڕین و لە ئاسمانێ چەرخێکیان لێدەدا و بە دوای ئاراستەی دورگەکانی فۆرتووناتەدا دەگەڕان.
ئامارانتا ئۆرسۆلا ساڵێک دوای گەڕانەوەشی، هەرچەند نەیتوانیبوو لەگەڵ کەسێک بناخەی ئاشنایی و دۆستایەتی دابرێژێ و میواندارییەک ساز بکا. دیسانیش بڕوای وابوو، دەتوانێ ئەو کۆمەڵە، کە گیرۆدەی بەدبەختی بووە. رزگار بکا. مێردەکەی، گاستۆن[٢] وریای ئەوەبوو نەکا قسەیەکی ئەوتۆ بکا لەگەڵ بۆچوونی ئەو ریکنەیەتەوە _هەر چەند لەو نیوەڕۆ بکوژەدا کە لە قەتار هاتەخوارەوە تێگەیشتبوو بڕیاری گەڕانەوەی ژنەکەی تەنیا تراویکلەیەکی دڵتەنگی بووە. بەو دڵنیاییەوە کە سەرەنجام راستی دەردەکەوێ و تێکی دەشکێنێ، خۆی زەحمەت نەدا دووچەرخەکەی دەپاڵ یەک بنێتەوە. لە جیاتیان لە نێو ئەو رایەڵە جاڵجاڵووکانەدای کرێکارەکان لە دیوارانیان کردبۆوە، خەریکی راوەگەرای گەورەتر بوو. چەند سەعاتان هێلەکانی بە نینۆکان لێک دەکردنەوە و بە زەرەبین تەماشای ئەو جاڵجاڵوکە زۆر وردانەی دەکرد کە لە هێلکەکان دەهاتنەدەرێ.ماوەیەک دواتر، بۆی روون بۆوە ئامارانتائۆرسۆلابۆئەوەی تەسلیم نەبێ، درێژە بە ئاڵوگۆڕ و گۆرانکارییەکانی خۆی دەدا، لێبرا دووچەرخەکەی، کە چەرخی پێشەوەی زۆرلەچەرخی دواوەی گەورەتر بوو،لەپاڵ یەک بنێتەوە و بەراگرتنی میش و مەگەزی جۆراوجۆری ناچەکە، کە لەو مەڵبەندە زۆربوو، کاتی خۆی

[٢] - Gaston

تێپەربکـــا. ئەگەرچـــی ئەو لە فڕۆکەوانیـــدا شـــارەزابوو ، بەڵام مـــێش و مەگەزەکـانی لەنێوشووشـــەی بەتـــاڵی مرەبـا دەکـردن و دەینـاردن بـۆ مامۆســتای مێـژووی سروشــتی پێشــووی خــۆی لەدانشــگای شــاری لیژ،٣ئەوشوێنەی کە دەوری بەرزی مەگەزناسیی لەوێ تەواوکردبوو.کاتێک ســواری دوچەرخەدەبوو،شـــەڵواری وەرزش و گــۆرەویی ئەســتووری شاخەوانیی دەبەردەکرد و کڵاوی بەگەڕی لەسەردەنا . بەڵام کاتێک بەپێیان دەگەڕا کـۆت و شـەڵوارێکی زۆر جـوان و خـاوێنی کەتـانی،لەگەڵ کەوشـی سپی و کراواتی ئاوریشمی دەبەردەکردن و کڵاوێکی حەسیری لەسـەردەنا و گۆچانێکی بەدەستەوەدەگرت. چاوی کەمرەنگی حاڵەتی مەلەوانیی ئەوی دەکردە دووبەرامبەر و سمێڵی خشپیلانەی دەتگوت پێستی دەڵەکە.هەرچەند پازدەســـاڵ لەژنەکەی گەورەتربـــوو، بەڵام ئیـــرادەی بەهێـــزی بـــۆ بەختەوەرکردنـــی ژنەکەی و بـــوونی هەمووتایبەتمەنـــدییەکی بەرزی ئەویندارێکی بـاش، ئەو جیـاوازیی تەمەنەی پردەکردوە.لەراسـتیدا هەرکەس ئەوپیاوەچـل سـاڵانەی دەدی کە ئاوهـا بەجـوانی لیباسـی دەبەرکـردووە و ملپێچی لەگەردن دایە و سواری دووچەرخەی سێرک دەبێ، ئیمکان نەبوو بیربکاتەوە کە لەگەڵ ژنەجحێڵەکەی پەیمانی ئەوینێکی شێتانەی بەستووە. هەردووکیان هەرلەسەرەتای ئاشنایەتییاندا هەرکات هەوەسـی ئەوینداریيان دەبزووت، ئەگەرلەشـوێنی زۆرنالەبـاریش بـان ،نائاسـاییتر هەوەسـی ئەوانی قـوڵتر و دەوڵەمەنـدتر کردبـوو، گاسـتۆن سـەرەڕای ئەوەی ئاشـقێکی شـێتی بەخەڵاتـی لەبـران نەهـاتووبوو، رەنـگە لەمێـژووی مرۆڤایەتیـدا هەوەڵـین پیـاوبووبێ کەبەتەیـارەکەی هـاتنەخواری لەبەرناچـاری کردبـوو، کە نزیـک بووخـــۆی و ماشـــووقەکەی بەکوشـــتن بـــدا ،ئەویـــش تەنیـــالەبەرئەوەی هەوەسـیان کردبوولەنێومەزرایەکی پـر لە وەنەوشـە ئەوینـداری بکەن.سـێ ساڵ پێش زەماوەند لەگەڵ یەکتربیبوونە دۆست،کاتێک بە فڕۆکەی وەرزشـی بەســـەرقوتابخانەی ئامارانتـــا ئۆرسـولادا دەفـری و بـۆئەوەی و بـۆئەوەی وەمیلەی ئاڵای خانووبەرەکە نەکەوێ مـانۆری ئازایـانەی دابوو، فڕوکەکەی کە لە جاو و وەرەقەی ئـالۆمینیۆم دروسـت کرابـوو، لە کلکەوە بەسـیمەکانی

کارەباوە هەڵاوەسرا.لەوە بەدوا،گاستۆن بەبێ ئەوەی گرینگی بە دەست و پێی لە گەچ گیراوی بدا ،هەمووئاخری حەوتووان دەرۆیشەقوتابخانەی شەوانەرۆژیی مەزهەبی کە ئامارانتا ئۆرسۆلا لە تەواوی ماوەی خوێندنی دا لەوێ ژیا و دەستوورەکانی بە پێچەوانەی ویستی فێرناندا هێندەش توندوتۆل نەبوون و، لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆیانەی وەرزشی. ئەوینی ئەوان لە بەرزایی پێنج سەد میتری زەوی ، لە ئاسمانی رۆژەکانی حەسانەوەی دەشتەکانەوە دەستیپێکرد، هەروا کە شتەکانی سەرزەوی چکۆلە و چکۆلەتردەبوونەوە، ئەوان لەیەکتر نزیک و نزیکتردەبوونەوە. ئامارانتا ئۆسۆلا باسی ماکۆندۆی بۆدەکرد و ئەوێی پێ روونـاکترین و ئارامترین شوێنی دونیا بوو. قسەی لەماڵێکی پان و بەرین و بۆن خۆشی پڕ لە پوونەدەکرد و ئارەزووی ئەوەبوو رۆژگاری پیری لەگەل مێردە وەفادارەکەی لەوێ تێپەڕکا، لەگەڵ دووکوڕان، کەناوەکانیان لەجیاتی ئۆرلیانۆ و خۆزێ ئارکادیۆ،رۆدریگۆ و، گۆنزالۆیە و کچێکیش کە ناوی لەجیاتی ڕێمیدیۆس، ڤێرجینیا بێ. لەبەردڵتەنگیی خۆی ،شارەکەی بەشکڵی دڵخوازی خۆی دانابوو و وەهابەسۆزەوە دەیهێنایەوە بیری خۆی کە مێردەکەی زانی ئەگەر بۆ درێژەی ژیان نەیباتەوە ئەوێ، هیچ کات ئامادەنابێ زەماوەندی لەگەڵ بکا. ڕویشتنی بۆئەوێ قبووڵ کرد ، هەروەک بە خەیاڵی خۆی قەڵادەی ئاوریشمی گەردنیشی هەوەسێکی زوو تێپەڕە، ئەویشی قبووڵ کرد، وایدەزانی ڕەوتی زەمان هەموشتێک چارەسەردەکا، بەڵام کاتێک دووساڵ لە ژیانیان لەماکۆندۆ تێپەری و ئامارانتائۆرسۆلا هەروەک رۆژی هەوەڵ خۆشحاڵ بوو، مێردەکەی نیگەران بوو. لەو ماوەیەدا هەموو ئەو مێش و مەگەزی ناوچەکەی بۆهەڵدڕین دەبوون، هەڵیدڕیبوون و وەک خۆولاتی- یەکی ئیسپانیۆلی فێربوو قسەی دەکرد و تەواوی ئەو جەدوەلانەی گوڤارەکانی بۆیان دەهاتن حەل کردبوو. بۆبەجێ هێشتنی ئەوێ نەیدەتوانی ئاو و هەوا بکاتە بیانوو ،چونکە سروشت جەرگ و سێپەلاکی ئەوەندە ساخی دابوویە کە بەهاسانی دەیتوانی خۆی لەبەرگەرمای سەعاتی یەکی نیوەرۆیە و خواردنەوەی ئاوی کرماوی

رابگرێ.خواردنی ئەوێی ئەوەندە پێ خۆش بوو، کە جارێکیان یەک جەم هەشتا و دوو هێلکەی ئیگوانای خواردن. ئامارانتا ئۆرسوڵابەپێچەوانەی ئەو، بەقەتار ماسی کۆنسێرو و سەدەفی بەستوو و گۆشت و مێوەی کۆنسێرووی لەگەڵ خۆی هێنابوو و تەنیا لەوانی دەخوارد . هەروا جلوبەرگی ئەوروپایی دەبەردەکرد و هەرچەند،نە دەرۆیشتە جێگایەک و نەکەسیش دەهاتە دیدەنی. هێشتا هەرگوڤارەکانی مۆدی ئابوونەبوون و لەرێگای پۆستەوە بەدەستی دەگەیشتن. لەوکاتەدا مێردەکەشی حاڵ و حەوسەڵەی تاریف و پێ هەڵاگوتنی دامێنە کورتەکانی و کڵاوە ئەستەرە دارەکان و گەردنبەندە حەوت ریزەکانی نەمابوو. وادەهاتە بەرچاو نهێنیی ئامارانتائۆرسۆلا لەوەدا شاردرابۆوە کە هەمیشە کارێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە هەتابێکار بەبێ. گیروگرفتی ماڵەوە، کە هەربۆخۆی پێکی دەهێنا،چارەسەری دەکردن و دەستی لەهەزاران شت وەردەدا هەتا رۆژی دواتر چاکیان کاتەوە – لەگەڵ وەسواسی فێرناندا و تێکدانی نەریتی بە میرات ماوەی بنەماڵە و سەر لە نوێ دروست کردنەوە. رۆحیەتی میوانداری پەرستیی ئەوەندە زیندوو بوو، هەرکات قەوانی تازەی مۆسیقای بۆ دەهاتن، گاستۆنی بانگ دەکردە ساڵۆنێ و هەتا درەنگانێک ئەو سەما و هەڵپەرکێیانەی لەگەڵ دووپات دەکردنەوە کە هاورێکانی شێوەکانیان بۆ ناردبوو. نزیکەی هەموو جارێک ئاکامەکەی دەگەیشتە ئەوەی یان لەسەر کورسی راحەتی یان لەسەر ئەرز خەریکی ئەوینداری بن. تەنیا شتێکی بەختەوەریی پتەوی ئەوی هێندێک لێڵ دەکرد، نەبوونی مناڵ بوو، بەڵام رێزی بۆ ئەو مەرجە دادەنا کە لەگەڵ مێردەکەی هەیبوو، مناڵ نەبوون هەتا پێنج ساڵ دوای زەماوەند.

گاستۆن، بۆ پڕ کردنەوەی سەعاتی مردووی خۆی، بەیانیان لەگەڵ ئۆرنیانۆی شەرمێون لە ژووری مێلکیادێس دەمایەوە. لە قسە کردن لەگەڵ ئۆرلیانۆ، لە وەبیرهێنانەوەی کون و قوژبنەکانی دوورەدەستی وڵاتی خۆی، کە ئەو وەها شارەزایان بوو دەتگوت سەد ساڵە لەوێ ژیاوە، کەیفی دەکرد. کاتێک گاستۆن لێی پرسی کە چۆنەتوانیویەتی ئەوزانیارییانە دەست

بخـا کە لە فەرهەنـگە کەدا نـین ، هەرئەو وەڵامەی دایەوە کە دابـوویەوە بە خۆزێ ئارکادیۆ :"هەمووشـتێک ئاشـکرایە."بێجگە لەسانسکریت، زمانەکانی ئینگلیسـی، فەرانسـە و کەمێک لاتـین و یۆنـانیش فێرببوو.لەوزەمـانەدا دوای نیوەرۆیــان لە مــاڵەوە دەردەرکەوت و ئامارانتائۆرســولا هێنــدێک پــارەی گیرفانی حەوتووانەی دەدایەی، لەبەرئەوە ژوورەکەی وەکب ەشێک لەکتێب فرۆشـی زانـای ئسـپانیۆلی دەهاتەبەرچـاو. هەتـا شـەودرەنگانێک بە ئیشـتیا شـتی دەخوێنـدەوە. گاسـتۆن دڵنیـابوو کە ئەو، ئەوکتێبـانە بـۆ ئەو مەبەسـتە ناکڕێ تا شتیان لێ فێربێ، بەڵکو تەنیا دەیەوێ زانیارییەکانی خـۆی لەگەڵ نێــوەرۆکی ئەوان بەراوردبکـــا، چــونکە ئەو دڵـــێ بە نووســـراوەکان لە هەمووشـــت خۆشـــتربوو و، زۆربەی ســـەعاتەکانی بەیانیـــان خەریکـــی خوێندنەوەی ئەوان بوو. هەم گاستۆن و هەمیش ژنەکەی زۆریان پێ خۆش بـوو ئەوی بهێنــنە نێوژیــانی بنەمــاڵەی خۆیــان، بەڵام ئۆرلیــانۆ پیــاوێکی گۆشـەگیربوو و خەرمانەیەکی نەزانراو، کە دەوران دەوری گرتبوو، لەگەڵ رەوتـی زەمـان پڕتردەبـوو. هێنـدە سەرسـەخت بـوو کە هەمـوو هەوڵ و کۆششی گاستۆن بۆ دۆستایەتی لەگەڵ ئەو بێسوود مایەوە و، سـەرەنجام کـابرای بێلژیکـی ناچـاربوو بـۆ پرکـردنەوەی کاتەتەکـانی مـردووی خـۆی بەدوای ســـەرگەرمییەکی دیـــکەدا بـــگەڕێ، ئەوەبـــوو بە مێشـــکیداهات رایەڵگەیەکی پۆستی هەوایی دابنێ.

پرۆژەیەکـی تـازەنەبوو. کاتێـک ئەو لەگەڵ ئامارانتـا ئێرسـۆلابوون بەئاشـنا، پۆسـتی هەوایـی مـاوەیەک بـوو لە مێشکی ئەودا ڕێککەوتبوو، بەڵام نەوەک لەماکۆنــدۆ، بەلکـــو لە کۆنگـــۆی بێلژیـــک، ئەو شـــوێنەی کە خزمەکـــانی سـەرمایەگوزارییان لەرۆنـی خورمـادا کردبـوو. زەماوەنـد و بڕیـاری بەرایـی ئەو بــۆ رابــواردنی چەنــد مانگێــک لەماکۆنــدۆ بــۆ دڵخۆشــیی ژنەکەی، جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیـان دواخسـت. بەڵام کاتێک زانـی ئامارانتائۆرسـۆلا خەریـکە کـۆمیتەیەک بـۆ چـاککردنی وەزعـی گشـتی دابنـێ و هەر کـات ئەو ئیشـارەیەک بـۆ ئیمکـانی گەرانەوە دەکـا پێـی پێدەکەنی، زانـی کە وەزعەکەی زۆر لەوە زۆرتردرێژە دەکێشی کە ئەوبیری لێ کردبـۆوە. لەوبـارەیەوە، بەو

خەیاڵە کە لە کارییبیش دەتوانێ وەک ئەفریقا پێش قەدەم بێ، لەگەڵ شەریکە فەرامۆش-
کراوەکانی پێوەندیی گرتەوە. بەهیوای دابەزاندنی نەخشەکە، خەریکی ئامادەکردنی دانانی فرۆکەخانەیەک لەناوچەی جادوویی بوو،کە لەوزەمانیدا وەک دەشتێکی بە بەردەستێ داپۆشراو دەهاتە بەرچاو. ئاراستەکانی با و وەزعی جوغرافیایی کەنارە و هێڵەکانی لەباری هەوایی خستنەژێرلێکۆڵینەوە و نەیزانی کارەکانی ئەوەندە بە کاری میستەر هێربەرت دەچێ بەرەبەرە خەڵکی شارەکە ئەوەندەبەدگومان دەکا کە ئەو نایهەوێ هێڵی هەوایی دابنێ، بەڵکو مەبەستی چاندنی داری مۆزە. بەخۆشحاڵی و رازیبوون لەجێبەجێکردنی نەخشەکەی، کە سەرەڕای هەمووشتێک جێگیربوونی هەمیشەیی ئەوی لە ماکۆندۆ پێکدەهێنا ، چەند کەرەتان رۆیشتە ناوەندی ئوستان و لەگەڵ کاربەدەستانی ئەوجۆرە کارانە دیداری کرد و رێگەی ماوەدانی لێ وەرگرتن و پەیمانی تایبەتی لەگەڵ بەستن و هەر لەو کاتەش دا لەگەڵ شەریکەکانی لە برۆکسێل لە نامەگۆڕینەوەدا بوو، نامەگۆڕینەوەیەک کە لە نامەگۆڕینەوەی فێرناندا و پزیشکانی نادیاری دەچوو. سەرەنجام توانی ئەوان رازی بکا، کە هەوەڵین فرۆکە بەمیکانیکێکی شارەزا بنێرنە نزیک ترین فرۆکەخانە، هەتا لەوێوە بەرێی بکەن بۆ ماکۆندۆ. ساڵێک دوای ئەندازەگرتنەکان و لێکدانەوەی کەشناسی و بروا بە وادەیەک لەدوایەکەکانی ئەوکەسانەی نامەی بۆدەنووسین ،عادەتی کردبوو بە شەقامان دا بروا و چاو لە ئاسمانێ بکا و بەهیوای دەرکەوتنی فرۆکە گوێ بۆهاشوهووشی با هەڵبێخێ. هەرچەند ئۆرلیانۆ خۆی تێینەگەیشتبوو، بەڵام گەڕانەوەی ئامارانتا ئۆرسۆلا بەتەواوی ژیانی ئەوی گۆڕی. بەدوای مردنی خۆزێ ئارکادیۆ ببوو بە مشتەری دایمی زانای ئیسپانیۆلی و بێجگە لەوەش، چونکە لەو زەمانەدا ئازادبوو، کاتێکی زۆری هەبوو، سەرنجێکی تازەی سەبارەت بەشار بۆ پەیدا بوو و بە بێ ترس و خۆف خەریکی گەڕان و شارەزابوون لەشاربوو. لەجادەکانی چۆل و پرلە تۆز و خۆڵ تێدەپەڕی و بەمەیلێکی زانستی دەرۆیشتە نێو ماڵە روو بە وێرانەکان و

سەیری تۆری ئاسنی پەنجەرەژەنگ لێدراوەکان، کە بە هێرشی باڵندە مردووەکان تێک قوپابوون و خەڵکی چەماوە بوو لە ژێر باری بیرەوەری بیەکانیاندا، تێدەکۆشا گەورەیی و شکۆداری وێرانکەری ناوچەی کۆمپانیای مۆز بێنێتە بەرچاو- جیگایەک کەگۆلی مەلەی بەتاڵی ئێستا هەتا لیواری پربوو لە کەوشی کۆنەی ژنانە و پیاوانە. لەماڵێکدا کە گیاکەڵە داپۆشیبوو و کاولیکردبوو، کەلاکی ویشک هەڵاتووی سەگێکی گەڕی ئالمانی بینی کە هەروەکخۆی بە زنجیرێکی ئاسن بەدیوارەوە بەستراب‌ۆوە، تەلیفۆنێک کە زەنگی لێدەدا و زەنگی لێدەدا هەتا ئەوەی ئەو تەلیفۆنەکەی هەڵگرت و گوێی دایە ئەو ژنەی کە لەدوورەوە بەئینگلیسی قسەی دەکرد و لە وەلامدا وتی بەڵی ، مانگرتن تەواو بووە، سێ هەزار لاشەیان لە دەریا هاویشتبوو کۆمپانیای مۆز ئەوێی بەجێ هیشتبوو و ماکۆندۆ سەرەنجام دوای ساڵان ئاسوودەیی خۆی دیسان دەست کەوتبۆوە، لەخولانەوەکانی خۆیدا کێشرایە گەرەکی فاحیشەکان، ئەو شوێنەی کە لە رابردوودا بۆ رابواردن دەستە دەستە ئەسکیناسیان ئاگر تێبەردەدا و ئێستا ببوو بەجادەی پێچاوپێچ و لەشەقامەکانی دیکە هەژارانەتر و بەدبەختتر ببوو و، هێشتا چەند لامپی سوور لەسەر هێندێک مالان دەئایسان. سەماخانەکانی خاڵی، کە بەگوڵی کاغەزی رازابوونەوە، لەنێویاندا بێوەژنە بێ کەسەکان و دایەگەورە فەرانسەوییەکان و دایکانی خەڵکی بابل، هێشتا لەتەنیشت گرامافۆنەکانیان چاوەروانبوون. ئۆرلیانۆ نەیتوانی کەسێک بدۆزیتەوە بنەماڵەی ئەویان بەبیر مابێ ، تەنانەت سەرهەنگ ئۆرلیانۆیش لەبیری کەسدا نەمابوو، بێجگە لە کەسێک، پیرەپیاوێک، کە پیرترین رەش پێستی رەش پێستانی خەڵکی ئانتیل بوو و مووە لۆکەییەکانی سەری، دەتگوت بەرعەکسی وێنەگرانن و، هێشتاش لەبەردەرگای ماڵی خۆیان ئاهەنگی تازیەبارانەی شەوانەی دەگوتنەوە. ئۆرلیانۆ بەزمانی ناوچەیی گرانی ئەو کە لەماوەی چەندحەوتووان دافێری ببو، قسەی دەکرد و جاری واش هەبوو دەبوو بە شەریکی ئەوشۆرباوە سەرەمریشکانە کە نەوەکەی بۆی لێدەنرا. نەوەکەی ژنێکی رەشپێستی زەبەلاحی ئێسک پان بوو، سمتی وەک

هی مایینان و مەمکی دەتگوت شووتین و سەری خڕی کە بە مووی وەک تێیلدڕوو داپۆشرابوو، وەک کڵاوخوودی شەرکەری سەدەکانی نێوەراست دەهاتە بەرچاو. ناوی نیگرۆمانتا بوو. ئۆرلیانۆ لەو دەورەیەدا بە فرۆشی کارد و چەنگاڵی زیو و شەمدانی و خرتو و پرتی دیکەی ماڵەوە، خۆی دەژیاند.

کاتێک بێپارە دەبوو (کە زۆرجار وابوو) دەڕۆیشتە بازاڕ و ئەو سەرە مریشکانەی خەڵک فڕێییاندەدان کۆدەکردەوە و دەیبردن بۆ لای نیگرۆمانتا، هەتا لەگەڵ تەرەتیزە و نەعنا سووپیان لێ دروست بکا. کاتێک باپیری پیر مرد، ئۆرلیانۆ نەڕۆیشتەوە ماڵیان. بەڵام لەگەڵ نیگرۆمانتا هەروا لە ژێر دارە بادامە رەشەکانی مەیدانێدا یەکتریان دەبینی، ئەو بەو فیتوانەی لێی دەدان وەکو حەیوانی کێوی بوو سەرنجی شەوگەڕانی رادەکێشا. ئۆرلیانۆ زۆر جار لە لای ئەو دەمایەوە و بە زمانی خۆی سەبارەت بە شۆرباوی سەرە مریشک و خواردنە تامخۆشەکانی دیکەی هەژاران، لەگەڵی دەدوا. دڵی دەیخواست زۆرتر لە لای ئەو بمێنێتەوە، بەڵام ئەو گوتی لەوێ مانەوەی مشتەرییان دەرەوێنێتەوە. هەرچەند زۆرجار وەسوەسەی کرد و ئەگەرچی بۆ خودی نیگرۆمانتاش ئەو پێکەوەلکانی سروشتییە دەبوو بە هۆی دڵتەنگیی دوولایەنە، بەو حاڵەش لەگەڵی نەدەنووست. بەوجۆرە کاتێک ئامارانتا ئۆرسۆلا گەرایەوە ماکۆندۆ و ئەوی خوشکانە لە ئامێز گرت و وەهای بە خۆوە کوشی نەفەسی لێبڕی، ئۆرلیانۆ هێشتا هەر کوڕ بوو. هەر جارەی ئەوی دەبینی و، بەتایبەتی ئەو کاتانەی سەمای مۆدی رۆژی فێر دەکرد، ئۆرلیانۆ هەمان نووشتانەوەی ئەسفەنجی لە ئێسقانەکانی خۆیدا هەست پێدەکرد کە باپیری کاتێک پیلار تێرنێرا لە عەمبارێ فاڵی وەرەقی بۆ گرتبۆوە، هەستی پێکردبوو. بۆ سووککردنی ئەو ئاوازە زۆرتر لە جاران خۆی بە خوێندنەوەی نووسراوەکان خەریک کرد و هەوڵیدا لە پێهەڵاگوتنەکانی پووری خۆی، کە شەوەکانی ئەوی لە خەرمانەیەکی خەمەوە دەپێچا، رابکا. بەڵام هەرچەندی زۆرتر خۆی لێ دەپاراست، زۆرتر چاوەڕوانی دەنگی قاقای پێکەنینەکانی

بوو. لە چاوەڕوانیی هاواری شادیی پشیلانە و گۆرانیی حەقناسانەی ئەودا لە هەموو سەعاتێک و لە هەموو گۆشەیەکیماڵەوەدا لەبەر دەردی ئەوین خۆی هەڵدەکوشی.

ژن و مێردێک کە هەرگیز لە ئەویندارى تێر نەدەبوون، شەوێک لە نێوانی دوومیتری جێخەوی ئەو، لە کارگای زێرنگەری، بوتڵەکانیان شکاند و لە سەر مێزی دەریاچەیەک لە ئەسیدموریاتیکدا ئەوینداریيان کرد. ئۆرلیانۆ دەمێکیش نەخەوت. سبەی ئەو رۆژە تای هاتێ و سەرانسەری رۆژەکە گریا، هەوەڵین شەو، کە لە بن سێبەری دارە بادامەکان چاوەڕوانی نیگرۆمانتای کرد، وایزانی چاوەڕوانییەکەی ئەبەدییە. بریسکی بە لەشیدا دەهاتن و پیزۆیەک و پەنجا سینتاوی کە لە ئامارانتا ئۆرسوڵا وەرگرتبوو. لە دەستیدا رێکی دەکوشین. ئەو پارەیەی لەبەر پێویستی لێ وەرنەگرتبوو، بەڵکو دەیویست بەجۆرێک لەگەڵ کارەساتی خۆی بیکاتە شەریک و بە گەندی بکێشێ. نیگرۆمانتا بردییە ژوورەکەی خۆی کە شەمێکی لێ دایسا- لە سەر تەختەسەفەرییەکەی خۆی کە مەلافەکانی بە ئەوینی پیس پەڵەپەڵە ببوو، بە سەر خۆی کێشا، بە سەر لەشی دیڵەسەگی وەحشیی خۆی، بە سەر لەشی وەک بەردی بێڕووح کە ئامادە بوو هەتا هەرچی زووە شیرەی ئەو وەکو کورەمناڵێکی ترساو دەرکێشێ. کەچی لە پڕ پیاوێکی بینی کە توانای لەبرانەهاتووی ئەوی لە ناوەوە وەکو بوومەلەرزە داتەکاند.

بوون بە ئاشق و ماشووق. ئۆرلیانۆ بەیانیان خەریکی ئاشکراکردنی نهێنیی نووسراوەکان دەبوو و کاتی خەوی دوای نیوەڕۆیان دەرۆیشتە ژوورێکی داهێزانهێنەر کە نیگرۆمانتا چاوەڕوانی دەکرد، هەتا فێری بکا چۆن هەوەڵێ وەکو کرم و دوایی وەکو شەیتانۆکە و سەرەنجام وەکو قرژاڵ بەیەکەوە ئەوینداری بکەن. ئەوجار نیگرۆمانتا ئەوی بەرەڵڵا دەکرد و بە چاوەڕوانیی ئەوینی بەرەڵڵایانە لە سەرجێگاکەی خۆی رادەکشا. چەندین حەوتوو رابرد. هەتا ئۆرلیانۆ زانی کە دەوری کەمەری نیگرۆمانتا جۆرە کەمەربەندێکی پێدا هاتووە کە دەڵێ لە جنسی ژێی کومانچە دروست کراوە. بەڵام ئەو بەنە کە

وەکو پۆلا قایم بوو نە سەرەتای هەبوو نە کۆتایی. چونکە لەگەڵ ئەو هاتبووە دنیاوە و لەگەڵ ئەویش گەورە ببوو. بەزۆری لەنێوان کاری ئەوینداری‌یەکانیان‌دا هەروا بە رووت‌وقووتی لە نێو جێگادا نانیان دەخوارد. لە گەرمای پشووبڕ و لە ژێر ئەو ئەستێرانەی رۆژێ، کە کون و کەلێنی قرمیتی ژەنگلێدراوی ژوورەکە پێکی هێنابوو، یەکەم جار بوو نیگرۆمانتا فاسقێکی خۆی هەبوو، قاقا پێ‌دەکەنی بانگی دەکرد (ئیسک شکێن)، وردە وردە ئاشقی ئەو دەبوو، کە ئۆرلیانۆ ئەوینی بە دزی خۆی سەبارەت بە ئامارانتا ئۆرسۆلا لە لای ئەو درکاند- ئەوینێک، کە تەنانەت لە جێدانانی ئەویش نەیتوانیبوو چارەی بکا، تاقیکردنەوە هەر بەوجۆرەی ئاسۆی ئەوینی لە بەرامبەردا دەکردنەوە، هەر بەو رادەیەش دەروونی ئەوی تێکەوە دەپێچا. لەوەبەدوا، هەرچەند نیگرۆمانتا وەکو پێشوو بە گەرمی وەری‌دەگرت، بەڵام ناچاری دەکرد پارەی بدا و چونکە ئۆرلیانۆ پوولی نەبوو، بە قەرزی لە سەر دەنووسی.

حیسابەکەی بە ژمارە نەدەنووسی، بەڵکو بە نینۆکی ئەنگوستی پشتی دەرگای ژوورەکەی شوێن دەکرد. لای تاوپەڕان کاتێک نیگرۆمانتا لە قەراخ سێبەرەکانی مەیدان پیاسەی دەکرد. ئۆرلیانۆ وەکو بێگانەیەک بە هەیواندا تێدەپەڕی و سڵاوێکی بەپەلەی لە ئامارانتا ئۆرسۆلا و گاستۆن دەکرد، کە لەو کاتەدا خەریکی شام خواردن بوون، بەبێ‌ئەوەی توانای خوێندنەوە یان نووسین یان بیرکردنەوەی هەبێ، دەرگای ژوورەکەی لە سەر خۆی داخست. بە نیگەرانیی تەواوەوە چاوەروانی ئەو پێکەنین و ناز و نووز و هەڵسوکەوتانەی پێش و دوای تەقینەوەی بەختەوەریی پڕ لە خۆشی بوو، کە شەوانی ماڵەوەی لێواولێو دەکرد. ژیانی ئۆرلیانۆ دوو ساڵ پێش ئەوەی گاستۆن چاوەڕوانی فڕۆکە بێ، بەوجۆرە رادەبرد هەتا ئەو دوانیوەرۆیەش کە رۆیشتە کتێبفرۆشیی زانای ئیسپانیۆلی ژیانەکەی هەر ئەوە بوو. لەوێ چاوی بە چوار کوری فروفیشاڵکەر کەوت، کە لە سەر شێوەی لەنێوبردنی سیسرکە لە سەدەی نێوەڕاستدا بەتوندی باس و کێشەیان بوو. کتێب-فرۆشی پیر، کە دەیزانی ئۆرلیانۆ چەندی دڵ بەوکتێبانەوەیە کە تەنیا

بودای(٧) بەرێز خوێندبوونیەوە. بەشێوەیەک لاساریی باوکانە هانیدا کە بچێتە نێو باسەکەوە و ئەو بە بێحەسانەوە شیکردەوە کە سیسرکە، قەدیمیترین باڵداری سەرزەوییە و لە زەمانی ئینجیلەوە بۆتە قوربانیی لینگەکەوشان و بەڵام لە بەر ئەوە کە رەگەزی ئەو مەگەزە لە بەرامبەر هەموو جۆرە ئامرازێکی کوشتاردا، لە لەتە تەماتەی خوێکراو بە خوێی ئەسید بوریک و سودیۆمەوە بگرە هەتا ئاردی تێکەڵاو لەگەڵ شەکر خۆراگرییەکی لەبڕان نەهاتووی هەیە، یەکهەزار و شەشسەد و سێ جۆریان لە بەرامبەر قەدیمیترین و بەهێزترین و بێبەزەییانەترین شێوە، کە بەشەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە بۆ لەنێوبردنی ئەوانە پێکیان هێناوە- لەگەڵ مرۆڤ خۆیشی، گیانیان رزگار کردووە. هەروا کە غەریزەی زاوزێ بە مرۆڤەوە پێوەند دەدرێ، غەریزەی روون و دایمی کوشتنی سیسرکەش پێوەندیی بە مرۆڤەوە هەبوو و، ئەگەر سیسرکە توانیبووی لە دەست زۆرداریی مرۆڤ رزگاری بێ، تەنیا لە بەر ئەوە بوو کە پەنای بۆ تاریکایی دەبرد و لەوێدا بە خۆڕاگری مابۆوە، چونکە بەشەر زاتەن لە تاریکی دەترسێ و سیسرکەش زاتەن لە رووناکایی دەترسێ. کەوابوو چ لە سەدەکانی نێوەراست و چ لە زەمانی حاڵ و چ لە سەدەکانی داهاتوودا تەنیا رێگەی کاریگەر بۆ کوشتنی سیسرکە رووناکایی رۆژێیە.

ئەو تاریفە فەرهەنگییانە، بوو بە سەرەتای دۆستایەتییەکی گەورە. ئۆرلیانۆ هەموو رۆژێ دوای نیوەرۆیان چاوی بەو چوار کەسە زۆربلێیە دەکەوت. ناوەکانیان ئالڤارۆ(٨) ، خێرمان (٩) ، ئالفۆنسۆ (١٠) و گابریل (١١) ، بوو. هەوەڵین و ئاخرین هاورێیانێک کە دۆزینییەوە. بۆ پیاوێکی وەکو ئەو کە هەتا ئەو زەمانی تەنیا نوقمی راستیی داپۆشراوی نێو کتێب بوو، ئەو باسە درێژانە کە لە سەعاتی شەشی دوای‌نیوەرۆ لە کتێبفرۆشی دەستی پێ دەکرد و، بەیانیی رۆژی دواتر لە فاحیشەخانە کۆتایی دەهات، زۆر تازە بوون. هەتا ئەو کاتە بە مێشکیدا نەهاتبوو کە ئەدەبیات باشترین قومارۆچکەیەکە مرۆڤ دایهێناوە، هەتا گەپ بە خەڵک بدا. شەوێکیان ئالڤارۆ ئەوەی پێ وت و زۆری بە سەرچوو هەتا ئالۆرلیانۆ زانی کە ئەوجۆرە

دادوەریکردنە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زانای ئیسپانیۆلی، کە باوەڕی وابوو ئەگەر ئاقڵ زانیاری نەتوانن ریگایەکی دیکە بۆ کوڵاندنی نۆک بدۆزنەوە، بەکاری هیچ نایەن.
دوانیوەڕۆیەک، کە ئۆرلیانۆ سەبارەت بە سیسرکە دووا، پاشماوەی باسەکە کێشرایە ماڵە کچانێکی لە بەر برسیەتی لە باوەشی ئەموئەودا دەخەوتن. فاحیشەخانەیەکی نایاسایی بوو لە دەرەوەی شار، خاوەنەکەی خانمسەرۆکێک بوو کە هێندەی دەرگا لیَکردبۆوە و دایخستبۆوە لێی ببوو بە نەخۆشی. زەردەخەنەی هەمیشەیی دەتگوت لە خۆشباوەڕیی مشتەرییانەوە پەیدا بووە، چونکە شوێنێک کە تەنیا لە دونیای خەیاڵدا هەبوو بەڕاستیان دەزانی. لەوێ تەنانەت شتی بەردەستیش راست نەبوون. سەندەڵییەکان هەتا کەسێکیان لە سەر دانیشتبایە لە بەریەک دەچوون، گرامافۆنێک کە نیوەکەی بەتاڵ بوو، مریشکێک هێلانەی تێدا کردبوو، باخی گوڵی کاغەزی، رۆژژمێرێک کە هی ساڵەکانی پێش هاتنی شیرکەتی مۆز بوو. چوارچێوەکان لەگەڵ وێنەی باسمەیی کە لە گۆڤارانێک بڕابوون کە هیچ کات چاپ نەکرابوون. تەنانەت ئەو فاحیشانەی کە خانمرەئیس بانگی دەکردن، مشتەری هاتووە، لە هەموو لاوە رایان دەکرد و دەهاتن هەر خەیاڵ بوون، بەبێ سەلام دەهاتنە ژوورەوە. لیباسە گوڵدارەکەیان هی کاتێک بوون کە پێنج ساڵ بچووکتر بوون و هەر بەو پاکییە کە دەبەریان کردبوو لەبەریان دەکردن. لە گەرمەی ئەویندارییدا بە ترسەوە دەیانگوت کە: "ئەی هاوار و داد! تەماشا کەن میچی ژوورەکە چۆن درزی داوە." هەر مشتەرییەک و پەنجا سینتاویان لە

خانمرەئیس وەردەگرت، بەو پووڵە لەتە نان و پارچەپەنیرێکیان دەکڕی کە هەر خانمرەئیس پێی دەفرۆشتن و، لەو کاتەدا زۆرتر زەردەی دەهاتێ، چونکە دەیزانی کە تەنانەت ئەو نان و پەنیرەش راستی نییە. ئۆرلیانۆ کە لەو زەمانیدا ئاسۆی دونیایەی لە مەکتەبەکانی مێلکیادێسەوە دەست پێ-دەکرد و لە باوەشی نیگرۆمانتادا کۆتایی دەهات، لەو فاحیشەخانە خەیاڵییەدا دەرمانی لە ریشەوە دەرێنانی شەرمێونی خۆی دۆزییەوە.

سەرەتا نەیدەتوانی کارێک بکا، چونکە راست لە گەرمەی ئەویندارییدا خانم-رەئیس دەهاتە ژووریّ و بەجوانی ئەو و هاوجێگاکەی هەڵادەگوت. بەڵام بە تێپەڕبوونی زەمان، توانی لەگەڵ ئەو بەدبەختییانەی دونیایە رێک کەویّ. بەجۆرێک، شەوێکی حاڵی لە شەوانی دیکە خراپتر بوو، لە ژووری چکۆلەی میوانداری خۆی رووت کردەوە و بە رووت و قووتی بوتڵێکی ئابجۆ لە سەر ئالەتی سەمەرەگەری خۆیدا دانا و لە نێو ماڵەکە دەستی بە گەران کرد. ئەم جۆرە خۆش‌رابواردنانەی لەوێدا کردنە داب و خانمرەئیس بە بێ ئەوەی دەنگی نارەزایی هەڵبڕیّ و بیّ‌ئەوەی باوەڕ بەوانە بکا، بە زەردەخەنەی هەمیشەیی ئەوانەی قبووڵ کردن. راست وەکو ئەوکاتەی خێرمان دەیویست ئەو شوێنە ئاگر تێبەردا هەتا بیسەلمێنێ کە هەر نییە و ئالفۆنسۆ تووتییەکی خنکاند و دە قابڵەمەی سووپی مریشکی هاویشت کە دەکوڵی.

هەرچەند ئۆرلیانۆ هەستی دەکرد کە هەر چوار هاوڕێکەی بە رادەیەک خۆش دەویّ و، هەموویان هەر بە چاوێک سەیر دەکا. بەمحاڵەش لە گابریل نزیکتر بوو، نەک لەوانی دیکە. ئەو نزیکییە لە شەوێکدا پێک هات کە بەهەڵکەوت قسە لە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا کرا و ئەو تەنیا کەسێک بوو کە باوەڕی بە قسەکانی ئۆرلیانۆ کرد. تەنانەت خانم رەئیسیش، کە عادەتی نەبوو خۆ لە وتووێژی مشتەرییان هەڵقورتێنێ، بە شێوەی خانم-رەئیسانە وتی: سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا- کە لە راستیدا هەر ئەو کاتە سەبارەت بەو قسەیان دەکرد ناوی بیستبوو- هەر کەسیەتییەکی ئەفسانەیی بوو، کە کاربەدەستانی دەوڵەتی دروستیان کردبوو هەتا بیانوویەکیان بۆ کوشتنی ئازادیخوازان بە دەستەوە بێ. بەڵام گابریل گومانی لە راستیی بوونی سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا نەبوو، چونکە ئەو کابرایە دۆستی خۆشەویست و هاورێی شەڕی باپیری خۆی سەرهەنگ خرینیلدۆ مارکیز بوو. هەرکات سەبارەت بە قەڵاچۆی کرێکاران قسە دەکرا، ئەو گومانەی بیرەوەرییەکان بەسامتر دەبوو. هەرکات ئۆرلیانۆ ئاماژەی بۆ ئەو مەسەلەیە دەکرد، نەتەنیا خانمرەئیس، بەڵکو کەسانێک کە تەمەنیشیان لەو زۆرتر بوو،

کارەساتی ئیزگە و قەتاری دووسەد واگۆنی هەڵگری لاشەکانیان دەدایەوە دوا و، پێیان دادەگرت کە دوور لە هەموو ئەو قسانە، ئەو مەسەلەیە لە پەروەندەکانی دادوەری و کتێبەکانی دەرسی قوتابخانانیشدا نووسراوە، کە کۆمپانیای مۆز هیچکاتێک نەبووە و بەوجۆرە ئۆرلیانۆ و گابریل بە جۆرەهاودەستییەک بە یەکەوە نووسابوون کە لە سەر ڕووداوانێک دامەزرابوو کەس باوەری پێ نەدەکردن و، وەها کاری کردبووە سەر ژیانی هەردووکیان کە تەماشایان دەکرد لە دژی ڕەوتی هەڵکشان و داکشانی زەمانەدا گوم بوون و، تەنیا شتێکی بۆیان ماوەتەوە دڵتەنگییە. گابریل لە هەر جێگایەک خەوی هاتبا، دەنووست. ئۆرلیانۆ چەند جاران لە کارگای زێرنگەری جێیکردەوە، بەڵام ئەو هەتا بەیانی لە بەر دەنگەدەنگ و هاتوچووی مردووان نەیتوانی بنوێ. ئەوی ناردە ماڵی نیگرۆمانتا و، ژنە هەرکات بەتاڵ دەبوو دەیبردە ژووری خەوتن و بە نینۆک حیسابەکەی لە پشت دەرگا، لەو شوێنە کەمەی کە لە بەر قەرزەکانی ئۆرلیانۆ مابۆوە بە خەتی ڕاست نیشانە دەکرد.

لەگەڵ ژیانی ئاڵۆز، هەموو ئەندامانی دەستە تێدەکۆشان لە سەر داوای زانای ئیسپانیۆلی کارێک بکەن درێژخایەن بێ. هەر ئەویش بوو وەکو خاوەن ئەزموونی مامۆستای پێشووی ئەدەبیاتی کلاسیک و فرۆشیاری کتێبی بێوێنە، شەوێک ئەوانی ناچار کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکانی، سی-وحەوتەمین کارەسات لە شارێکدا بدۆزنەوە، کە ئێستا نە کەس حەوسەڵە و نە ئیمکانیش بوو دوای دەورەی سەرەتایی درێژە بە خوێندن بدا. ئۆرلیانۆ، تواوە لە خۆشیی ئاشکرابوونی ڕەفاقەت و گێژی ئەفسوونی دونیایەک، کە زۆرداریی فێرناندا لێی قەدەغە کردبوو، دروست لەوکاتەیدا کە خەریک بوو بزانێ مەکتەبەکان بە پێشگویی ڕێکوپێک نووسراونەوە، دەستی لە دۆزینەوەی ڕەمزەکان هەڵگرت، بەڵام کاتێک بۆی دەرکەوت کاتی پێویست هەیە تا بتوانێ کاری دیکەشی پێ بکا، بێئەوەی دەست لە فاحیشەخانە هەڵگرێ، توانای ئەوەی پەیدا کرد جارێکی دیکە، بەو لێبڕاوییە، هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی بۆ دۆزینەوەی ئاخرین کلیلی ڕەمزەکان بەکار بێنێ.

بگەڕێتەوە ژوورەکەی میلکیادێس. ئەو ڕەوتە کاتێک بوو کە گاستۆن تازە چاوەڕوانی هاتنی فڕۆکەی دەست پێکردبوو و، ئامارانتا ئۆرسۆلاش هێندە هەستی بە تەنیایی دەکرد کە ڕۆژێکیان بەیانی ڕۆیشتە ژوورەکەی ئەو.

پێیگوت : "سڵاو ئینسانخۆر، دیسان گەڕایەوە بۆغار."

بە دەبەرکردنی لیبادێکی خۆی بڕییووی و، بە لەملکردنی گەردنبەندێکی شووشەیی، کە خۆی دروستی کردبوو، لەرادەبەدەر جوان بوو. کاتێک دڵنیا بوو کە مێردەکەی وەفادارە بۆی، قەڵادە ئاوریشمەکەی لە ملی کردبۆوە و بۆ هەوەڵینجار دوای گەڕانەوەی، وا دەهاتە بەرچاو کە کارێکی نییە بیکا، ئۆرلیانۆ پێویستی بەوە نەبوو چاوی لێ بێ هەتا بزانێ هاتۆتە ژوور. ئامارانتا ئۆرسۆلا ئانیشکی لە سەر مێزی کارەکە دادان و ئەوەندە نزیک و ئەوەندە جەرگبڕ بوو کە ئۆرلیانۆ دەنگی قورسی ئێسقانەکانی گوێ لێ بوو. چاوی بە نووسراوەکان کەوت. ئۆرلیانۆ لە کاتێکدا هەوڵی دەدا بە سەر شۆڕشی دەروونی خۆیدا زاڵبێ، دەنگی خۆی کە، لە دەستی رادەکرد. دووبارە هێنایەوە بەردەستی خۆی. بە سەر ژیانی خۆیدا، کە خەریک بوو لە نێو دەچوو و بە سەر بیرەوەرییەکدا کە خەریک بوو دەیکرد بە ماسییەکی هەشت پێی بەردین، سەرکەوت و، سەبارەت بە چارەنووسی خواناسانەی زانایانی سانسکریت دوا، سەبارەت بە ئیمکانی زانستی بۆ دیتنی داهاتوو لە ڕەوتی زەماندا- وەکو ئەوەی پەرەکاغەزێکی نووسراو لە بەر ڕووناکایی ڕابگرین، قسەی دەکرد. لە پێویستیی دۆزینەوەی نهێنی قسەی دەکرد، کە چۆن بە دۆزینەوەی پێشبینییەکانی دەتوانن پێشی تێشکانەکانی خۆیان بگرن و، لە سەدەکانی نوستراداموس و لەنێوچوونی کانتابریا(١٢)، کە بە هۆی سان ئەمیلیانۆ (١٣) پێشبینی کرابوو، قسەی کرد و لە پڕ بە بێئەوەی قسەکەی ببڕێ، بە هەستێک کە لە سەرەتای بوونیەوە تێیدا خنکابوو، دەستی لە سەر دەستی ئەو دانا، بەو هیوایە کە ئەو لێبڕانە یەکجارییە کۆتایی بە شک و گومان بێنێ. ئەو ئەنگوستی ئۆرلیانۆی هەر بەو ساکارییەی کە لە منداڵیدا دەستی دەگرت، لەنێو دەست گرت و هەر لەو حاڵەدا کە ئەو وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە ئەنگوستی لە نێو دەستی

خۆیدا راگرت.هەر بەو جۆرە مانەوە، بە تێکەڵبوونی قامکی ساردوسڕ، کە هیچ شتێکیان بۆ یەکتر نەدەهێنا و نەدەبرد. هەتا ئەوەی کە ئامارانتا ئۆرسوۆلا لە خەونی زووتێپەری خۆی وەخەبەر هات و دەستێکی لەنێوچاوانی خۆیدا و وتی: "ئای مێرووەکان." ئەوکات بە بێئەوەی بیر لە نووسراوەی سەرپێستەکان بکاتەوە، بە
سەماکردن خۆی گەیاندە دەرگای ژوورەکە و لەوێوە بە سەری پەنجان ماچێکی بۆ ئۆرلیانۆ نارد، وەکو ئەو پاشنیوەرۆیەی کە دەینارد بۆ برۆکسێلێ و ئەو بە وەهاماچێک ماڵئاوایی لە باوکی کردبوو.
وتی: "ماوەکەش دوایە بۆم باس دەکەی. لەبیرم چووبوو کە ئەمرۆ دەبێ قسڵی بە کونەمێرووان وەربکەم."
هەرکات رێگای لەو لایانە کەوتبایە، سەرێکی ژوورەکەی ئەویشی دەدا و هەروا کە مێردەکەی چاوی لە ئاسمانی بڕیبوو، چەند دەقیقەیەکیش لە لای ئۆرلیانۆ دەمایەوە. ئۆرلیانۆ کە بەو گۆرانە هیوادار ببوو و، جارێکی دیکە لەگەڵ خانەوادەکەی نانی خواردبوو، ئەو کارەشی دوای هەوەڵین مانگەکانی گەرانەوەی ئامارانتا ئۆرسوۆلا نەکردبوو. گاستۆن لەو بارەوە هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد. لە وتوویژی دوای نانخواردندا، کە زۆرجار لە سەعاتێک زیاتری دەخایاند، ئەو بە بۆڵەبۆڵ دەردی دڵی دەکرد، کە شەریکەکانی خەریکن کڵاوی لە سەر دەنێن. هەواڵیان پێ دابوو کە فرۆکەکەیان بە کەشتییەکدا ناردووە، بەڵام کەشتییەکە نەدەگەیشتێ و هەرچەند کۆمپانیەکانی کەشتیرانی پێیان دادەگرت کە ناوێک لەوکەشتییە لە ریزی کەشتییەکانی دوورگەکانی کاریبیدا نییە، شەریکەکانیشی سوور بوون لە سەر ئەوە کە فرۆکەکەیان ناردووە، تەنانەت گومانیان بۆ هاتبووە پێش کە رەنگە گاستۆن لە نامەکانیدا درۆیان لەگەڵ بکا، ئاڵوگۆری نامە گەیشتە جێگایەکی شک و گومان، گاستۆن لێبرا ئیدی نامەیان بۆ نەنووسێ و خەریکی بەراوردکردنی سەفەرێکی کورت و بەپەلە بە فرۆکە بۆ برۆکسێل و گەرانەوە بوو، هەتا مەسەلەکەی روونکاتەوە. بەو حاڵەش کاتێک ئامارانتا ئۆرسوۆلا دژی راوەستا و وتی ئامادەیە مێردەکەی لە دەست

بـدا، بـەڵام پـێ لـە ماکۆنـدۆ نەباتـەدەرێ، هـەموو نەخشـەکانی پووچـەڵ بوونـەوە. لـە سـەرەتادا ئۆرلیـانۆش وەکو هـەموو خـەڵکی دیکـە لای وابـوو گاسـتۆن ئاشـقی دووچەرخەیـە و بـەزەیی پێیـدا هـات. دوایـە کاتێـک لـە فاحیشەخانە زانیاریی قووڵتری سەبارەت بە نێوەرۆکی پیاوان دەستکەوت، وایزانـی کـە لەسـەرەخۆیی گاسـتۆنی لـە شـەهوەتی بێئەنـدازە و لـەبران-نەهاتوویەوە سەرچاوە دەگرێ.

بەڵام کاتێک باشتری ناسی و شارەزای رەوشتی راستەقینەی ئەو بوو، کە دروست بە پێچەوانەی رەفتاری بوو، بە گومانێکی بە رقەوە زانـی، تەنانـەت چـاوەڕوانی فرۆکـەش شـتێکی سـاختەیە. بیـری کـردەوە کـە گاسـتۆن ئـەو جۆرەش کە نیشانی دەدا ساکار نییە، بەڵکو پیاوێکی بەئیرادە و بەسـەبرە و کاری خۆی دەزانـێ، بەتەمایە بـەوە کە خۆی دایمـە لەگـەڵ قسـەی ژنـەکەی یەکـە تێکـی بشـکێنێ و قـەت نـەڵێ نـا. کـەمێکیش گیروگرفـت پێـک بێنـێ و بـەجۆرێک لـە رایەڵـەداوی خۆیـدا گرفتـاری بکـا، کـە ژنـە رۆژێـک لـە هیـوا پووچـەکانی خۆی بگـات و باوڵـەکانی دابخـا و بگەڕێتـەوە ئورووپـا. بـەزەیی سـەرەتایی ئۆرلیانۆ بووە رقێکی ئەسـتوور. نەخشـەی گاسـتۆنی شـەیتانانە و لە هەمان کاتـدا کاریگـەر دەهاتـە بـەرچاو. لێبڕا ئامارانتـا ئۆرسـوڵای ئاگـادار کاتـەوە. بـەبێ ئـەوەی تەنانـەت قورسـایی ئـەوین و دووڵـی و حەسـوودیی ئۆرلیـانۆ تێبگـا گاڵتـەی بـە قسـەکەی کـرد. ئـەو نـەیزانیبوو کـە هەسـتێکی گرینگتر لە خوشک و برایەتیی لـە ئۆرلیـانۆدا بەخەبـەر هێناوەتـەوە. رۆژێـک، کە دەیویست دەرگای قوتوویـەکی کومپووتی هڵوو بکاتـەوە، دەسـتی خۆی بری، ئۆرلیانۆ غاریدا پێشـەوە، خوێنی ئەنگوسـتی بمژێ. هێنـدە بەئیشـتیا و راسـتی ئـەوکارەی کـرد کـە هـەموو گیـانی لـە سـەرمان لـەرزی هـاتێ. بـە نارەحەتییـــەوە پێکـــەنی و وتـــی: " ئۆرلیـــانۆ ناجســـنتر لـــەوەی ببیـــە چەکچەکیکەیەکی-شەمشەمە کوێرە- باش."

ئـەوکات ئۆرلیـانۆ خـۆی رانـەگرت و بـەری دەسـتی پرکـرد لـە مـاچی خۆشەویسـتانە و نهێنیتـرین گۆشـەکانی دڵـی بـۆ کـردەوە، ریخۆڵەیـەکی لەبڕاننـەهاتوو و برینـدارو پـیس و بەسـامی، کـە لـە دڵـی خۆیـدا راگرتبـوو،

دەرکێشا دەرەوە. راستیی پێگوت کە چۆن نیوەشەوان لە جێگای خۆی هەڵستاوە و بەسەر ئەو ژێرپۆشانەی ئەودا کە لە حەمام بۆ ویشکبوونەوە هەڵی خستوون، بە رق و ناهومێدییەوە گریاوە. بۆی باس کرد کە چۆن بە نیگەرانییەوە لەبەر نیگرۆمانتا پاراوەتەوە، هەتا وەک پشیلە بمیاوێنێ و بە گریانەوە لە بن گوێی بڵێ گاستۆن گاستۆن گاستۆن و بە چ فێڵێک شووشە عەترەکانی ئەوی دزیون هەتا بە سینگی ئەو کچانەی داکا کە لە برسان خۆیان داوەتە دەست ئەویندارێ. ئامارانتا ئۆرسۆلا کە لە بەر تەوژمی ئەوینی ئەو راستی گوتنە ترسابوو. وەکو سەدەفێک کە دەچێتەوە نێوخۆی، سەبر سەبر قامکەکانی خۆی نووشتاندەوە هەتا ئەوەی دەستی بریندارێ دوور لە هەرجۆرە ئێش و بەزەیییەک، بوو بە مستێکی زومورەد و زەبەرجەد و ئیسقانی بەرد و بێهەست.

وەک ئەوەی تفی فرێدا، وتی: " گەوجە! بە هەوەڵین کەشتی دەگەڕێمەوە بۆ بلژیک."

لە تاوپەڕی یەکێک لەو رۆژانە، ئالفارۆ هاتە کتێبخانەی زانای ئیسپانیۆلی و بە دەنگێکی بەرز ئاخرین دۆزینەوەی خۆی راگەیاند. فاحیشەخانەیەکی باخی کێوی.

ناوی (منالی زێڕین) بوو و بریتی بوو لە سالۆنێکی گەورە لە هەوای ئازاد دا، کە نزیکەی دووسەد حەواسیل بە سەربەستی تێیدا دەگەڕان و بە قیژەی کەرکەری خۆیان کاتیان رادەگەیاند. لە دەوراندەوری مەیدانی سەمادا لە ناوچەی سیمکێشیکراو، لە نێوان گوڵانی کامیلیای گەورەی دارستانەکانی ئامازۆن، باڵندەی ماسیخۆری رەنگاورەنگ و مارمێلکەی گەورەی بەقەد بەراز و ماری دوازدە زەنگوڵە و رەقەیەکی پشتزێڕین، کە لە نێو ئوقیانووسێکی دەستکرد دا مەلەی دەکرد، دەبیندران. سەگێکی سپیی گەورەش لەوێ دەگەڕا، کە دیار بوو زۆرلێکراوە و حاڵەتێکی بێکارەی هەبوو. هەر ئەوەندە خواردنیان دابایە رێگەی دەدا سواری بن. شوێنەکەی ئەوێ، خەستییەکی بێگەردی هەبوو، دەتگوت هەر ئەو دەمە دروست کرابوو. کچانی دوورەگە و جوان و ناهومێد لە نێو پەلکەگوڵی

خوێنین و قەوانی مۆسیقای لە مۆدکەوتوو چاوڕەوان ویستابوون و هەموو شێوەیەکی ئەویندارى کە مرۆڤ لەو بەهەشتی ئەرزیدا لە پاش خۆیان بەجێ هێشتبوو، شارەزا بوون. هەوەڵین شەو کە ئەو چەند هاورێیە رۆیشتنە ئەو گوڵخانەی هیواپووچانە. پیرێژنێکی بێدەنگ و جوان لە بەردەم دەرگای چوونەژوورەوە لە سەر کورسییەکی راحەتی دانیشتبوو، کاتێک لە نێو ئەو پێنج کەسەی چوونەژوورەوە، چاوی بە پیاوێکی ئێسکپانی دەمارگرژ کەوت، کە روومەتی دەرپەریوی وەکو روومەتی تاتاران بوو و لە سەرەتای دروستبوونی دونیاوە بە نیشانەی تەنیایی دروشم کرابوو، هەستی کرد کە زەمان بۆ شوێنی سەرەتای خۆی دەگەڕێتەوە. ئاخێکی هەڵکێشا و وتی : " ئاخ ئۆرلیانۆ!" دەتگوت سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیای دەبینێ، دروست هەروا کە ئەوی زۆر پێش ئەو شەوانە و پێش پەژارەی سەرفەرازی و دوورخراوەیی ناهومێدی لە شۆقی چرادا دیتبووی-لەو بەرەبەیانییە دوورەدەستەی کە رۆیشتبووە ژووری خەوەکەی هەتا هەوەڵین فەرمانی ژیانی خۆی بدا، ئەوینم بدەنێ. پێلار تێرنێرا بوو. زۆر سالان پێشتر، کاتێک گەیشتبووە تەمەنی سەد و چل ساڵی، دەستی لە عادەتی زیانباری ژماردنی ساڵەکانی تەمەن هەڵگرتبوو و تەنیا لە زەمانی لێوارەکانی بیرەوەرییەکاندا درێژەی بە ژیان دابوو-لە داهاتوویەکی روونا لەو بەری داهاتووەکانی، کە لەگەڵ داو و گومانەکانی دوژمنانەی فاڵی وەرەقەکانی ئەودا تێکەڵ ببوون.

ئۆرلیانۆ لەو شەوەوە، پەنای بردە بەر خۆشەویستیی دڵسۆزانەی نەنکی نەناسراوی خۆی. ژنە لە نێو سەندەڵیی دارەبیی خۆیدا دادەنیشت و رابردووی بیر خۆی دەهێنایەوە و قسەی لە گەورەیی و بەدبەختییەکانی بنەماڵە و شکۆی بەفیرۆرۆیشتووی ماکۆندۆ دەکرد. ئالڤارۆ بە قاقاکانی مارمێلکەکانی دەترساند و ئالفۆنسۆ لە خۆوە داستانی سەیر و سەمەرەی ساز دەکردن، کە چۆن حەوتووی پێشوو باڵندەماسیخۆرەکان چاوی چوار مشتەرییان دەرهێنابوون، کە لەوێ بەدرەفتارییان دەکرد و گابریلیش لە ژووری یەکێک لە کچەکانی دوورەگە بوو کە ئەوینی خۆی بە پوول

نەدەگۆرییەوە و لە جیاتیان داوای لە مشتەرییەکانی دەکرد کە بۆ دۆستەکورەکەی کە قاچاخچی بوو و لەو لای شاری ئۆرینکۆ (١٤) حەبس بوو، نامە بنووسن. گاردەکانی سنوور ئەویان گرتبوو و دوای حۆقنە لە سەر لەگەنێکیان دانیشاندبوو، کە پر ببوو لە پیسایی و لە ئەلماس. ئەو فاحیشەخانە راستییە، لەگەڵ ئەو خانمرەئیسە دایکانەیەی، دنیایەک بوو کە ئۆرلیانۆ بە درێژایی زیندانی خۆی لە ماڵەوەدا، بیری لیکردبۆوە. هێندە لەوێ راحەت و هاودەمی تەواوی هەبوو، دوانیوەرۆیەکەی ئامارانتا ئۆرسۆلا لە خۆی دوورخستەوە، بێجگە لەو پەناگەیە بیری لە شوێنێکی دیکە نەکردەوە. دەیویست قوڵپی دڵی بە وشان هەڵرێژێ، هەتا کەسێک ئەو گرێیانە بکاتەوە کە سینگیان هەڵدەدڕی، بەڵام لە جیاتیان تەنیا توانی لە باوەشی پێلار تێرنێرادا بەگەرمی و بەئارامی فرمێسکان هەڵرێژێ. ژنە لێیگەرا هەتا فرمێسکەکانی تەواو بوون، بە سەری پەنجان سەری دەلاواندەوە و بەبێ ئەوەی ناچاری بکا دان بەوەدابنێ لەبەر ئەوین فرمێسکان دەرێژێ. دەستبەجێ کۆنترین گریانی مێژووی مرۆڤی ناسییەوە.

هەروا کە دڵی دەدایەوە، وتی : " باشە، کورەکەم، بڵێ بزانم کێیە."

کاتێک ئۆرلیانۆ ناوی خۆشەویستەکەی خۆی هێنا، پێلار تێرنێرا، قاقا پێکەنی، پێکەنینێک کە ئێستا ئیدی تەنیا وەکو بەغبەغووی کۆتران دەچوو. ئەو ئاگاداری هەموو نهێنییەکانی بنەماڵەی بویندیا بوو، چونکە سەدەیەک پێشگوێی بە فاڵی وەرەق و ئەزموون، فێری کردبوو کە مێژووی ئەو بنەماڵەیە بە بێ لادان وەکو چەرخ دووپات دەبێتەوە، چەرخێکی کە بە دەوری خۆیدا دەسوورایەوە.

بە زەردەخەنەوە وتی : "خەمێ مەخۆ، ئەو لە هەر جێگایەک بێ ئێستا چاوەڕوانی تۆیە."

سەعاتی چواری پاشنیوەرۆیە بوو کە ئۆرسۆلا ئامارانتا لە حەمام هاتەدەرەوە، ئۆرلیانۆ لە پشت دەرگای خۆیەوە چاوی لێ بوو تێپەرِی. رۆب دۆشامبرێکی چیندداری نەرمی لە بەردابوو، خاولییەکی وەکو مەندیل لە سەر بەستبوو، لە سەر پەنجەی پێیان بەدوای کەوت. لە مەستییان بە لادا

هات و دروست لەو کاتەیدا کە رۆب دۆشامبری لە خۆی کردەوە و دیسان لە ترسان لە خۆیەوە پێچایەوە، ئۆرلیانۆ رۆیشتە ژووری خەوەکەی. ئامارانتا ئۆرسۆلا بەترسەوە ئاماژەی بۆ ژوورەکەی تەنیشتی کرد. دەرگای ئەوێ نیوەئاوەڵا بوو و ئۆرلیانۆ دەیزانی کە گاستۆن لەوێ خەریکی نامەنووسینە.

ژنە بە بێدەنگی وتی : "برۆ دەرەوە."

ئۆرلیانۆ زەردەیەکی هاتێ و بە دوودوستان وەکو گوڵدانێکی بگۆنیا هەڵی گرت و هاویشتییە سەر تەختی خەوەکە و بە جۆرێکی وەحشیانە رۆب دۆشامبرەکەی لە بەر دادڕی و پێش ئەوەی بتوانێ رێگەی لێبگرێ، روانییە هەڵدێرێکی رووتی کە تازە شۆرابوو. پێستی سەراسەر یەکرەنگ بوو. هێڵی مووەکانی و خاڵە نهێنییەکانی، کە لە تاریکایی ژوورەکانی دیکەوە هێنابوونیە بەرچاوی، چاوپێکەوتن، ئامارانتا ئۆرسۆلا بەدڵەوە بەرگریی لە خۆی دەکرد و بە زیرەکیی ژنێکی ئاقڵ، لەشی لووس و بۆنخۆشی وەکو خەز لە بەردەستی ئەودا هەڵدەخلیسکاند و هەوڵی دەدا زەبرێکی لە زگی بدا و بە دووپشکی نینۆکەکانی دەموچاوی هەڵدڕێ، بەڵام تەواوی ئەو هەڵس و کەوتانە هەم ئەو و هەم ئەوی دیکە بە هەناسەهەڵکێشانی ئاسایی کردیان، وەکو هەناسەهەڵکێشانی کەسێک کە لە پەنجەرەوە خەریکی تەماشای رۆژئاوابوونی جوانی مانگی ئاوریلە، خەباتێکی دڕندانە بوو، شەڕێکی بکوژ، بەڵام بە بێهیچجۆرە لێکدانێک. هێرشەکان وەکو بۆپێشەوەچوونی تارماییيان ئارام و بەپارێز و لەسەرخۆبوون، بەجۆرێک، لە درێژەی خەباتی ئەوانەدا، خونچەکانی گوڵی ئەتلەس کرانەوە و گاستۆن لە ژووری تەنیشتیان، خەونیئاسمانگەری خۆی لەبیر چۆوە، دروست دەتگوت ئەو دوو ئاشقە دوو دوژمن بوون کە خەریکبوون لە قووڵایی ئاوەزێیەکدا ١٥ پێکەوە ئاشت دەبوونەوە. لە گەرمەی ئەو خەباتە وەحشیانە و لە هەمان کات رەسمییەدا، ئامارانتا ئۆرسۆلا زانی کە بێدەنگیی بەردەوامی ئەو هێندە بێدەلیلە، ئیمکانی هەیە زۆر زیاتر لە هەراوگرمەی شەڕێکی، کە ئەوان خۆیان لێ دەپاراست ببێتە هۆی گومانی مێردەکەی، کە

لەو نزیکانە بوو. کەوابوو بە لێوی لێکنەکراوە پێکەنی و بە بێ ئەوەی دەست لە بەربەرەکانی هەڵگرێ، بە گەستنی بەدرۆ بەرگریی لە خۆی دەکرد و لەشی خۆی سەبر سەبر دەجووڵاندەوە. کاتێک سەرەنجام تێگەیشتن کە هەم حەریفی یەکن و هەم شەریک، شەرەکە بوو بە هەڵبەزدابەز و هێرش بە لاواندنەوە. لە ناکاو ئامارانتا ئۆرسوۆلا وەکو بڵێی بەشۆخی دەستی لە بەرگری هەڵگرت و، کاتێک لەو شتەی کە خۆی ڕێگای دابوو سام گرتی، ویستی دووبارە بەرگری دەست پێ بکاتەوە، بەڵام زۆر درەنگ ببوو. گێژەن و زەنایەکی گەورە ئەوی ئەوی بەرەو چەقی خۆی کێشکرد و لە جێگای خۆیدا چەقاندی. ئیرادەی بەرگری و نیگەرانیی زۆر لە زانینی سووتەکانی پرتەقاڵی ڕەنگ و وتەکانی نادیار کە لە دوای مردن چاوەروانییان دەکردن چۆن لەنێو چوون. تەنیا دەرفەتی ئەوەندەی بۆ رەخسا کە دەست درێژ بکا خاولییەک بدۆزێتەوە لە نێو ددانانی بگرێ هەتا نەهێڵێ زاق و زرووقی پشیلانەی کە دڵ ودەروونی دەڕنی لە زاری بێتە دەرێ.

پێلار تێرنێرا، لە شەوێکی میوانداریدا، هەر لەو حاڵەیدا کە لە نێو سەندەڵیی راحەتیی دارەبییەکەدا دانیشتبوو و پاسەوانیی لە بەهەشتی خۆی دەکرد، مرد. لە سەر ئاخرین داوا و ئاواتی بە بێتابووت ناشتیان. هەشت پیاو هەرچۆن لە سەندەڵییە راحەتییەکەیدا دانیشتبوو، لە قووڵکەیەکی قووڵیان هاویشت کە لە نێوەراستی مەیدانی سەمایە هەڵیان قەندبوو. کچە دوورەگەکانی رەشپۆش، کە لە بەر گریانێ رەنگیان بزرکابوو، گوارە و ئەنگوستیلە و دەرزیلەی سینگیان لە نێو قوڵکەکە هاویشت. لە سەر قوڵکەکە بەردەکێلێکی بێناو و بێ رێکەوتیان دانا و سەریان بە کۆگایەک لە گوڵەکامیلیای ئامازۆن داپۆشی. دوای ئەوەی حەیوانەکانیان دەرمانداو کرد و دەرگا و پەنجەرەکانیان بە خشت و چیمەنتۆ گرت، بە باولەکانیانەوە، کە لە نێوەوە بە وێنەی پیرۆزان و عەکسی باسمەیی گۆڤاران و وێنەی

ماشووقەکانی دوورەدەست و سەیر و سەمەرەیان، کە ئەڵماس دەڕیان. یان ئینسانیان دەخواردن یان لە نێو دەریاکانی پان و بەریندا شای وەرەق بوون ئاستەر درابوون، بە سەرانسەری دونیادا بڵاو بوونەوە.
کۆتایی گەیشتبووە جێ. وێرانەکانی رابردوو، لە نێو گۆڕی پێلار تێرنێرا دا و لە نێو سروودەکان و خشڵیھەرزان قیمەتی جندەکاندا دەڕزی- هەمان وێرانییە پووچەش کە دوای ئەوەی زانای ئیسپانیۆلی کتێبفرۆشییەکەی هەراج کرد و، بە تێشکاویی دڵتەنگی بەهاری ئەبەدی، گەرایەوە بۆ گوندە مەدیتەرانەییەکەی زێدی خۆی، لەوێ بەجێما. هیچکەس نەیتوانیبوو بزانێ ئەو بۆ ئەو بڕیارەی داوە. لە گەرما و گەرمی کۆمپانیای مۆزدا، لە یەکێک لە شەرە زۆرەکان رای کردبوو و هاتبووە ماکۆندۆ. هیچکارێکی باشتری لە کتێبفرۆشی بە مێشکیدا نەهات و لەوێدا کتێبە قەدیمییەکانی چاپی پێش سەدەی پازدە و کتێبەکانی چاپی هەوەڵێ بە چەند زمانان دەفرۆشتن و مشتەرییەکانی بە رێکەوت، هەروا کە چاوەروان بوون لە ماڵەکەی ئەوبەری شەقامەکەوە خەونەکانیان بۆ لێکبدەنەوە، کتێبەکانیان، وەکو ئەوەی سەرگوێلک بن بە پارێزەوە هەڵدەداوە. نیوەی تەمەنی لە پاشخانەی گەرم و پشووبڕی کتێب فرۆشیدا بردەسەر. بە دەست و خەتێکی خواروخێچ و بەلام بەجوانی، بە مەرەکەبێکی ئەرخەوانی لە سەر ئەو کاغەزانەی کە لە دەفتەرچەکانی قوتابخانە سەرەتاییەکانی دەکردنەوە، شتی دەنووسی. هیچ کەس بە تەواوی نەیدەزانی چ دەنووسێ. کاتێک ئۆرلیانۆ لەگەڵی بوو بە ئاشنا، دوو سندووقی پڕ لەو نووسراوانە هەبوو، کە بەجۆرێک مەکتەبەکانی مێلکیادێسیان دەهێنایەوە یاد. لەو کاتەوە هەتا کاتێک ئەوێی بەجێ هێشت، سندووقێکی دیکەشی شت نووسیبوو. وا دەهاتە بەرچاو لە ماوەی مانەوەی لە ماکۆندۆدا بێجگە لە نووسینێ کارێکی دیکەی نەکردووە و، ئەوە کارێکی زۆر بەجێ بوو. تەنیا لەگەڵ ئەو چوار هاورێیەی خۆی پێوەندیی هەبوو. فرفرە و بادەواکانی ئەوانی لەگەڵ کتێب گۆڕیبوونەوە و

کاتێک هێشتا دەچوونە قوتابخانە، هانی دابوون بەرهەمەکانی سێنێکا (١) و ئۆروید (٢) بخوێننەوە. لەگەڵ نووسەرانی بەرهەمی کلاسیک ئەوەندە ئاشنا بوو کە دەتگوت ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان هاومەنزڵ بووە و، شتی ئەوتۆی دەزانی کە زانینی زۆریش پێویست نەبوو: بۆ وێنە ئەمە ئاگۆستینی پیرۆز لە بن لبادی خۆیەوە کراسێکی ئاوریشمی دەبەر دەکرد، کە چاردە ساڵان دای‌نەنا و، ئارنالدۆ دی ویلانۆ (٣) ناسراو بە نیگرۆمانتە (٤) لە بەر ئەوە بەمناڵی دووپشک پێوەی دابوو پیاوەتی خۆی لەدەست دابوو. ئۆگریی سەبارەت بە وشە نووسراوەکان، تێکەڵاوێک بوو لە ڕێزی تەشریفاتی و پاشملانە و تەنانەت نووسراوەکانی خۆیشی ئەو دوو لایەنەی دەگرتەوە. ئالفۆنسۆ، کە زمانی ناوچەیی ئەو فێر ببوو، لوولەیەکی لە نووسراوەکانی ئەوی بۆ وەرگێران لە گیرفانی خۆی نابوو، کە هەمیشە پڕ بوو لە لەتەبڕاوی ڕۆژنامەکان و خۆڕاهێنانی کارە سەیر و سەمەرەکان و، شەوێکیان ئەو لوولەیەی لە ماڵی ئەوکچانەی کە لە بەر نەداری لە باخەڵی ئەو و ئەودا دەنووستن ون کرد. کاتێک پیرەپیاو بەو مەسەلەیەی زانی، پێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرا، شەڕ و هەڵلای ساز نەکرد، بەڵکو بەپێچەوانە قاقا پێکەنی و وتی چارەنووسی ئەدەبیات هەر دەبێ ئەوە بێ. لە بری ئەوە، کاتێک دەیویست بگەڕێتەوە بۆ گوندی زێی خۆی، هیچ هێزێکی بەشەری نەیتوانی ڕازی بکا کە سێ سندووقەکە لەگەڵ خۆی نەبا و، کاتێک لێکۆڵەرەوانی ڕێگای ئاسن دەیانویست سێ سندووقەکە وەکو شتومەک بەرێ بکەن ئەو جنێوی پێدان و توانی سندووقەکان لەگەڵ خۆی بەرێ بۆ واگۆنی نەفەربەران. وتی : "ڕۆژێک قەرار بێ مرۆڤ بە کووپەی دەرەجەیەک سەفەر بکا و ئەدەبیات لە واگۆنی شتوومەکدا، دونیا تێک چووە."

پێش وەرێکەوتن ئەمە ئاخرین ڕستەیەک بوو کە وتی. لە خۆئامادەکردنی سەروبەندی سەفەرەکەدا، حەوتوویەکی خراپی تێپەڕ کردبوو. هەرچی

سەعاتی سفر نزیکتر دەبۆوە، زۆرتر نارەحەت دەبوو، شتەکان زۆرتر شوێنیان دەگۆڕا. هەرچی لە شوێنێکی دادەنا، سەری لە شوێنێکی دیکە دەردێنا، دروست وەکو ئەو کاتەی کە تارمایی ئەو بەڵایەیان بە سەر فێرناندا‌ش هێنابوو.

جنێوی دەدا و دەیگوت : "دایکقەحبەینە، تف لە هەرچی قانوونی ٢٧ی شووراکانی لەندەنی هەیە."

خێرمان و ئۆرلیانۆ، وەکو منداڵان یارمەتییاندا، بلیت و بەڵگەکانی دیکەی رۆیشتنیان بە دەرزیلەیەک لە گیرفانەکانی قایم کردن، لەو کارانەش، کە دەبوایە هەتا گەیشتن بە شاری بارسیلۆن جێبەجێیان بکا، ریزێکیان ئامادە کرد. لەگەڵ هەمووی ئەوانە، بە بێ ئەوەی بزانێ شەڵوارێکی، کە نیوەی پارەکانی ئەوی تێدا بوو، فرێدا. شەوێک پێش رێکەوتن، دوای ئەوەی سندووقەکانی بەبزمار داکوتان و لیباسەکانی لە نێو ئەو باوڵە نان کە لەگەڵ خۆی هێنابووی بۆ ماکۆندۆ ، پێڵووە وەک سەدەفەکانی دادنەوە و بە جۆرە بێشەرمییەک ئاماژەیەکی ئەو هەموو کتێبانەی کرد کە ساڵانی دووریی لە نیشتمان پێ بە سەر بردبوون و بە هاورێکانی وت : "تەواوی ئەم شتە پیسانە بۆ ئێوە بەجێ دێلم!."

سێ مانگ دواتر، پاکەتێکی گەورەیان بەدەست گەیشت کە بیست و نۆ نامە و زۆرتر لە پەنجا وێنەی تێدا بوو و لە سەفەری دەریایی کۆی کردبوونەوە. گەرچی نامەکان رێکەوتیان پێوە نەبوو، رێک و پێک دیار بوون. لە نامەکانی هەوەڵدا بە رووحییەتی هەمیشەیی خۆی، باسی گیروگرفتی سەفەری بۆ کردبوون کە چۆن ئەفسەری کارمەندی چاوەدێریی شتومەک، رێگەی نەدەدا سندووقەکان لە ژووری دانیشتنی خۆیدا دابنێ و هێندەی نەمابوو لە دەریایان باوێ، یان لە گەوجیی خانمێک کە لە ژمارە ١٣ی کابینی خۆی زۆر ترسابوو- نەوەکو لە رووی خورافاتەوە، بەڵکو چونکە پێی وابوو ئەم ژمارەیە هەمیشە بە نوقسانی ماوەتەوە- و لە

بردنـەوەی گریۆیكدا لـە كاتی خـواردنی هـەوەڵین شـامدا لـە بـەر ئـەوەی توانیبووی تامی ئاوی كانی لێریدا (٥) لە نێو چەوەندەرەكانی شـامیَ دا هەڵبدا قسەی كردبوو. بە تێپەڕ بوونی رۆژەكان رووداوەكانی كەشتیی گرینگی خۆیـان لـە دەسـت دەدا و هـەموو شـتێك دڵـی وەتـەنگ دەهێنـا. هەرچەنــدی كەشــتی دوور دەكەوتــەوە ئــەویش خــەمبارتر دەبــوو. دڵتەنگییەكـەی تەنانـەت لـەو وێنانـەی كـە ناردبووشـنی دیـار بـوو. لـە وێنـەكانی هەوەڵێدا، بەوكراسـە سپۆرتەیەوە كە وەكو كراسـی درێژی - نەخۆشخانان دەچوو و، بەو مووانەی وەكو بەفری لە ئوكتوبری هەتاوی دورگـەكانی كاریبیدا، خۆشـحاڵ دەهاتـە بـەرچاو. لـە وێنـەكانی دواییـدا باڵتۆیەكی رەشی دەبەر كردبوو ملپێچێكی ئاوریشمی لە ملی هاڵاندبوو. رەنگپـەریو و بـێدەنـگ لــە سـەر سـەكۆی كەشـتییەك كـە تازیـەبار و خەواڵوو لە ئوقیانووسەكانی پاییزیدا بـەرەوپێش دەرۆیشـت راوەسـتابوو. خیرمان و ئۆرلیانۆ وەڵامـی نامەكانیان دەدایەوە. لە مانگەكانی هەوەڵدا ئەوندەی نامە نووسین هاورێكانی وایان دادەنا ئێسـتا زۆر لەوكاتە لێیان نزیكتـرە كە لە ماكۆنـدۆبوو و هێنـدێك لـەو توورەبوونـەیان بـە بۆنـەی ئەوەی بە جێی هێشتبوون كەم بۆوە. سـەرەتا دەینووسـی هـەموو شـتێك وەكـو پێشـوو وایـە : لـەو ماڵـەی كـە لـەدایك بـووە حەلەزوونـەكان- بوزاقەكان- چێرەیی‌رەنگ هەروا هەبوون و تـامی ماسـیی دوكەڵكراو لـە سەر نانی برژاو هەر ئەو تامەی جارانی هەبوو و، تاڤگـەی گوند، لـە لای ئێواران هەروا بۆنی خۆشـی لـێدەتكا. نامـەكانی لـە سـەر لاپـەرەی كتێب چــان دەنووســی و بــە دەســت و خــەتی خــوار و خــیچ و مەرەكەبــی ئەرخەوانی و، بۆ هەر یەكەیان پاراگرافێكی دەنووسـی. بـەڵام وردە وردە بـە بـێئـەوەی خۆشــی بزانــێ، ئــەو نامــە هاندەرانــە بوونــە بەرنامــەی گوندییەكی بێهیوا. لە شـەوەكانی زستانێدا، كاتێك سـووپ لـە سـەر ئـاگر

دەكوڵی، ئەو دڵی بۆ گەرمای پاشخانەی كتێبفرۆشی و دەنگی هەتاوی لابەلای دارە بادامەكانی تۆز و خۆڵگرتوو و سووتی قەتار لە خەوی پاشنیوەڕۆیاندا تەنگ دەبوو- دروست هەروەكو ئەوەی كە لە ماكۆندۆ، دڵی بە سووپی سەرئاگری شەوانی زستان و هاواری قاوەفرۆشان و دەنگی كۆترەباریكەی زووتێپەڕی بەهاران، تەنگ دەبوو. لە دوو دڵتەنگی كە وەكو دوو ئاوێنە لە بەرامبەر یەكتریدا راگیرابوون، تێك چووبوو. هەستی جوانیی مەجازیی لە دەست دا و سەرەنجام هەموویانی راسپارد ماكۆندۆ بەجێ بێڵن و هەموو ئەو شتانەی كە سەبارەت بە دونیا و دڵی بەشەری فێری كردوون، لەبیر بەرنەوە و، لە بەرهەمەكانی هۆراس (٦) بڕیین و لە هەر جێگایەك هەن هەمیشە لەبیریان بێ كە رابردوو درۆیە و بیرەوەری گەرانەوەی بۆ نییە و، هەر بەهارێكی رادەبرێ ناگەرێتەوە و تەنانەت توندترین و شێتانەترین ئەوینەكانیش راستییەكی پووچن.

ئالوادۆر هەوەڵ كەس بوو كە سپاردەكەی ئەوی قبووڵ كرد و رەفتاری پێكرد. ماكۆندۆی بەجێ هێشت. هەرچی هەیبوو، تەنانەت ئەو پڵینگەی كە لە ماڵەوەی بەستبۆوە و خەڵكی پێدەترساند، فرۆشتی. بەو پووڵانەی كە دەستی كەوتبوو، بلیتێكی دایمیی بۆ قەتارێك، كە هەمیشە لە حاڵی سەفەردا بوو، كڕی. لەو پۆستكارتانەدا، كە لە ئێزگەكانی سەر رێگاوە بۆی دەناردن، بە هاوارەوە، ئەو دیمەنە زووتێپەرانەی لە پەنجەرەی كووپەی قەتارەكەوە بینیبوونی بۆ ئەوانی تاریف دەكردن، هەروەكو بڵێی شێعرێكی درێژ كە بەرە بەرە لەنێو دەچێ دەربەدەر بكا و بیداتە دەستی بای فەرامۆشی. رەشپێستانی ئانی لە مەزراكانی لۆكەی لویزیانا (٧) ئەسپە باڵدارەكان لە مێرگە شیناوەردەكانی كێنتاكی (٨) ، ئەویندارانی یۆنانی لە تاوپەڕانی جەهەننەمیی ئاریزۆنا (٩) ، كچێكی كە بلۆوزی سووری دەبەردا بوو و لە كەنار دەریاچەی میشیگان (١٠) بە

ئاو و رەنگ نەقاشیی دەکرد و بە فڵچەکانی دەستییەوە دەستی بۆ رادەوەشاند- نە لە بەر ماڵئاوایی، بەڵکو لە رووی هومێدەوە، چونکە نەیدەزانی دەست بۆ قەتارێک رادەوەشێنێ کە گەرانەوەی بۆ نییە. دوای ئەو ئالفۆنسۆ و خێرمانیش لە رۆژێکی شەممەدا ئەوێیان بەجێ هێشت، بەو خەیاڵە کە رۆژی دووشەممە بگەرێنەوە، بەلام ئیدی سەروسوراخیان نەبوو. ساڵێک دوای ئەوەی زانای ئیسپانیۆلی لەوێ رۆیشت، لەو چوار کەسە، تەنیا گابریل لە ماکۆندۆ مابۆوە. هێشتا هەر سەرخۆشی دڵسۆزییەکانی نیگرۆمانتا و خەریکی وەلامدانەوەی پرسیارەکانی گۆڤارێکی فەرانسەوی بوو، کە سەفەرێکی بۆ پاریس بە خەلات دەدا. ئۆرلیانۆ، کە ئابوونەی گۆڤارەکەی بە ناوی ئەو بوو، لەپرکردنەوەی وەلامی پرسیارەکان یارمەتیی دەدا- جارجار لە ماڵی ئەو و جارجاریش لە نێو شووشە دەرمانەکان و بۆنی تەنتوروالرین، لە تەنیا دەرمانخانەیەکی لە ماکۆندۆ مابۆوە و مێرسیدێس (١١) ، دۆستی کچی نهێنیی گابریل لەوێ دەژیا. ئاخرین نیسانەکانی رابردوویەکی فەوتاو کە هێشتا لە حالی لەنێوچوون دابوو، لە دەروونەوە دەپووکا و هەمیشە کۆتایی دەهات، بە بێئەوەی کۆتاییەکەی تەواوبوونی هەبێ. تێکۆشانی شار گەیشتبووە رادەیەک لە وەستان کە کاتێک گابریل کێبەرکێیەکەی بردەوە و بە دوو دەست لیباس و جووتە کەوشێک و کۆمەڵەبەرهەمی رابلە (١٢) بەرەو پاریس رۆیشت، ناچار بوو ئاماژە بداتە رانندەی قەتارەکە لە ئێزگە رایبگرێ و ئەوی سوار کا. شەقامی تورکەکان جێگایەکی کە عەرەبەکان، بە دابی هەزار ساڵە لە بەر دەرگا دادەنیشتن و بەرەو مردن دەچوون، فەرامۆش کرابوو. ساڵەها لەو کاتە تێدەپەری کە ئاخرین پارچەیان فرۆشتبوو و لە ویترینەکانی تاریکی دووکانەکاندا تەنیا مانکێنی بێسەر دەهاتە بەرچاو. ناوچەی شیرکەتی مۆز، کە پاتریشیا

براون هەوڵی دەدا لە شەوەکانی لەتاقەتبەدەری پراتویل ئالاباما‌دا، بۆ نەوەکانی خۆی تاریف بکا، ببوو بە دەشتێکی پڕ لە گیا و گوڵی کێوی. کەشیشێکی پیر، کە ببوو بە جێنشینی باوکی رووحانی ئانجیل و هیچ-کەس تەنانەت حەوسەڵەی نەمابوو ناویشی لێ بپرسێ، لە بەر ئاوسانی گەیەکان و نەخۆشیی بێخەویی گومان، لە جۆلانەی خۆیدا کەوتبوو و لەو کاتەدا کە مارمێلکە و مشکان لە سەر میراتی کڵێسا بەشەڕ دەهاتن، ئەویش چاوەروانی بەزەیی خواوەندی مەزن بوو. لە شاری ماکۆندۆ، ئەو شوێنەی کە تەنانەت باڵندەکانیش فەرامۆشیان کردبوو، ئەو شوێنەی کە ئەوەندەی تۆز و خۆڵ و گەرما هەبوو هەناسە بە زەحمەت دەدرا، لە حاڵێکدا کە لە بەر هاتوچوو و خشپ وهۆری مێرووەسوورەکان خەوی لێ حەرام ببوو، ئۆرلیانۆ و ئامارانتا ئۆرسۆلا کە لە تەنیاییدا، لە ئەوین و تەنیایی ئەویندا خۆیان حەشار دابوو، تەنیا گیانلەبەرێکی خۆشبەخت بوون، خۆشبەختترین بوونەوەری سەر زەوی.

گاستۆن گەرابۆوە برۆکسیل. لە چاوەروانیی گەیشتنی فرۆکە ماندوو بوو و رۆژێکیان شتومەکی پێویستی خۆی لە باولێک هاویشت و پووشەی نامەکانی خۆی هەڵگرت و رۆیشت، بەو نیازە پێش ئەوەی ئیمتیازەکەی ئەو بدەن بە دەستەیەک فرۆکەوانی ئاڵمانی، کە پرۆژەیەکی گرینگتر لە پرۆژەکەی ئەویان دابوو بە کاربەدەستانی ئوستان، بە فرۆکە بگەرێتەوە. ئۆرلیانۆ و ئامارانتا ئۆرسۆلا، دوای هەوەڵین دوانیوەرۆی ئەویندارىی خۆیان، بە کەڵک وەرگرتن لە نەبوونی دایکی مێردەکەی، بە خۆشییەکی دزانە و پرمەترسی بە یەکەوە ئەویندارییان کردبوو و نزیکەی هەموو جارێکیش بە گەرانەوەی چاوەروان‌نەکراوی ئەو، ئەوینەکەیان بە نیوەچڵی دەمایەوە. بەڵام کاتێک بەتەنیا لە ماڵەوە دەمانەوە، خۆیان لە ماخولیای ئەوینەکانی پاشکەوتوو دەهاویشت.

هەوەسێکی شێتانە و هەوسارپچڕاو، کە ئێسقانی فێرناندای لە گۆڕدا لە ترسان دەلەرزاند، ئەو دووانەی لە هاندان و ئیشتیایەکی هەمیشەییدا رادەگرت. هاوار هاواری ئامارانتا ئۆرسوولا و گۆرانییە ئازاراوییەکانی، چ لە سەعاتی دووی پاشنیوەرۆیان لە سەر مێزی نەهارخۆری و چ لە سەعاتی دووی نیوەشەو لە عەمبارێ لە ماڵەوە دەتەقینەوە. پێ دەکەنی و دەیگوت : "زگم بەوەدەسووتێ کە هێندە بەخۆرایی کاتی خۆمان بەفیرۆ داوە." لە گێژی ئەو شاوەتەدا مێرووەکانی دەبینی کە لە لای باخەکەوە هێرشیان هێناوەتە سەرماڵ و، برسیایەتیی پێش سەرەتای مێژوویی خۆیان بە خواردنی تەختەکانی ماڵەوە دابین دەکەنەوە. تەماشای ئەو شتە قاڵبووە زیندووەی دەکرد کە بە هەیوانی ماڵەوەدا دەرواتەخوارێ و تەنیا زەمانێک کەوتە بیری لەنێوبردنیان کە گەیشتە ژووری خەوەکەی. ئۆرلیانۆ وازی لە نووسراوەکان هێنابوو. لە ماڵەوە دەرنەدەکەوت و بە پەلە وەڵامی نامەکانی زانای ئیسپانیۆلیی دەدایەوە. حەقیقەتیان لەدەست دا، زەمان و عادەتی رۆژانەیان لەبیر چۆوە. دیسان دەرگا و پەنجەرەکانیان داپۆشی هەتا بۆ رووتبوونەوە کات بەفیرۆ نەدەن و هەروا کە رێمیدیۆسی جوانکیلە پێی خۆش بوو لە ماڵەوە بگەرێ، لە ماڵەوە بەرووتی دەگەڕان. لە نێو گڵی قوڕاویی حەوشەدا بەسەر یەکدا دەتلانەوە. جارێکیان، دوانیوەرۆیەک، کە لە نێو حەوزەکەی حەمامیدا خەریکی ئەویندارى بوون زۆری نەمابوو بخنکێن. لە ماوەیەکی کورتدا، زۆر لەوە زۆرتر کە میرووەسوورەکان ئەوێیان کاول کردبوو، وێرانیان کرد : شتومەکی ساڵۆنیان ورد کردن، بە شێتبازیی خۆیان جۆڵلانەیەکی کە لە بەرامبەر ئەوینەکانی هۆردوویی و خەمهێنەری سەرهەنگ ئۆرلیانۆبویندیادا خۆی راگرتبوو دڕبەدڕیان کرد، دۆشەکەکانیان دادڕین و لە حەوشە بەتاڵیان کردن، هەتا لە لافاوی لۆکەدا ئەویندارى بکەن.

ئەگەرچی ئۆرلیانۆش وەکو حەریفەکەی خۆی، ئاشقێکی کێوی و دێوانە بوو، بەو حاڵەش ئەوە ئامارانتا ئۆرسۆلا بوو کە بە بۆچوونە سەیر و سەمەرەکانی و بە ئیشتیای شاعیرانەی بۆ ئەو بەهەشتە پربەلایەی رێنوێنی دەکردن، دەتگوت هەموو ئەو هێزەی کە دایەگەورەی بۆ دروستکردنی حەیوانە کۆلەکانی ئاوی نەبات بەکاری هێنابوو، کۆی کردبۆوە لە ئەویندارییدا. کاتێک لە خۆشییان گۆرانیی دەگوت و لە داهێنانەکانی خۆی لە پێکەنینان دڵی لەخۆ دەبۆوە، ئۆرلیانۆ بێدەنگ دەبوو و خۆی دەخواردەوە، چونکە هەوەسەکەی لە خۆیدا کۆدەبۆوە و دەیسووتاند، بەو حاڵەش، هەردووکیان ئەوەندە شارەزاییان پەیدا کرد کە تەنانەت کاتێک لە بەر زەبری هەڵچوون، دادەتەپین، باشترین کەڵکیان لەو حاڵەتە ماندوویی و تەپینە وەردەگرت. زانیان کە یەکهەوابوونی ئەوین زۆر ئیمکانی نەزانراویی لەگەڵە کە زۆر لە ئیمکانی خودی شەهوەت دەوڵەمەندترە. خەریکی پەرستنی لەشی خۆیان بوون. هەروا کە ئۆرلیانۆ مەمکە خرەکانی ئامارانتا ئۆرسۆلای بە سپێنەی هێلکە دادەماڵی و رانە سفت و نێورانی وەک هڵووی بە شیلاوکی گوێزی هیندی شیرن دەکرد، ئامارانتا ئۆرسۆلا بووکەڵەی بە ئالەتی گەورەی ئۆرلیانۆ دەکرد و، بە ماجیک چاوی بۆ دروست دەکردن و بە کلچۆک سمێڵی بۆ دادەنا و کراواتی گچکەی ئۆرگاندی لە مل دەکرد و کڵاوی چکۆلەی جغجغەی دروست دەکردن و لە سەری دەنان. شەوێکیان سەرتاپا مرەبای هڵوویان لە خۆیان دا و وەکو سەگ یەکتریان لستەوە و لە سەر هەیوانێ بە یەکەوە ئەویندارییان کرد و، کاتێک وەخۆ هاتنەوە کە تەماشایان کرد سێڵاوی مێروولەی گۆشتخۆر بەرەو ئەوان ریزیان بەستووە و دێن.

ئامارانتا ئۆرسوڵا، لە نێوان ماوەکانی شێتیدا، وەڵامی نامەکانی گاستۆنی دەدایــەوە، لای وابــوو ئەوەنــدە دوورەدەســت و گرفتــارە گەرانــەوەی ئیمکانی نییە. گاستۆن لە یەکێک لە هەوەڵین نامەکانی خۆیدا نووسیبووی کــە لــە راســتیدا شــەریکەکانی فرۆکــەیان نــاردبوو، بــەڵام یــەکێک لــە شــیرکەتەکانی کەشــتیرانیی برۆکســێلی فرۆکەکــەی بــە هەڵــە ســواری کەشــتی‌یــەک بــۆ تانگانیا کردبــوو و، لەوێشــەوە فرۆکەکــەیان دابــوو بــە تایفەیەکی دوورکەوتــە بــە نــاوی ماکۆنــدوس. ئــەو وەزعــە ئاڵۆزە هێندەی کارەکان تێکدابوون، کە دۆزینەوەی فرۆکەکە دوو ساڵی وەخت دەویست. لە بارەوە ئامارانتا ئۆرسوڵا ترسی گەرانەوەی لە نەکاوی ئەوی لــە ســەر رۆیشتە دەرێ. ئۆرلیانۆش بەش‌بەحاڵی خــۆی، بێجگە لــە نامــەکانی زانــای ئیســپانیۆلی و هەواڵــەکانی کــە مێرسیدێســی دەرمــان‌فرۆشــی بێدەنگ لــە گابریلەوە بۆی دەهێنا، پێوەندییەکی دیکەی لەگەڵ دونیای دەرەوە نــەبوو. لە سەرەتاوە ئەوە پێوەندییەکی راستەقینە بوو. گابریل بلیتی گەرانــەوەی خۆی دابۆوە، هــەتا لــە پاریســێ بمێنێتــەوە و لــە فرۆشــی کۆنــەرۆژنامان و ئەو بوتڵە بەتاڵانەی خزمەتکارەکانی هۆتێلێکی خەمهێنەر لە کۆڵانی دوفین (١٣) فرێیــان دەدا، خــۆ بژێنــێ. ئۆرلیــانۆ ئــەوی دەهێنــا بــەرچاوی کــە پۆلیــوێرێکی یەخــەداخراوی لــە بەردایــە کــە تــەنیا لــە گازینۆکــانی قــەراخ شەقامی گــەرەکی مۆنپارنــاس (١٤)، کــە پر بــوو لــە ئاشــقی بــەهاری، لــە بەرخۆی دادەکەنێ و، رۆژانە دەنووســت و شــەوانە شــتی دەنووســی و، لە ژوورێکی بۆنی کەلەمی کوڵاوی لێ‌دەهات و بڕیار بوو ئیمانی لەوێدا سەبارەت بە رۆکامادۆر بمرێ، برسیایەتیی فریو دەدا. هەواڵــەکانی ئــەو بەرەبەرە بی‌متمانە دەبوون و نامەکانی زانای ئیسپانیۆلیش هێندێ جار پر لە دڵتەنگی بوون، ئۆرلیانۆ عادەتی گرت هەر بــەو جــۆرە بیریــان لــێ-بکاتەوە کە ئامارانتا ئۆرسوڵا بیری لــە نامــەکانی مێردەکــەی دەکردەوە.

هەردووکیان بە هەلاواسراوی لە چاڵاوی وێڵدا مانەوە، شوێنێک کە تەنیا راستیی رۆژانە و هەتاهەتایەی ئەوین بوو و هیچی تر.

لەو دونیایەی بەختەوەری و بێخەبەریدا، هەواڵی گەرانەوەی لەنەکاوی گاستۆن وەکو تەقینەوەیەک تەقیەوە. ئۆرلیانۆ و ئامارانتا ئۆرسۆلا چاویان کردنەوە و تەماشای رووحی خۆیان کرد و دەستیان لە سەر دڵی خۆیان دانان و لە نامەکە ورد بوونەوە و هەستیان کرد ئەوەندە لە یەک نزیک بوونەوە کە مردنیان پێ باشترە لە جیابوونەوە. ئەوجار ئامارانتا ئۆرسۆلا نامەیەکی بۆ مێردەکەی نووسی کە زۆر لە راستی دوور بوو. لە ئەوینی خۆی سەبارەت بەو و لە پەلەی چاوەروانیی بینینی ئەو دوا و لەگەڵ ئەوەشدا ئەوینی خۆی سەبارەت بە ئۆرلیانۆ بە ئەستۆی چارەنووس داهێنا و راستیی بە مێردەکەی گوت. پێچەوانەی چاوەروانی، گاستۆن وەڵامێکی هێمن و تەنانەت باوکانەی بۆ ناردنەوە، لە دوو لاپەرەدا باسی پووچیی شەهوەتی بۆ کردبوون و لە کۆتاییدا لە قووڵایی دڵەوە داوای بەختەوەریی بۆ کردبوون، کە بۆخۆی لە ماوەی ژیانی کورتی ژن و مێردایەتییدا پێی گەیشتبوو. دژکردەوەکەی ئەوەندە دوورەئاقڵ بوو کە ئامارانتا ئۆرسۆلا بە فکری ئەوەی بیانوویەکی دابوو بە دەستی مێردەکەی، کە هەروا بەرەڵڵای بکا زۆر بە توندی هەستی بە بچووکبوونەوە کرد. شەش مانگ دواتر، کاتێک گاستۆن لە لیئۆپۆلدویل (١٦) ەوە ئەو شوێنەی کە فرۆکەکەیان لێ دۆزیبۆوە نامەیەکی بۆ نارد، رقەکەی سەبارەت بەو بوو بە دوو بەرامبەر، چونکە لە نامەکەیدا نووسیبووی کە دووچەرخەکەی بۆ پۆست بکەن، تەنیا شتێکی کە لە ماکۆندۆ جێی هێشتبوو و بۆ ئەو نرخی رووحی هەبوو. ئۆرلیانۆ رقی ئامارانتا ئۆرسۆلای بە لەسەرەخۆیی خستە ئەستۆی و، هەوڵیدا پێی نیشان بدا کە لە

بەدبەختیش‌دا دەتوانێ وەکو دەورانی بەختەوەری بۆ ئەو مێردێکی باش بێ. کاتێک ئاخرین پارەکانی گاستۆن تەواو بوو، پێویستییەکانی رۆژانە دەورەی دان، پێوەندییەکی هێندە پتەوی لە نێوانیاندا پێک هێنا کە هەرچەند هەوەسی ئەوین بریقەدار و مەستیهێنەر نەبوو، بەڵام بوو بە هۆی ئەوە کە یەکتریان هێندە خۆش بوێ وەک ئەوەی لە سەرەتای هەوەسی شێتانەی خۆیاندا ئاشقی یەکبوون. کاتێک پێلار تێرنێرا مرد چاوروانی منالێک بوون.

لە داکەوتنی دووگیانیدا، ئامارانتا ئۆرسۆلا هەوڵیدا خەریکی بازرگانیی گەردنبەندان بێ، کە لە ئێسکی ماسی دروستی دەکردن. بەڵام بێجگە لە مێرسیدێس ،کە یەک دوو دەستە گەردنبەندی لێکڕی، مشتەریی دیکە دەست نەکەوتن. ئۆرلیانۆ بۆ هەوەڵین کەرەت تێگەیی کە زیرەکیی زمانفێربوونەکەی، زانیارییەکانی فەرهەنگەکەی و زیرەکیی کەموێنەی لە بەرکردنی وردی رووداوەکان و شوێنە دوورەدەستەکانی هەرگیز نەیدیبوون، وەکو جەعبە جەواهێراتی ژنەکەی، کە لەو زەمانەدا زۆرتر لە هەموو سامانی خەڵکی ماکۆندۆ نرخی هەیە، هەتا چ رادەیەک بێکەڵک بوون. بە سەیری درێژەیان بە ژیان دەدا. هەرچەند ئامارانتا ئۆرسۆلا خۆشخولقی و بلێمەتیی شێتانەی شەهوانیی خۆی لەدەست نەدابوو. بەڵام دوانیوەرۆیان لە حاڵەتێکی خەو و نیوەخەودا لە هەیوان دادەنیشت و بیری دەکردەوە، ئۆرلیانۆ لە تەنیشتی دادەنیشت و جاری وابوو بە بێدەنگی. هەتا تاوپەران لەگەڵ یەکتر دادەنیشتن و چاویان لە چاوی یەکتر دەبڕی و لەو هێمنایەتییەدا ئەوەندە ئاشقانە ئەویندارییان دەکرد کە تین و تەوژمی زۆرجار لە ئەوینداریيە ئابڕووبەرەکانی پێشوو پتر بوو، بە نەبوونی دڵنیایی لە داهاتوو، دڵیان بۆ رابردوو سووراند. خۆیان لە بەهەشتی ونبوونی زەمانی لافاودا دەدیتەوە، کە

خۆیان لە قووڵکە ئاوەکانی حەوشە دەهاویشت. خۆیان دەدیتەوە کە مارمێلکەیان دەکوشتن هەتا بە ئۆرسۆلای هەڵاوەسن و ئەوی زیندەبەگۆڕ کەن. لەو بیرەوەرییانەوە، تێگەیشتن کە ئەوەندەی وەبیریان دێ بە یەکەوە بەختەوەر بوون. ئامارانتا ئۆرسۆلا هەروا کە نوقمی قووڵایی رابردوو دەبوو، دوانیوەڕۆیەکی بیرکەوتەوە رۆیشتبووە کارگەی زێڕنگەری و دایکی پێی وتبوو ئۆرلیانۆی بچکۆلانە کۆرپەیەکی فرێدراوە و ئەویان لە سەبەتەیەکدا لە رووبار گرتۆتەوە. هەرچەند باوەڕیان بەو داستانە نەبوو، بەڵام ئیمکانی شتێکی دیکەیان بە دەستەوە نەبوو، هەتا شوێنی ئەو بە شتێکی راستی پڕ کەنەوە. بەدوای لەبەرچاوگرتنی هەموو ئیمکانێک بە شتێک دڵنیا بوون : فیرناندا دایکی ئۆرلیانۆ نەبوو. ئامارانتا ئۆرسۆلا بە خەیاڵی ئەوەی رەنگە ئۆرلیانۆ کوڕی پیتراکۆتیس بێ، کە داستانەکانی ریسوایی ئەوی بیر دەکەوتنەوە، پڕبەدڵ ترسا.

ئۆرلیانۆ بە ئازاری ئەوەی مەبادا برای ژنەکەی خۆی بێ، رۆیشتە ماڵی کەشیش هەتا لە نێو فایل و پەروەندە کەپەکی و مۆرکە خواردووکاندا نیشانەیەک لە بن و بنەچەکەی خۆی بدۆزیتەوە. کۆنترین بەڵگەیەکی کە لە نێو پەروەنداندا دۆزرایەوە، شایەدی نامەی (غسل تعمید) ی ئامارانتا بویندا لە تەمەنی بلووغیدابوو، بە هۆی باوکی رووحانی نیکانۆر رەئیناوە. لە دەورەیەکدا کە دەیویست بە فروفێڵی شکلاتیبوونی خوا بسەلمێنێ. خەریک بوو بە لەبەر چاوگرتنی ئەو ئیمکانەی رەنگە ئەو یەکێک بێ لەو حەڤدە کەسە ئۆرلیانۆیانەی رێکەوتی لەدایکبوونیانی لەوێدا دۆزیبۆوە هیوایەکی پەیداکردبوو ، بەڵام رێکەوتی غوسلی تەعمیدی ئەوان زۆر لە تەمەنی ئەو دوور بوو. کەشیشی دەردەدار بە نەخۆشیی جومگەکان، بە چاوپێکەوتنی کە وەها لە پێچاوپێچێ

بنەماڵەییدا ون بووە لە سەر جۆللانەیەکەوە بە دڵسۆزییەوە ناوەکەی پرسی.

ئەو وەڵامی دایەوە: "ئۆرلیانۆ بویندیا."

کەشیش بە دڵنیاییەوە وتی : " کەوابوو لەو بارەوە بەخۆرایی خۆت لەم گەرانەدا هیلاک مەکە، چەندین ساڵ لەمەوپێش لێرە شەقامێک بەو-ناوە هەبوو و لەو کاتەدا خەڵکی عادەتیان بوو ناوی شەقامەکان لە منالی خۆیان بنێن."

ئۆرلیانۆ لە رقان لەرزی هاتێ.

وتی : " ئاخ! کەوابوو ئەتۆش باوەر ناکەی."

- چ شتێک؟

ئۆرلیانۆ وەڵامی دایەوە : " کە سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا سی و دوو شەڕی نێوخۆیی کردووە و لە هەمووشیاندا شکاوە، کە هێزی ئەرتەشی سێهەزار کرێکاریان دایە بەر رەشاش و لاشەکانیان لە قەتارێکی دووسەد واگۆنی بارکردن هەتا بیان خەنە نێو دەریاوە."

کەشیش، بە بەزەییەوە سەیرێکی کرد.

ئاخێکی هەڵکێشا و وتی : "ئاخ، کورم، بۆ من هەر ئەوەندە بەسە دڵنیابم کە ئەتۆ و ئەمن لەو ساتەدا هەین – هەر ئەوە."

بەوجۆرە ئۆرلیانۆ و ئامارانتا ئۆرسوڵا، داستانی سەبەتە و رووباریان قبووڵ کرد، نەک لە بەر ئەوەی بەراستی بڕوایان بەو داستانە هەبوو، بەڵکو لە بەر ئەوەی لە ترس رزگاریان بێ، چارەیەکی دیکە نەبوو. هەروا کە سکپڕییەکەی هەڵیدەدا. ئەو دووانەش وردە وردە دەبوونە یەک لەش و یەک گیان، دەبوونە بەشێک لە تەنیایی ئەو ماڵە، ئێستا تەنیا هەناسەیەکی کۆتایی دەویست بە سەریەکیدا برووخێنێ. تەنیا فەزای پێویستیان لە بەر دەستدا بوو : لە ژووری فێرنانداوە شوێنێک

کە بە جوانی ئەوینی نیشتەجێی خۆیانیان تەماشا دەکرد، هەتا سەرەتای هەیوانێ، ئەو شوێنەی ئامارانتا ئۆرسۆلا دادەنیشت و بۆ ئەو منداڵەی کە بڕیار بووبێتە دونیاوە کەوش و کڵاوی دەدروو و، ئۆرلیانۆ وەڵامی نامە تاک و تووکەکانی زانای ئیسپانۆلی دەداوە. باقی ماڵەکە کەوتە بەر هێرشی ویرانی. کارگەی زێڕنگەری، هۆدەی مێلکیادێس، سنووری سەرەتایی و بێدەنگیی سانتا سۆفیا دێلا پێداد، وەها لە قووڵایی دارستانی ماڵەوەدا نوقم بوون کە کەس نەیدەوێرا دەریان بێنێتەوە. ئۆرلیانۆ و ئامارنتا ئۆرسۆلا، کە سروشت دەوری دابوون، قووتیان بدا، هەروا خەریکی چەقاندنی پوونە و بگۆنیا بوون و بە پڕاندنی قسڵ لە دونیای خۆیان بەرگرییان دەکرد و لە شەڕی ئەبەدی لە نێوان بەشەر و مێرووولە، ئاخرین سەنگەرەکانی خۆیان هەڵدەکەند. پرچی درێژ و ئاڵۆز، شینبوونەوەی دەم وچاو، ئاوسانی پێیەکان، گۆڕانی لەشێکی کە زەمانێک ئەوینی لێ دەباری، قیافەی لاوی ئامارانتا ئۆرسۆلای – کاتێک کە بە قەوزەی کەنارییە بەدبەختەکانی خۆی و مێردێکی بە قەڵادە بەدوای خۆیدا دەکێشا، هاتبووە ماڵەوە - گۆڕی، بەڵام رووحییەی شادی نەگۆڕا، پێدەکەنی و دەیگوت : "تف لەم وەزعە، بە بیری کێدا دەهات سەرەنجام بەراستی بکەوینە رۆژگاری مرۆڤە سەرەتاییەکان" ئاخرین هەودای کە ئەوانی بە ژیانەوە دەبەستەوە، لە مانگی شەشەمی دووگیانیدا پسا. نامەیەکیان پێگەیی کە دیار بوو لە لایەن زانای ئیسپانیۆلییەوە نییە. نامە لە بارسلۆنەوە (١٧) پۆست کرابوو. بەڵام ئادرێسەکەی بە مەرەکەبی شین نووسرابوو خەتەکەشی دەسخەتی ئیداری بوو. نامەکە، حاڵەتێکی بنامەکە، حاڵەتێکی بێتاوان و بێگانەی پەیامی دوژمنانەی هەبوو. کاتێک ئامارانتا ئۆرسۆلا ویستی پاکەتەکەی بکاتەوە، ئۆرلیانۆ نامەکەی لەدەست رفاند.

پێی وت : "نا، نامەکە مەکەوە، نامەوێ بزانم چی تێدا نووسراوە."
دروست هەروەکو پێشبینیی کردبوو، زانای ئیسپانیۆلی ئیدی نامەی نەنووسی. ئەو نامە نامۆیە بە بێ ئەوەی بخوێندرێتەوە بوو بە خۆراکی مۆرکان. لە سەر تاقەی، دروست لەو شوێنەی کە فێرناندا جارێکیان ئاڵقەی زەماوەندی خۆی لەبیر چووبوو لە نێو ئاگری ناوەوەی هەواڵە ناخۆشەکەی خۆیدا سووتا. ئاشقانی تەنیا، پێچەوانەی رەوتی شەپۆلەکانی ئاخرین رۆژەکانی ژیان بەلەمیان رادەدا، غەرقبوون و گەیشتن بە سەحرای بێ ئەوین و فەرامۆشی بڵاو دەبوونەوە. ئۆرلیانۆ و ئامارانتا ئۆرسوڵا، کە ئاگاداری ئەم هەرەشەیە بوون، مانگەکانی ئاخر، دەست لە نێو دەستی یەک، بە ئەوینێکی پاکەوە چاوەڕوانی ئەو مناڵە بوون کە تۆوەکەی لە شێتیی ئەویندا گوورابوو. شەوانە کاتێک لە باوەشی یەکتردا نوقم دەبوون، تەقینەوەی بورکانی مێرووان و خشپ و هۆڕی مۆرکان و دەنگی چەقەرەدانی پێکەوەی گیاوگۆڵ، لە ژوورەکانی دەوروبەر نەیدەترساندن. چەند جاران بە دەنگەدەنگی هاتوچووی مردووان وەخەبەر هاتن. ئۆرسوڵایان بینی کە بۆ پارێزگاری لە مانەوەی وەچەی خۆی خەریک بوو لەگەڵ یاساکانی خوڵقان شەڕ و کێشەی دەکرد، خۆزێ ئارکادیۆ بەدوای دەرخستنی راستیی ئەفسانەیی داهێنانەکانی گەورە دەبوو، فێرناندا دوعای دەکردن، سەرهەنگ ئۆرلیانۆ بویندیا دەموچاوی لە بەر فروفێڵی شەڕ و ماسییە چکۆلە زێرەکان ناحەز ببوو و، ئۆرلیانۆی دووهەم لە هەراوهوریای میوانداریيەکانی خۆیدا لە بێکەسییان دەمرد. ئەوکات تێگەیشتن کە ئەرواح لە وەسواسی خۆیاندا بە سەر مردنیشدا سەردەکەون و بە دڵنیاییەوە دوای مردن، تەنانەت زۆر دوای ئەو کاتەی نەسلی حەیواناتی داهاتوو، ئەو بەهەشتە بەڵاڵێدراوەی لە مێش و مەگەز بدزن، ئەو مێش

و مەگەزەی کە خۆیان ئەوبەهەشتەیان سەرەندام لە بەهەشت دزی، بە تارمایی و روحی خۆیان هەمیسان ئەویندارى بەیەکەوە دەکەن، بۆیە دیسان هەستیان بە بەختەوەری کرد.

رۆژی یەکشەممە، سەعات شەشی دوای‌نیوەرۆیە، ئامارانتا ئۆرسۆلا هەستی بە ژانی زان کرد. مامانی زار بە پێکەنینی ئەوکچانەی کە لە بەر نەبوونی ئەویندارییان دەکرد. ئەوی لە سەر مێزی نانی نیوەڕۆ درێژ کرد و لاقی هەڵێناوە و ئەوەندە ناشیانە زگی کوتایەوە هەتا هات وهاوارەکانی بە گریانی کوێێکی جوانکیلە دامرکانەوە. ئامارانتا ئۆرسۆلا لە نێوان پەردەی فرمێسکەکانی خۆیدا دەیدی کە منداڵەکە یەکیک لەو بویندیایە گەورانەیە، بە هێز و خەپەتۆڵە وەکو خۆزە ئارکادیۆکان و چاوکراوە و بەهۆش وەکو ئۆرلیانۆکان، ئامادەی دەستپێکردنەوەی نەسلی ئەوان لە هەوەڵەوە و پاککردنەوەیان لە هەموو جۆرە خراپە و پیسایەتی و تەنیاییەک، چونکە ئەو منالە تەنیا بوونەوەرێک بوو کە لەو سەد ساڵەدا پر بە ئەوین هاتبووە سەر دونیا.

وتی : " دروست و تەواو ئینسانخۆرە. ناوی دەنێین رودریگۆ."

مێردەکەی رازی نەبوو و وتی : " نا، ناوی دەنێین ئۆرلیانۆ هەتا لە سی‌ودوو شەڕاندا سەرکەوێ."

لەو کاتەدا کە ئۆرلیانۆ چرایەکی لە سەر راگرتبوو، مامانەکە دوای نێوکبڕین، بە پەرۆیەک خەریکی خاوێنکردنەوەی چەورایی شینی لەشی منداڵەکە بوو.

کاتێک لە سەر زگ درێژیان کرد، تەماشایان کرد شتێکی لە مرۆڤ زێدەتر هەیە. سەریان بە سەردا گرت جوانتری ببینن- کلکەبەراز بوو.

نەترسان. ئۆرلیانۆ و ئامارانتا ئاگایان لە مەسەلەی کلکەبەرازی بنەماڵە نەبوو و، ئاگادارییە بەترسەکانی ئۆرسۆلاشیان نەدەهاتەوە یاد.

مامانەکە، بەوە کە لە کاتی ددان کەوتنی منداڵەکە، ئیمکانی برینی کلکە-زیادییەکە هەیە، سێبووریی دانێ. دوایی دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەمایەوە بیر لە کلکی بەراز بکەنەوە، چونکە وەکو سێڵاو خوێن لە بەر ئامارانتا ئۆرسۆلا دەرۆیشت. هەوڵیاندا بە داوی جاڵجاڵۆکە و خۆڵەمێش پێشی خوێنبەربوون بگرن، بەڵام دروست وەکو ئەوە دەچوو کە بە دەست بیانەوێ پێشی هەڵقوڵینی کانی بگرن. ئامارانتا ئۆرسۆلا، لە سەعاتەکانی هەوەڵدا هەولی دەدا نەچرژێ. دەستی ئۆرلیانۆی پەرێشانی گرتبوو و لە بەری دەپاڕایەوە نیگەران نەبێ، چونکە کەسانێکی وەکو ئەو، بە پێچەوانەی مەیلی خۆیان بۆ مردن دروست نەکراون. گاڵتەیان بە چارەسەرییەکانی ژنەمامان دەهات، بەڵام هەروا کە ئۆرلیانۆ وردەوردە هیوابڕ دەبوو، ئەویش هێدی هێدی دەتوایەوە. دەتگوت بەرەبەرە رووناکایی لێ دەبڕێ. بەیانیی رۆژی دووشەممە، ژنێکیان هێنایە سەری و ئەو ژنە هێندێک دوعای بۆ زیندوومانەوەی ئامارانتا ئۆرسۆلا بە سەردا خوێندەوە، کە بۆ مرۆڤ و حەیوان کاریگەریی هەبوو. بەڵام خوێنی بە ئەوین نەخشاوی ئامارانتا ئۆرسۆلا هیچ چارەیەکی، کە لە ئەوینەوە هەڵنەقولابێ، قبوول نەکرد. دوانیوەرۆی ئەو رۆژە، دوای بیست و چوار سەعات بێچارەیی و دوای ئەوەی خوێنەکە بە بێ هیچ چارەسەرییەک لە خۆوە راوەستا، تێگەیشتن کە ئەو مردووە. لاچاوەکانی دیسان هاتنەوە سەر رەنگی هەوەڵێ و شینیی دەمووچاوی پەڕی و گۆنای مەرمەرینی بزەی هاتێ.

ئۆرلیانۆ هەتا ئەو کاتە نەیزانیبوو کە هەتا چ رادەیەک هەڤاڵەکانی خۆش دەوێ و هەتا چ رادەیەک دڵی بۆیان تەنگ بووە. ئارەزووی ئەوە بوو لەوکاتەدا لەگەڵ ئەوان با. منداڵەکەی لە سەبەتەیەک نا کە دایکی بۆی ساز کردبوو و روخساری مەیتەکەی داپۆشی و بێئاسۆ لەو

شارە تەریکەدا لە ڕێگایەک دەگەڕا کە بەرەو ڕابردوو بگەڕێتەوە. دەرگای دەرمانخانەی کە لەم دوایانەدا ڕێی تێ نەکەوتبوو، کوتا، بەڵام لە بری دەرمانخانە کارگەیەکی دارتاشیی لەوێ دیتەوە. پیرێژنێکی چرابەدەست دەرگای لێ کردەوە و دڵی بە حاڵی پەرێشانی ئەو سووتا و بەراشکاوی پێیگوت : نا لێرە هەرگیز دەرمانخانەیەک نەبووە و ئەو هەرگیز ژنێک کە گەردنێکی باریک و چاوێکی خەواڵووی هەبووبێ و ناوی مێرسیدس بووبێ نەیناسیوە. ئۆرلیانۆ ناوچاوانی بە دەرگای کتێبفرۆشییەکەی زانا ئیسپانیۆلییەکەوە نووساند و گریا. دەیزانی کە خەریکە فرمێسکە وەدواکەوتووەکانی مەرگێک هەڵدەڕێژێ کە نەیویستبوو کاتی خۆی بە شکاندنی جادووی ئەوین بیانرێژێ. مستەکانی کوتایە سەر دیوارە گێچرێژراوەکەی (مناڵی زێرین) و پێڵار تێرنێرای بانگ کرد. سەرنجی نەدایە ئەو کەوانە نارنجیڕەنگانەی لە ئاسمانەوە تێدەپەرین و ئەو بە شادییەکی مناڵانەوە گەلێک جار لە شەوەکانی بانگهێشتن و میوانیدا لە حەوشەی باڵندە ماسیخۆرەکانەوە سەیری کردبوون. لە دوایین مەیخانەی ئاواڵەی گەڕەکی ڕابواردندا، گرووپێک بە ئۆکۆردیۆنەوە، ئاهەنگەکانی ڕافائیل سکالۆنا (١٨) ی برازای ئوسقۆف و میراتگری نهێنییەکانی فرانسیسکۆیان لێدەدا. خاوەنی مەیخانەکە، چونکە دەستی لە سەر دایکی بڵیند کردبوو، دەستی ویشک و چرچ هەڵگەڕابوو، فەرمووی لە ئۆرلیانۆ کرد تا شووشەیەک ئارەقی ئاڵووی لەگەڵ بخواتەوە. پیاوەکە کارەساتی دەستە ویشکهەڵگەڕاوەکەی بۆ ئۆرلیانۆ گێڕایەوە و ئۆرلیانۆ کارەساتی دڵی، دڵی ویشکهەڵگەڕاوی، کە دەتگوت سیس و پێشێلکراوە، چونکە دڵی بە خوشکی خۆی سپاردبوو. لە ئەنجامدا هەردووک بە یەکەوە گریان. کاتێک ئۆرلیانۆ لە دوایین گزینگی شاری ماکۆندۆدا خۆی تەنیا دیتەوە،

لە نێوەڕاستی مەیداندا باوەشی خۆی لێک ئاوەڵا کردەوە و ئامادە بوو بۆ ئەوەی هەموو جیهان لە خەو راپەڕێنێ. بە تەواوی هێزەوە هاواری کرد :
" هەڤاڵەکان جگە لە کۆمەڵێک قورمساغ هیچ شتێک نین!"
نێگرۆمانتا ئەوی لە چاڵاوی فرمێسک و رشانەوە دەرکێشادەرێ و بردییەوە ناو هۆدەکەی خۆی و فینجانێک سووپی دەرخوارد دا. بەو خەیاڵەوە کە دەتوانێ دڵی بداتەوە، کوتێک زوخاڵی هەڵگرت و بە سەر ئەو نیشانە بێ ژمارانەی ئەوێندا خەتی کێشا کە ئۆرلیانۆ پیی قەرزدار بوو و، بەتایبەت هەموو خەمەکانی تەنیایی خۆی وەبیرهاتەوە تا ئۆرلیانۆ لە گریانی خۆیدا بەتەنیا نەبێ. دوایی کە ئەو و زەردەپەر، هەردووک لە خەوێکی کورتخایەن و ئاڵوسکاوهەستان، ئۆرلیانۆ هەستی بە سەرئێشەیەکی قورس کرد. چاوی لێک هەڵێنا و مناڵەکەی وەبیرهاتەوە. مناڵەکەی لە ناو سەبەتەکەدا نەدیتەوە. ساتێک بە شادییەوە وایدانا کە ئامارانتا ئۆرسۆلا لە جێخەوی مەرگەوە هەستاوە و ئاگاداری لە مناڵەکە دەکات. بەڵام مەیتەکە لە ژێر پێخەفدا ببوو بە بەرد. ئۆرلیانۆ بەو دڵنیاییەوە، کە کاتێک هاتبووە ناوماڵ دەرگای وەتاخی خەوی ئاواڵە دیتبوو، لە بەر هەیوان کە تێکەڵاوی بۆنی پنگەی بەربەیانیان ببوو، چوو بۆ وەتاخی نان خواردن. شوێنەوارەکانی مناڵبوون هێشتا بەدی دەکرا : مەلافە خوێناوییەکان، شووشە پر لە خەڵووزەکان و ناوکی مناڵەکە، کە پێچی خواردبوو و لە کۆنەیەکی ئاواڵەدا لە سەر مێزێک لە کەنار مەقەست و رووپۆشە ئاوریشمەکاندا کەوتبوو. ئەو بیرەی ڕەنگە ژنە قابیلەکە (مامان) بە شەو گەراوەتەوە تا مناڵەکە لەگەڵ خۆی بەرێ، هەلێکی بۆ رەخساند تا نەختێک بە هێمنی بیر بکاتەوە. لە سەر سەندەڵییەکە دانیشت، هەمان کە رێبێکا لە هەوەڵین سەردەمەکانی بنەماڵەدا لە سەری دانیشتبوو و جلوبەرگی بۆ مناڵەکان درووبوو و دەرسی گوڵدۆزینی دابۆوە، هەمان سەندەڵی کە ئامارانتا لە سەری دانیشتبوو و لەگەڵ سەرهەنگ خرینیلدۆ

مارکیز یاریی تاوڵەی کردبوو. لەو ساتەدا بوو کە تێگەیشت ناتوانێ باری قورسی ئەو هەمووە رابردووە لە سەر دڵی تەحەممول بکات. هەستی کرد بە سەرنێزەی کوشندەی دڵتەنگییەکانی خۆی و ئەوانیتر بریندار کراوە. تارە جاڵجاڵۆکەی لەپسانەهاتووی سەر گوڵەسوورەکان، پێشرەویکردنی گیایەکان و سەبر و خۆراگریی هەوای بەربەیانی روناکیی مانگی فیورییەی ستایش کرد و ئەوکات چاوی بە مناڵەکە کەوت، جەستەیەکی ویشکهەڵاتووی هەڵمساو، کە تەواوی مێروولەکانی جیهان لە نێوان کەلێنی بەردەکانەوە بە دوای خۆیاندا رادەکێشا. ئۆرلیانۆ هێزی وەی نەبوو لە جێگای خۆی بجووڵێتەوە، نەک لە بەر ئەوەی کە لە حەژمەتان لە شوێنی خۆی ویشک بووبێت، بەڵکو چونکە لەو ساتە جادوولێکراوەدا ئاخرین کلیلەکانی رەمزی نووسراوەکانی مێلکیادێسی لێ ئاشکرابوو و، نێوەرۆکی نووسراوەکانی بە تەواوی بە پێی شوێن و زەمانی مرۆڤ، کەوتە بەرچاو: (یەکەمینی ئەوانیان لە دار بەست و ئاخرینیان دەبێتە خۆراکی مێروولەکان.)

ئۆرلیانۆ هەرگیز لە هیچکام لە کارەکانی تەمەنی خۆیدا وەها زیت و وشیار نەبوو. مردووەکان و خەمی مردووانی لەبیر کرد. بۆ جارێکی تر دەرگا و پەنجەرەکانی بە دارە سەلیبییەکانی فیرناندا وە بەستەوە تا رێگا لە هەرچەشنە وەسوەسەیەکی ماددی بگرێ کە بیەوێ هەڵیخەڵەتێنێ ، چونکە تازە لەوە تێگەیشتبوو کە چارەنووسی ئەو لە نووسراوەکانی مێلکیادێسدا نووسراوەتەوە. ئەوانی بەدەست لێنەدراوی دیتەوە، لە ناو گیاوگۆڵەکانی بەر لە مێژوودا و قووڵکە هەڵمڵێنیشتووەکان و مێرووە نوورانییەکاندا، کە هەرچەشنە نیشانەیەکی مرۆڤیان لە وەتاخەکەدا پاککردبۆوە. نەیدەتوانی نووسراوەکە بخاتەدەر و بیخوێنێتەوە. هەر لەوێ، بەپێوە، لە ژێر تیشکی کوێرایی‌هێنەری نیوەرۆدا بە دەنگی بەرز، بە بێ هیچ چەشنە زەحمەتێک — دروست وەکو ئەوەی کە بە ئیسپانیۆلی نووسرابن — خەریکی

کەشفکردنی رەمزی نووسراوەکان بوو کە لە سەر پێست نووسرابوون. نووسراوەکان بەسەرهاتی بنەماڵەیەک بوون کە مێلکیادێس بە گێڕانەوەی ورد و درشتی رووداوەکان، سەد ساڵ پێش روودانیان نووسیبوونی. مێلکیادێس نووسراوەکەی بە زمانی سانسکریت نووسیبوو، کە زمانی زگماکی خۆی بوو. بەیتە جووتەکان بە رەمزی تایبەتی ئیمپراتۆر ئۆگۆستوس (١٩) و بەیتەتاکەکان بە کلیلی رەمزی شەرکەرە ئیسپارتییەکان پڕ کرابوونەوە. مێلکیادێس دوایین بەشی نووسراوەکەی، کە ئۆرلیانۆ بەهۆی ئەوینی ئامارانتا ئۆرسۆلاوە زۆر سەرنجی پێنەدابوو، بە شێوەی زمانی ئاسایی مرۆڤ نەنووسیبوو، بەڵکو یەک سەدە هەڵسوکەوتی رۆژانەی بەجۆرێک لەپاڵ یەک خستبوو کە هەموویان بەیەکەوە لە یەک ساتدا وەبەر چاوبکەون. ئۆرلیانۆ نوقم لە جوانیی ئەم دۆزینەوەیەدا، بە دەنگی بەرز، بێئەوەی لە پەرەیەک بە نەخوێندەواری تێپەڕێنێ، دەستی بە خوێندنەوەی ئەو سروودانە کرد کە مێلکیادێس کاتی خۆی بۆ ئارکادیۆی خوێندبوونەوە و لە حەقیقەتدا پێشگۆییکردنی تیربارانکرانی ئارکادیۆ بوون. لە دواییدا لەدایکبوونی جوانترین ژنی جیهانی لەوێدا دیتەوە، ژنێک کە بە رۆح و جەستەوە بەرەو ئاسمان فڕی و سەرچاوەی دووبرای دوانەی دیتەوە، کە دوای مەرگی باوکیان لەدایکببوون و لە کەشفکردنی رەمزەکانی نووسراوەکان چاوپۆشییان کردبوو، نەک لە بەر ئەوەی کە لێهاتوویی و شێلگیریی پێویستیان بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەو کارەیان نەبوو، بەڵکو چونکە زەمانی پێویست بۆئەوکارە هێشتا دانەهاتبوو.

لێرەدا بوو ئۆرلیانۆ، کە بەهۆی ئاگاداربوونەوە لە بنەچەکەی خۆی ئارام و قەراری لەدەست دابوو، چەند لاپەڕەیەکی بە نەخوێندراوەیی بەجێهێشت و لەوکاتەدا بوو کە با هەڵیکرد، بایەکی گەرم و تازە، ئاخنراو لە دەنگەکانی رابردوو و سرتەی گوڵەکێویلەکۆنەکان و ئاخە بێهیوایەکان،

کە پێش دەستپێکردنی سەردەمانی دڵتەنگی هاتبوونە کایە. ئۆرلیانۆ گوێی لە دەنگی با راگرتبوو، چونکە لەو ساتەدا خەریک بوو یەکەم نیشانەکانی بنەچەکەی خۆی لە باوکە گەورە عەیاشەکەیدا دەدۆزییەوە. باوکەگەورەیەک کە بە دوای هەوا و هەوەسی خۆیدا، لە پێدەشتە دوورەکاندا، بە دوای جوانییەکدا سەری خۆی هەڵگرتبوو کە هیچ بەختەوەرییەکی بۆ بەدیاری نەهێنابوو. ئۆرلیانۆ ئەوی ناسییەوە. درێژەی شەقامە نادیارەکانی ئەوی گرتەبەر و گەیشتە ساتێک کە خۆی لە ناو دووپشکەکان و پەپوولە زەردەکاندا دۆزییەوە کە لە سکی دایکیدا تازە گەرای بەستبوو. لە ئێوارەی حەمامکردنێکدا کە شاگردێکی میکانیک هەوەسی خۆی لە ناو باوەشی ژنێکدا دادەمرکاند، کە تەنها بە خاتری ملباداان لە بەرامبەر زەبر و زەنگی دایکیدا خۆی خستبووە ناو باوەشی پیاوێکی بێگانەوە. وەها لە خوێندنەوەدا نوقم ببوو کە ئاگای لە دووهەمین هوروژمی با نەما، بایەک کە بە هێزێکی شەیتانئاساییانەوە خەریکی دەرهێنانی رەگ و چوارچێوەی دەرگا و پەنجەرەکان بوو.

لەوکاتەدا بوو کە تێگەیشت ئامارانتا ئۆرسۆلا نەک خوشک، بەڵکو پووری ئەو بوو. تێگەیشت کە فرانسیس دریک هێرشی بردبوو بۆ سەر ریۆهاشا بۆ ئەوەی ئەوان بتوانن لە نێوان پێچەڵپاچێکی ئاوێتەی خوێندا یەکتر ببیننەوە و حەیوانێکی ئەفسانەیی بخوڵقێنن کە تۆماری ئەوان تێکەوە بپێچێ و کۆتایی بە رەگەزیان بێنێ. ماکۆندۆ ببوو بە گێژاوێکی سامناک لە تەپ وتۆز و وێرانی، کە لە ناوەندی تۆفانی نووحدا دامەزرابوو. ئۆرلیانۆ یازدە لاپەڕەی تریشی تێپەڕاند تا کاتی خۆی لەگەڵ شتی ئاشنا و ناسراو بەفیرۆ نەدات و خەریکی کەشفکردنی رەمزی ئەو ساتە بوو، کە تێیدا دەژیا و درێژەی بە کەشفی رەمزەکاندا تا ئەوکاتەی کە خۆی لە دوایین لاپەرەی مەکاتیبدا دۆزییەوە، دەتگوت خۆی لە ناو ئاوێنەیەکی قسەکەردا دەبینێ. ئەوکات دیسان درێژەی پێدا تا لە پێشگۆیی و دڵنیابوون، لە کات

و شوێن و چەشنی مەرگی خۆی ئاگادار بکرێت، بەڵام پێویست نەبوو تا دوارستەکان بخوێنێتەوە، چونکە بەروونی لەوەتێگەیشت کە ئیتر هەرگیز لەو وەتاخە وەدەر ناکەوێ، وەها پێشگۆیی کرابوو کە شاری ئاوێنەکان (یان تراویلکەکان) دروست لەو کاتەی ئۆرلیانۆ، کە ئۆرلیانۆبابیلۆنا کەشفی رەمزی نووسراوەکان تەواو بکا، بە هۆی تۆفانی نووح، لە سەر زەوی و لە یادی مرۆڤ بۆ هەمیشە پاک دەبێتەوە و ئەوەی کە لە مەکاتیبەکاندا نووسراوە لە ئەزەلەوە تا ئەبەد قەت بۆ جارێکی تر دووپاتناکرێتەوە، چونکە وەچە مەحکوومەکانی سەد ساڵ تەنیایی، هەلێکی سەر لە نوێیان لە سەر زەوی بۆ نارەخسێ.